## لەم ژمارەیەدا

رۆشنبیری نوێ ژماره ١٢٤

جمادی الآخره/ ١٤١٠

کۆڤارێکی وەرزانەی لێکۆلینەوەیە

هۆزکای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات



ناونیشان

هۆزکای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی وزیریە تەنیشت المعهد القضائی ت٤٢٥١٨٤٦

# سیاسەتی دوژمنکارانەی ئێران و سیاسەتی ئاشتیخوازانەی عیراق و رەنگدانەوەی لە قادسیەی صدام دا

گەلاوێژ حەسەن عەبدوللە

پێشەکی :

هیوادارام پێشەکی لەم باسەدا، ئەولایەنە گرنگانەم خستبێتە پێشی چاوتان کە بەدرێژایی مێژ وو هەتا دوا رۆژی جەنگ لە گۆری دابوون. . . هەروەها توانیبێتم ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی کە سەرۆکی فەرماندە صدام حسین (خوا بیپارێزێت) خستبێتە پێش چاوتان بۆ دوورکردنەوەی عیراق لە خوێن رشتن و ئاگری شەر.

هەروەها ئومیدەوارم سرنجی هەموو دڵسۆزێکی مرۆڤایەتیم راکێشابێ بۆ دەس نیشان کردنی ئەو تاوانبارانەی کە بوونە مایەی هەڵگیرساندنی شەرەکە وە بەردەوام بوونی وکێ لە مەدا گوناهبارە. . . لەگەڵ ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی کە دران بۆ کوژاندنەوەی ئاگری شەرەکەو هێنانەدی ئاشتی. باسەکەم دەکەمە سێ بەشەوە ئەمانەش بەشەکانن :

١ - مێژ ووی دوژمنکاری نێوان عیراق و ئێران بەردەوام دەس درێژ یی ئێران و دەس تێ وەردان لە کاروباری عیراق.

٢ - جەنگی قادسیەی صدام و هەولەکانی رێکخراوو لایەنە نێو دەوڵەتیەکان بۆ راوەستانی شەر.

٣ - چۆنیەتی مل کەچ کردنی ئێران و دان نان بە بریاری ٥٩٨ .

بەڵێ زۆر بە باشی هەموومان لە یادمانەو. . . لە یادمانیش ناچێتەوە چۆن ئاگری جەنگ هەڵگیرسا لە نێوان عیراق و ئێراندا؟ . . چۆن ئەم شەرە بەسەرماندا سەپاندرا؟ . . . چۆن رق و شەرخوازی و چاوچنۆکی و خەیاڵ پلاوی ئامانجی فراوانگەری خوێنی زۆری لە ئێران و عیراق رژاند؟ بەڵێ هەمومان لە یادمانە چۆن عیراق بە هەموو رۆڵەکانیەوە بەرگری کرد لە خاکی عیراق؟ .

چۆن شەپۆلە دراندانەکانمان یەك لە دوای یەك پلیشاندەوە هەروەها دروشمی ئاشتی و ئارەزووی زیاتر بۆ بەدی هێنانی لەگەڵ ئالای سەرکەوتن و بەتواناو بازووی عیراقیەکان بەرزدەکرایەوە بە خوێنی شەهیدەکان رەنگین دەکرا بە درێژایی هەشت ساڵ جەنگ. جا بۆئەوەی بزانین ئەم دەستدرێژ ی یە هۆیەکانی چیەو دەگەرێتەوە بۆ چ زەمان و شوێنێك دەبێ قوڵ ببینەوە لە مێژ ووی ئەم دەستدرێژ ی یەو ئامانجەکانی. هەر لە بەر ئەم هۆیە سەرەکی یەش سەرۆکی فەرماندە صدام حسین «خوابیپارێزیت» داوای دانیشتنێکی تایبەتی کرد بۆلێکۆڵینەوەی ناکۆکی و گیروگرفتەکانی نێوان عیراق و بۆئەوەی بە چەشنێکی دوورو درێژ هەموو مەوداکانی ئەم ناکۆکی یەو پاشماوە مێژ ووی یەکانی.بخەینە روو چونکە هیچ تەنگ و چەڵمەیەك ناکرێت لە چوارچێوەی مێژ ووییانەو هۆیە راستەوخۆیەکانی جیابێتەوەو هەوڵدانی بۆچارەسەرکردنی ئەم ناکۆکی یەی کە رووی داوە پێویستە بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بێت[1] (صدام حسین ل٧) چونکە ئەم ناکۆکی یە تەنیا تەنگ و



چەلـەمـەیـەکی سنـووری نیـە بەڵکـو لەوە زۆرتـرو فراوانترە چونکە تەنـگ وچەڵـەمـە لە چاوچنـۆکی یە فراوان خوازی‌یـەکانی ئێران دا خۆی نیشـان دەدات لە ناوچـە عەرەبی یەکانی دراوسێ و ئەوانەی بە پاڵ سنووریەوەن.

پێش ئەوەی مەودای ئەم ناکۆکی یە بەسەربکەینەوە دەبێ کەمێك قووڵتـــر ببینـەوە ئاورێکیشی لە مەودای تێ‌کـۆشـانی عەرەب دژی رەگــەز پەرستیـەتی فارسی بدەینـەوە بەراستی دوژمنـایـەتی ئیـران ئەنجامی بارو دۆخی شۆرشگیرانەی عیراقی نوێ هاتۆتە کایەوە..

هیـــچ گومـــانیشی تێـــدا نی‌یـــە کە ئەم مل ملانێ‌یـــە لە پێش پەیـدابـوونی ئاینی ئیسـلامـەوە بەرپـا بوەو میللەتی عیراقیش بەر لە پەیـدا بوونی ئیسـلام، بۆ بەرگری کردن لە ئادگاروتایبەتیی وخودی شارستـانیـەتی عەرەبی کەسایەتی نەتەوەی خۆیان لە دژی هێرش و شاڵاوەکانی فارسەکان پاراستووەو خەباتیان کردووە.

مێژووی. ناکۆکی نێوان عیراق و ئیران.

---

لە لایـەنی میـژ ووەوە هەر لە ساڵی (١٥٢٠) وەهەژدە پەیمان لە نێـــوان دەولـــەتی فارس و دراوسێکـــانی‌دا لە رۆژ ئاواوە مۆرکـراون هەمـوویـان دەربـارەی پەیـوەنـدی لە گەلیان دا. لە ناو ئەوانیش دا مەســـەلـەی سنـوور. . دەولـەتی فارسیش لە هەمـوو بۆنـەیـەك دا چاوەڕێی هەلی کردووە بۆ ئەوەی لەو پەیمانانە لا بدات چ بە گفت و گۆ، چ بەکـردەوە. دەولـەتی فارس و دەولـەتی عوسمـانی یەکەمین پەیمـانی نێـوانیان لە ساڵی (١٥٢٠)دا مۆرکرد ئەویش لە ئەنجامی دەس بە سەر گرتن و داگیـر کردنی چەنـد ناوچـەیەکی عیراق کە ئەو کاتـە بە دەس عوسمـانیـەکانەوە بوو... بە ئارەزووی خۆی خستیە سەر سنـوری خاکی خۆی. بەڵام دەولـەتی فارسی بە گوێـرەی ئەو پەیمـانـانـە ناچـار بوو ئەو خاکـانـە بەجێ بهێڵێ. دوای ئەوە چەند پەیمـانێکی تریش بەستـراو رێکـەوتن لە سەری گرنگتـرین پەیمان ساڵی ١٦٣٩ یە کە لە (زەهـــاو) مۆرکـراو بۆ یەکـەمین جار سنـوری هەردوو لا دیـــاری کرا دەتـــوانین بڵێن ئەم پەیمـانـە ئەو پەیمـانـەی دووبـــارە کردەوە کە لە ساڵی (١٧٤٦)دا مۆرکـــرا کە تێـیـدا هاتـووە سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت ئەوەیە کە لە پەیمانی ١٦٣٩دا باس کراوە. شایـانی باسیش بێت لە هەردوو پەیمانەکەدا دەوڵەتی فارس ناچـــار کراوە لە زەوی‌وزاری عەرەب لە چوارچێـــوەی دەوڵـــەتـی عوسـمـــانی‌دا بکشێتـــەوە کە دەوڵـــەتی فارس بە گوێـــرەی شوێنی جوگـرافی خۆی لە سەر حسـابی ئەو فراوان دەبـووەوە هەر بە شوێن هەڵگیرسانی جەنگ لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی فارس دا لە ساڵی (١٨٣٣) دا پەیمـانی (ارضـروم)ی یەکەم مۆرکرا کە برگە مۆرکـراوەکـانی پێشـووی دووپات کردەوە سەبارەت بە سنووو...

بەتایبەتی پەیمانی (١٧٤٦) کە بە کارپێکراوی داناودەبێت هەردوو لا پەیرەوی بکەن . . . هەردوولا لەم پەیمانە نوێیەدا بە شێوەیەکی تایبەتی دووپاتی قەدەغەکردنی دەستێوەردانی دەوڵەتی فارسیان کردەوە بە هەرچەشنێك بێت لە کاروباری ناوخۆی عیراق کە ئەو سەردەمە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوو. . بەڵام کێشەی سنووری نێوان هەردوو لا لە ئەنجامی بەردەوام تەماعکاریی ناوچەگەرییەکانی فارس هەردرێژەی کێشا . . سەرەرای ئەو پەیمانانەی کە باسمان کرد بەتایبەتی بە هۆی سەرهەڵدانی پێش برکێی نێوان رووسیای قەیسەریو بەریتانیا بۆ دەست بە سەرداگرتنی ناوچەکە ئەوا هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و فارس وایان بە باش زانی کە سنوورێکی تەواو چەسپاو بۆ خۆیان دابنێن. . لەم بوارەشەوە روسیای (قەیسەری)و بەریتانیا دەوری ناوبژیکەریان بینی . . ئەوە بوو پەیمانی (ارضروم)ی دووەم لە ساڵی ١٨٤٧دا مۆرکرا . . بە گوێرەی ئەم پەیمانەش . . .

دەوڵەتی فارس بۆ یەکەمین جار فراوان بوونەوەی ناوچەیی لەسەر حسابی مافەکانی عەرەب دەستگیربوو. پێش ساڵی ١٨٤٧ لە ناوچەی شط العرب دا لە رۆژهەڵاتی دوورگەی عەبادانەوە بوو . . پەیمانە کە وای لێهات لەگەڵ کەناری رۆژهەڵاتی شط العرب دا بروات . .

ئەگەرچی شط العرب بە تەواوی ئاوەکەیەوە لە ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانی داو بە بەشێك لە عیراق مایەوە کە ئەو سەردەمە بەشێکی دەوڵەتی عوسمانی بوو بێ گومان دەوڵەتی فارس دەستکەوتێکی ناوچەیی بەسەر خاکی کەناری رۆژهەڵات دا دەستگیربوو ئەویش بریتی بولە دەدان نان بە دەستەڵاتی فارس بەسەر بەندەرو کەشتیرانی (محمرە)دا کە کەوتوتە بەرامبەر نۆکەندی (الحفار) لە رووباری کاروون و دوورگەی خضر کە ئێستا بە (عەبادان) ناو دەبرێت، هەرچەندە ئەو خاك و شارو بەندەرەکانی لێ دەرچێت کە لەو کەنارەدان و لە ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانیدا مانەوە. شایانی باسیشە کە پەیمانی (١٨٤٧) بە راشکاوی تێیدا هاتووە هەر لایەکیان دەبێ واز لە داواکاری ناوچەگەری لە خاکی ئەوی تر بهێنن و دەست لە کاروباری ناوخۆی یەکتر وەر نەدەن . . . بە گوێرەی ئەوەش لیژنەیەکی هاوبەش پێکهێنرا بۆ دیاری کردنی هێڵی سنوور لە سەر نەخشە بە گوێرەی وەسفەکانی دیاری کردنی سنوور کە لە پەیمانەکەدا هاتووەو نەشدەتوانرا ئەم ئەرکە بەجێ بیهێنرێت بە هۆی ئەو جەنگانەوە کە لە ناوچەکەدا هەڵگیرسن کە جەنگی قرم نێوان دەوڵەتی عوسمانی و روسیایە لە (١٨٥٤ - ١٨٥٦) داو جەنگی بەریتانیاو فارسە لە (١٨٥٦ - ١٨٥٧)دا هەروەها جەنگی بەلقانە ئیتر بارودۆخ تاکو ساڵی ١٩١١ بە مەنگی مایەوە ئەوسا کە دەربارەی بەجێ هێنانی پەیمانی (ئەرزرۆم) ی دووەم ناکۆکێ سەری هەڵدایەوە ئەمەش لە ئەنجامی قایل نەبوونی دەوڵەتی فارس لە بەجێ هێنانی پەیمانەکەدا . . .

ئەنجام بەوە دوایی هات کە پرۆتۆکۆلی (تاران)ی ساڵی ١٩١١ مۆر بکرێت کە هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و فارسی بۆ بریار لە سەردان و چەسپاندنی هێڵی سنوور لە نێوان هەردوو وڵات دا بە گیانێکی بێ لایەن لە سەر پێکەوەنانی لیژنەیەکی هاوبەش رێك کەوتن کە لە (ئەستەنبول) کۆبێتەوە پاشان لیژنەیەکی هونەری وەسفی هێڵی سنوور لە سەر سرووشت جێ بەجێ بکات بە گوێرەی ئەوەی لە بەندەکانی پەیمانی ئەرزروم واهاتووە کەساڵی (١٨٤٧) مۆرکراوە .

پاش ئەوەی هەر دوولا ساڵی ١٩١٢ لە ئەستەنبول کۆبوونەوە نەیانتوانی لە سەر پیلانی کار کردن رێك بکەون بەهۆی ناوبژی کردنی روسیاو بەریتانیاوە دیسان پرۆتۆکۆلی ئەستانەی ١٩١٣ مۆرکرا کە نوێنەری هەردوولاو هەردوو دەوڵەتی ناوبژیکەر مۆریان کرد.

پرۆتۆکۆلی ناوبرا وەسفێکی ئاشکرای هێڵی سنووری جیاکەرەوەی نێوان هەردوو وڵاتی تێدا هاتووە ئەو وەسفەش جیاواز نیە لەوەی کە لە پەیمانی (ارضروم)ی ساڵی (١٨٤٧)دا هاتووەو چەسپانی ئەم وەسفە لە سەر سروشت و دامەزراندنی ستوونەکان لە لایەن لیژنەیەکەوە ئەرکەکانی دیاری کراون هەروەها پرۆتۆکۆلەکە تێیدا هاتووە کە ئەو سنوورەی لە سەر سروشت دیاری دەکرێت بەو چەشنە دادەنرێت کە بە تەواوی چەسپاوەو لەمەوپاش لێی ورد نابێتەوەو دەستی لێ نادرێت. . .

لەم پرۆتۆکۆلەدا جارێکی تر دەوڵەتی فارس دەستکەوتێکی ناوچەگەری لە سەر حسابی مافەکانی عەرەب چنگ کەوت. . . ئەوەبوو دەوڵەتی عوسمانی جارێکی تر دەستی لە بەشێکی ناوچەی عەرەبی لە شط العرب دا هەڵگرت بەرامبەری بە بەندەری محمرەو کە درێژایی چوار میل، ئەوە بوو هێڵی سنوور لەم ناوچەیەدا وای لێهات بە ناوەراستی شط العرب دا بروات بە ماوەی ناوبراوو ئینجا دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی شان بەشانی کەناری رۆژهەڵاتی رووبارەکە بروات تاوەکو دەریا، کەکۆمەڵێ دورگەی لە ژێر چنگی

دەوڵـەتی فارس دا هێشتـەوە لە ئەنجامی ئەوەوە لیـژنـەیـەکی چوار قۆڵی ی هاوبـەش بە گوێـرەی پرۆتـۆکـۆڵـەکـە لە نوێنـەری روسیـاو بەریتـانیـاو دەوڵـەتی عوسمـانی و ئێـران پێکهێنـرا سنـووری لە سەر سروشت چەسپـانـد بە گوێـرەی ئەو وەسفـەی لە پرۆتـۆکـۆڵـەکـەدا هاتـووە . ئەویش بریتی یـە لە گەیشتنی شط العـرب ەوە بە ئاوی کەنداوی عەرەب لە باشوورەوە تا دەگاتە ئارارات لە باکوور . . .

لیـژنـەکـە کاروبـاری خۆی لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٤دا کۆتـایی پێ هێنـاوە دەربـارەی و ئەویش مەحـزەری دانیشتنـەکـانی و بریـارەکـانی و نەخشـەی پێـویستی رێکخست و (١٢٦) بنکـەی سنـووری دروست کران . ئەم مەحـزەرانـە پێیـان دەوتـرێت (مـەحـزەرەکـانی دانیشتنـەکـانی لیـژنـەی دیاری کردنی سنووری عوسمانی ـ فارسی ساڵی ١٩١٤) تا بەم جۆرە دەبوو سنوور چەسپاو بێت بەتەواوەتی و هەر دوو لا لە مێژەوە ددانیان پێدا نابێت . . .

پاش ئەوەی عیـراق سەر بەخـۆیی وەرگـرت و لە ئیمپـراتۆریەتی عوسـمـانی جیـابـووەوە دوای جەنگی یەکـەمی جیهـان بوو بە دەوڵەتێکی سەر بەخۆ.

بە گوێـرەی یاسـای نێـو دەوڵـەتان لەو ئیمپراتۆریە عوسمانی یەوە پەیمـانـە تورکی کـانی تایبـەت بە ناوچـەی عیـراقی بۆ بەجێ ما، دوواپین پرۆتـۆکـۆڵی ساڵی (١٩١٣) و مەحزەرەکانی لیژنەی دیاری کردنـی سنـوور هی ساڵـی ١٩١٤ بوو کەدەبـوو ئێـران هیـچ تەنـگ وچەڵـەمـەیـەك بۆ عیـراق لەم بارەیەوە نەنێتەوە . . بەڵام لەو سەردەمـەی عیـراق تازە سەربـەخـۆیی وەرگـرتبـوو بە تایبەتی ساڵی ١٩٣٢ زنجیـرەیەك کاری سنوور بەزاندنی ئەنجام داو رایگەیاند کە خۆی بە پەیمـانی (ارضـروم) و پرۆتـۆکـۆڵی ١٩١٣ مەحـزەری دانیشتنەکانی ساڵی ١٩١٤ نابەستێتەوە و دەستی کرد بە زنجیرەیەك کاری دەست تیـوەردانی چەکـدارانە لە شط العرب و پێ خستنە ناو ناوچەی عیراقەوە ئەویش بە دروست کردنی مەخفەری سنوور لە ناو خاکی عیـراق داو پاسـەوانی کردنی بە هێـزی چەکـدارانە . . . ئەم سنـوور بەزانـدنـەش سەربـاسی ئەو سکـالایە بوو کە عیراق ساڵی ١٩٣٤ پێشکـەشی دەستـەی نەتـەوەکانی کرد عصبة الامم ئەوەبوو دەستـەکـەیش ئامـۆژگـاری ئەوەیان کرد کە پیویستە ناکۆکی یەکە لە رێگەی گفت وگۆی راستەو خۆوە چارەسەر بکرێت .

ئەم ناکـۆکی یـە بە مۆرکـردنی پەیمـانی سنوور لە نێوان عیراق و ئێـران لە چواری تەمـوزی ١٩٣٧دا کۆتایی پێ هات کە لە یەکەمین بەندی ئەم پەیمانەدا هاتووە پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩١٣ و مەحزەرەکانی دانیشتنـەکـانی لیـژنـەی دیـاری کردنی سنـووری ساڵی ١٩١٤ بە بەڵگـە نامەی رەوا دەژمێررێن و دەبێت هەردوو لا چاودێرییان بکەن لە نێـوان هەردوو دەوڵـەت دا هەمـان ئەو هێڵە هەبێت کە لەلایـەن لیژنەکەی (١٩١٤) وە دیاری کراوەو دارێژ راوە . .

ئەوەی پەیوەندی بە (شط العرب)ەوە هەیە، ئێران سەر لە نوێ بە گوێـرەی ئەو پەیمـانـە لە سەر حسـابی عیـراق کەوتـە پەل هاویشتن دەستکەوتێکی ناوچەیی نوێی جەنگ کەوت سەرەرای ئەوانەی کە لە پێشـوودا لە رێکـەوتننامەی ساڵی ١٩١٣دا دەستی کەوتبوو ئەمەش بریتی یـە لەوەی کـە . . عیـراق دەست لە بەشێکی بچـووکی شط العـرب بەرانبـەر بە عەبـادان هەڵبگـرێت بۆ ئەوەی هێڵی سنـوور بە ئاوەرۆی قووڵـی ئاوەکـەدا بە درێـژایی نزیکـەی چوار میـل تێ بپـەرێت . . ئەمـەی لێ دەرچێت . هێڵی سنـوور لە نێـوان عیراق و ئێران دا لە پلەی ئاوی تەنکی کەناری رۆژهەڵاتی شط العرب دا بە گوێـرەی دیاری کردنی سنوور کە لە مەحزەری دانیشتنەکانی دیاری کردنـی سنـووری ساڵی ١٩١٤ باس کراوە مایـەوە . . . بەنـدی سێیەمی پەیمانی ١٩٣٧ دەڵێت لیژنەیەك بۆ داکوتانی ئەو ستوونانە پێکبهێنرێ کەوا شوێنەکانیان و دامەزراندنیان لە لایان لیژنەی ساڵی (١٩١٤)ەوە دەستنیشـان کراوە هەروەهـا دانـانی ستـوونی نوێی کەش ئەگەر کەڵك لە دیاریکردنی بینرا .

مەبـەستیش لەمـە وەدیهێنـانی ئەوەیـە کە هەردوو لا لە دێباجەی پەممـانـەکـەدا ئاشکـرایـان کرد بۆ دانـانی . رادەیـەك بە شێوەیەکی کۆتایی بۆ مەسەلەی سنووری نێوان هەردوو وڵات .

لیـژنـەکە داکوتانی ستوونەکانی سنوور ساڵی ١٩٣٨ پێکهات و دەستی کرد بەکار بەڵام لە ساڵی ١٩٤٠دا راوەستا بە هۆی ئەوەوە کە ئێران خۆی لێ کێشایەوە . دوای ئەوەی کە بۆی روون بووەوە کە زۆر سنـووری گەورەی ناوچـەی بچـرانـدووە لە خاکی عیـراق دا لە ناوچـەیی (ام شیـر) لە پارێـزگـەی میسان لە خوارووی رۆژهەڵاتی عیـراق وە . ئیـران سەر لە نوێ گەرایـەوە سەر دروست کردنی ئەو گیـروگـرفتی سنـوورەییـانـەی کە پێش بەستنی پەیمـانی (١٩٣٧) دروستی دەکـردن بۆ عیـراق وەدەستی کرد بە پێ خستنـە ناوخاکی عیـراقـەوە لە چەنـدین ناوچـەی جۆراوجۆردا ئەویش بە دروست کردنی مەخفـەری سنـووری چەکـدار لە خاکی عیـراق داو کاری دەسـت تێـوەردانـی چەکـدار لە شط العـرب دا کە داوای کرد کەشتی رانی تێیـدا لە ئیختصـاصی لیـژنـەیـەکی هاوبـەشی بێت دەسـەڵاتی یاسـایی و جێبـەجێ کردن و دادوەری هەبێت ئەگەر چی

رووبـارێکی نیشتمـانی‌یە بە تەواوەتی لە ژێر دەستەلاتی عیراقدایەو ناوەکەشی بەلگەی ئەوەیە عیراقی و عەرەبی‌یە

ئێـران بەردەوام لە هەردوو سەردەمی پاشـایی و کۆمـاری‌دا ئەم گیـروگـرفتـانـەی بۆ عیـراق پەرە پێ‌دەداو هەڵـوێستی خۆی بەتـوند دەگـرت ئەگـەرچی عیـراق بەرێگـەی دیبلۆمـاسی هەوڵی دا ناکۆکی‌یـەکە چارەسەر بکرێت پەیوەندی‌یەکی ئاسایی لەگەل ئێران پێك بهێنرێت بە گوێرەی ئیلتیزاماتە یاسایی‌یەکانی نێوان هەردوو ولات.

لەگـەلّ هەمـوو شتێك دا. ئێران سەر لە نوێ ئەو رێگەیەی گرت کە لە رابـوردوودا پێ راهـاتبـوو بیگیـرێت ئەوەبـو لە ١٩ی نیسـانی ١٩٦٩ رایگـەیـانـد کە پەیمـانی سنـووری سالّی ١٩٣٧ کۆتـایی هات. عیـراق بۆ دووربـونـەوە لە جەنـگ و خوێن رشتن هەمە جۆر رێگـەی گرتـە بە. بەلام تەقـەلاکانی عیراق پەسەند نەدەکرا لە لای ئێرانـەوە دەخرایە پشت گوێ ئێران لە هەموو کاتێکا بەدوای هەلیك ئەگـەرا بۆ داوا کردنی کێشـانی سنوور سەر لە نوێ لە شط العرب لە سەر بناغەو بنچینەی هێڵی (تالوك) بەم جۆرە بارودۆخ هەر لە سالّی ١٩٦٩ وە پاش شۆرش ١٧ - ٣٠ تەمـوز تا سالّـی ١٩٧٥ هەتـا پەیمـانی جەزایـر مۆرکـرا هەروەك خۆی مایـەوە. . . [سـەرۆکی فەرمـانـدە صدام حسین (ل ١٨) ئارەزوومـان بۆ ئاشتی لە شوێنی توانای بیروباوەی دادپەروەرانەوەیە]

**هەڵوکەوت و پیلان گیران پاش شورشی ١٩٦٨ -**

ئێمـەی عیـراقی هەمـوومان ئەزانین هەموو جیهانیش ئەزانێ کە عیـراقی شورشی هەڤـدەو سی تەمـووز عیراقی پێشـەوای گەل کاك صدام حسین لە ۆ(خـوابیپارێزیت) لە رۆژی سەرکەوتنی شۆرشـەوە لە تەمووزی ١٩٦٨ تا ئەمرۆ رێبازێکی رامیاری نیشتمانی و نەتەوەی پیشکەوتنخوازانەی گرتۆتە بەر کە لەم جیهانەدا بۆ ئەوە دەشێ بکرێتە رێبـازو رێـرەوێکی ئەوتـۆ کە گەلانی ئازادیخـوازو پێشکـەوتن خواز سوودی لێ وەرگـرن بەراستی شۆرشێـك بەم شیـوەیە لە ناوجەرگی وولاتی عەرەبی بێت دوژمنـانی مرۆڤـایەتی نارەحەت ئەکات وای لێ ئەکا بە دوای پیلان گیران بگەرێ بەلگەلەك بدوزێتەوە بیکاتە دار دەسێ خۆی هەر وەك ئەو پیـلانـەی کە گێـرای بۆ وەستـانـدنی ئەم شۆرشـە لە کاروانی پێشکـەوتـووی‌دا کەلـەئـەنجـام دا هەمـوو پیلانەکانیان هەلۆشا فرو فێلەکانیان سەری نەگرت دوا پیلانیان ئەوە بو. . .

کە رژێمی خومـەینی رەگـەز پەرست هان بدەن بیکـەنـە تێـلای دەسیان ئیدی هەموومان زۆر بە باشی دەزانن خومەینی بە یارمەتی و پشت گیـری ئیمپـریـالیـزم و زایـۆنـزم هاتـە سەر حوکم دوای ئەوە خومەینی ئەوەی لە بیر چوو کە ئەم شۆرشە گەلی ئیرانی پێ‌ی‌هەڵسا کۆشکی شای روخان و دوژمنانی گەل ئەم شۆرشەیان دزی لەم گەلە. . .

خومـەینی زوو بە زوو ئەوئەرکـانـەی کە لە لایەنی ئیمپریالزم و زایۆنیزمەوە پێی رادەسپێردرا جێ‌بەجێی دەکرد. عیراق زۆر هەولّی‌دا خۆی لە شەرو ئاژاوەی رژێمی ئیران دوور بخاتەوە بەلام بێ سوود بوو بەلام خۆیـان گەوج کرد بەرامبـەر مێژ ووی گەلی عیراق چونکە زۆر باش دەیـانـزانی گەلی عیـراق زولّم و زۆر قبـول ناکـا. وازیان نەهێنـا تەپلی شەریـان لێ‌دا لە مانگی شوبـاتی ١٩٧٩ واتـە بە گەیشتنی خومـەینی بۆ سەر کورسی حوکمـداری لە ئێـران هەتـا شەرەکە بەم تاوانانە هەستان :-

یەکەم - ٢٤٢ جار فرۆکە جەنگیەکانی ئیران هاتنە سەر ئاسمانی عیراق. (٢)

دووەم - ٢٤٤ جار لە حوزەیـرانی ١٩٧٩ تا چواری ئەیلول تەقـەیان لە مەخفەرە سەر سنوریەکانمان کرد گولە بارانیان کردن.

سێ هـەم - لە مانگـی ئاب وئەیـلولی ١٩٨٠ دا سی جار هێـزی چەکـداری ئێـران و هێـزی هەوایی ئێـران تەقـەیـان لە فرۆکـە مەدەنیەکانی عیراق کرد [فرۆکەیەکی مەدەنی عیراقیش ناچار کرا کە لە ئیران دا دابەزێت]

چوارەم :- لە هەمـان سالّ دا حەوت جار بۆردوومـانی دامـەزراوە ئابوریـەکـانی عێراقیـان کرد. بەرامبـەر ئەم دەست درێـژ یـانـە حکـومـەتی عیـراق تەنیـا رێبـازی وریـاکردن و وسەرنج راکێشان و ئامۆژگـاری گرتـەبـەر بەو نیـازەی ئێران بە ئەقل و مەنتیق ورێگەی دیبلوماسی چارەسەری گیرو گرفتەکانی نێوان هەردوو دەولّەت بکات هەر لە بەر ئەمە هەتا مانگی ئەیلولی ١٩٨٠ حکومەتی عیراق ٢٩٣ بیرخەرەوەی پێش کەش حکومەتی ئێران کرد بەلام ئیران وەلامی ئەو بیرخەرەوانەی عیراقی بە هێرشێکی توندترو بەربلاوترو فروانتر دایەوە لە ٤/٩/١٩٨٠ شارەکـانی مەنـدەلی، خانـەقین، زربـاطیـة، نفط خانەی تۆپ باران کرد لەم حالّەتەدا چارەنەما دەبوو حەددێکی بۆ دابنـرێ کە بێتـە رادەیـەك بۆ تاوان ودەست درێـژ یەکانی، بۆیە **عیراق بریاری لە دوای سێ هەفتە واتە لە ٢٢/٩/١٩٨٠ وەلامیان بداتەوە لەم رۆژە بریاری تولّەسەندن درا**(٣) . . .

**[ئێمە هەمو لە یادمانە کە چۆن شەیتان چووە ئەقلی لێپرسراوانەوە**

له ئیران داو فیز زلی وگومڕایی جڵەوی لێ ستاندبوون وچوون
بانگەوازەکانی ئاشتیەکانمان لەگەڵ ئەقلیەت ومەنتیق
چوونەکانی داو بۆچوونەکانمان بۆ چارەکردنی کێشەکە بە پەیرەوی
لاوازی و ترس و دەزانی ئیمەی ئەوانەی کە بوارین لە بوارەکانی
زۆرانبازی ئێستاو رابوردوویش وەك گەلیکی دێرین ئەوەی دەربارە
نەزانیوین پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین بیێتە هۆی دیارە بە هەڵەدا
چوون و ئەوەی لە زاری جادووکەرانەو دەردەچوو چزەی لە سەر
بڵندی عیراق و نەتەوەی عەرەب هەڵ دەستاند ئەگەر ئەوا ئیمە لە
دروشمی ئاشتی بۆچوونەکانی ئارەزووکردنی بەدی هێنانی
دۆستایەتی وهاوسی یەتی هەنگاومان ئەهێنا
ئێران بوو کە لە لایەن نێو دەولەتی و ناوچەیی یەکانەوە هەر لەڕەت
کردنەوەی بریاری ئەنجومەنی ئاسایشەوە بگرە لە ٢٨ی ئەیلولی
ساڵی ١٩٨٠دا تادەگاتە بریاری ئەنجومەنی ئاسایش ژمارە - ٥٩٨ -
کە لە ٢٠ی تەمووزی ساڵی ١٩٨٧دا دەرچوو بەردەوام کەچی
عیراق هەموو بریارە ناوچەیی و نێو دەولەتیەکانی قبول کردووە کە بۆ
وەدیهێنانی ئاشتی دەرچوون چی ئەوکاتەی عیراق لە خاکی
ئێران دا بوویان چی ئەوکاتەی لە سەر سنوور دەجەنگاو ئەزیەت
دانی لە گەل ونەتەوە و شتە پیرۆزەکان دوور دەخستەوە (٥) زۆر حەز
ئەکەم ئەو هەوڵدانانەی کە عیراق بۆ شەر راوەستان هەوڵی دا بیخەمە
یادتان هەرچەندە لە بیرمان ناچێ بەدرێژای مێژوو:

١ - رێکخراوی دەولەتە موسلمانەکان
٢ - دەولەتە بێ لایەنەکان
٣ - ئەنجومەنی ئاسایش

یەکەم رێکخراوی دەولەتە موسلمانەکان ئەم رێکخراوە لە یەکەم
مانگی دەست پێکردنی شەڕەکە هاتە مەیدانی ناوبژی کردن و
هەوڵی دلسوزانەیدا بۆ شەر راگرتن لە هەوڵدان نەکەوت بە درێژای
ئەم هەشت ساڵە عیراق یارمەتی دان قبولی کرد بە پێچەوانەی
ئێرانەوە گوێی خۆی کەر کرد دژ بە هەموو پێشنیارەکانی ئەم لیژنەیە
کە رێکخراوە بە ناوی (المسیاعي الحمیدة) . دووەم هەوڵدانی
دەولەتە بێ لایەنەکان . کاتێ کە کۆنگرەی وەزیرانی دەرەوەی
وڵاتە بێ لایەنەکان لە شوباتی ١٩٨١دا لە نیودلهی) لە هیندستان
بەسترا . بریاریان دا کە لیژنەیەك بۆ شەر راگراتن دامەزرێنن عیراقی
سەرکەوتو پێشوازی لێ کردن بەلام ئێران دژیان وەستا .

لە ١٩٨٣/١/٤ . وەزیری دەرەوەی عیراق لە کۆبونەوەیەکی
ساڵانەی دەولەتە بێ لایەنەکاندا کە لە نیویۆرك بەسترا ئارەزووی
عیراقی دەربارەی شەر راگرتن و بەرپابوونی ئاشتی راگەیاند

٣ - لە کاتی کۆبونەوەی نوسینگەی رێکخستنی بزووتنەوەی بێ
لایەنەکان [مکتب تنسیق حرکة عدم الانحیاز] کە لە
١٩٨٥/٤/٢٠ لە نیودلهی بەسترا . عیراق ئامادەی خۆی پیشان دا
بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نێوان عیراق و ئێران . .

٤ - لە ١٩٨٦/٨/٣ تێکرای بەشداربونی کۆبونەوەکانی بزوتنەوەی
بێ لایەنەکان لە (نیودلهی) پەنجەیان بۆ هەڵوێستی ئاشتیخوازانەی
عیراق راکێشا ورێزیان لە هەلوێستی ئاشتی خوازی گرت

٥ - لە ١٩٨٦/٩/٥ حکومەتی زیمبابۆی کە سەرۆکایەتی
بزوتنەوەی دەولەتی بێ لایەنەکانی دەکرد پرۆژەیەکی پێش کەش
کرد وەك بریارێك دەربارەی راوەستانی شەرەکە هەموو ئەندامانی
کۆنگرە پەسەندنیان کرد بەلام ئێران رەفزی کردەوە .

سێیەم : نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجومەنی ئاساتەوە یەکگرتوەکان و
ئەنجومەنی ئاسایش لە سەرەتای هەڵگیرساندنی شەڕەکە دەستیان
کرد بە هەوڵدان بۆ راگرتنی شەرەکە هەندێ بریاریان لە بارەی
راوەستانی شەرەکەوە دەرکرد عیراقی مەزن بە هەمووی رازی بوو کە
چی ئێران رەفزی ئەکردەوە

(١) بریاری ژمارە ٤٧٩ لە ١٩٨٠/٩/٢٨
(٢) بریاری ژمارە ٥١٤ لە ١٩٨٢/٧/١٢
(٣) بریاری ژمارە ٥٢٢ لە ١٩٨٢/١٠/٤
(٤) بریاری ژمارە ٥٤٠ لە ١٩٨٣/١٠/٣١
پێش ئەوەی دەرچێ ئێران ئاشکرای کرد کە پێی رازی نابێ .
(٥) بریاری ژمارە ٥٨٢ لە ١٩٨٦/٢/٢٤
(٦) بریاری ژمارە ٥٨٨ لە ١٩٨٦/١٠/٨
دووەمین رۆژ ئێران رەتی کردەوە .

(٧) دوا بریاری ئەنجومەنی ئاسایش بۆ چارەسەری کێشەی نێوان
ئێران و عیراق و راوەستانی شەرەکە بریاری ژمارە ٥٩٨ بوو کە لە
١٩٨٧/٧/٢٠ دەرچوو ئەمە یەکەم بریارە کە بەگشتی هەموو
دەولەتەکان پێی رازی بوون بە پێی ئەم بەراورد کردنەی ئێستاو
رووداوەکانی مێژووی و رووداوەکانی هەشت ساڵی جەنگ بۆمان
دەرئەکەوێ کە وەکو هەموومان ئەزانین کە عیراق ئاشتی لە یەکەم
رۆژەوە دەی ویست شەر راوەستێ چونکە لەو باوەڕە دایە کە ئاشتی
رێگای راستی ژیانە رازی بوونی بە بریاری ژمارە ٥٩٨ هەر
ئەکەوێتە ناو ئەم بۆچوون و بیروباوەڕانە لە کاتێکدا ئێران کە بە هۆی
حوکمڕانە کانیانەوە هەموو بریارو دەست پێشخەرییەکانی رەفز کرد

لەو بریــارەوە کە لە ٢٨ی ئەیلولی ١٩٨٠ لە ئەنجومەنی ئاسایش دەرچــوو تارەفز کردنی بریاری ٥٩٨ کە لە ١٩٨٧/٧/٢٠دا دەرچو ڕازی نەبــووپیّی بەڵام دوای ئەوەی کە لوتی شکــا پاش شکــانی سوپــاکــەی و سەرکــەوتنی عیــراق بەڵام هەمــوو جیهــان ئەیــرانی خومــەینی بە ئارەزووی خۆی ڕازی نەبــووبەم بریــارە کاتێك سەری شۆرکــرد دوای ئەو لەرزە گەورەی کە تووشــی بوو لە ئەنجـــامی سەرکەتنەیەك لە دوای یەکی هێزە چەکدارەکانی عیراق. . .

ئیّمە لە هەموو کاتێکا ووتە پیّروزەکانی سەرکردەمان لە بیر ناچیّ سەرۆکی فەرمــانــدە صدام حسین (خــوابیپاریزیّت) کە لە پاش دوو هەفتــەی لە سەر هەڵگیرساندنی شەڕەکە فەرمویەتی [ئەگەر پرسیارم ئاراستــە بکــەن هەرچەندە ئیّمە بە پەنای خواسەرکەوتوین باشتر وایە کەشەر بیّت یا نا؟ پیّتان ئەڵیّم نا وەڵلاهی باشتر وا بو کە شەڕرووی نەدایــە]. سەرۆکی فەرمــاندە بەوپەری دڵسوزانەوە لە یەکەم ڕۆژەوە هەولی چارەســەری ئەم شەرەی‌دا لە بەر ئەوە لەماوەی ئەم. هەشت ساڵــە بیــری لە ئاشتی دەکــردەوە بە پیّــنج خاڵی سەرەکی بۆچارە سەرکــردنی ئەم کیّشــەیە ئەم خاڵانەش لەدووی ئابی ساڵی ١٩٨٦ بڵاوکرانەوە کاری نەکردە سەر ئیّران ئەمانەن:

١) - ڕیّگەی ئاشتی بە کشانەوەی تەواو وبەر بڵاوو بیّ مەرج دیّتەکایەوە.

٢) - ئاڵ وگۆرکردنی فراوان و تەواوی دیلەکان

٣) - مۆرکــردنی ڕیّکــەوتننامەی ئاشتی و قەدەغە کردنی هیّرش بردنە سەریەك لە نیّو هەردوو وڵات دا.

٤) - قەدەغــەکــردنی دەست دریّــژ کردنی بۆناو کاروباری ناوخۆی یەکترو ریزگرتنی هەر لایەك بۆ هەڵبژاردەکانی ئەوی تر.

٥) - عیــراق و ئیّــران دوورەگــەزی ئیجــابی بۆبە دیهیّنــانی هیّمنی و ئاسایش لە ناوچەکەداو لە ناوچەی کەنداوی عەرەبدا.

(سەرۆکی فەرماندە ١٩٨٨/٨/٦)

ئەم خاڵانــەی سەرەوە سەرۆکی فەرمــانــدە دووپــاتی کردنــەوە بۆ ئەوەی بکریّنە ریبازیّك بۆشەر ڕاگرتن لەووتە بەنرخە میّژ ووییە کەیدا کە بەبۆنەی تیّپەر بوونی بیست ساڵ بەسەر شۆرشی ١٧ی تەمووزی مەزن. فەرمــوی‌بــووی هەمــوومــان ئەزانین هۆی سەرکــەوتنمــان ئەگــەریّتــەوە نەخشــەکیشــانی دڵسۆزانەی پیّشرەوی گەل و نیشتمان دڵسۆزیەتی ئەم بلیمەتە پاڵەوانە سەرۆکی فەرماندە هەروەها بە کارە باشــەکــانی بایــەخ دان بەجــەنگــاوەروخیّــزانی جەنگــاوەر ئەگــەر بریــندار بــوایــە یا دیــل بوایــە هەروەها بایەخ دان بەشەهیدوخیّزانی شەهیــد ئەم هەڵــویّستــانــە پلەی بروای جەنگــاوەری عیــراقی بەرزکــردەوە. چونکــە سەربــاز زۆر بە باشی ئەیــزانی ئیّران تەماحی کردوە لە خاکی مەبــەستیش فراوانگــەری‌یــە هەر لە بەر ئەوە بەدڵ و گیــان چەکــی هەڵ گرت بۆماوەی هەشــت ساڵ. ڕۆژ دوای ڕۆژ بروای بە خوێ زیاتر ئەبوو ئەمانە بوون بەکورتی هۆی سەرکەوتنمان لە ئەنجامــا تەنــانــەت نەڵیّم هەرچــەند بنووسین وبڵیّین نەزمان نە پیّنــووس ناتــوانیّ ئاوی دڵمــان بداتــەوە بەباس کردنی دڵسۆزی ئەم پیّشــرەوە نەمــرە زۆر سوپــاس بۆخوای گەورەو میهــرەبــان کە ئەم ڕەحمەی پیّ کردین صدام ی پیّ بەخشین.

سەرچاوەکان


١ - صدام حســیــن، ئارەزوومــان بۆئاشتــی لە شویّــنــی توانــای بیروباوەری دادپەروەرانەوەیە، بەغدا ١٩٨١.

٢ - گۆڤاری ڕۆشنبیری نویّ ژمارە ١١١

٣ - گۆڤاری ڕۆشنبیری نویّ ژمارە ١١٩

٤ - گوڤاری ڕۆشنبیری نویّ ژمارە ١٢١

٥ - نامەی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین (خوابیپاریّزیت) لە ٦ی ئابی ١٩٨٨ز

٦ - گۆڤاری بەیان ژمارە ١٣٥

٧ - ڕۆژنامەی الثورە ژمارە ٦٦٥٠

ملخص البحث .

# السياسة العدوانية لايران والسياسة السلمية للعراق وانعكاسها في قادسية صدام

گلاويژ حسن عبدالله

ويتناول البحث مواقف السيد الرئيس خلال الحرب من اجل السلام وكذلك في نفس الوقت تخطيطاته العسكرية الجبارة التي دحرت كل الهجمات الفارسية الشرسة على بلد صدام حسين بلد الانتصار والبطولة . وكذلك يتناول البحث قدرات قواتنا المسلحة وايمانه بالنصر المحتوم وبقيادته الفذه وبقضيته العادلة .

ويتناول البحث ايضاً مراعاة السيد الرئيس لعوائل الشهداء والاسرى والمفقودين .

واهم نقطة اساسية في البحث ابراز النقاط الخمس التي اعلنها السيد الرئيس في خطابه الذي القاه في ١٧ / تموز ١٩٨٨ من اجل السلام الدائم والتي تعتبر نقاطاً رئيسية لاجل الوصول لحل جذري وشامل لقضية السلام .

يتناول البحث، العداء الفارسي للعراق منذ القدم واطماعهم التوسعية قبل الاسلام والى يومنا هذا وكذلك البحث يتناول الاعتداءات الفارسية على حدود بلدنا العزيز منذ إستلام خميني زمام الحكم في ايران وموقف العراق إزاء هذه الاعتداءات والمحاولات والمساعي المبذولة لوقف القتال بين دولتين جارتين مسلمتين وتجاوب العراق مع كل المساعي السلمية من موقع القوة والانتصار عكس نظام إيران الذي كان حصته طيلة ايام الحرب خلال ثمانية سنوات خسارة واندحار ومع هذا كانوا يرفضون جميع المساعي المبذولة من اجل السلام .



# لەشکەرێ عیراقێ ئو سەرکەوتن

نڤیسینا: بریندار مزیری

## پێش گوتن

هەمی عیراقی یا وەلاتەکێ سەربەست دڤێت ئو هەمی یا دڤێت بژیت ب دل خوشی ئو کامیرانی ئورحەتی ئو ئەو خودانێ بریارا بیت، ژ بەرخاترا ئەڤێ چەندێ هەمی یا خەباتا خۆکرو خۆ کرنە ئێك دل و ئێك دەست ئول بەرسینگێ دوژمنێت مللەتێ عیراقێ راوەستیان ئو خوراگرتن ئو هەمی نەخش و پیلانێت رژێمێت

کەڤنەپەرێسا تێکدان ئو دویماهیکەك بۆ کولەداری یێ دانا..

شۆرەشا (۱۷ ـ ۳۰)ێ تیرمەها پیرۆز باقوماندارییا پارتا بەعسا عەرەبی یا هەڤپشکی دویماهیکەك دانا بۆ ئەوان ئالوزی و نەخوش یا ئەوێت لناڤ لەشکەرێ عیراقێ دا.. ئو مللەتی. ئەڤە چیرۆکەکا دیرو درێژە.. هەکە بەرێ خو بدەینە سەرو بەرێ لەشکەرێ

عیراقی . . ڤیجا ج ل دەمێ حکمێ بریتانیا ل عیراقی . . ئوپشتی شۆرەشا (١٤) تیرمەها پیروز . . ئو دەورێ لەشکەری ل دەمێ شۆرەشا (١٧ ـ ٣٠) تیرمەهێ دێ بینین جیاوازییەکا مەزن هەبۆ . . ئو یاهەی .

لەشکەرێ عیراقێ ل دەمێ حکمێ بریتانیا یێ تەپەسەربۆ . . نووەلاتێ گرێدای بۆ ب هندەك پەیماناڤە . . وەکو پەیمانا بەغدا . . هەروەسا ج دەورەکێ مەزن لەشکەری نەبۆ ئو نەدهێلا لەشکەر بهێتە چەککرن ب نویترین چەك ژ بەرکو داخۆل بەرسینگێ وان نەدەت . . ئو باشترین نمونە دەمێ لەشکەرێ عیراقێ پشکداریکری دجەنگا (١٩٤٨) یافەلەستینێ تشتەکێ ئاشکەرا بۆ . . ب چەکەکێ بێخێر پشکداربۆ . . ئەڤ سەرویەرە ما . . پشتی شۆرەشا (١٤) تیرمەهێ . . بەلێ دیسا نەشیان لەشکەرەکێ هێژا وزیرەك پەیدابکەن بەس هەرچەوابت باشتر بۆژ سالێت حکمێ بریتانیا لە دەمێ شۆرەشا هەڤدەی سیها تیرمەهێ هاتی . . بۆجارا ئێکێ لەشکەر دانا بەرچاڤێ خۆ . . ئو دڤیا لەشکەرەکێ خومالی و زیرەك چێ بکەت . . هەروەسا ڤیا . . چەکەکێ باش بێختە ددەستی دا . . لەوانیکێ بریاردا ب ڤەگوهازتنا سەروکانێت کرینا چەکی یاکو بەراهیکێ بەس موسکو بۆ . . بەلکو شۆرەشێ وقوماندارییا وێ ڤیا سەروکانێت چەکی ببنە گەلەك داکو ج دەولەت گڤاشتنێ نەکەتن ل سەر مللەتی نەخاسمە ل دەلیڤێت تەنگاڤی یێ دا ئو نەخاسمە ل دەمێ شەری . .

ئەڤەمو شۆرەش ب ئەڤێ چەندێ ژی رازی نەبو . . بەلکو قوماندارێت شۆرەشێ هزر دکر ئو دگۆت هەکە مە دڤێت مللەتێ خۆ پارێزین ئو ب سەربلندبیت دڤێت سامان ئو ئابورێ وەلاتی یێ رزگارکریبیت . . ڤیجا پێنگاڤ پێنگاڤ هاتنە هاڤێتن . ئەوژی دەست پێ هاتەکرن ب خومالی کرنا گازێ یاکو ئەو بۆیە ئەگەرەکا مەزن بۆ گوهۆرینا سەرویەرێ ژیانێ ل عیراقێ . . هەروەسا داخبارکرە ل سەر هەمی لایێت ژیانێ . . بکرە ژسنعەتکاری ئو چاندنێ و سەخبیرییێ وجڤاکی . .

هەروەسا جهێ عیراقێ هاتە دیاربۆن لناڤ کەلەخێ دەولەتی دا ئو دەولەتا هزرەکا دی بۆ عیراقێ کر . . ئو تێکەلیێت خۆ موکمکرن دگەل دەولەتێت هەڤال ئو دەستێ هاریکارییێ درێژکر بۆ بزاڤێت رزگاریخواز ل جیهانێ ئو نەرازیبونا خۆ دیارکر بەرامبەری رامیارییا توخم پەرێسی یێ ئو خەبات و بزاڤا عیراقێ هاتە دیارکرن لناڤ کۆنگرێت دەولەتێت بزاڤا بێلا ئو دەورێ وێ بۆ پارێزتنا ئاشتی یێ ئو تەناهییا دەولەتی . . ڤیجا دەمێ کولەداریێ ئو ئیمپریالیزمێ هەست ب ئەڤێ چەندێ کری هەولدا ب راوەستاندنا خرخالا پێشکەفتنێ ل عیراقێ ئو شورەشا (١٧ ـ ٣٠) تیرمەهێ تێکبدەت ئینا رابۆ ب هلکرنا ئاگرێ شەرێ عیراقێ و ئیرانێ ئو ئیران پالدا ژ بەرخاترا داکو دویماهیکەکێ بۆ پێشکەفتنا عیراقێ بدانیت .

بەلێ پارتێ و شورەشێ ئاگەهـ ل ئەڤان پیلانا هەمییا بۆ . . ئو ئاگەهـ ژ سەرویەرێ ژیانا مللەتی هەبۆ . .

ئو شەرێ عیراقێ وئیرانێ شەرێ مان ونەمانێ بۆ . . کورێت مللەتی دەستێت خۆ تێکگرتن ئو بەرەڤانی ژ وەلاتێ خۆ کر . .

ئەڤ جەنگە پەیدا بۆ پشتی کو رژێما خومەینی کورسیکا حکمی وەرگرتی ئو شاهـ ژ ئیرانێ دەرکەفت ڤیجا ئەمریکا هەست ب رەڤینەکێ کر ئو ترسیا نەکو موسکو جهێ پێت خۆل دەڤەرا کەنداڤێ عەرەبی بکەت ئینا بزاڤ کر ب هلکرنا ئاگرێ شەری دناڤبەرا عیراقێ و ئیرانێ دا . داکو پەرژەوەندییا خۆ ب پارێزیت ل دەڤەرێ ئو تەرازییا هێزێ بهێتە پارێزتن دناڤبەرا واشنتن و موسکودا .

## ئیستراتیجی یائێکێ
## زیرەکییا لەشکەرێ عیراقێ

ل دەمێ رژێما ئیرانێ ئاگرێ شەری هلکری . . ئەوان هزر دکر کو دێ مللەتێ عیراقێ بن دەست کەن . . بەلێ زیرەکییا خوشمێرێت عیراقێ ئو شیان وپێڤەهاتنا وان ئو خەمخورییا قوماندارییا شۆرەشێ شیان هەر ژ رۆژا ئێکێ دریێت دژوار بدانن هێزێت دوژمنی . . ڤیجا ئیستراتیجییا هێزێت عیراقێ ئەو بۆ . . شەری دویربێخیت ژ وەلاتێ مە . . ئوژ باژێر و گوندێت مە . . ئو شەری بێختە دناڤ ئەردێ ئیرانێ دا داکو زیانەکا مەزن ب مللەتێ مە نەکەڤیت ئو ئەڤ رامیارییە ئو ئیستراتیجییا لەشکەری بجهـ هات ئو هێزێت عیراقێ شیان ب دەمەکێ کورت گەلەك ژ ئەرد و باژێرێت ئیرانێ بگرن . . وەکو قصر شرین و باژێری محمرە . . یاکو ئەڤباژێرە ب ناڤ و دەنگ بۆن . . هەروەسا هێزێت مە گەهشتنە نێزیکی باژێرێ عەبەدان . . ئو ژلایێ هێزێت ئەسمانی ڤە هێزێت مە یێت ئەسمانی . . هەر ل رۆژا ئەولی . . پشتا ئابورێ دوژمنی شکاند . . ئو ئاگر بەردانە بیرێت گازێ ئو کارخانێت سنعەتکارییاوان تێکدان . . هەروەسا باراپتر ژ بالفرێت دوژمنی هەر ل دەست پێ کرنا شەری کەڤتن . . ئو زیانەکا مەزن گەهاندێ . .

ڤێجا هەکە قومانداریيەکا زیرەك چاڤدێرییا ئەڤی شەری نەکربا دا چەوا شێت خۆ راگریت بەرامبەری ئاستەنگە و دژواریيا شەری. . بەلێ ج رێـك ژ رێکـا سەربلندیيێ چێترنینن ئەڤە یاهـاتی یە دیارکرن دفەرمەنگا خەباتێ دا. . ئوژ بەرخاترا ئازادیيێ ئو پێشکەفتنێ و پەیڤا پێڤەهاتنێ ل دەڤ عیراقیيا یا ئاشکەرایە ئو ئەڤە ژی هاتەدیارکرن ل دەڤ لەشکەرێ مە یێ کو بەرەڤانی کری ژ مللەتی ئو ئاخا وەلاتی پارێزتی. . ئودربێت دژوار دانایە دوژمنی ئو لناڤ ئە ردێ وان. . ئو هەمی ئەردێ ئیرانێ ب بۆمەیدانا یارێت وان. . ئوداستان وچیڤانۆکێت زیرەکی یێ نڤیسین ل درێژییا ئەڤی شەریدا. . ئوهێلا ئەردێ عیراقێ بهێتە پارێزتن. . ژ وی هرویایێ دهێت ئودهات ژئیرانێ. . ئوگەلەك جارا قومانداری عیراقێ گۆتە حاکمێت ئیرانێ: بەسە. . ژ کەرێ عیناتێ وەرنە خوارێ گوهێ خۆ بدەنە بانگێت ئاشتیيێ ئو بۆخۆ وان دەلیڤا بکاربهینن ئەوێت ئەم بۆهەوە پەیدادکەین. . چونکو هندی ئەڤ شەرە ڤەکێشیت دێ زیانێت مەزنتر بەرهنگاری مللەتێ ئیرانێ بیت. . ». .

حاکمێت ئیرانێ هزر دکر کو هەکە رابۆن ب ڤەگوهازتنا گازاخۆ ژگزیرتا خەرج بۆگزیرتا «سری» دێ گازا وان دویرکەڤیت ژ هێرشێت بالەفرێت عیراقێ ئو دێ شێن ڤەگوهازتنەکا دی ئێخنە بەردەوام بۆنا شەری. . بەلێ ئەو دحسابێت خۆدا دخەلەت بۆن. . ئو ئەوان نەزانی کو عیراقییا بۆهەر شەرەکی رەنگەکێ چەکی بکارتینیت ئو هەرویێ پەردەکا شانوگەریيەکا نوی نیشا حاکمێت ئیرانێ ددەن. . ئو (١٠٠٠) هزار کیلومەتر نە تشتەکێ ب زەحمەتە بەرامبەری بالەفرێت عیراقێ. . ئو دەستێ عیراقییا گەلەکێ درێژە.

## ئیستراتیجییا دوێ یا هێزێت عیراقێ

ئەڤەو پشتی هێزێت عیراقێ دربێت خۆدانایـنە هێزێت دوژمنی. . ئو ئامیرەتا لەشکەرێ دوژمنی پیچ کری ئو ئەردێ وان بن دەست کرو باژێریت وان گرتن ئو ئەردێ عیراقێ زرگارکر. . ل سیف سعد. . ئوزین القوس وشط العرب. . ئودڤنا لەشکەرێ دوژمنی شکاند. . گۆتە وان یانکو هنگە بزانن ئیرادەتا عیراقییا یا مەزنە. . ڤێجا قومانداریيێ بریاردا ب ڤەکێشانا هێزێت خۆ ژ ناڤ ئەردێ ئیرانێ. . ل وی دەمی کو داستانێت مێرخاسیيێ نڤیسیبون ل شەرێت کیلان غرب و سومار وشوش ودیزفول دهلران سەرپی زهاب ئوخفاجیيە ئوبسیتین. . ئولەشکەرێ عیراقێ ب زیرەکی شیا دەربازبیت ل روبارێ کارون: پشتی ئەڤێ هەمییێ قومانداریيێ بریاردا ب ڤەکێشانا هێزێت عیراقێ ژناڤ ئەردێ دوژمنی ئوب زڤرنە ل سەر توخیبی بەلکو رژێما ئیرانێ ب زڤریتە بکارهینانا ئاقلی ئودویماهیکەکێ بدانیت بۆشەری ئو رێکا گۆت وبێژا بگریت داکو ئاشتی پەیدابیت بەلێ ئەول سەر مکورییا خۆ نەهاتنە خوارێ ئورابون هەرجارەکێ دا ئەردەکی ژ درێژییا توخیبێ دناڤبەرا عیراقێ و ئیرانێ دا دهلبژێرن ئوهێرشێ ئینە ل سەر وەلاتێ مە. . ڤێجا جار بەسرە. . جار دڤەرا طیب وفەکە وشیب ئوجار دڤەرا خانقین ومندلی ئوزرباطیيە ئوجار دەڤەرا ژورییا وەلاتی. . پنجوین ئوحاجی عمران وسیدەکان بەلێ ل هەمی هەولدانێت خۆدا داکەفتن ئوزیانا وان یا زور بۆ. . ئو کت و ڤەوزارانێ داکەڤیتە دناڤ وان دا. . ل وی دەمی کورێت مللەتێ مە وەکو شێرا ل بەرسینگێ وان دراوەستان ئو ئەو هێرش ب سەرێ وان دا دئینا خوارێ. . ئوهێرشێت رۆژهەلاتا بەسرە و رۆژهەلاتا میسان ئورۆژهەلاتا دجلە ئوتاجا شەران ئومەندلی و پێنجەوین بۆنە داستانێت مێرخاسیيێ و کورێت مللەتی شانازیيێ پێ دکەن. . چونکو ئەوهاتن ئو ئەوان زیرەکیيا عیراقییا دیت. .

ئو وان دیت کەس ژ وان نەدزڤری. . . هۆسا لەشکەرێ عیراقێ ئیستراتیجییا خۆگوهارت ژ ئیستراتیجییا هێرش کرنێ بۆ ئیستراتیجییا بەرەڤانیيێ ئو هۆسا زیرەکی ئو مێرخاسییا وان هاتە دیارکرن. . ئوسال بۆسالێ کاروکوکێ خۆکربۆ. . ئوخۆ بەرهەڤ دکر. . ل وی دەمی کو هێزێت ئیرانێ ئەودا بخۆجهی ئو دەمی هلبژێرن بۆهێرش کرنێ ئودا بینی دیسا دهێرشا خۆدا داکەفتن ئو کت و ڤەوزارانێ داکەڤیتە دناڤ وان دا. .

ئەڤەو یاهەژی گۆتنێیە پشتی کو دەولەتان هێزا لەشکەرێ عیراقێ دیتی ئو زیرەکییا وان هزرەکا دی بۆکر. .

ئەڤ زیرەکیيە ژی دزڤریتە ئەوێ چەندێ کو ئەڤ لەشکەر پێك هاتیيە ژ کورێت مللەتێ عیراقێ یێت کوچ جا تەپەسەری ل سەر خۆقەبیل نەکری. . ئوب سەرشوری ورەزیلی نە ژیایی ئو نەڤیایە. . ئو هەمی گاڤا ئەڤی مللەتی یا خودیتی کو ئەوە خودانێ بریارا خۆ. .

## سالا ڤەبر ئو داخبارییا وێ یا لەشکەری ئو رامیاری. . ئو لەشکەرێ عیراقێ

دەمێ کو رژێما ئیرانێ رەشەکێت خۆ خرڤەکرین ئو هندەك چەك بۆخۆ ژ هندەك دەولەتا کرین ئو کەلەخێ زایونی و ئەمریکا دەستێ

هاریکاری‌یا چەکی بۆ درێژ کری . . ڤێجا رابۆن ب کف کرنا . . ئو ناڤێ هێرشا خۆ یا نوی دانا هێرشا سالا ڤەبر . . ئارمانجا وان ئەو بۆ کو خەمونا باب و باب کالکێت خۆ بجهـ بینن . . چونکو ئەڤە ئەو دوژمنە ئەوێ گەلـەك جارا هەولـدای ئەردێ عیـراقێ بن دەست بکـەت . بەلێ یا زانـاو ئاشکـەرا ئەوە چ هەولدانا کری ئێك سەر ئو دەم دەست یا پیچ بوی . . ئول درێژی‌یا دیروکا سالێت شەری ئەو داکـەفتن دکاروکوکێ خۆدا ئەڤەژی چ ژلایێ لەشکەری‌ڤە . . بیت یان ژی ژ لایێ رامیاری‌و ئابوری‌ڤە بیت .

ژلایێ لەشکـەری‌ڤـە هەتکـا وان چوو . . ئورووی‌یێ وان رەش بۆ . . نەخـاسمـە ل وان رەڤێنێت وان یێت بەردەوام ل سەر باژێـرێ بەسـرە . . هەروەکـو رادیـو ئو تێلەفزیـون و ئاژانسێت دەنگە و باسا دیارکری . . ئو گۆتی : . هێرشێت رۆژا مەزن و دروینا مەزن ئو تاجا شەرا دگریت ژ هێرشێت مەزن ئو یێت بۆ حسابەکا مەزن دهێتەکرن ئو دانـان . . بەلێ هێـزێت عیـراقێ شیان خۆراگرن ئو پشتا هێزێت ئیرانێ شکاند . .

ئو ژلایێ رامیـاری‌ڤـە دەنگێ نەرازی بونێ لنـاڤ ئیـرانێ‌دا بلند بۆ . . ئەڤە ژی ژ بەر مکوری‌یا وان ل سەر شەری ئو نەگوهدانا وان بۆ وان بانگێت ئاشتی‌یێ ئەوێت هاتینە کرن ژ دەف لیژنێت خێرخوازی‌یێ . .

ئو ژ لایێ دەولەتان ڤە بیت یان ژی ژ لایێ وێ بزاڤا هاتی‌یەکرن ژ دەف رێکخراوا کۆنگرا بوسلمانا یان رێکخراوا وەلاتێت ئێکگرتی ئو جڤاتا پارێزتنا دەولەتان ئو یان یێت دەولەتێت بزاڤا بێلا . .

ڤێجـا ئەوێت بازرگـانی‌یێ دکـەن ب شەری ئو یێت دەستێ خۆ گرێـددەن ب دەستێ شەر فروشـاڤـە وەکـو زایونی‌یا . . ئو دەولەتێت کولـەداری‌یێ هەلبـەت هیڤی و ئارمـانجێت وان بجهـ نائێن ئو دێ وێـران کرن ئو کاڤـل بونا باژێرا بارا وان بیت ئو ژلایەکێ دیڤە هەکە رژێما ئیرانێ هزرکربیت کودێ چەکێ زایونی ئو یێ ئەمریکی ئەوێ دایێ دێ خەمونێت خۆ یێ بجهـ ئینن بەلێ ما ئەو نزانن باوەری‌یـا موکم ئو بەرەڤانی‌یا ژ دل ژ وەلاتی باشترین چەکە ددەستێ سەربازادا . .

لەوانیکێ هەمیگـاڤـا هێزێت عیراقێ دسەرکەفتی بۆن . . ئو دیرۆکا خۆ دنـەخشـانـد ب سەرکـەفتنا ئو ئالایێ عیـراقی‌یا هەر ما بلند ئو هندێ قوماندار‌ی‌یا عیراقێ شیرەت دکرن ئو داخواز دکر داکو پێکڤە بژین بەلێ ئەوان هزرەکـا دی ژڤـان شیـرەتـا دکر . . ژ خالا وان ڤە ئەڤ ئاخفتنە ژ دەست کورتی‌یا عیراقی‌یایە . . ئو ئەو دشێن زیانەکێ گەهینە عیـراقی‌یـا . . بەلێ ئەو دحسـابێت خۆدا دخەلەت بۆن . .

نەبەس ئەڤە . . بەلکو ژهەتك برنا وان ئو قەهرو کوڤانێت رەڤینا وان دشـەرادا ئو ژ بـەرخـاتـرا داکـو دلێ مللەتێت خۆ رحـمەت بکـەن ئو پەردەکێ بەردەنـە ل سەر رەڤینێت خۆ . . بەلێ ئەوان بخـۆ دڤـنـا رەشـەکێت خۆ بن ئاخ کر . . ئو راستی‌یـا رژێمێ بۆ هەمی جیهانێ هاتە دیارکرن . .

**بوچی مکوری‌یا ئیرانێ ل سەر شەری بۆ؟**

مکـوری‌یـا ئیـرانێ ل سەر شەری بۆ . . ئەوژی دزڤـریتـە چەند ئەگەرەکا . . ژ وان ئەگەرا . .

١ ـ ژ شەرما رەڤینێت بەردەوام ل بەروکێت شەری‌دا .

٢ ـ راستی‌یـا رژێمێ دیـاربـۆ بۆ مللەتێت ئیـرانێ . . ئەوێت کو باوەری‌یا خۆ پێ هینای بۆ دەرئێخستنا شاهی . .

٣ ـ دەنگێ نەرازی‌بـوونێ لنـاڤ ئیـرانێ دا رۆژ بۆ رۆژێ بلنـد دبـۆ ئەوژی ژ بەر مکوری‌یا رژێما ئیرانێ ل سەر شەری . .

٤ ـ زیانەکا مەزن گەهشتە مللەتێ ئیرانێ ژلایێ جڤاکی ئو رامیاری ئو ئابوری . . ئو هەمی ژی ژ خەلەتی‌یا رژێما ئیرانێ بۆ . .

٥ ـ گرێدانا رژێما ئیرانێ ب ئەمریکاڤە . . ئو بجهـ ئینانا رامیاری‌یا وێ یاکو خزمەتا پەرژەوەندی‌یا وێ دکەت . .

٦ ـ دەولـەتێت کولـەداری‌یێ حەزدکەن ئەڤ شەرە یێ بەردەوام بیت داکو ببیتە سویکەك بۆ فرۆتنا چەکێ وان ئو سودێ ژێ وەربگرن . .

٧ ـ کەلـەخێ زایـونی هەولـددەت ئەڤ شەرە ڤەکێشیت داکو عیراق دویربکەڤیت ژ شەرێ عەرەبی ئو زایونی ئو داکو لەشکەرێ عیراقێ لاواز بیت

٨ ـ هیڤی و ئارمانجا وێ ئەوە دەست هەلاتداری‌یا خۆ بەلاڤە بکەت ل سەر دەڤەرا کەنداڤێ عەرەبی . . ئو عیراقێ ئو نەخشا وێ ب گوهوریت .

٩ ـ ئیران و کەلەخێ زایونی هەولددەن . . داکو ئالۆزی ئو گرفتاری‌یا ل دەڤـەرا رۆژهـەلاتا ناڤەراست پەیدابکەن داکو هەر ئەو مژویل بن ب نەخـوشی و گرفتـاری‌یێت خۆڤـە . . ئو داکـو ئەو ب کەیفـا خۆ بکەڤن . . ئو ژ کنارەکێ دیڤە هەکە ئەم بەرێ خویدینە دیرۆکا شەری دێ بۆ مە خویـا بیت کو عیـراقێ گەلـەك بزاڤـا کری بۆ دانـانـا دویماهیکەکێ بۆ ئەڤی شەری ئو گوهێ خۆ یێ دایە هەمی بانگێت ئاشتی‌یێ ئەوێت دەولـەت و رێکخـراوێت دەولـەتی پێ رابـوین . . وەکـو رێکخـراوا کۆنگـرا بوسلمانا ئو بزاڤا دەولەتێت بێلا ئو وەلاتێت ئێکگـرتی ئو هەتاکو ئەو بریارێت دەرکەفتین ژ دەڤ جڤاتا ئیمناهی‌یا دەولـەتـان ئو بریـارا وێ یا دویمـاهیکێ یا هەژمارا وێ (٥٩٨) یاکو

ئیرانێ پشتی بورینا سالەکێ شونیکا باوەری‌یا خوپێ‌هینای ئەوژی رەڤینا وێ یالەشکەری ل بەروکێت شەری‌دا نەخاسمە ل کریارێت رمەزانا پیروز بورزگارکرنا (فاو) ئو کریارێت هیڤیا مە ب خودێ یائێکێ ودوێ‌و سێ‌یێ وجارێ بورزگارکرنا شلامچە ئومجنونا بنەڤانێ ویاژوری.. ئوگرکێت شهابی وزبیدات.. هەروەسا ل کریارێت محمد رسول الله بو رزگارکرنا کوێت چیایێت مە.. ل کوردستانێ..

ڤێجا ئەڤان رەڤینا داخباری‌یەکا مەزن ل سەر رژێما ئیرانێ کر.. ئو خورتی لێ‌هاتەکرن کو بجەمیێت بو ئاشتی‌یێ هەروەسا دەنگێ نەرازی‌بونێ بلند بو لناڤ ئیرانێ بخوئو هێزێت بەرا رزگارکرنا ئیرانێ رابون ب هێرشێت مەزن ئوگەلەك ئەردێ ئیرانێ گرت ژوان بازێرێ مهران هەروەسا تێك چوونا سەروبەرێ ئابوری.. لناڤ ئیرانێ ئەوژی ژ بەر ئەوان دربێت دژوار ئەوێت هێزێت مەیێت ئەسمانی دانابنە بیرێت گازێ یێت ئیرانی ئوبەندەرێت وان نەخاسمە پشتی پیچ کرنا گزیرتا خەرج ئووێران کرنا وێ.. ئو ژلایەکێ دیڤە ناڤ ودەنگێ ئیرانێ رەش بو لدەڤ دەولەتان ئو دەرڤەی ئیرانێ ژ بەر وێ رامیاری‌یا ئەرهابی ( ) خوکەشتنێ ئەوا ئەو بکاردهینیت.. ئەڤە هەمی بونە ئەگەر کوگوهێ خوبدەتە بانگێ ئاشتی‌یێ.. ئو باوەری‌یا خوبینیت ب بریارا هەژمارا وێ (٥٩٨) هەرچەندە ئەڤە سالەکە دسەر ئەڤێ بریارێ‌را بوری ئوهێشتا ئینیەتا وێ یا باوەری‌پێ هینانێ نەیا دیارە.. بەلکو ئەوێ باوەری‌یا خو پێ‌هینا داکو بوخو سودەکێ ژێ وەربگریت ئوبێهنا خو ب هەلکێشیت ئو هێزێت خو خرڤە بکەت پشتی رەڤینێت مەزن ڤێکەفتین..

بەس ئەڤ دور زڤرینە لدور بریارا هژمارا وێ (٥٩٨) نە دخزمەتا وێ دایە.. بەلکو هندی بجهـ ئینانا وێ گیرویت زیانا وێ دێ ل سەر ئیرانێ مەزنتر بیت.

دویماهیك

شەرێ رژێما ئیرانێ ب عیراقێ دایەکرن ئارمانج ژێ ئەوبو دربەکێ دژوار بدانیتە شورەشێ ئوملەتێ عەرەبی.. ئوداکو ئەو ب کەیفا خوشانوگەری‌یا خول دەڤەرێ پێشکێش بکەت ئو بەرژەوەندی‌یا کەلەخێ زایونی بجهـ بینیت.. ئودربەکی بدانیتە شورەشا فەلەستینی..

ئو پێدڤی‌یە بێژم کو ئارمانجا ئەمریکا ژێ ئەوە چەکێ ئەمریکی بگەهیتە ئیرانێ داکو بکاربینیت دژی وەلاتێت عەرەب بەرامبەری جهـ خوشکرنا ئەمریکا ل دەڤەرا روژهەلاتا ناڤەراستێ ئو نێزیك بێنا وێ بو سەروکانیێت گازا عەرەبا ل دەڤەرا کەنداڤێ عەرەبی.. ئەڤەو هەکە دیروکا شەرێ عیراقێ و ئو ئیرانێ ڤەکەین دێ بومە دیاربیت کو شەرێ عیراقێ وئیرانێ کاغەزێت پیلانێت چەپەل دیارکرن ئەوێت هاتینە نڤێسین ژ دەڤ ئیمپریالیزمێ ئوسەهیونی‌یەتێ ئوهەمی پیچ بوون ئوڤی شەری هوشیاربونەکا مللی یا نوی پەیداکر ئو ئەڤە ژی بەراهیکەکە بوچاخەکێ نوی یێ شورەشا عەرەبی ئوپاشەروژا وێ.. ئوهێلا کو ئەوپێکولێت هاتینەکرن ژلایێ هندەك دەستەکێت دەولەتی‌ڤە. داکو رێزومەزناتی‌یا عیراقی.. لناڤ کومەلگەها دەولەتی‌دا کێم کەن بەلێ ئەڤێ رامیاری‌یێ جهێ خونەگرت ئو نەشیا چ زیانا بگەهیتە عیراقێ.. بەلکو ناڤ ودەنگێ عیراقێ ئو حەزکرنا وێ بو ئاشتی‌یێ بلندترلێ هات ئوزیرەکی ومێرخاسی‌یا کورێت عیراقێ بوخەلکی هاتە دیارکرن هێلا هزرەکا مەزن بو بکەن.. ئەڤە ژی گەلەکە.. بومە....

●●●

ژێدەر

١ ـ امين هويدى. احاديث في الامن القومي العربي. دار الوحدة چاپا ئێکێ بەیروت سالا ١٩٨٠

٢ ـ دكتور حامد ربيع. تأملات في الصراع العربي الاسرائيلي دەزگەها عەرەبی یا خاندنا و بەلاڤ کرنێ..

٣ ـ خليل الياس مراد. حرب الخليج وانعكاساتها على الامن القومي العربي. سالا ١٩٨٧ بەغدا

٤ ـ دكتور محمود حافظ. استراتيجية الغرب في الوطن العربي..

٥ ـ انتوني كوردزمان. الحرب العراقية الايرانية تهديد متصاعد للخليج والغرب. واشنطن ١٩٨٤ ترجمة مركز البحوث والمعلومات سالا ١٩٨٤.

٦ ـ ادموند غريب. الحرب العراقية ـ الايرانية. ترجمة مركز البحوث والمعلومات ١٩٨٤.

٧ ـ عصام فاهم جواد. لماذا تستمر الحرب العراقية الايرانية گوڤارا الطليعة العربية هەژمارا (٢٠) یا روژا ٢٦/ ايلولا سالا ١٩٨٣.

٨ ـ بنێرە کوڤارا المستقبل. (حرب الخليج خط الاحمر يهز العالم. هەژمارا (٤٧٠) روژا ١٩٨٦/٢/٢٢

٩ ـ کوڤارا الوطن العربي. الفاو الفصل الاخير في الكارثة الأيرانية هەژمارا (٤٧٢)

# فەلسەفەی سروشتی لە لێکدانەوەی مێژوودا تایبەتێتی زیندوویی شارستانێتی یەکان لای شپنگلەر

د. محسن محمد حسین
بەشی مێژوو ـ کۆلیجی پەروەردەی یەکەم/
زانکۆی بەغداد

## پێش دەستی :

کەس نی یە خەریکی مەسەلەکانی لێکدانەوەی مێژوویی بووبێت، شپنگلەر[1] جێ پەنجەی بیری خۆی لەسەر بیری ئەو کەسە دانەنابێت. . لە پێشەنگی ئەوانەش دا (توینبی)ی گەورەترین مێژوونووسی ئەم چەرخەوزۆری دی هەن کە لەمەولا ناویان دەزانین. بەناوبانگترین ئەوکەسانەش کە کاریان لە بیرکردنەوەی ئەوکردووە (گۆتە)ی شاعیری گەورەو (نیچە)ی فەیلەسوفی ئەلمانن.

شپنگلەر دەربارەی پەیدابوون و لەناوچوونی شارستانەتی بۆچوونێکی تازەو لێکدانەوەیەکی تایبەتی وای هەیە کە لەسەر بناغەی بایۆلۆجیانەی بزووتنەوەی مێژوو هەستاوە، لە بیری بەرودواهاتنی خولەکان (التعاقب الدوري) جیاوازە کە ئیبن خەلدون و (ڤیکۆ) پێش ئەو باسیان کردووە. بیروڕای خۆیشی لە کتێبێك دا خستوەتەڕوو ناوی ناوە (ئاوابونی رۆژاوا) کە بە ناوی «تدهور الحضارة الغربية»وە کراوەتە عەرەبی و هەرچی فەلسەفەی خۆی هەیە تێیدا جێی کردۆتەوە، بە لێکۆڵینەوەی بەراورد ـ دراسة مقارنة ـ لە دیاردەی پێکهاتنی شارستانەتی یەکانی کۆڵیوەتەوە، بە شێوازێك کە هەندێ جار مەیلی بەلای ئاڵۆزیی شیعرو بەلای خوتبەدانداینەو بە (حدسی ذاتی)وتێڕوانینی روحیانەی تایبەت بە فیکرەی مێژوو پشتی بەستووە زیاتر لەوەی مەیلی بەلای باس کردنێکی رێکوپێکی بە پروگرام وشیکردنەوەیەکی مەنتیقیانەی ریزبەستوودا هەبێت.[2]

شپنگلەر لەو باوەڕەدایە کە مێژوو زنجیرە رووداوێکی تاکانەی تەواوکردو (متكامل)وسەربەخۆی یەك لەدوای یەك پێك دەهێنێت کە بە (رۆشنبیریگەل ـ ثقافات) ناوی دەبات، هەر رۆشنبیری یەکیش مۆرکی جیاکەرەوەی[3] خۆی هەیە. هەرچی چوارچێوەی تیووری یەکەیەتی ئەوە لە کاکڵ دا پشت بە فەلسەفەی سروشتی دەبەستێ نەك بەو مەبدەئە مێژوویەی کە بەرامبەری دەوەستێ.[4] بەڕادەیەك پێی لەم زانیاریی سروشتی یە هەڵبریوە کە تا ئێستا تەنانەت خاوەن بیرەکانی سەدەی نۆزدەمیش کە پەیرەوی بەرنامەی دانانیان دەکرد (المنهاج الوضعي)و تەقەلایان دەدا مێژوو بگۆڕن بە زانستێك لە زانستەکان بەوڕادەیە نەگەیشتوون. لەم بوارەدا دەڵێ ئەوەی ئەو بە مێژووی کردووە (نیوتن)یش هەر ئەوەی بە ماثیماتیك (رياضيات) کردووە کەوا هاتووە ئەودیاردانەی نەخشەکێشاوە کە جاران لە قەوارەی توندوتۆڵی زانین دا لێك

جودابوون. (٥)

جا بۆ ڕوون کردنەوەی ئەوەی شپنگلەر لە لایەنەکانی فەلسەفە مێژووینەکەی خۆیدا گوتوویەتی، بیری ئەومان بەسەر چەند تەوەرەیەکدا (محور) دابەش کرد کە ئەمانەن:

**تەوەرەی یەکەم:**

**هەڵوێستی شپنگلەر بەرامبەر بە بیر ورای کۆمەڵێك مێژوونووس و فەیلەسوفانی مێژووە ئەوروپایی یەکان و تەقەلای ڕەت کردنەوە (یان ڕاست کردنەوەی) بیروراکانیان و وەڵام دانەوەیان:**

یەکەم: سەرەتا شپنگلەر داوای شۆرشێکی کوپرنیکی دەکات لە لێکۆڵینەوەی مێژوودا بۆ سرینەوەی ئەو بەندوباوەی کە ئەوسا ـ تا ئێستاش ـ لە مێشکی ئەوروپایی یەکان چەسپیوە، گوایا شارستانەتیی ڕۆژاوا جەمسەرێکی نەبزووتووی هەموو شارستانەتیەکانەو دەبێ هەموویان بە پێوانەی ئەو بپێورێن. هەروەکو چۆن خەڵك بە هەڵە لە بەندوباوی ئەوەدا بوون گوایە زەوی نەبزووتووەو تەوەرەیەکە هەموو ئەستێرەکانی تری ئاسمان بەدەوریدا دەخولێنەوە! پاش ئەوەی ڕاستی یەکانی گەردوون دەرکەوتن وازیان لەم بیرە چەوتە هێنا کە ئەمەش شۆرشێك بوو لە هەموو مەیدانێك دا ڕەنگی دایەوە. شپنگلەر دەڵێ ئەوروپایی یەکان دەبێ ئێستا چاو لەو شۆرشە بکەن و بەسەر شارستانەتی یەکەی خۆیان دا تەتبیقی بکەن و واز لەو بۆچوونە بێ پشتوپەنا زانستیی یەی خۆیان بهێنن. جا لەسەر بناغەی ئەم شۆرشە لەمەر تێگەیشتنی مێژوو دەتوانین لە هەر شارستانەتی یەك بەجۆرێك بکۆڵینەوە کە بە دیاردەیەکی سەربەخۆی دابنێین کە لە بوونەوەرێکی زیندووی سەربەخۆ دەچێت. چونکە هەر شارستانەتی یەك قەوارەیەکی سەربەخۆی هەیەو لە قەوارەی شارستانەتی یەکانی تر جیاوازە لەبەرئەوەیش هەر شارستانەتی یەك، بەوپێ یە کە بوونەوەرێکی زیندووو هەبوونێکی (وجود) ڕاستەقینەیە یەکەیەکی خاوەن ماڵ و دەرگای داخراوی خۆیەتی بۆیە ڕێ نی یە شارستانەتی یەك بە شارستانەتی یەکی تر پێوەندی بکات، ئەوەیش کە دەیبینین لە وێك چوونی بابەت یان شێوازی دەربڕین لەنێوان شارستانەتی یەکان دا ـ بە گوێرەی ڕای شپنگلەر ـ هەمووی بەندوباوە. بەڵکو هەر وێکچوونێکی ڕووکەشەو لە کاکڵەوە نی یە، چونکە هەر شارستانەتی یەك تەعبیرکردنە لە گیانێك، گیانیش بەتەواوی لە شارستانەتی یەکەوە تا یەکێکی دی کە جیاوازە. (٧) کەوا مێژوونووسی ئەوروپایی دێنێ تیووریی چەوتی بەتلیموس بەسەر مێژوودا تەتبیق دەکات، کاتێك لای وایە ئەوروپای ڕۆژاوا جەمسەری نەبزوتووی هەموو شارستانەتی یەکانە «بەبێ هیچ هۆیەکی پەسەند مەگەر هەر ئەوە چونکە خۆی لەو شارستانەی یەدا دەژیت». (٨) شۆرشی کوپرنیکی لە مێژوودا لەجیاتی ئەوە وادابنێ کە شارستانەتی یەکانی جیهان هەمووی لە خولگەی گەردوونی ئەوروپای ڕۆژاوادا دەخولێنەوە بەوپێ یە کە بنکەی هەموو ڕووداوێکی جیهانی یە، دێ هەر شارستانەتی یە بە جودا باس دەکات و لێی دەکۆڵێتەوە، کەواتە شارستانەتیی ئەوروپا لە شارستانەتی یەکانی تر بەرزتر نی یە، چونکە لەوانەیە شارستانەتیی تری وا هەبێت کە لە لایەن ژمارەی ئەوگەلانەوە کە لەژێر خێوەتی ئەوەدان و لەلایەن مەزنیی ڕوحی یەوە لە شارستانەتیی ڕۆژاوا بەرزتر بێت (٩) بۆیە دەڵێ: «کەوابێت چارنی یە دەبێ ئەوەی کوپرنیکوس کردی کەوا دیتن (النظر)ی بەناوی جێی دوا نەهاتوو (المکان اللامتناهی) ڕزگارکرد جاری دووەمیش بکرێتەوە؛ گیانی ڕۆژئاوایی لەمێژە دەربارەی سروشت ئەو ڕزگاری یەی کردووە، کاتێك کە وازی لە بۆچوونەکەی پەتلیموس هێنا دەربارەی ڕژێمی گەردوون و هاتەسەر ئەو باوەڕەی کە ئەمرۆ بەڕاستی سەیری ڕژێمی گەردوون دەکەین» (١٠)

**دوومم: بەلاوەنانی ڕۆژژمێری ئەوروپایی:**

بەندوباوی بنکەیی شارستانەتیی ئەوروپا بەندوباوێکی تریشی لەگەڵ دا بوو کە لەبابەت ڕۆژژمێری ئەوروپایی یەوەیە کە دەیەوێ بیکاتە پێوانەی کۆڵینەوە لە مێژووی شارستانەتی یەکانی دی. کە ئەوروپایی مێژووی کرودەتە سێ بەش: کۆن، ناوەند، نوێ. شپینگلەر بەو دابەش کردنە دەڵێ «بەرنامەیەکی بێ کاکڵی لەرزۆکی بێ مانایە تا ئەورادەیەی ژیری قەبوولی نەکات، بەڵام، لەگەڵ ئەوەش دا، هەر بەرنامەیەکەو بەسەر بیرکردنەوەی مێژوویمان دا بەتەواوی زاڵ بووە.» (١١) هەروەها ئەوروپایی «هەندێ مێژووی گەورەی درێژخایەنی خول هەزارساڵی و شارستانەتی بەشان وشکۆی ئێجگار کۆن، بەهەمووساکاری وبێ فیزی یەکەوە، بەدەوری ئەو جەمسەرەدا دەخولێنێتەوە. ئای چەند بەرنامەیەکی

سەیرو سەمەرەی خۆرو ئەستێرانە!»[١٢]

جا بەو رۆژ ژمێـرە ئەوروپـایی یـە چەوتـە - وەکـو بۆی دەچێ - مێـژ ووی زۆر شارستـانـەتـی دووری وەهـا کە هەزاران ساڵەن وەکو مێـژ ووی چین و میصـر دەچنەوە باریەك و بە شارستانەتی بێ نرخ و بێ کاریـگـەری پیشـان دەدرێن «کـەچی چەنـد دە ساڵی دوای سەردەمی مارتن لۆثـەر، بەتـایبـەتی لە سەردەمی ناپلیـۆنـەوە وا بە گەورەیی دیـاردەکـەون دەڵێی تیشکی شەبـەنگن»[١٣] هەروەهـا بەنمـونـە کە دەڵێن مێـژ ووی نوێ لە سەردەمی راپـەرینـەوە یان لە شۆرشی فەرەنساوە دەست پێ دەکات، بۆچوونێکی چەوتە، چونکە بەم قسـەیـە مێـژ ووی زۆر کۆمەڵی دەرەوەی ناوچەی ئەوروپا بەلاوە دەنێن، ئنجـا ئەگـەر ئەم کارە رەوابێت، ئەوا مێژ ونوسێکی چینیش بۆی هەیەو هەقی خۆیەتی کە مێژ ویەکی وا بۆ جیهان دابنێ کە بێ هەست و خوست بە هەڵمـەتـەکـانی خاچپـەرستی و بە سەردەمی راپەرین و فردریکی گەورەدا رەت بێت بەو پێ یە کە ئەمانە شتی بێ بایەخ و بێ نرخن.[١٤]

**سێیەم: بیری پێشکەوتن:**

بیری پێشکەوتن لە رۆژ ی سەرهەڵدانی یەوە هەر بە زانستەکان و بە گەشـەکـردنیـانـەوە بیـەنـد بووە، کە پێش ئەمـەش بووەتـە هۆی دۆزینـەوەی نەزانـراو (مجهـول)، یەکێکیش بووە لە ئەنجـامەکانی سەردەمی رووناکی EnLightenment، سەردەمەکە بە خۆیو بە روانینە دوارۆژ بە چاوی دڵنیـایی و گەش بینی یـەوەو ئارەزووی ژێـردەست خستنی سروشت و لە رابـردوو هەڵگەرانەوەو ئاواتی دەستگیرکردنی پیشەسازی پێشکەوتنەوە.[١٦]

زۆر خاوەن بیـری رۆژاوا، بەتایبەتی لە چەرخی هەژدەو نۆزدەدا دەربـارەی بیـری پێشکـەوتن نوسیـویـانـە، لەگـەڵ ئەوەش دا ئەم فیکرەیە پشتگیریی زۆر بووە، بەڵام هەندێك خاوەن پیر فیکرەیەکی تریـان هێنـایـە مەیدان کە بریتی یە لە پاشگەزی (النکوص) کەوا لە وێنـەیـەکی دەستکـاریکـراوی تیووریی (بەرواهاتنی خولەکان)ی باس کراودا یان لە تیـووری (نـە - پێشکـەوتن)دا خۆی دەنـوێنێ. شپنگلەریش سەردەستـەی ئەوانە بوو کە فیکرەی (نەپێشکەوتن)یان هەبوو. لەپاشان، مێژ ووی بە بارێکی گران یان کارێکی بێ ئامانج دەبینیۆ دەیگـوت (پێشکەوتن) نە - پێشکەوتنە، هەروەکو چۆن هەر وەچـە ئادەمـیـزادێـك لە پشـتـی پێش خۆی جیـاواز نی یـە، شارستـانـەتی یـەکـانیش بەم جۆرە وەهـان. وبـڵاوی کردەوە: لە (ئـامـانـج)دا؟ بێ ئامـانجی یـە، بەڵکو وەکوژ یانەکە خۆی ئەویش کردارێکی بایۆلۆجی یە.[١٧]

هەروەهـا بڵاوی کـردەوە کە تیووریی (پێشکەوتن) لە تێگەیشتنی رەوتی مێـژ وودا بەهـەڵـەداچـووە کە وای زانیـوە پێشکـەوتنێکی سەرومـری ژ یـریی مرۆڤە بەبێ دوایی، لە کاتێك دا مێژ وو شانۆی ژمـارەیـەکی زۆر شارستـانـەتی یـە کە وەکـو بوونـەوەرانی ئەنـدامی (عضـوی) وەهان، شین دەبن، پێ دەگەن، سیس دەبن و دەمرن، مێـژ ووی شارستـانـەتیش وەکـو مێژ ووی هەر بوونەوەرێکی زیندوو وایـە، چ مرۆڤ و چ گیـانلەبـەریان رووەك. لێکـدانـەوەی ئەوە کە مێژ وو بەبێ دوایی هەر بەرەوپێش دەچێت هەر لە (تصور)ی ئەوە دەکـات کە بە خواردن کرمـۆکـە (یـەرەقە) هەر گەورەبێت و دوایی نەیەت، چونکە وەکو چۆن بوونەوەری زیندوو خولێکی ژ یانی هەیە شارستانەتیش خولە ژ یانێکی داخراوی هەیە.[١٨]

بێ گـومـان ئاکـامی شەری یەکـەمی جیهـان و ئەنجـامی پر لە کارەسـاتی جەرگبـرو ماڵوێرانی، ویژدانی مرۆڤایەتیی توند گوشیو زۆر لە نووسـەرانی خاوەن بیـرو فەیلەسوف و ئەدیب و هونەرمەندی تووشی بەرچـاورەشی کردو خستنیـە مەیدانخوازی لەگەڵ تیووریی پێشکـەوتـن دا، شپنگلەریش ئەم جۆرە بەرهـەڵستی یـەی ئەو تیـووری یـەی دەربـری.[١٩] نـاودارتـرینی ئەو کەسانەی لایەنگری جووڵانـەوەی گەرانـەوەی پەك کەوتـوویی مێـژ وو بوون کۆمـەڵێـك خاوەن بیـری ئەوروپـا کە لەوان (جۆرج سوریل)، (ئەدوەر کربنتر) لە کتێبـەکـەیدا (شـارستـانی: هۆیـەکـانی وچـارەسـەرکـردنی)، هەروەهـا جورج بەرنادشۆی نووسەری ئیرلەندیو ئەلبەرت شفاتیزر لە کتێبـەکـەیدا (فـەلسـەفـەی شارستـانـەتی)وە گۆتیـەی شاعیری ئەلمان و هتد...

**چوارەم: بەندوباوی کاریگەریو کارلێکراوی:**

شپنگلەر رەخنـە لە بەرنـامـەکـانی لێکۆڵینەوەی مێژ وو و فەلسەفە باوەکـەی لای مێـژ وونووسانی ئەوروپاو غەیری ئەوروپا دەگرێت و لایوایــە روانینی بێ لایــەن بۆ مێـــژ ووا پێـویست دەکـات بەبێ خۆخـەریـك کردنی درۆزنـانەو خۆرایی بەباس کردنی کاریگەریو سەرچـاوە دەرەوەیـی یـەکـانی سەرهــەڵــدان و گەشــەکــردنی شارستانەتی یەوە لە شارستانەتی یەکان بکۆڵدرێتەوە، چونکە شتێکی وا لە ئارادا نی یـە کە شارستـانـەتی یەك لە دەرەوەی شارستانەتی یەکە خۆیدا تەفـسـیـر بکـرێـت. شپـنگـلەر لەو بروایــە دایــە ئەو مێـژ وونـووسـانـەی دەڵێن لەنێـوان شارستانەتی یەکان دا پەیوەستی (روابــط) هەیـە زۆر بەهـەڵـەداچـوون؟ کەوا بایـەخ بە فیکـرەکی

کاریگەری و کارلێ کراوی دەدەن ، چونکە خۆ ئەگەر هەندێ وێکچوون لە نێوانیان دا لەبابەت هەندێك دیمەن و باروودۆخ دا ببینین ئەمە تەنیا وێکچوونێکی رواڵەتی دەرەوەیە ، بەڵکو لەوانەشە ئەم وێکچوونە جۆرە شێوە وەرگرتنێکی درۆزنانەی شارستانەتی بێت . [٢١] کاتێك کە روو دەدات شارستانەتی یەکی کۆنی ناوچەیەك کە شارستانەتی یەکی نوێی (ساوا)ی تێ دا بڵاودەبێتەوە ؛ بڵاوبوونەوەیەکی بەهێزی وەها کە لێ ناگەرێ (ساوا) کە هەناسەبدات و سروشتیانە پێ بگات ، ئەوسا ئەویش ناتوانێت وێنە تەعبیری یە پەتی یەکانی خۆی گەشە پێ بکات . . بەڵکو رێی پێگەیشتنی هەست بەخۆ کردنی خۆیشی لێ دەگیرێت . ئیتر زۆری پێ ناچێت هەرچی لە قووڵایی گیانی تەرو تازەی دا هەیە لەو قاڵبە بەتاڵانەدا دایدەرێژێت کە ئەم ژیانە بێگانەیە پێ یان ، بەجێ یانی هێشتووە . «زۆری پێ ناچێت هەمەجۆر هەستی گەشاوەی لاوچاك دەبنە بەدی ئاساری کۆنی پەرپووت . » [٢٢] جا ئەگەر هەر شارستانەتی یەك تەعبیر لە خولێکی داخراوی ژیان بکات ، ئەوا نابێ باسی بنەرەتە بیانی یەکانی رووالەتەکانی شارستانەتی بکرێت ، چونکە ئەمە بەندوباوێکە لە ئەنجامی هەوڵی نەهێشتنی تایبەتی یە نەتەوەیی یەکانی شارستانەتی دا ، یان ئەوەی پێی دەڵێن «جیهانگیریی شارستانەتی» (عالمية الحضارة) ، پەیدابووە .

کە ئی پاشی لە پێشوو شت وەردەگرێت . هەر لەم رووەوە مێژ وو نووسە رۆژاوایی یەکان وایان دەزانی کە شارستانەتیی عەرەبیی ئیسلامی شتی لە شارستانەتیی یۆنانی وەرگرتووە هەتا لەپاشان دا بیداتەوە بە شارستانەتیی رۆژ اوایی ، ئەمەش درۆیێکە بە عەقڵی شپنگلەردا ناچێت و بە روانینێکی سەرپێیانەی رێرەوتی مێژ ووی دادەنێت .

**تەوەرەی دووەم : تیووری یەکەی شپنگلەر :**

**یەکەم : سەرهەڵدانی شارستانەتی یەکان .**

شپنگلەر لای وایە لەدایك بوونی شارستانەتی لەو چرکە کاتەدا دەبێت کە گیانێکی گەورەی تێ دا هۆشیار دەبێتەوە و لە حاڵەتی روحیی سەرەتایی منداڵی یەتی هەتاهەتای مرۆڤایەتی جیادەبێتەوە ، هەروەکو چۆن وێنە لە شتێکی وێنە پێ نەبوو جیادەبێتەوەو هەروەکو چۆن سنووورکراو و نەمان لە بێ سنووری و مانەوە هەڵ دەکوڵێن . . لە خاکی ژینگە (بیئە) یەکیش دا پێ دەگات ، کە زۆر باش دەتوانرێ دیاری بکرێت و تاسەر پێ یەوە دەنووسێت هەروەکو بێوەندیی شەتڵێك بەو زەوی یەی لێی شین دەبێت . [٢٣]

وە بە لەدایك بوونی شارستانەتی یە تازەکە ، ئەو ئاژاوە بەرەڵلایەی جاران لە کۆمەڵ دا باوبووە دەگۆرێت و دەبێ بە سەرداتواندن بۆ ویستی داهێنەرو هاندەرێ خولقاندن زۆر جۆر بواری رۆشنبیریی رژێم و زیندوویی داهێنان لە شارستانەتی یەکەدا بەردەوام دەبێت [٢٤] تا لە رادەیەك دا دەوەستێت ، ئەوسا ژماردنی بەرەواژ (داکشاو) دەست پێ دەکات دوای روون بوونەوەی هێڵی تێك شکانی تەمەنی شارستانەتی .

ئەمەش مانای وایە کە شارستانەتی لای شپنگلەر ژیانەوەیەکی روحیی کۆمەڵێك خەڵکە (نەتەوە) کە بەرامبەر بە بوون (وجود) تێگەیشتنێکی لێکەوە نزیك پێکەوەیان دەبەستێ ، ئەمەش لە زۆر چەشنە چالاکی دا رەنگ دەداتەوە ؛ وەکو دین ، فەلسەفە ، ئەدەب ، هونەر ، ئابووری ، سیاسەت و شەر . بەم پێ یە تێگەیشتنی تایبەتی ئەم کۆمەڵە بەرامبەر بەوجێ یەی لێی دەژ ین وچالاکی لەسەر دەنوێنن ، بواری تەعبیرکردنە لەوژ یانەوە روحی یە [٢٥] کەوا ئەو کۆمەڵە خەڵکە دەخاتە سەر دروست کردنی مێژ وو و شارستانەتیی خۆیان ، وە ئەو (چارەنووس)ەیە کە لە شوێنی «چینی بەرز - العلية»ی داناوە ، چونکە ئەمە وادەکات مێژ ووبچێتەوە سەر زانستەکانی سروشت ، لەبەرئەوەیش کە وتەی (چارەنووس - المصير) گونجاوترە بۆ تێگەیشتنی باری مێژ وو . [٢٦] وە لای وایە مرۆڤ ویستی سەربەستی نی یە ، پێویستە مل کەچی چارەنووسی خۆی بێت ، کەوابێت مرۆڤ خۆی شارستانەتی دروست ناکات (بەڵکو بەم دروست دەبێت) و رووداو خۆیان پیاوی خۆیان هەڵ دەبژێرن و مێژ وو دروست دەکەن .

شپنگلەر نموونە بە ناپلیون دەهێنێتەوە کە لای وایە عەرەبانەیەك بوو رووداوەکانی شۆرشی فەرەنسا سواری بیوون ، ئەو رووداوانەش دەیان توانی زۆر کەسی وەکو ناپلیۆن بدۆزنەوە . [٢٧]

شپنگلەریش مەبەسی لە «چارەنووس» ئەو مەبەسە نی یە کە شانۆ تراجیدی یەکانی یۆنان دەیانەوێ بیکەن بە هاو واتای ناچارکردن (جەبر) بەڵکو مانای هەست کردنی مرۆڤە بەخۆی لە بەرامبەر هێزێکی تری مرۆڤیانەدا کە مەیدان خوازی لەگەڵ دەکات و بوونی دەخاتە مەترسی یەوە ، ئەو دەمە وزە ماتەکانی ناو مرۆڤ لەپێناو چەسپاندنی مانی دا سەر هەڵ دەدەن .

فیکرەی چارەنووسیش پێویست بە بوونی دوو هۆ دەکات :

١) (خۆ ـ ذات)یەکی سەربەخۆ کە مۆرکێکی تایبەتی سەربەخۆی پێوەبێت.

٢) بوونی رووداوی دەرەوە، کە لە نێوان ئەوان و ئەو(خۆ)یەدا پێوەندییەکی مەیدان خوازیانە هەبێت. کە لە ئەنجامی لەیەك کەوتن و بەگژداچوون دا جۆرە کارلێکێك (تفاعل) پەیدا دەبێت رەفتاری (خۆ)یەکە لە قۆناغەکانی لەمەودوادا دیاری دەکات. پێویستیشە ئەم رووداوە دەرەوەییانە بۆ مەڵبەندی ناوەوەی (خۆ) یەکە شۆڕ ببنەوە تا کاکڵی خۆ (جوهر الذات) دروست ببێت. (٢٨)

**بارەکانی لەدایك بوونی شارستانەتییەکان:**

لەبەر روناکیی وتەی «چارەنووس» پێویستە هۆیەکی دەرەوەیی ورووژێنەر هەبێت کە توانستە مات دراوەکانی کۆمەڵە خەڵکێك بورووژێنێ، ئەمەش واناگەیەنێ کە هۆی دەرەوەیی شارستانەتی دروست دەکات، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێ کە دەرەوە هۆی بەئاگا هێنان هیمەت و بزواندنی چالاکی و توانستەکانە وە راپێچ کردنیانە بەرەو کارێکی داهێنەرانەو خولقێنەر، واتا هان دانی ئەوگەلەی شایانی بەشداری کردنە لە بنیات نانی قەڵای شارستانەتی دا ئەم بنیات نانە یان ئەو لەدایك بوونەی شارستانەتی یەش لە چوارچێوەی یەك لەو سێ حاڵەتانەی خوارەوەدا دەبێت:

١) بزواندنی تواناکانی کۆمەڵێك کە بە باری کپی دا تێپەڕ دەبێت و ئاژاوەو شڵەژاوی دەوریان داوە، ئەمەش بە وروژاندنی شانە زیندووە چالاکەکانی، ئەوسا لەناکاو گیانێکی تازەی پڕ لە توانستی بەفەڕ سەرهەڵ دەدات و شارستانەتییەك دێتە کایە کە لە زۆر لایەن دا بەخشش و بەرهەم بە جوانی پێش کەش دەکات، تا ویست و دەسەڵاتی بەسەر ئاژاوەکەدا بسەپێنێ و هەرچی لە بەردەمی دا بێتە کۆسپ بە زەبری وزە دەرنەکەوتوو و هێشتا خوێنەگرتووەکانی تێکی بشکێنێ.

ئەم حاڵەتەش لەوە دەچێت کە دەزووێك بە کونی کۆمەڵێك مووروی رەنگاورەنگی پەرش و بڵاودا بیەیت و بە هۆنینەوەیان هەموویان رێك بخەیت، لە کۆمەڵیش دا لە هەموو بوارەکاندا: وەکو دین و زمان و زانست و بیرو هونەرو یاسادانان و فەلسەفەو.. تاد بەهرەو داهێنانی دەردەکەوێ، ئەودەمە مرۆڤایەتی لە ماوەیێك دا مۆرکی ئەوی پێوە دەبێت و ئیتر ئەم گیانە مادام لە وزەی خۆیی خولقێنەری مات دراو بڕبێت هەمیشە لەو بوارانەدا توانست دەنوێنێ، چونکە شارستانەتی گیانێکە هێزە بەپیتە راپەڕیوەکانی تێ دا ماتە. (٢٩)

٢) لە حاڵەتێکی تریش دا شارستانەتییەکی تازە سەرهەڵ دەدا ئەمەش کاتێك کە دوو شارستانەتی بەیەك دەگەن، یەکەمیان هێزی پتەوو زۆرترە، بەڵام دووەمیان کۆنترو بەهەرەترە، ئەوسا پێك گەیشتنیان بە کۆبوونەوەی (شێر)و (پێنووس) دەژمێردرێ و ئەنجامی پێك ـ گەیشتنەکەیان سەرکەوتنی شێرو بەزینی پێنووس دەبێت! لا بەزیوەکە ناچاردەبێت بە رووکەش لەگەڵ لا سەرکەوتووەکە بگونجێت مادام ناتوانێت بە شێوەیەك پەرەبستێنێ کە تەعبیر لە سروشتی پەتی خۆی بکاتەوە، وە رووالەتە شارستانەتییەکانی لە ناو ئەو قاڵبە بەتاڵانەدا دادەرژێن کە شارستانەتییە بیانییەکە بەسەریدا سەپاندووە، تەنانەت یەکێك کە سەیری رووی دەرەوەی واقیعەکە بکات وا دەزانێ شارستانەتییە بەزیوەکە ون بووە، لە کاتێکدا زیندووەو لە ژێر ئەو توێژە دەرەوەییەی بەسەریدا سەپاوە خۆی مات داوە.

شپنگلەر بۆ ئەمە نموونەیەك دەهێنێتەوە دەڵێ: ناوچەی رۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست گەلێ شارستانەتیی کۆن و کارکردوو لە مێژ ووی کونی دا تێ داهەڵکەوتووە، بەڵام هێزێکی دەرەوەیی ناوچەکەی داگیرکرد، کەوا ئەسکەندەری گەورە (لە سەدەی چوارەمی پێش زایین دا) شارستانەتیی هێلینی بەسەر میصرو شام و عیراق و هەتا تخوویەکانی هیندستان دا فەرزکردو رووەکانی چالاکی بیرورۆشنبیریی ناوچەکە وێنەی هێلینیان پۆشیو شەخسییەتی شارستانەتیی رۆژهەڵاتیانەیان نزیکەی هەزار ساڵ داپۆشراوبوو، بەڵام وێنە هێلینییەکەش تەنیا توێژێکی چاوخەڵەتێن بوو راستەقینەی بنەرەتیی نەدیو دەکرد.

دژی هێلی چەماوەی هێلینی زۆر بەرهەڵستی کاردانەوەی رۆژهەڵاتی سەری هەڵ دا چ لە بواری سوپایی و سیاسی یان رۆشنبیری و روحی دا، نموونەش سەرهەڵدانی مەسیحیەتی بوو ئەو دینە تازەی کە دژی بت پەرستیی هێلینی و پاشان رۆمانی بوو، پاشان مەسیحیەت پەرییەوە رۆژاوا و دوای ئەوەی ئۆگستینی ئیمپراتور لە سەدەی چوارەمی زایین دا بوو بە مەسیحی دینەکەش بوو بە دینی دەوڵەت. ئنجا کە رۆما جارێکی دی هاتەوە رۆژهەڵات داگیربکاتەوەو لە مەسیحی گەیشتنی خۆی بەسەر رۆژهەڵاتییەکان دا بسەپێنێ، خەڵکی رۆژهەڵات بەتایبەتی لە

میصر و شام و جزیره پاشان له ئەرمینیا ـ ناچار بوون به دەسەلاتی رۆمانی قایل بین بەلام بەرهەلستی رێبازە کلێسە رەسمی یەکەیان کرد، بۆیە له ولاتی رۆژهەلات دا رێبازی یەعقوبی و نەستووری بلاوبووەوە که له رێبازی دەولەت بەتایبەتی دەربارەی سروشتی مەسیح جیاوازن.[30]

ناوچەی رۆژهەلات، هەر چاوەروانی هەل بوو بۆ دەربڕینی خۆیەتیی خۆی دوای ئەوەی هەندەی نەما بوو کەسێتی شارستانی و دینی خۆی لەدەست بچێت، دەربڕینی راستیش له پەیدابوونی ئیسلام و محمدی پێغەمبەردا (ص) دەردەکەوێت. که دینەکە وەکو بروسکە له هەرێمەکانی رۆژهەلات دا بلاوبووەوە و رووالەتەکانی شارستانەتیی بیانی یان له کۆل خۆ کردەوە و ئەو رووالەتە شارستانەتیانەش شارستانەتی یەکی رۆژهەلاتیانەی راستەقینەیان پێك نەهێنانی بوو چونکە له ناو رۆژهەلات دا قوول روونەچووبوون، بۆیە شپنگلەر بەو پێکهاتنە دەلێ پێکهاتنێکی شارستانەتی یەکی درۆزنانە. ئەوەبوو (پێنووس)ی رۆژهەلاتی (عەرەبی ئیسلامی) جارێکی دی هاتەوە کایە تا بە راستی خۆیەتی خۆی دەرببڕێت، دوای ئەوەی (شیر)ی هێلینی پاشان رۆمانی دەستی بەسەردا گرتبوو. له ئەنجام دا شارستانەتی یەك پێك هات که هەموو رۆژهەلاتی گرتەوە هەر له تخووبەکانی چینەوە تا ئاقارەکانی فەرەنسا.

۳) حالەتی سێیەمی دامەزرانی شارستانەتی حالەتی بەیەك گەیشتنی شارستانەتی یەکی بەهێزتر و کۆنتر و بەپیت و درێژ راکشان و داهێنان و بەفەرتر لەگەل شارستانەتی یەك که تازە سەری هەلداوە، بۆیە خەفەدەبێت و لەناودەچێت وەکو لەناوچوونی شارستانەتیی مەکسیك و[31] شارستانەتیی هیندیی سوور له هەردوو ئەمریکاکەدا که شارستانەتیی تازەی رۆژاوا له ناوی بردن.

**دووەم: رووخانی شارستانەتی یەکان:**

شارستانەتی هەتا گیانەکەی له خەباتی سەخت دا بەردەوام بێت بۆ خولقاندنی کۆمەلێك وێنە و باروودۆخی وەها که بنە مۆرکەکەی ئەویش بەردەوام دەبێت. بەلام هەر که هێزە خولقێنەرەکانی ون کرد ئەنجامی خەفەبوونی لەژێر کاریگەریی گیانێکی لەخۆ بەهێزتر و بەپیت تردا یان له ئەنجامی ئەوەدا که بە مەبەستی خۆی گەیشت و دوا وێنەکانی خۆی هێنایەدی و توانای ئەوەی نەما لەو سنوورەی بۆی هەلکشابوو بەرزتر ببێتەوە و له دەرەوەدا هەرچی توانستی هەبوو هەمووی هێنایەدی، ئەووەختە خوێنەکەی وشك دەکات و گوڕو تینی تێك دەشکێ و قەوارەکەی دەبێتە بەرد و دوای ئەوەی شارستانەتی بوو دەبێ بە «مەدەنییەت».[32] دوای ئەوەی هێزەکانی بەهرەوداهێنانی لەناودەچێت بەرە بەرە ئەو رووناکی یە دەکوژێتەوە که جاران لێی دەبریسکایەوە و پرشنگەکەی هێزی راستەقینەی لەوە کەمترە که بەرچاو دیارە[33] هەروەکو دارێك که ئاوگەکەی نەمێنێ و کانیی ژیانی لێ وشك بێت، ئەمەش وانا که کتوپڕ بمرێت، بەلکو تەمەنی بە پاییزێك دا تێدەپەڕێت که چارنی یە دوای ئەویش زستان دێ. کەوابێت شارستانەتی وەکو زیندووێکی ئەندامی یە بە هەموو قۆناغەکانی گەشەکردن و پێگەیشتنی بوونەوەری زیندوودا تێدەپەڕێ. واتا هەموو شارستانەتی یەك بە ساوایی و لاوی و کاملی و پیری یان بە وەرزی بەهار و هاوین و پایز و زستان دا تێدەپەڕێ.

شپنگلەر لای وایە که شارستانەتیی ئەورووپا قۆناغی خولقان و داهێنانی بڕیوەو ئەو کول و جۆشەی مایەی داهێنانی بوو ساردبوەتەوە، کانت (۱۷۲۳ ـ ۱۸۰٤) فەیلەسووفی ئەلمانی خالی گۆڕان دەنوێنێ له شارستانەتی یەوە بۆ مەدەنییەت. کەوا سنووری یەگجاری رەنگی فیکری فەلسەفی کێشاوە و پاش ئەو فەلسەفە بەرەو لایەنی کردار «واتا کەلك دەری پراگماتی»ی نموونەی مۆرکی مەدەنییەت شۆڕبووەوە.

شپنگلەر لای وایە هەوای کلاسیکی دوادوای سەدەی هەژدەمین له ئەورووپا تەعبیر کردنە له هەستی خەمباریی گیان بە نزیك بوونەوەی قۆناغی پیری، دیارە له پیریش دا مرۆڤ بەتاسەوە له رابردوو، له ساوایی بیردەکاتەوە، پاشان شارستانەتیی ئەورووپا تووشی پەرێشانی یەکی توندتر بوو له هەواخوازیی رومانتیکی دا، که سۆفی گەری یەکی نادیاری وای تێدایە پەرێشانیی شارستانەتی دەگەیەنێ لەبەر نزیك بوونەوەی کۆتاهاتنی.[34] دوای ئەوەی بێ تاقەت بوو تەرایی تێدا نەماو خوێنی له دەماردا وشك بوو، ئەوسا شارستانەتی یەکە له مانەوە وەڕز دەبێت و حەزدەکات له تاریکی دا ئەو گیانە سەرەتاییانەی تێدایە که له مندالدانی تاریکی دایکی دا هەبوون، واتا له گۆڕدا ستاربگرێت.[35]

(گویتە) که پنگلەر زۆر پەسندی دەکرد دەلێ: هەر پێشکەوتنێك هەلکشانێکی گیانی لەگەلدا نەبێت مەترسیدارە، چونکە کاتێك که عەقل دەسەلات بەسەر هەموو رووالەتەکانی بیرکردنەوەدا پەیدادەکات مانای وایە شارستانەتی وشك دەبێت و دەکەوێتە ژماردنی سەربەرخوار تا دەبێتە مەدەنییەت و ئەوجا دوایی دێت.

هەموو شتێك سەری بۆ مەنتیقی هۆ و ئەنجام «عیللەت و

مەعلول» نواندووەو چۆن «حاڵەت» بووەتە چەند «ژمارە»، چەرخێکیش مەکینەیی رووت تێیدا زاڵ بێت و خۆکردیی هونەری و فەلسەفەیی تێدا نەسەپێنی و رێبازە (بێدینەکان)ی تێدا دەست رۆیشتوو بێت ئەم چەرخە چەرخی رووخان و لەناوچوونە. پاشان بەداخەوە دەڵێ: رێگاکان بوون بە مەبەست، ئەمەش لە دوو باردا خۆی دەنوێنێ:

(١) پارە «سامان» (٢) ئامێر.

مرۆڤ کە گەیشتە ئەوەی پارە بۆ مامەڵەت و ئاڵ وگۆڕ بەکاربهێنێ، لەجیاتی کرداری سەر بە سەرێی جاران کە گرێی ئاڵۆزی ئاڵوگۆڕی بازرگانی پێ نەدەکرایەوە؛ پارە بۆ ئەوە دۆزرایەوە تا ئەو ئاڵۆزیانە ئاسان بکات و ببێتە هۆو رێگەی کڕین و فرۆشتن و ئاڵوگۆڕی. بەڵام پاشان خۆی لە خۆیدا بوو بە مەبەست و وای لێهات بەهای هەموو شتێ بە پارە بپێورێت، وە سیاسەتیش وای لێ هات ئابووری بیجووڵێنێ، دوای ئەوەی مرۆڤ دەوڵەمەند بوو چونکە بەهێز بوو ئێستا بەهێزە چونکە دەوڵەمەندە، دوای ئەوەش دێهات دیمەن و رواڵەتی ژین بوو، شار بەوپێیە کە بازاڕی پارەو سامانە بوو بە رواڵەتی ژین. وە لای وایە دواهاتنی شارستانەتی بە پەیدابوونی شاری ئیجگار گەورە دەبێت، چونکە شار لەچاو شپنگلەردا دکتاتۆریەتی سامانە.[٣٦]

هەرچی ئامێرە «مەکینە» ئەوا مرۆڤ بۆیە دروستی کرد تا ببێتە هۆی حەسانەوەو رێگەیەك بێت بۆ خۆشی زیاتری، بەڵام ئەویش بوو بە (مەبەست) و وای لێهات هەموو شتێك کەوتە ژێر دەستی ئامێرو، مۆرکی مەدەنییەتی تازە بوو بە مەکینەیی و هەرچی لە کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا هەیە بە هێزی ئەسپ دەپێورێت، نەك بە هێزی واتایی گیانی، مرۆڤیش بوو بە پیاوی مەکینەیەتی. کاردانەوەی ئەم کارەش لە داهێنان و خۆکردییەکانی هونەردا رەنگی دایەوە، نمرونەش رێبازەکانی بێهوودەیی و ناماقوول لە ئەدەبدا «بە مەبەست و رۆمان و شانۆیی یەوە»، سوریالیەت لە هونەرە بەرچاوەکان دا، وە مۆسیقای پڕ لە هەراو هۆریا کە گیان بۆ بەرزی هەڵناکشێنێ و خۆشی ناداتێ، ئەم وێنانەش یاخی بوونی مرۆڤ بوو لە مەکینەیەتی.[٣٧]

شپنگلەر رایدەگەیەنێ کە داهێنانەکان (مخترعات) گرنگترین هۆیەکانی پێشکەوتنەوەی ئەورووپا بوون، بەڵام ئەم فارە ورگە هاتووە کەوتە بەر هەڕەشەی مەترسی گەلانی جیهانی سێیەم و رەنگاورەنگ وەکو خۆی ناوی ناون.»، کەوا تیپ تیپ خەڵکیان نارد تا لە نهێنی پێشکەوتنەوەی ئەورووپا بگەن و بزانن بۆچی لەوان سەرکەوتوونە، لەبەرئەوەیش کە کرێ لە ولاتانی جیهانی سێیەم دا کەمەو شارستانەتییەکانی ئەو جیهانە مرۆڤەکان ناکاتە بەندو کۆلەی ئامێرو مەکینە، بۆیە ئەوان «واتا گەلانی رەنگاورەنگ» ئامێریان دەوێ بەڵام لێ ناگەڕێن مل دەچیان بکات، پاشان دەیانەوێ بزانن رازی ئەو پێشکەوتنەوەیەی ئەورووپا لە وان چییە. تا بتوانن ئەوانیش پێشی بکەنەوەو بەسەری کەون.

بڕیاری شپنگلەر بەرامبەر بە شارستانەتیی ئەورووپا کەوا چارنییە هەر دەبێ بڕووخێت دەگاتە ئەوە بڵێ: هاوڕێیی هاتنی سەردەمێك رێبازە بێدینییەکانی تیدا بڵاوبێتەوە لەگەڵ پەرەسەندنی ئیستیعماریدا بەشێوە جیاوازەکانییەوە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم سەردەمە سەردەمی رووخان و لەناوچوونەو هەرگیز لە توانادانییە لاویی ئەو شارستانەتییە نوێ بکرێنەوە هەروەکو چۆن ناتوانرێت بوونەوەرانی زیندوو بگەڕێنەوە قۆناغی لاوێتی. ئێمەی ئەورووپاییش چیمان پێ ناکرێت چونکە لە قۆناغی زستانی ئەو شارستانەتییەدا لە دایك بووین و ئەوەی کە ئەورووپا بەدەستییەوە دەناڵێ تەنگوچەڵمەیەکی ناوەخت نییە، هەرکە هۆیەکانی نەمان نەویش بەسەربچێت، بەڵکو تووشی مەرگەساتێکی راستەقینەی وا هاتووە کە نەیدەتوانی خۆی لێ بەدوورگرێت، چونکە ئەو چارەنووسە سەختە لادان لەتوانادا نییە.

جاری وا دەبێت لەوباری دزی یان بە سنووریی یە گیانێك سەرهەڵ دەدا هەندێ کەس لایان وادەبێ ئەمە بەردەوامی گیان و زیندوویەتیی شارستانەتییە، دەچی لە راستیدا گمانێکی درۆزنەو هەرچی واهیمەی مەدەنییەت هەیە تێیدا کۆبووبەوەو حەڵکەکەش بە ماوەیەکی کورتی دیموکراتیدا تێپەڕدەبن، وا دەزانن کە لە سێبەریدا ئەو سەربەستییە دێتەدی کە پاش سوکمی موتلەق (قەیسەری و دکتاتۆری) دەکەوێت.[٣٨] ساوێلکەکانیش بە رواڵەتە گەشە مادییەکان و زۆریی داهێنراوەکانی (مخترعات) هەڵ دەخەڵەتێن، بەرهەمی ئەم رواڵەتانەش «بازرگانی و گشتی و بێ نرخ) دەردەچێت.»[٣٩]

بۆیە هەر مرۆڤێك لەوە تێ نەگات کە رووخانی شارستانەتیی رۆژاوا گومانی تێدا نییەو هیچ دەستکاری و پینەو پەڕۆیەك دادی نادات، وە پرشنگەکەی بریسکەیەکە زووون دەبێت، دەبێ ئەو مرۆڤە هیچ ئارەزوویەکی لە مێژوو گەیشتن یان لەگەڵ مێژوو

ژیان، یان بەشداریی دروست کردنی مێژووی نەبێت. [٤٠]

## تەوەرەی سێیەم: بەرنامەی شارستانانەی شپنگلەر «سروشتی شارستانەتی‌یەکان»

ئەو بەرنامەیەی ئەم فەیلەسووفە بۆلێکۆڵینەوەی شارستانەتی‌یەکان بەکاری دەهێنێ لەسەر بەدەرخستنی روو یان ئەو رواڵەتانەی کە شارستانەتی‌یەکان تێی‌دا بەشدارن هەڵدەستێ، ئەگەرچی هەر شارستانەتی‌یەکیش کەسێتی‌یەکی سەربەخۆو مۆرکی وای هەیە کە وای لێ دەکات تایبەتی‌یەتی‌یەکەی لە گیان و لە بەرهەمی خەڵکەکەی‌دا دیاربێت. چونکە شارستانەتی‌یەکان بریتین لە یەکەی لێکۆڵینەوەی مێژوو (وحدة الدراسة التاريخية)، ئەمەش دیاردەیەکی گیانی‌ی کۆمەڵێ خەڵکە بەرامبەر بە جیهان یەك جۆرە روانینیان هەیەو یەکیەتی روانینەکەشیان لە رواڵەتەکانی شارستانەتی‌دا وەکو دین، فەلسەفە، سیاسەت، هونەروزانستی و هی تر.. پێ‌دەگات. هەر ئەم یەکیەتی‌یەش کەسێتی‌یەکی شارستانەتی خاوەن سروشتە خۆیی‌یەکانی خۆی پەیدادەکات، پاشانیش دوو شارستانەتی لە یەك ناچن. [٤١] بەڵام ئەوروواڵەتانەی کە هەر شارستانەتی‌یەك سەربەخۆ تێ‌یان دا بەشداری دەکەن ئەمانەن:

١) نیشانەکانی «رەمزەکانی»

٢) وەرزەکانی

٣) هاوچەرخانەی فەلسەفەیی.

* *

(١) لەبارەی نیشانەکانی شارستانەتی‌یەکانەوە، شپنگلەر هەوڵ دەدا هەر شارستانەتی‌یەك بە دیارترین نیشانەیەك گیان و فەلسەفەکەی بگەیەنێ ناودێر بکات، چوون هەر کە پیاوباسی شارستانەتی‌یەکی لا بکەن یەکسەر وێنەیەکی تاکانەی ئەو شارستانەتی‌یەی دێتە بەرچاو کە لە هی تر جیاوازەو ئەم وێنەیە دەبێتە نیشانە جیاکەرەوەکەی..

بەنموونە نیشانەی شارستانەتی یۆنانی «ئەغریقی» لە بۆچوونی یۆنانەکان بەرامبەر بە گەردوون دەردەکەوێ کە وایان دەروانی‌یە گەردوون (کەون)ێکی بێ کۆتایی، بێ کۆتایی‌یەکی گۆشەگیری داخراوی (مجسم)ی وا هیچ شتێکی لەدواوە نەبێت. [٤٢]

بۆیە شپنگلەر نیشانەی ئەم شارستانەتی‌یەی بە پەیکەرێکی دیاری‌کراوی بێ جوولەی تابلێی ئەندام ڕێك و ساز دەدیت ئەویش پەیکەری ئەپۆلوی خواوەندی جوانیی پیاوانەو هەڵبەست و مۆسیقایە لای یۆنانەکان، کە لاوێکی تابلێی قۆزورێك وپێکە. چونکە کابرای یۆنانی گیانی هونەریی خۆی لە لەشێکی گۆشەگیر (منعزل)دا تەعبیر کردووەو هەروەها تەعبیریشی لە خودی خۆی لەرووی سیاسەتەوە لەوەی کە دیاری‌کراوە لە دەوڵەتی شاردا کردووە، کاتێکیش کە کابرای یۆنانی تەصەوری (جێ)دەکات، وەکو ئەقلیدس، بە جێ‌یەکی رووتەختی سنوور بۆ کێشراو تەصەوری‌دەکات. [٤٣] لە مێژووی سیاسیی کۆنیش دا یۆنانەکان، بە مانای تەواوی نەتەوە، نەتەوەیان پێکەوە نەنابوو، بەڵکو نەتەوە لای ئەوان گەلی هەر شاریك بووە لە شارەکان، ئەوان ئەو زاراوەیان نەزانیوە. ناوی (هیلینی)ش کە لە دەوروبەری ساڵی ٦٥٠ پێش زایین دەرکەوت مانای نەتەوە یان گەل ناگەیەنێ، بەڵکو مانای کۆمەڵی خەڵکی سەر بە شارستانەتی‌یە کۆنەکەو کۆمەڵی (نەتەوە یۆنانی‌یەکان) بەرامبەر بە درندەکان دەگەیەنێ. [٤٤]

نیشانەی بەدەرەوەی شارستانەتی میصری کۆنیش (رێ)یە، چونکە گیانی میصری هەستی بەخۆی کردووەو وای دەزانی کە ژیان گەشتەو دەبێ رێیی نەخشەکێشراوو دیاری‌کراوی وردو دروستی ئەم گەشتە ببڕێت. [٤٥]

هەرچی شارستانەتی عەرەبی ئیسلامیشە ئەوا شپنگلەر نیشای گیانی پێ‌دەدا، چونکە لای وایە تاك لەو شارستانەتی‌یەدا بە جۆرێك هەست بە هەبوونە گیانی‌یەکەی خۆی دەکات کە بەشێکە لە گیانێکی گەورە، موسڵمان لە شتی بەرهەستەوە (محسوس) هەڵدەکشێ بۆ شتی گوزارەیی (مجرد)، جا چونکە خواکەی لەش و قەبارەی بۆ دانانرێ مۆرکی گوزارەیی لای ئەو لە هونەرەکەدا لە چەند هێڵێکی لە گیان بەدەردا خۆی دەنوێنێ. کە وێنەکێشانی لەش و پەیکەری لەشی لێ حەرام کراو هونەرە تەشکیلی‌یەکەی وای لێ هات لەگەڵ گیانی شارستانەتی‌یەکە نەگونجێت.. بۆیە موسڵمان وێنەی ناو قوولایی‌یەکانی خۆی بەو نەخش و نیگارە دەربریوە کە لە رۆژاوا پێی دەڵێن «ئەرابسك» Arabesque هەروەها بە جۆرەها هونەری خەت تەعبیری لە هونەری پەیوەست بە باوەڕەکەی کردووە، کە لە خەت دا لایەنی گوزارەیی و مفارقەی لەشی و ماددەیی تێ‌دایە. رەنگە بێ مێژ وونووسێکی هونەری فەرەنسەیی ئەوەی دەست نیشان کردبێت کە دەڵێ: هونەری ئیسلامی پاکترین هەوڵەکانی گیانی مرۆڤایەتی‌یە لە پێناوی زاڵ بوون بەسەر

کۆتایی‌یەتی (النهائي)و لابەلایی (عرضي)و کومان لیٚ‌کراو و سەرپیٚ‌یی‌دا»[٤٦] وە لە سیاسەت و یاسادانان دا (کە ئەمە بەشیٚکی گرنگی‌یەتی) یەکتایی خوا لای ئەولە بۆچوونی سیاسی و فیکری رەنگی داوەتەوە، وە برِوای هیٚناوە بە هاوکۆمەڵی‌یەك کە ریٚگەی کوفری لیٚ بەستوەوە.[٤٧]

مۆرکی شارستانەتیی رِۆژاواش گیانی فاوستی‌یە «کەوا هەمیشە نەسرەوتەو جووڵەی دینامیکیانەیەو هەوڵ دەدا بۆ گەیشتن بە مەبەستانیٚك کە کۆتاییان بۆنی‌یە» ئەم گیانەش نموونەی هەموو خەسیەتەکانی عەقڵی ئەوروپایی‌یە کە عەقڵیٚکە بە بیٚ‌کۆتایی ناسراوەو لە کاتدرائیە قووتی‌یەکان دا خۆی دەنویٚنیٚ کە سەیریان دەکەیت دەبینیت کۆمەڵە خانوٚیٚکی قووچی وەهان دەڵیی بەبیٚ‌کۆتایی بۆ ئاسمان هەڵکشاون، هیٚلەکانیان و تاق و کەوانەکانیان نووك تیژ ن شەبەنگی رووناکی‌یەکی تیٚکەڵ بە رەنگەکانی ویٚنەکانی سەر تەبەقی شووشەی پەنجەرە بەرزەکان نوقمی کردوون، ئەو خانووانە سووك، ئامادەی راپەرین، سەرکەش، بەرەڵلا، ئارەزووکردووەی سەردان لە بۆشایی بیٚ‌کۆتایی دیاردەبن.[٤٨]

هەروەها عەقلی کردەوەیی ئەوروپایی - لای‌وایە - لە حیسابی بیٚ‌کۆتایی (جیاکاری‌و تەواوکاری - التفاضل والتكامل)دا دەردەکەویٚ، گیانە هونەری‌یەکەشی ئەوەتا کابرای رِۆژاوایی بە زمانیٚکی بزواوی گیانی لە مۆسیقای باخ J.S.Bach (١٦٨٥ - ١٧٥٠)ی مۆسیقازانی ئەلمانی خاوەن ئاوازی بەرزی خۆش خۆشی سەردەمی پیٚش رۆمانسی دا دەری‌بریوە کەوا مۆسیقا زمانیٚکی جیهانگیرە، جیهانگیریی مەسیحیەت دەردەبریٚ، ئەم زمانە جیهانگیرەش تەعبیر کردنە لە بیٚ‌کۆتایی چونکە خوای مەسیحی بیٚ‌کۆتایی‌یەو موسیقاش زمانی گیانەو خوای مەسیحیش گیانە نەك لەش.[٤٩]

هەروەها ئەو بیٚ‌کوتایی‌یەشی لە ئیستیعماری جیهانگیرو تەلەفوٚن کە بەسەر جیٚی سنووردارردا زاڵەو رادیوٚش دا (ئەو سەردەم تەلەفزیوٚن و کۆمپیوتەر نەزانرابوو) دەبینی. گیانی فاوستیش لە ئابووری جیهانا نموونەکەی لە بازرگانیی جیهانی و بەنکەکان دا خۆدەنوێنیٚ. بەم جۆرە کابرای رِۆژاوایی جیٚ بە راکشان (امتداد) دەبینیٚ و لای ئەو راکشان هەموشتیٚکە.[٥٠] بۆ نموونە لای ریٚبازی فاوستی نیشتمان لەلایەن جیٚ‌وە پارچە زەوی‌یەکە تاکی دانیشتووی هەست بەوە ناکات کە سنووری هەیە، بەڵکو ئاسوٚیەکی جوغرافی وای هەیە تا بیٚ‌کۆتایی رادەکشیٚ، ئەگەرچی ئەو فاوستی‌یە ئەوروپایی‌یە لە هەموو ساتیٚك دا ئامادەیە لە پیٚناوی ئەم نیشتمانە بیٚ سنوورەدا خۆی بەخت بکات.[٥١]

**٢) وەرزەکانی شارستانەتی‌یەکان:**

ئەم رەمزانە ئەوە دەگەیەنن کە هەر شارستانەتی‌یە کەسیٚتیی خۆی‌و خەسیەتگەلی خۆیی خۆی هەیە، ئەمەش مانای وایە هەر شارستانەتی‌یەك داخراوەو گیانیٚکی بەرەڵلا نی‌یە وەکو هیگل بۆی چووە. چونکە گیانی بەرەڵلا (مطلق) تەعبیر لە ریٚ‌رەوتی شارستانەتی‌یەکان ناکات، بەڵکو بەرودواهاتنی وەرزەکان بە شیوەیەکی خولدانەوە تەعبیر لەو ریٚ‌رەوتە دەکات، کەوا ئەوەی بوونەوەری زیندوو دەیبینیٚ لە زان و پیٚگەیشتن و پیری‌و نەمان هەر شارستانەتی‌یەکیش دەیبینیٚت. شپنگلەر کاتی پشکووتنی شارستانەتی‌یەکان بە وەرزی بەهار دەچوٚنیٚ کە سەردەمی قارەمانی‌یەو ژیانی ئەفسانەو هەڵبەستی داستانانە کەوا هیٚزو ئازایی هەڵ دەنیٚن، وەکو سەردەمی هۆمیرۆسی یۆنانی و سەردەمی چەرخە ناوەراستەکانی رِۆژاوایە، ئەمەش قۆناغی گەشەکردن و بەهرە پشکووتنە کە دەرچوونە لە ئەشکەوتی بەربەریٚتی‌و ریٚك بوون، لەگەڵ زنجیرە کردەوەیەکی داهیٚنەرانەی وەها کە نیشانەی دەست پیٚ‌کردنی ژیانی تازەیە.

پاش ئەمە هاوین دیٚت کە چەندین سەرکردایەتیی راپەریوی ئاوات فراوانی تیٚ‌دا پەیدا دەبیٚت، وەرزی دەرکەوتن و گەشەکردنی (دەوڵەتی شار)ە لە شارستانەتیی ئەپولونی (یوٚنانی)، چەرخی راپەرین و هونەری مایکل ئەنجیلوی ئیتالی. [کە گەورەترین پەیکەرتاش و ویٚنەکیٚشی جیهانە ١٤٧٥ - ١٥٦٤]وە سەرکەوتنەکانی گالیلوٚیە (١٥٦٤ - ١٦٤٢) [کە زانایەکی بەناوبانگی ئیتالیایی‌یە تەلەسکۆبی دۆزییەوەو گوتی زەوی خرەو بە دەوری هەتاودا دەسوریٚتەوە] ئەو سەرکەوتنە زانستانەی لە کۆری گەردوون ناسی‌دا ئازایانە زۆر بیری وای پووچ کردەوە کە لە کۆنەوە لە میٚشکی زاناکان چەسپاو بوو، هەروەها سەردەمی ئەدەبی شکسپیری شاعیری ئینگلیزی بەناوبانگ لە شارستانەتیی فاستی‌دا.

پاییزیش قۆناغی پیٚگەیشتنی تەواوی سەرچاوە گیانی‌یە رۆشنبیری‌یەکان و نیشانە سەرەتاکانی پیری‌و بیٚ تاقەتی دەنویٚنیٚ، لەم وەرزەدا مەلیکایەتی یەك ناوچەیی و فەلسەفەی بەرهەلستی

دین و نرخەکان بەناوی فەلسەفەی رووناك کردنەوە (یان رووناك بوونەوە ـ Enlightenment, سەردەمی سوفیستایی یەکان Sopnist [52] و سوقرات و ئەفلاتونە لە شارستانەتی ئەپولونی و سەدەی هەژدەمی ئەوروپا، کەوا ناوەندی پایزە لە موسیقای مۆزارت (١٧٥٦ ـ ١٧٩١)ی نەمساوی و هەڵبەستی گوتیەو فەلسەفەی کانت دا.

پاشان دەگەینە زستانی شارستانەتی کە هونەر لەم وەرزەدا مۆرکێکی نەزانراوی نەهێنی وەردەگرێت کاتیکیش فەلسەفەی مۆرکی گومان و نازانمی (لاأدریة) وەردەگرێت وە لە سیاسەت دا سەردەمی ئیمپراتۆریات و ئیستیعمار و ستەمکاریی سیاسی دادەسەپێ، چونکە لە زستان دا شارستانەتی گیانی داهێنەری لەدەست دەدات و دەبێتە مەدەنییەتێکی رووتی وەها چاکترین بەرووبوومی هەر ئەوە دەبێت زانست لە کۆری پیشەسازیدا تەتبیق بکات و تواناکانیش لە راکشانێکی ئاسۆیی (امتداد إفقي) و بڵاوبوونەوەدا گیردەخۆن، جا ئەگەر لاوە فاوستی یە «رۆژاوا»یی یەکە بیەوێ لە زستانی شارستانەتی یەکەیدا دەورێك بگێرێت یان دەچێ بەرگی سەربازی لەبەردەکات یان دەچێتە فێرگەیەکی تەکنولوجیا.[53]

**٣) بەرنامەی هاوچەرخایەتی فەلسەفەیی:**

بەردەوامی لەسەر بابەتی ئەو وەرزانەی هەموو شارستانەتی یەکان پێیدا تێدەپەرن، سەرەڕای سروشتە خۆییەکانی هەر شارستانەتێکیش، شارستانەتی یەکان بەهۆی هاوتەریبی (التوازي) یان هاوچەرخایەتی فەلسەفەیی یەوە هاوچەشن دەبن. واتا هەموویان چەند قۆناغێکی لەیەك چووی هاوچەشن دەبرن ئەگەر بە وردی لە مێژ ووی ئەو شارستانەتیانەمان کۆڵییەوە ئەوسا دەبینین ـ هەروەکو شپنگلەر دەڵێ ـ دوو رووداوی مێژ وویی لە دوو شارستانەتی دا لە دوو جێ و کاتی لەیەك دووردا پەیدابن بە هاوچەرخ دەژمێردرێن، ئەگەر هەر یەکەیان هەمان دەور بگێرێت و هەمان ئەرکی هاوچەشنەکەی لە شارستانەتی یەکەی تردا بەجێ بگەیەنێت. ئەوەیش کە هەندێك مێژ وونووس دەیکەن لە بەراوردکردنی ئەسکەندری گەورە لەگەڵ ناپلیون پۆناپەرت دا، یان لە بەراوردکردنی بوودا و مەسیح، وە مەسیحیەتی سەرەتار سوشیالزمی نوێ، لەبەرئەوەی لە هەندێ رووەوە لەیەك دەچن، چاوی خۆ بەستنە لەو جیاوازی یەی کە لەنێوان ئەو کەسێتی یە مەزنانەدا هەیە، لەبەرئەوە کە لە ئاستی شێوەی رووداوەکەو دەوری بەدەرەوەی کەسەکەوە لەیەك دەچن نەك لەسەر ئاستی قۆناغی مێژ وویی. واتە لەیەکچوونەکەیان لەیەکچوونێکی دروزنەو دەستکردە، بەراوردکردنەکانیش نادروست و داسەپاون و بەراوردکردنی شیعرین زیاتر لەوەی بەراوردکردنێك بن لە هەست کردنێکی قووڵەوە دەرچووبن بەوە کە مێژ وو باری خۆی هەیەو هەمیشە کۆمەڵێك دیمەن و هەلومەرج و هەڵوێستی تێدا دووبارەدەبێتەوە.[54]

شپنگلەر نێوان هاوتایی یەك (تماثل) کە لەیەکچوونێکی رووکەش دروستی کردبێت لە گونجایشێك (توافق) جیادەکاتەوە کە بەڵگەی یەکسانی نیسبەتی بێت لە پەیکەر و پێکهاتن و ئەرك دا. کەوا لە گیانلەبەرە بڕبڕەدارەکان دا هەر لە مرۆڤەوە تا دەگا بە ماسی، هەر بەشێك لە بەشەکانی کەللەسەر هاوچەشنی بەشەکانی جۆرەکانی ترە «بە نموونە سی یەکان لەگەڵ لوتۆکەی ماسی» لەبەرئەوەیش کە مێژ وو ـ لای شپنگلەر ـ مل کەچی لێکدانەوەی بایەلۆجی یە، بۆیە گونجایش لە لەیەکچوون وردتر و قووڵ ترە.[55]

هەر بەم پێیەش فیثاگورسی زانای ماثماتیك لە شارستانەتی یۆنان دا لەگەڵ دیکارتی زانای ماثماتیك لە شارستانەتی تازەی ئەوروپادا هاوچەشن و گونجاون، بەڵکو هاوچەرخیشن. هەروەها ئەسکەندەرییەش لە شارستانەتی یۆنان و بەغدا لە شارستانەتی عەرەبی ئیسلامی دا. . کەوا دەوری هەر یەکێکیان لەو دوو شارستانەتی یەدا هاوچەشن و گونجاو و هاوچەرخە لە هەر پلەیەك لە پلەکانی ئەم دوو شارستانەتی یەدا. جا دەتوانین پرۆگرامی هاوچەرخایەتی بەسەر هەموو دیاردە هونەری و دینی و زانستی و سیاسی و ئابووری یەکان لە هەموو شارستانەتی یەکان لە سەردەمی سەرهەڵدان و گەشەکردن و رووخان و نەمانیان دا تەتبیق بکەین، مادام پێکهاتنی ناوەوە لە هەمووو شارستانەتی یەکان دا هاوڕێك و گونجاوە. هەر بەم جۆرەش لەچاو دیاردەکانی تردا ئەوانیش لە سەرهەڵدان و پێگەیشتنیان دا هاوچەرخن، کەوا هیچ دیاردەیەکی بەنرخی گەورە لە شارستانەتی یەك دا نی یە ـ هەروەکو شپنگلەر دەڵێ ـ ئەگەر هاوچەشنی لە شارستانەتی یەکانی تردا نەبێت، ئەوەتا بوودایی هیندستان و رەواقیی رۆمانی هاوچەرخن[56] هەر بەم جۆرەش گوێزانەوەی شارستانەتیی یۆنانی بۆ دەوری مەدەنییەت لە سەردەمی فلیپی مەکدوونی و ئەسکەندەری گەورەی رۆژاوا لە سەردەمی شۆرشی فەرەنساو ناپلیۆن دا.[57]

شپنگلەر لای وایە هەر شارستانەتی یەك لە هونەردا سۆرکێکی

دیاری‌کراوی بۆ خۆی هەڵبژاردووە کە تەعبیری پێ‌دەکات لە گیان و لە کەسێتی یەکەی بۆیە لە شارستانەتێکی ماددیدا ـ هەروەکو باسمان کرد دیاری‌کراو بە دیاری‌کراو وێنەدەکێشرێت وە گیانیش ماددیانە بەرجەستە دەکرێت، هەروەکو یۆنانی‌یەکان لە هونەری پەیکەرتاشی‌دا تا ڕادەی نایابی کردیان. لە کاتێك دا عەرەبی موسلمان خۆی لە پەیکەرتاشی و وێنەکێشان بە دوور گرت چونکە لەگەڵ گیانی‌دا نەدەگونجان، بۆیە باوەڕ بێ کۆتایی کەی (اللامتناهیة) بە نەخش ونیگار (ئارابسك) دەربڕی کەوا لەسەر شێوەی چەند هێڵێکەو لایەنی گوزارەیی (تجرید)ی تێ‌دایە. بەلام ئاوروپایی یەکە بە مۆسیقا کە زمانێکی جیهانی و تەعبیرە لە بێ‌کۆتایی‌یەکە ڕاکشان (امتداد)ی دەردەبڕی.

ئەم دەربڕینە تایبەتی‌یە ماثماتیك و ڕەمزەکانیشی کە ژمارەن دەگرێتەوە، شپنگلەر بەشێکی کتێبەکەی بۆ باسی «مانادانی ژمارەکان»(٥٨) تەرخان کردووەو دەڵێ شارستانەتی‌یەکان بەوە لەیەکتر جیادەکرێنەوە کە هەریەکە بیرێکی جیاوازی خۆی هەیە لە ماثماتیك دا، وەنەبێ بەو مانایەی کە گەردوون یان کیمیا ناودێردەکەین شتێك هەبێ ناوی «ماثماتیك» بێت، چونکە لە شارستانەتی‌یە جیاوازەکان دا زۆر جۆر ماثماتیك هەیە.(٥٩)

**گرنگی و کەڵکەکانی بەرنامەی هاوچەرخایەتی:**

ئەگەر باوەڕمان بە ڕاستی ئەو بەرنامەیە هێنا، کە شارستانەتی‌یەکان گشتیان بە چەند قۆناغی هاوتای هاوچەرخایەتی فەلسەفییانەدا تێ‌دەپەڕن، ئەوا مەیلەو یاسایەکمان دەست دەکەوێت کە بەسەر هەموو شارستانەتی‌یەکان دا کاریگەر دەبێت.. تەتبیق کردنە ناواخنی‌یەکەی بەسەر ڕووداوەکانی مێژوودا وامان لێ دەکات لەم لایەنانەوە کەڵك لەو بەرنامەیە وەربگرین:

یەکەم: دەتوانین پێکهاتنی چەند چەرخێکی مێژوویی دووبارەبکەینەوە کە هیچمان لێ‌تەدەزانین. جا دووبارە پێك هێنانی ڕابردوو بەم شێوەیە ئەوەی دێرینەناسی و بەڵگەنامەو کتێب پێ‌یان نەکرا ئەودەیکات. واتا ـ ئەم جارە ـ فەلسەفە بۆ کۆڵینەوە لە مێژوو بەشداری دەکات، دوای ئەوەی سەردەمێکی زۆر مێژوو دەستی بۆ فەلسەفە درێژدەکرد، ئەوسا لێکۆڵەرەوەی مێژوو دەتوانێ بەرنامەی هاوچەرخایەتی بکاتە ڕێگەیەك بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوو، کاتێك کە بۆ لێکۆڵینەوە کەرەستە باوەکانی باسکراوی لەبەردەست دا نەبێت.

دکتۆر بەدەوی دەڵێ: ئەگەر دانمان بەوە دانا کە مێژوو بۆ پێویستی‌یەکی ئەندامیی زیندوو مل کەچ دەکات، یەکسەر دەزانین ئەو بەرنامەیە لە لێکۆڵینەوەی مێژوویی‌دا چەند گرنگە، وە ئەو ئاسۆ فراوانانە سەیر دەکەین کە تەتبیقەکەی بۆمانی والادەکات، وە ئەو ئەنجامە کاریگەرانەش ئەگەر هاتوو ئێمە ڕێکمان خست و دەستوورو مەرجمان بۆ دانان.(٦٠)

دووەم: بە بەکارهێنانی بەرنامەی هاوچەرخایەتی دەتوانین ترپە (ایقاع)و ڕێرەوت و مەبەستی مێژوو بزانین، پاشان دەتوانین سنووری ئێستا ببڕین بەرەو ئاسۆکانی دوارۆژ و پێش بینی‌یەکی زانستانەو وردی دوارۆژ بکەین، ئەوسا بزانین خولەکانی ئایندەی شارستانەتی ئەوروپا ـ یان هەر شارستانەتی‌یەکی تر ـ چۆن دەبن دوای ئەوەی دەتوانرێ باری گەشەکردن و ڕێرەوتەکەی بەسەربکرێتەوە. واتا بەرنامەی هاوچەرخایەتی وادەکات فەلسەفەی مێژوو دەستی درێژ بکات بۆ زانستی سیاسەت و ئابووری و نەخشەکێشانی دوارۆژی کۆمەڵ بە چاوبرینە قۆناغە بەرودواکانی کە مێژوو پێ‌یان دا تێپەڕ دەبێت، ئەمەش وا دەگەیەنێ مێژوو، پاشان فەلسەفەی مێژووش، بەتەنیا هەر بۆخودی خۆی نابێتە مەیدانی لێکۆڵینەوە بەڵکو بۆ زۆر کاری بەسوود کە لەلایەنە بنەڕەتەکانی تر کەڵکیان لێ‌وەردەگیرێت. ئەم سوودگەیاندنەش دەبێتە پێشدەستی بۆ ئەو سوودەی کە ئەوەتدلە سێ‌یەم دا باسی‌دەکەین:

سێ‌یەم: بەپێی ئەم بەرنامەیە ڕووداوەکانی مێژوو بە لەناکاوی دیار نابن چونکە مێژوو وناس شارەزای زنجیرەیی و بەرودواهاتنی مێژوو دەبێت، بۆیە ئەو کارەساتە دڵتەزێنانەی بەرپادەبن مێژوونووسەکە ناشڵەژێنن و عادزی ناکەن. بەوپێیە شەڕی یەکەمی جیهان ڕووداوێکی لە جغزی باری گشتی مێژوو بەدەر نی‌یە، کە ئارەزوی دەسەلاتداری و ئاغایەتی هەندێ ڕژێم یان هەندێ کەس پەیدای نەکردووە. ئەم شەڕە هەر تەنیا لەڕووی هۆکارە ئابوورییەکان لێك نادرێتەوە، بەڵکو لەڕاستی‌دا ـ وە بە پێی بەرنامەی هاوچەرخایەتی ـ خاڵی گواستنەوە دەنوێنێ لە شارستانەتی ئەوروپادا هاوتای گواستنەوەیە لە چەرخی هێلینی‌یەوە بۆ چەرخی ڕۆمانی. جا دەڵێ: هاوچەشنی‌یەکی سەیر لەنێوان شەڕی تەروادەو شەڕەکانی خاچی‌یەکان، شەڕی بۆلینیزی و(٦١) شەڕی یەکەمی جیهانی‌دا هەیە، هەروەها لە نێوان ئەتیناو پاریس، ئەرستۆ و کانت، ئارەزوی جیهانگیریی لە ئەنجامی وڵاتگیری‌یەکانی ئەسکەندەرو ئیستیعماری ئەوروپاییش دا.(٦٢)

## تەوەرەی چوارەم: داخـــراویی شارستـــانـــەتی‌یـــەکـــان «نەبوونی وتوویژ لەنێوان شارستانەتی‌یان دا»

شپنگلەر لای وایـە هەر شارستـانـەتی‌یەك قەوارەی دوورەپەریزو سەربـەخـۆ لە قەوارەی شارستانەتی‌یەکانی تری هەیەو ماوەی بەیەك گەیشتنیـان نی‌یـە، بەوپێ‌یـە کە هەر یەکـە بوونەوەرێکی ئەندامی و هەبـــوونێکی راستـــەقینـــەی هەیـــە. یەکـــەیـــەکی دەرکـــەداخـــراو پێـك دەهێنێ، لەیـەکچوونی بابەت کە لە نێوان دوو شارستانەتی، یان لەیـەکچـوونی شێـوازی دەربـڕین لە نێـوان دوو شارستـانـەتیی جیـاوازدا کە دەبینـرێ ئەمـە چاو خەڵـەتێنە، چونکە لەیەکچوونەکە تەنیـا لە دیمـەنی دەرەوەیـە نەك لە کاکڵی ناوەوە. چونکـە هەر شارستـانەتی‌یەك تەعبیرە لە گیانێك، گیانیش لە شارستانەتی‌یەکەوە تا ئەوی تر زۆر جیاوازە، لە کاکڵی‌و لە شێوازی‌و لە تواناکانی هەبـوونی‌دا.[٦٣] کەوابێ شارستـانـەتی‌یەکی گشتی لە ئارادا نی‌یە، بەڵکـو هەر شارستـانـەتی‌یەك فەلسەفەو سروشتی خۆی هەیە، هەر یەکـەش ژیـانێکی دیـاریکـراوی هەیە کە دەبێ لە رادەیەك کۆتایی بێت، هەروەکـو چۆن تاکـەکەس نامێنێ بەڵام (جۆر) دەمێنێ، بەم جۆرەش چاروبێ‌چـار هەر شارستانەتی‌یەکیش دەبێ لەناوبچێت و مانـەوە تەنیـا بۆ ئەو مرۆڤـایـەتی‌یـەیـە کە کۆمەڵی شارستانەتی‌یەکان دەنـوێنێت، جا ئەگـەر هەمـوو هەبوویەکی ئەندامی زان و ساوایی و لاوی‌و پیـری‌و مردن ببینێت، هەمـوو شارستانەتی‌یەکیش بەم جۆرە وایـە. بەم هۆیـە، مێـژووی جیهـان پێـك هاتـووە لە دانـانی شارستانەتی‌یەکان یەك لە تەك یەك دا و لە یەکتر جیاو سەربەخۆ، بەو پێ‌یـە هەر یەکـە دیاردەیەکی دەرکە داخراوە گیانی شارستانەتی‌یەکە بەرجەستە دەکات و تەعبیری لێ‌دەکات.[٦٤]

ئەمجـا ئەگـەر رەگـەزە دەرەوەیی‌یـەکـانی لە دوو شارستـانـەتی کارکـردوو هاوبـەش بوون، هەر شارستـانـەتی‌یـەك بە شێـوەیەکی تەواوو جیـاواز لە شارستـــانـــەتی‌یـــەکـــەی دی ئەم رەگـــەزانـــە قەبـوول دەکـات، چونکـە هەر یەکـەیـان تا ئەو رەگـەزانە حەواڵەی سروشتی خۆی نەکـات پێی هەزم ناکرێت، خۆ ئەگەر تەبیعەتەکان گۆران ئەو مۆرکەش دەگۆرێت کە هەر گیانەی رواڵەتەکانی پێ‌رەنگ کردووە.

بۆیە (راستی) تەنیا بەنیسبەت هەر شارستانەتی‌یەك خۆی هەیە، ئەگـەر بابـەتێـك لە شارستانەتی‌یەکەوە پەری‌یەوە شارستانەتی‌یەکی دی، گوێـــزانـەوەکـەی تووشی گۆرانی دەکـات. چونکـە هەروا سووك و ئاســان رەت نابێت بەڵکـــو هەردەبێ کردارێکی ئاڵـــۆزی دووروودرێـــژی گۆرین پاشـان شی‌بـوونـەوە، ئەوجـا هەزم کردنی بەسەردا بێت.[٦٥]

کەوابێتـە شتێـك نی‌یـە ناوی کارتێکـردنی شارستـانـەتی‌یەك لە شارستـانـەتی‌یـەکی دی بێت بە شێوەیەکی وەها کە وابزانرێ دووەم کەلەپووری یەکەمی بۆ خۆی گوێزاوەتەوە.

ئەگـەر بێتـو وادابنێین رەگـەزێکی شارستـانـەتی‌یەك، بابەنموونە بڵێین دین، دوو شارستـانـەتیی جیـاولز قەبوولیان کردبوو، ئەوا هەر یەکـەیـان بە جۆرێکی جیـاواز لەوی تر وەری دەگـرێت، بەڵکو هەر شارستانەتی‌یەك شتێك وەرناگرێت ئەوە نەبێ کە لەگەڵ سروشتی‌دا بگـونجێت پاشـان شتێکیشی لە گیانی خۆی دەخاتە سەر. ئەوە بوو کاتێـك کە بوودایی لە هینـدستانەوە چووە چین گیانێکی چینی‌ی لە بوودایی بنـەرەت جیـاوازی وەرگـرت، هەروەهـا مەسیحیـەتی رۆژهـەڵاتی (رێبـازگـەلی یەعقـوبی و نەستـووری‌و ئەریـوس) لە مەسیحیەتی کاتۆلیکێ جیاوازە.[٦٦]

ئەم روانینـە ئەوەمـان بۆ لێـك دەداتـەوە بۆچی شارستـانەتی‌یەك هەنـدێ رەگـەزی شارستـانـەتی‌یەکی دی پشت گوێ دەخات، وە بۆچـی عەرەب بەجـۆرێـك لە ئەرەستـۆ گەیشتـوون کە تەواو لە ئەرەستۆی راستەقینە جیاوازەو تا وای‌لێ‌هاتووە ئەرەستۆ لای عەرەب ئەو ئەرەستـۆیـە نی‌یـە کە لای یۆنـانـەکـانـە:[٦٧] بەڵکو هەر کاتێك شارستانەتی‌یەك کەسێتی‌یەك یان ناودارێکی لە شارستانەتی‌یەکی تر لا پەسەند بوو ئەوە ـ هەروەکو شپنگلەر دەڵێ ـ چاك دەی‌شێوێنێ‌و نابـووتی‌دەکـات.[٦٨] هەروەهـا دەڵێ دە کەوایـە با هەمـوو ئەو بیـرە پروپـووچـانـە نەهێڵین کە مێژوونووسە هەڵخەڵەتاوەکان مێژوویان زۆر خراپ پێ تێـك دا ونـاشیـرینیـان کردو خەڵکیشیـان تووشی گومـرایی و لە خشتـەبـراوی کردو لەسـەر بنـاغەی ئەم وێنەیەی کە بۆ مێژوویان کێشا گەڵێ بەهای ساختەیان قیت کردەوە، ئەم بیرانەش ئەمانەن: کاریگەری، بەردەوامی، یەکەتیی مێژوویی.

ئەم مێـژوونـووسـانـە گوتوویانە شارستانەتی‌یەکان پێوەندییان لە نێـوان دایـە، پێـوەندیی عیللەت بە مەعلوول یان هۆکار بە ئەنجام و گوایا هەموو شتێك ئەنجامەو شتێك نی‌یە نوێ بێت. خۆ هەر کە لە شارستـــانـــەتی‌یـــەکی نوێ رەگـــەزێکی رووکـــەشی سەربـــانی شارستـانـەتی‌یـەکی کۆنیـان بەدی‌کـردوە دەنگیـان لێ‌هـەڵبـرییـەوەو گوتوویانە: ئەمەتا «کاریگەری». وئیتر لە هەموو جێ‌یەك دا بە دوو

ئەم کاریگـەری یـەدا گەڕاون و خەیـاڵیـان وا بری کـردووە کە ئەرکی مێژ وونووس پەردە هەڵدانەوەیە لەسەر «کاریگەری» جا کە ئەوەی بۆ کراوە تێر لێی خەوتووە و ئەرکی سەر شانی خۆی باش جێ بەجێ کردووە![٦٩]

پوختـەی قسە ئەوەیە: شارستانەتی یەکان هەر یەکە سەربەخۆیەو بازنـەیـەکـی داخـراوی لە دەوری خۆیدا کێشـاوەو لەگـەڵ شارستـانـەتی یـەکانی ترا چەند دەلاقەیەکیان لەنێوان دا هەیە، ئەم دەلاقـانـە لێ نـاگـەڕێـن ئەوەی لەگـەڵ جەوهـەرو گیـانـی شارستـانـەتی یـەکـەدا گونجـاو نەبێت تێپەڕ ببێت، کەوا ئەوەیش کە تێپـەڕ دەبێت زۆری پێ نـاچێ دەچێتە سەر سروشتی شارستانەتی یە دووەمـەکە، هەر لەیەکچوونێکیش هەبێت ڕواڵەتی دەرەوەیەو گوتنی یەك کەلـەپـوور بۆ هەمـوو مرۆڤـایـەتی، یان خەیـاڵ کردنـەوە لە کاریگەری و کارتێ کراوی. . قسەی پووچ و بەندوباوە.[٧٠]

لەمـەوە تێ دەگـەین کە شپنگلەر بە پێچەوانەی زۆر بیری سەلماو لای مێـژ ووپەروەرانی کۆن شارستـانـەتی بۆ ئێمـە خستوەتەڕوو. . خستنە ڕووەکەشی بـ «نە»ەکان داڕشتووە وەکو: نە کاریگەری و نە کارلێکـراوی یان لاسـایی کردنەوە، بەڵکو تازەگی و داهێنان و. . . . نە بەردەوامی بەڵکـو دابـەش بوون و دوورەپـەرێزی، نە پێشکەوتن بەڵکو خولێکی داخراو، نە مەبەست بەڵکو چارەنووسێکی بڕیارداو.[٧١]

**پایەی بیرەکانی شپنگلەر:**

---

سەرەڕای ئەوەی بیروڕاکانی شپنگلەر کەوتە بەر ڕەخنەی هەندێ بیـرکـەرەوەو فەیلەسـووفی مێژ وو[٧٢] لەگەڵ ئەوەش دا بە یەکێك لە گرنگتـرین کۆڵـەکـەکـانی بیری مێژ ووی لە جیهان دا دەمێنێتەوە، چونکە هەر کە بەشی یەکەمی کتێبەکەی «ئاوابوونی ڕۆژ اوا»ی ساڵی ١٩١٨ دەرچـوو دەنگـدانەوەیەکی گەورەی لای هەموو ڕۆشنبیرانی ئەورووپا پەیداکردو کۆمەڵی خوێنەران پەسەندیان کردو بەهۆی ئەوەی شتی نوێ و قووڵ و بەربلاویان لێ بەدی دەکرد بەشەوقەوە دەیان خوێندەوە.[٧٣]

ئیمـەری نیف شپنگلەری بە «پیـاوە مەزنـەکـە» ناوبـردووە.[٧٤] کتێبـەکـەشی بە جۆرێـك ڕێـزی لێ گیـراوە کە لە ڕۆژ اوادا بە مەزن ترین کتێبی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم داندراوە.[٧٥]

وەرگێـری کتێبـەکـەش بۆ زمـانی عەرەبی دەڵێ: ئەم کتێبـە ناخـوێنـدرێتـەوە بەڵکـو بە دەرس دەخـوێنـدرێ. وە بە دڵنیایی یەوە دەڵـێ: کاتـی ئەوە هات خوێنـەری عەرەب لە خوێنـدنـەوەی بۆ رابـواردنـەوە بگـوێزێتەوە خوێندنەوە بۆ خۆ ڕوشنبیرکردن، کتێبەکەی شپنگلەریش یەکـەم تەقـەلـلایـەکـە کتێبخـانـەی عەرەبی دیـاریی کەلـەپـوورێکی نەمـری مرۆڤـایـەتیی لەم سەنگـە پێش کێش بە خوێنەران بکات.[٧٦]

بەڵگـەی ڕادە بەرزیی بیـری شپنگلەرو کاریگەریی ماوە دووری ئەوە بەسـە کە کاری لە داڕشتنی بیـری سێ بیـرکـەرەوەی مەزنی چەرخی نوێ لە ئەورووپـاو ئەمـریکای دوای شەڕی جیهانی کردووە کە هەر خەریکی لێکـۆڵینـەوەی کردوون دەربـارەی چارەنـووسی شارستـانـەتیی ڕۆژ اواو تەنگـوچـەڵـمـەی هاوچەرخی ئەورووپا، لە وێنـەی بیـرکـەرەوەی ئینگلیـز کولن ویلسـون[٧٧] و فەیلەسـووفی ئەمـریکایی بنەچە ئەڵمان هەربەرت مارکوز. .[٧٨] ڕەنگبێ ئەرنولد توێنبیش دواکەسیان نەبێت.[٧٩]

شپنگلەر بەهـۆی بیـروڕاکـانی یـەوە، تووشی گێچەڵێکی زۆر هات، بەتـایبـەتی کە نازی یـەکـان لە ئەلمـانیـا هاتنە سەر تەخت، ئەوان لە جۆری ئەم بیـرانـەی ڕازی نەبـوون. تا ساڵی ١٩٣٦ بە بێ کەسی و دڵ بە خەم لە میونیخ مرد.

## تەوەرەی پێنجەم: ڕەخنە لە بیرەکانی شپنگلەر

کولجـوود دەڵێ: ئەو تەقـدیـرەی شپنگلەر بۆ مێـژ ووی دادەنێ تەقـدیـرێکـە بەرهـەڵستی سروشتی مێـژ ووخۆیـەتی، چونکـە تەقـدیـرێکـە پاڵ دەدا بە فەلسـەفـەیـەکی سروشتیانەی ڕووت. . هەروەکـو ئەوە کە بەرودواهـاتنی ئەو قۆناغانەی کە لە ڕۆشنبیری یەك لەو ڕۆشنبیـریـانـەدا هەیـە بەو شێوەیەی ئەو بۆی دەچێ، مانایەك لە مانـاکـانی مێـژ ووی زیـاتـر لەوەی تێدا نی یـە کە بەرودوا هاتنی قۆنـاغـەکـانی ژیانی زیندەوەرێکی وەکو مێشوولە ڕێك دەخات واتا کرمـۆکـە، مت بوو، پێ کـوڕە ئەوجـا زینـدەوەری پێگەیشتوو. هەر قۆنـاغێکیش لەو قۆنـاغانەی ڕۆشنبیری لێ پێك دێ، بە ڕێگەیەکی میکـانیکی دەگوێزێتەوە قۆناغەکەی دوای خۆی، ئەگەر هاتوو کاتی خۆی هات بەبێ بایەخ دان بە چالاکی ئەو کەسانەی تێیدا دەژ ین.[٨٠]

لەسـەر بنـاغـەی ئەم قسـەیەی باس کرا ژمارەیەك فەیلەسوف و بیـرکـەرەوە توهمـەتی ڕێبازگیریی (المذهبية) (دوگماتی ـ دابڕین ـ چەسپـاوی) دەخـەنـەپـاڵ، هەربۆیە ئەرنولد توینبی مێژ وونووسی بەنـاوبانگی ئینگلیز دەڵێ: شپنگلەر زیاد لە پێویست ڕێبازگیر بوو،

بەبێ گێرانەوە باوەڕی بە حەتمیەت هەبوو. [٨١]

کولنجـوود لای‌وایـە، کە شپنگلەری بار قورسی ڕۆشنبیـری، سەیـردەکـەیت بۆ خاتـری گونجـان لەگـەڵ مەبـەستی ئەو بیرەی کە دەیـەوێ میـژ وو بە زانسـتـە سروشتی یـەکـان رابگـەیـەنێت ڕۆشنبیـری‌یەکەی دەشێوێ و دەستکاری دەکرێت. ئێجگار دڵرەقانە پێـی دەڵـێ: هەڵگـەرانـەوەی «تـا ئەو رادەیـە پێ هـەڵبـرین لە هەڵگـەرانـەوەی راستی‌دا کەس نەی‌گـەیشتـووەتێ، تەنـانـەت بیـرکـەرەوەکـانی چەرخی نۆزدەمینیش کە بە دوو بەرنـامـەی دانـان (المنهـاج الـوضعي) کەوتبـوون، کە زۆر رەنجی بێ بـەریـان دا بۆ گۆڕینی میژ وو بە زانستێکی سروشتی. [٨٢]

گۆڕیـنـی میـژ ووش بە زانـسـت، بەو ڕشـتـەیـەی شپنگلەر ویستـویـەتی، وادەکات شارستانەتی‌یەك هەرگیز نەتوانێ خۆی لە چارەنـووسی وەك رووخـان و نەمانی شارستانەتی‌یەکانی دی بە دور بگـرێـت، گوایـا چونکـە ئەم چارەنـووسـە، سروشـتـێـکـی شارستانەتی‌یەکانە. ئەمەش مانای وایە کە چار نی‌یەو بە شێوەیەکی لە چارەنـووسـراوی بێ سێ‌ودوو کردن دەبێ رووداوو راگـوێـزان لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێك بەرودوا بێن. «چونکە رێی دەربازبوون نی‌یـە.» [٨٣] هەروەهـا شپـنـگلەر لە توانـای رەگـەزی مرۆڤ بۆ رزگارکردنی شارستانەتی ـ هەر شارستانەتی‌یەك بێت ـ لە رووخان، بەگومانە. [٨٤]

خۆ ئەگـەر ویستمـان ئەم بیـردۆزەیە لە شێوەیەکی مام ناوەندی‌دا سەیـربکـەین و تێی بگەین، بەدەست خۆمان نی‌یە دەبێ بیڵێین کە شپنگلەر خولی شارستـانـەتی بە خولی ژیـانی بوونـەوەری زینـدوو دەشـوبهێنێ ئەوەنـدە سەردەکـات کە لەگـەڵ پرۆگـرامی زانستی‌دا رێـك ناکـەوێت چونکـە «بـوونـەوەری زینـدوو پاش ئەوەی لەشی دەگـاتـە پلەیـەکی تایبـەتی پێ گـەیشتن دەمـرێ بەڵام گەلان یان کۆمەڵان لەگەڵ هاتنە دنیای هەر نەوەیەك دا لاوێتی‌یان نوێ‌دەبێتەوە. [٨٥] ئیتر شایانی ئەوە نی‌یە ئەگەر لە رووی مەجازیکی رووتـەوە نەبێت شارستـانـەتی‌یەك بە پیری وەسف بکرێت، چونکە لێـرە پیـری کە بێ هێـزی و رزینـە لە دیـاردە کۆمـەڵایـەتی و سیاسی‌یەکان دا لە پیربوونی ئەندامی (العضوية)ی زیندوان زۆر جیایە.

دوو لێکـۆڵـەرەوە «کـاروبر» و «سوروکین» زۆر بە روونی و بێ لە گومـان پیشانیان داوە کە زۆر رژیمە شارستانەتی یان کۆمەڵایەتی لە زۆر شارسـتـانـەتی مەزن دا ڕووی‌داوە لەدایـك بوون پاشـان مردوون، جارێکی کەش لەدایـك بوون و پاشـان مردوون، ئەم شارستـانـەتیـانـەش «لـە ڕووی کۆمـەڵایەتی و فیکری و سیاسی‌یەوە هەڵکشـاون، پاشـان لە ژیـانی بێ‌رادە درێـژ یـان دا زۆر جار دانەویون، وەنەبێ هەر یەك جاریش لەدایك بوون و مردنیان تووش بوویێت، وەنـەبێ هەر ماوەیـەکیش تەنیـا گەشـانـەوەو یەك ماوەش سیسی و ئاوابوونیان تێ‌دا بێت. [٨٦]

هەروەهـا زۆر میژ وونووسی رۆژاوایی دەربارەی ئەو پێش بینی‌یە رەشـەی شپنگلەر بەرامبـەر رووخـانی رۆژاواو تێـك هەڵـوەشـانی شارستـانـەتی یـەکـەی هەیـەتی کە گوایا چونکە بەهۆی مادییەت و میکـانیکی یـەوە زینـدوویـەتی ون کردووەو پێی نـاوەتـە کۆری خۆش رابـواردنی مادییـانـەو نەرمونیانی ژیری و چارنی‌یە دوای ئەمە نەمـانی تووش دەبێت، لەسەر ئەوە رەخنەیان لێ‌گرتووە. سەرباری ئەوە کە میـژ وو بواری سەربـەستی مرۆڤـانەیەو وەکو سروشت نی‌یە دیاردەکانی حەتمی و داسەپاو بن، بۆیە پێش بینی‌کەران (المتنبئين) لەناو لێکۆڵەرەوانی میژ وودا جێ‌یان نابێتەوە. [٨٧]

هەنـدێ لەو بیـرکـەرەوانەی رەخنە لە شپنگلەر دەگرن لایان وایە تێـروانینی بۆ جیهـان گەلێـك لە تێـروانینی مکیـافیللی یـەکان پر لە کارەسـات ترە، چونکە مرۆڤایەتی لە هەموو دوارۆژێك دادەبرێت و بێ‌واتـایی «بێ‌هـوودەیی»ی دیـاردەخـات کاتێـك کە میـژ وو بە گەردوون دەبـەستێ. [٨٨] بەڵکـو هەنـدێکی دی رەخنـەکـەیـان لە شپنگلەر دەگـەیـەنـنـە رادەی هێـرشێکی رووت و دەڵێن بیروراکانی شپنگلەر بانگی «نا هیوایی» دەدەن. [٨٩]

هەرچـۆنێـك بێت، بیـروراکـانی شپنگلەر، سەرەرای مەودای فەلسـەفـەییـانـەیـان، لە ئەنجـامـدا لە ئاشی بیـری کۆنـەپـەرستی دەکـەنـەوەو دان نانێن بە دەوری شارستـانـەتی یـەکـانی تر لە گەشەسەندنی رەوتی شارستانەتی مرۆڤایەتی‌دا، کە ئەمەش دوورە لە واقـعـی بەردەسـت و دوورە لە مەنـتـیـق و لە بەڵگـە چەسپـاوە میـژ وویی یـەکـان. هەر بۆیـەش بوو بیـروراکـانی بوونـە هۆیەکی یاریـدەری دەرکـەوتنی بیـری نازییـەت لە ئەڵمـانیـا، ئەگـەرچی شپنگلەر، شەخسـی خۆی دژی نازییەت وەستاو لە کتێبی «ساڵانی بریاردان»دا (میونیخ ١٩٣٣) رەخنەشی لێ‌گرت.

بیـری شپنگلەر وەکـو ئەنجـامی شارستـانـەتی‌یـەکـانی خۆی کۆتـایی یـەکی دڵتـەزێنـانـەی هەبـوو، کەوا وای‌دانـا لە میژ وودا نە راستی و نە داهێنانەکان هیچیان نا بەڵکو خواستی هێز سەردەکەوێ. لای ئەو دەوری تەکنەلوجیاو ئابووری لە پلەی دووەم دا دێن.

هەرچی مرۆڤیشــە بەوپێیــە کە بەرهــەم هێنــە «بــەرهــەمی بەرهــەمــەکــەیەتی» ئەوا فڕێ دراوەتە دەرەوەی مێژ وو. ئەگەر مرۆڤ هەر نرخێکی هەبێ ئەو نرخــە لە خانــەدانــەکــان (ئــەرستــوکــراتیی کۆمــەڵ) واتــە هەڵبــژاردەکــان دا هەیە نەك لە جەماوەردا. لای وایە کاتێـك خانـەدانی تەمێنێ و جەمـاوەر سەربکەوێ مانای وایە مێژ وو کۆتـایی دێت و مرۆڤـایـەتی لە بێدەنگی و بێ ئـاگـایی و لە نەبوون دا نوقم دەبێت. بۆیە شپنگلەر بە ئەیدیولوجیی پاشگەزی کۆپەرستانەو دوژمنایەتیی زانستی یەوە پەیوەندیدار بوو.

## پەراوێز:

(١) ئوزوالــد شپــنگلەر Oswald SpengLer (١٨٨٠ ـ ١٩٣٦) لە شاری بلا کنبــورگە هاتــوەتــە دنیاوەو لە قوتابخانەی (هال) خوێندوویەتی، پاشان چووەتە زانکــۆی بەرلین و زانســتــەکــانی سروشتی خوێنــد. دوایی چووە زانکــۆی (میــونیــخ)و جارێکی دی گەڕایــەوە بەرلین، پاشــان بە یەکجــاری لە میــونیــخ دانیشت و ژیـانی خۆی بە لێکـۆڵینـەوەو رامـان بەســەر بـرد، تا گۆشەگیر و سەر بەستانە ساڵی ١٩٣٦ مرد.

شپنگلەر فەیلەســوفێکی ئەڵمـانییـە لە خوێنـدن دا ماتمـاتیـك و مێـژووی سروشتی و هونـەر و فەلســەفـەو مێـژووی کۆکـردوەتەوە. کۆمەڵێك کتێبی داناوە بەتـایبەتی دەربارەی مێژووی ئەلمانیا. سـاڵی ١٩٠٤ پلەی دکتۆریی وەرگرت، نامــەی دکتــۆراکــەی دەربــارەی (هیــرکلیتس)ی فەیلەســوفی یۆنـانی بوو بە ناوبانگترین کتێبەکانی کتێبێکە بەناوی «ئاوابوونی رۆژاوا Der Untergang des AbendLandes أحمـد الشيــاني ئەم کتێبەی بەناوی تدهور الحضارة الغربيەوە بەدوو بەش بە زمانی عەرەبی لە بیروت بڵاوکردوتەوە.

(٢) د. عفت محمد الشرقاوي، ادب التاريخ عند العرب، دار النهضة العربية بيروت ١٩٧٣، ل٨٠

(٣) ر.ج كولنجــوود، فكـرة التـاريخ. ترجمة محمد بكير خليل، ط٢. لجنة التاليف والترجمة والنشر، القاهرة ١٩٦٨ ل٣٢٠.

(٤) هەر ئەو سەرچاوەیە. ل: ٣٢٣

(٥) كولن ويلســون، سقــوط الحضــارة. ترجمـة أنيـس زكي حسن. طبعة دار الأداب، بيروت ١٩٧١ ط٢، ل١٢٩

(٦) دەست نیشــان کردنی کوپــرنیکــوس Copernicus ی زانــای گەردووناسی گەورەی پۆلـۆنیـیە ١٤٧٢ ـ ١٥٤٣ کە بیــردۆزەی بەتلیمـوسی پووچ کردەوە، ئەوەی دەیگــوت زەوی ناوەنـدی گەردوونـە. ئیتـر ئەو بیــردۆزەیــەی زۆر رای بەڵگــەنــەویــستی لە مێــشکی خەڵــك و زانـاکـان چەسپــاوی گۆڕی، ناوی ئەم زانـایــەش بوو بە نیشــانــەی تەقــەڵــلای چاوگێـرانــەوە بە بیــر وتێگەیشتنی باوداو گومان کردن لە ڕاستی یان.

(٧) د. الشرقاوي، ل: ٨٠ لەم کتێبەوە:

The EneycLopedia of phiLosphy, N.Y.1967, V.II, P.528

(٨) کتێبی «تدهور الحضارة الغربية» بەشی یەکەم، ل: ٦٠

(٩) د. احمــد محمــد صبحي، في فلسفـة التاريخ، مؤسسة الثقافة الجامعية. الاسكندرية، ١٩٧٥، ل: ٢٤٦

(١٠) د. عبــدالـرحمن بدوي، اشپنجلر، منشورات مكتبة النهضة المصرية. مطبعة الرسالة، چاپی دووەم. قاهرة ١٩٤٥، ل: ٣٧

(١١) شنبجلر. تدهور الحضارة الغربية. بەشی یەکەم، ل: ٦٠

(١٢) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل: ٦١

(١٣) هەر ئەو سەرچاوەو ئەو لاپەڕەیە.

(١٤) هـ. س. ل.

(١٥) دەربــارەی بیــر و فەلســەفـەی ئەم چەرخە بڕوانە: جورج پوليتزر، فلسفة الأنوار، ترجمة جورج طرابيشي، چاپی دار الطليعة. بيروت ١٩٧٤.
د. مصطفى ابو حنيف أحمد. منهج البحث التاريخي بين الماضي والحاضر. چاپی دار البيضاء. المغرب ـ ١٩٨٧، ل: ١٠٣ كولنجوود، فكرة التاريخ ل: ١٤٨ ـ ١٥٦
گۆڤاری (عالم الفكر). کوەیت. مجلد (٥)، ژمارە (١) ل: ٧٤ ـ ٧٥، ١٣٠
گۆڤاری (المنار)، پاریس. ژمارە (٢٤ ـ ٢٥) ١٩٨٧، ل ٣٤ ـ ١٤٧ هەروەها بەم چەرخەش دەڵێن چەرخی ژیری. Age of Reason

(١٦) لەبابەت بیری (پێشکەوتن)ەوە سەرچاوە زۆرە لەوانە:
د. حسين مؤنس ـ الحضارة. ل: ٢٧٥
د. الشرقاوي ـ أدب التاريخ. ل: ١٧٥
د. عبدالجليل الطاهر ـ مسيرة المجتمع ل ١٣٧ ـ ١٦٨
ألبــرت شفـاتيـزر «شفيتسر» ـ فلسفة الحضارة، ترجمة د. عبدالرحمن بدوي، بەندەکانی: ٧، ١٢، ١٣، ١٤.
جۆرج بليخـانـوف، محاضرات في فلسفة التاريخ. ترجمة جورج طرابيشي، دار الطليعة، بيروت، ١٩٧٣، المحاضرة الاولى.
عبدالحميد صديقي، تفسير التاريخ، ل: ٧٦

(١٧) كولن ويلسن، سقوط الحضارة، ل١٢٩٠

(١٨) د. بدوي، اشپنجلر، ل: ٧١

(١٩) د. عفت الشرقاوي، في فلسفة الحضارة الاسلامية. دار النهضة العربية، بيروت، ط٣، ١٩٨١، ل: ١٩٦

(٢٠) هەر ئەم سەرچاوەیە، ل: ١٧٩ ـ ١٨٤

(٢١) زاراوەی «شێــوە وەرگــرتنی درۆزنـانـە» واتا (التشكل الكاذب) لە زانستی کانەکـانـەوە خواستراوەتەوە، جاری وا هەیە بلووری کانێك لە چینێکی بەردا دەبێ، پاشــان وا دەبێ ئەم چینــەی بەردە درز و کەلێنی تێدا پەیـدادەبێت ئاوی تێدەچێت، ئاوەکە بلوورەکـان هەڵ دەکـوڵێ تا هیچی وایان لێ نامێنێتەوە تەنیا دیمــەنێکی کلۆر نـەبێت، پاشــان ئەگــەر چەنـد دیـاردەیـەکی بورکـانی پەیدابوو قەوارەی چیــاکــە بگــۆڕن، تۆپەڵی شل بووەوە دێن و لە چینــەکـانی بەردەکـە دەچنــەژوور؛ پاشــان لە ناویـان دا دەمـەیین و رەق دەبن.. بەڵام ئەم تۆپـەڵـە

شل بۆوانــه به گوێــرەی شێوەی سروشتی بلوورەکـانیـان رەق نابن و نابن به بلوور، بەڵکـو ناچـار دەبن شێـوە کلۆر و بەتاڵەکانی ناو بەردەکە ـ ئەوەی بلوورە کۆنـەکان بەهۆی کاری ئاوەکەوە دروستیان کردووە ـ پڕ بکەنەوە، ئەوسا شێوەی درۆزنـــانــه پەیـدادەبن کە ئەو بلوورە تازانـەن کە پێکهـاتنی ناوەوەیـان لەگـەڵ پەیکەری دەرەوەیان دا ناکۆکە.

د. بدوی. اشپنجلر، ل:١٠٣

بۆ زیـادە زانیاری بڕوانە کتێبەکەی شپنگلەر، تدهور الحضارة. بەندی (١٨). بەشی دووەم، ل٢٦٩

(٢٢) د. الشرقاوي، ل: ١٩٥ ـ ١٩٦

(٢٣) تدهور الحضارة، بەشی ١، ل٢١٧٠

(٢٤) د. الشرقاوي، في فلسفة الحضارة، ل: ٢٠١

(٢٥) هـ. س.، ل: ١٩٨

(٢٦) د. صبحي، في فلسفة التاريخ، ل: ٢٤٤

(٢٧) تدهور الحضارة، جـ١، ل: ٢٨

(٢٨) د. صبحي، ٢٤٤

(٢٩) هـ. س: ٢٥٤

(٣٠) له بابـەت چەوسـانـدنـەوەی مەسیحیەکان لەلایەن رۆمە بێزەنتی‌یەکانەوەو دەربارەی ئەم دوو رێبازە مەسیحی‌یە بڕوانە:

د. أدمون رباط، المسيحيون في الشرق قبل الاسلام، بيروت ١٩٨١ وفكتور سحـاب، من يحمي المسيحيين العـرب؟ دار الوحدة للطباعة والنشر. بيروت ١٩٨١، ل١١ ـ ١٨، ٨٠ ـ ١٠٤

(٣١) کاتێـك کە شارستـانـەتیی ئەوروپـا دنیـای تازەی گرت، شارستـانـەتیی مەکسیکی لە لانـك دا نەبـوو، بەڵکـو لەو شارستـانەتیانە دەژمێردرا کە لە چەند سەدەیـەکـەوە کۆتاییان هاتووە، لەوانەیە ئەوەندە زانینە کەمەی ئەوروپایی‌یەکان لەبـابـەت شارستـانـەتیی مەکسیکـەوە هەیان بووە ئەو سەردەمە وای لە شپنگلەر کردووە وا بزانێت شارستـانـەتی‌یـەکـە ئەو رۆژانـە لە سـەردەمی سـەرهـەڵدانی‌دا بووە. (دانەر).

(٣٢) لەم بابـەتـەوە بڕوانە کتێبی: علي القريشي، بين الحضارة والمدنية، دار المعارف. بيروت ١٩٧٧، هەروەها بڕوانە شپنگلەر، تدهور الحضارة ١.٠ ل: ٨٧

(٣٣) د. بدوي: اشپنجلر، ل: ٧٤

(٣٤) د. صبحي، ل: ٢٥٦

(٣٥) د. بدوي، ل: ٧٥

(٣٦) د. الظاهر، مسيرة المجتمع، ل: ٢٣٨

(٣٧) د. صبحي، ل: ٢٥٧

(٣٨) د. الظاهر، ل: ٢٣٨٧

(٣٩) هـ. ي. ل.

(٤٠) د. مؤنس، الحـضـــارة، ل: ٢٤٩، هەر لەم جۆرە قسـەیـەش ئیبـن خەلـدوون گوتـوویـەتی، بڕوانـە پەراوێـزی (٤٩) لەبـاسی «بـەروداواهـاتنی خولەکان ـ التعاقب الدوري».

(٤١) د. صبحي، ل: ٢٤٨

(٤٢) د. الشرقاوي، في فلسفة الحضارة، ل١٩٨

(٤٣) د. صبحي، ل: ٢٤٨

(٤٤) د. بدوي، اشپنجلر، ل: ١٩٨

(٤٥) د. الشرقاوي، في فلسفة الحضارة، ل: ١٩٨ ـ ١٩٩

(٤٦) هـ. ي. ل.

(٤٧) د. صبحي ل: ٢٤٩

(٤٨) د. حسن عثمان، پروگرامی لێکۆڵینەوەی مێژوو، ط ١٩٨٤، ل: ٤٣

(٤٩) د. صبحي، ل: ٣٥١

(٥٠) هـ. ي. ل: ٢٤٩

(٥١) د. بدوي، ل: ١٩٩

(٥٢) سۆفسـەتایی: رێچکەیەکی فەلسـەفەی بەناوبانگی یۆنانی‌یە، گۆڕا و بوو بە رێچکەیەکی قازانجی ناپاکژ. بڕوانە: الموسوعة الفلسفية المختصرة).

(٥٣) د. صبحي، ل: ٢٥٠
بڕوانە د. الطاهر، مسيرة المجتمع، ل: ٢٣٨

(٥٤) د. بدوي، اشپنجلر، ل: ٧٨

(٥٥) هـ. س. ل: ٧٩

(٥٦) رەواقی: رێـبازێکی فەلسـەفەی بەرەسەن یۆنانی‌یە زینون Zenon دایناوە، بریـتی‌یــە لەوە کە مرۆڤ دەتـوانێ بەهـۆی مایـەداری‌یـەوە واتـا (فضيلة) دەستبـەرداری هەمـوو شتێـك بێت، دانـا بە گونجـاوی لەگـەڵ سروشت دا سەربـەست و سەربـەخۆیـانـە ژیـانی خۆی بەسـەردەبات، سامان و جوانی‌و ناوبانگە لای مرۆڤی (مایەدار) بوون و نەبوونیان یەکە وەك یەکی لێ‌دێت.

د. عادل البكري. الفلسفة لكل الناس، ص٤٢

د. عرفان عبدالحميد، المدخل الى معاني الفلسفة، ص٨٢

(٥٧) د. بدوي، شپنجلر، ص: ٧٥ ـ ٨٩.

د. صبحي، ص: ٢٥٢

(٥٨) تدهور الحضارة الغربية، الفصل الأول، جـ ١ص: ١٢١ - ١٩١
(٥٩) كولن ويلسون، سقوط الحضارة، ص: ١٢٩
(٦٠) د. بدوي، اشپنجلر، ص: ٧٨

(٦١) شەری بۆلینیزی: ئەو شەرە لەنێوان هەردوو شاری ئەتینـاو ئەسپـارتەی یۆنـانیدا لەمـاوەی ٤٣١ - ٤٠٤ پێش زایین ڕوویدا، بە سەرکەوتنی ئەسپارتەو بەزینی ئەتیناو ڕژێمە دیموکراتی‌یەکەی دوایی‌هات.

(٦٢) د. صبحي، ل: ٢٥٢
(٦٣) د. بدوي، اشپنجلر: ل: ٩١ - ٩٢

(٦٤) د. صبحي، ل: ٢٥٠
(٦٥) د. بدوي، ل: ٩٣
(٦٦) دەربارەی ئەو کڵێسەو ڕێبازانە بڕوانە: د. أدمون رباط، المسيحيون في الشرق قبل الاسلام.
(٦٧) بڕوانـە: د. بدوي: ارسطو عند العرب. وكالة المنطبوعات، الكويت، دار القلم، بيروت.

(٦٨) د. صبحي، ٢٤٧
(٦٩) د. بدوي، ٩٤
(٧٠) هـ. س. ل: ٩٥
(٧١) هـ. س. ل: ٢٠٠
(٧٢) بۆ نمـوونـە بڕوانـە: هـ. أ. مـارو، من المعـرفـة التـاريخيـة ترجمه الى العربية: جمال بدران، مراجعة د. زكريا ابراهيم. القاهرة ١٩٧١
- د. مـومجـان، نقـد الفكـر البـرجوازي المعاصر ترجمة: يوسف عبدالمسيح ثروة. منشورات وزارة الثقافة والفنون. بغداد ١٩٧٩.
- سيمون دی بوفوار، واقع الفكر.
دار الطليعة، بيروت ١٩٦٣
- د. مصطفى ابو ضيف أحمد، منهج البحث التاريخي الدار البيضاء، ١٩٨٧
- ايمری نف، المؤرخون وروح الشعر.
سەرچاوەی تریش.
(٧٣) د. مؤنس، التاريخ والمؤرخون، مجلة عالم الفكر. ژمارەی باسکراوە ل: ١٠٣
كولنجوود، فكرة التاريخ، ل: ٣٢٠
(٧٤) ايمری‌نف، ص: ٢٦٩
(٧٥) مقدمة «تدهور الحضارة الفربية» ل: ٧
(٧٦) هەمان سەرچاوە: ل: ٨
د. بدوي، اشپنجلر.

(٧٧) کتێبەکەی «ئاوابوونی شارستانەتی» باسکراو.

(٧٨) کتێبـەکـەی «مـرۆڤی یەك ڕەهەند»، وەرگێڕانی بۆعەرەبی: جۆرج طرابیشی بەناوی (الانسـان ذو البعد الواحد) چاپی دار الآداب. بيروت ١٩٦٩ هەروەها کتێبەکەی «ژیری و شۆڕش» کە د. فؤاد زکریا بەناوی «العقل والثورة» کردوویە بە عەرەبی، الهيئة المصرية العامة للتأليف والنشر. بيروت ١٩٧٠

(٧٩) د. صبحي، ل: ٢٥٨
(٨٠) كولنجوود، ل: ٣٢٢

(٨١) د. صبحي، ل: ٢٦١
(٨٢) كولنجوود، ل: ٣٢٣

(٨٣) كولن ويلسون، ل: ١٤١

(٨٤) ايمـری نف، المؤرخـون و روح الشعر، وەرگێڕانی بۆعەرەبی د. توفيق اسکندر. طبعة مكتبة الانجلو مصرية القاهرة: ١٩٦١، ل: ٢٧٢

(٨٥) د. حسن مؤنس، التاريخ والمؤرخون
عالم الفكر. الكويت، ل: ١٠٣

(٨٦) د. صديقي، ل: ١٧٢
(٨٧) د. الشرقاوي، في فلسفة الحضارة، ل: ٢٠٣

د. مصطفى ابو ضيف، منهج البحث التاريخي، ل: ١٢٣
د. مؤنس، التاريخ والمؤرخون، ل: ١٠٤

(٨٨) سيمون دي بوڤوار. واقع الفكر اليميني. دار الطليعة. بيروت، ١٩٦٣، ل: ٥٥

(٨٩) هـ. أ. مـارو. من المعـرفـة التـاريخيـة ترجمـة: جمال بدران، مراجعة د. زكريا إبراهيم القاهرة ١٩٧١، ل: ٥٦

د. مـومجـان. نقـد الفكـر البـرجوازي المعاصر. ترجمة: يوسف عبدالمسيح ثروة. دار الحرية للطباعة بغداد، ١٩٧٩

د. عبدالجليل الطاهر، مسيرة المجتمع. ل: ٢٤٠

# الفلسفة الطبيعية في تفسير التاريخ الخاصية الأحيائية للحضارات عند شپنگلر

د. محسن محمد حسين
قسم التاريخ كلية التربيةالاولى (ابن رشد)
جامعة بغداد

يتناول موضوع البحث مكانة فيلسوف التاريخ البارز «اوزوالد شپنگلر OswaLd Spengler» والبصمات الفكرية التى تركها في توجهات العديد من مفكري العصر، ولاسيما في الغرب.

ويبدأ بشرح تصوره الخاص في نشأة الحضارات وانهاكها ثم هلاكها وقد ظهرت افكار هذا الفيلسوف الالماني في كتابه الشهير (تدهور الحضارة الغربية The Dechine of the West) وقد قسم الكاتب البحث الى خمسة محاور، تحدث في الاول منها موقف شپنگلر من آراء جملة من مؤرخي وفلاسفة التاريخ في اوروپا، ومحاولته دحض تلك الآراء والرد عليها. بينها دعوته الى قيام ثورة كوبرنيكية (نسبة الى كوبرنيكس) في اذهان مفكرى الغرب لكي يكفوا عن اعتبار حضارتهم مركزا لحضارات الكون وأسماها، وطالبهم بالتخلي عن الاستهانة بحضارات الغير.

وكذلك نبذ ما أسماه بالتقويم الاوربي، اي تقسيم تاريخ العالم بما ينسجم مع التقسيم الاوروبي، اي الى عصور قديمة ووسيطة وعصور حديثة بنفس التسميات والتواريخ الاوربية. وكذلك دعا الى دحض فكرة (التقدم) اللامتناهي التي آمن بها مفكرو عصر الانوار «التنوير» في القرن الثامن عشر، ولاسيما في فرنسا. وتصور شپنگلر الحضارات انها دورات او حلقات مستقلة بعضها عن الآخر. وأخيراً فند فكرة التأثير والتأثر «الاخذ والعطاء» بين الحضارات واعتبرها وهماً، ولااساس لها.

وفي المحور الثاني يتحدث الموضوع عن نظرية شپنگلر في الحضارات ويوضح جملة مسائل بينها اولاً: كيف نشأت (اوتنشأ) الحضارات، ولاسيما لحظة تفتقها، ثم حالات ميلاد الحضارات ثانياً: سقوط الحضارات، وهل يتحتم ان تسقط كافة الحضارات؟ والا يمكن الحيلولة دون انهيار صرح بذلت الانسانية جهوداً مضنية لأقامته؟ ولم هذا المصير الحزين؟. ويرى شپنگلر ان حضارة الغرب بدأت بخطوة التدهور فعلاً، وسوف تتلاشى حتماً، بعد بعض العقود، رغم بريقها الوهاج الحالي الذي سرعان ما ينطفىء.

والمحور الثالث يلقي الضوء على طبيعة الحضارات ـ كل الحضارات ـ كما يراها شپنگلر، اومايسمى بالمظاهر التي تشترك فيها الحضارات، وهي:

اولاً: رموز اوسمات الحضارة، اي ان لكل حضارة خاصية معينة تجسدت في نتاج فني اوفكري خاص بها.

ثانياً: فصول الحضارات: ان لكل حضارة فصولها، فتبدأ من الربيع وتصعد مع الصيف، وتنضج معالمها مع الخريف، ثم يتوقف عطاؤها مع بداية الشتاء وتنتهي.

ثالثاً: تعاصر الحضارات فلسفياً: اي ان الحضارات في صيرورتها تتعاصر او تتناظر طبيعتها، عبر توازي نتاجاتها المادية والفكرية، لأن جميع الحضارات تجتاز مراحل متشابهة متناظرة، وتتكرر فيها الصور والاوضاع والموقف، حسب مايرى.

وفي المحور الرابع: يوضح البحث مكانة افكار شپنگلر، وتأثيرها على تشكيل افكار العديدين. واخيراً يبين الانتقادات التي وجهت الى افكار هذا الفيلسوف الكبير.

# شاری کۆیە لە پایزی ساڵی "١٩٣٥"دا

● نووسینی: حوزنی موکریانی ● ● ئامادەکردنی: د. کوردستانی موکریانی ●

## پێشەکی

لە ژمارە (١٢٠)ی کۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)ی خۆشەویست دا بابەتێکی گرنگی مامۆستا حوزنی موکریانیم بڵاوکردەوە، کە سەبارەت بە شاری سلێمانی بوو لە ساڵی ١٩٣٤دا.

بابەتی ئەم جارە دەربارەی شاری ئەنجیلانەی کۆیەیە، کە مامۆستا حوزنی لە سەرەتای پایزی ساڵی ١٩٣٥دا رووی تێکردووەو گەلێك باسی جۆراوجۆرو بە پێزی لە بارەی هونەری بیناکاری، باخ و کارێزو کانیو رێگاو بان و تەکیەو مزگەوتی ئەوسای کۆیەی تێدا تۆمار کردووە، هەروا چەشنی هەڵس و کەوت و جل وبەرگ و چەند بارێکی دیی کۆمەڵایەتی خستۆتە روو.

لەو شاعیرە ناودارانەی ئەوسا، کە لە کۆیەدا مامۆستا حوزنی چاوی پێکەوتوون و گفت وگۆی لەگەڵ دا کردوون مامۆستا مەلا مستەفا حاسی بووە، کە لە کۆتایی ئەم بابەتەدا بەسەرهات و چەند نموونەیەك لە هۆنراوەکانی، کە مامۆستا حوزنی لە خۆی وەرگرتووە نووسیومەتەوە.

ئەو پەڕاوەی ئەم باسانەی کۆیی تێدا تۆمارکراوە پەڕپەڕ بووەو زەرد هەڵگەراوەو بەزەحمەت توانیم بابەتەکانی رێك بخەم، دەستنووسەکە لە نووسینی مامۆستا حوزنی نەمرەو وا دیارە هەر وەکو کەرەستەیەك بووە بۆ پرۆژەیەکی گەورەتر ، بەڵام باری ناهەمواری مامۆستا حوزنی هیچ کاتێك یارمەتیدەر نەبووە، بۆ ئەوەی پێیدا بچێتەوەو چاپی بکات. بابەتەکە بە مەرەکەبی شین نووسراوەتەوە، بۆیە زۆر وشەی بە جۆرێك کاڵ بۆتەوە ناخوێندرێتەوە و هەر وشەیەکی بۆم ساخ نەبۆتەوە نیشانەی (؟) بۆ داناوە.

لەبەر گرنگی باسەکانی بابەتەکە نەمەویست ئەم دەستنووسە تەمەن پەنجاو چوار ساڵە کۆنتر بێت و زیاتر نەخوێندرێتەوە، بۆیە بەبێ دەسکاری بەرێنووسی ئەمرۆم نووسیوەو باسەکانیم

رێك خست و ئامادەی بڵاوكردنەوەم كرد بەو هیوایەی كەلێنێك لە هێندیك لایەنی بواری رۆشنبیری كۆیەی خۆشەویست پڕ بكاتەوە .

كوردستان

## كۆیی سنجاق

شاری كۆیێ شارێكی زۆر كۆنەو بەناوبانگە جێگەیەكی زۆر خۆشەو بەئاو و باخچەو میوەیە لەنێوانی كێوی هەیبەت سولتان و كێوی باواجی‌دا هەڵكەوتووە . پێشی روو بەدەشتەو زۆر خۆشەو كووچەو كۆڵانی باشی هەیەو دیواری خانووەكانی پتر بە بەردو گەچ لەسەر دەستووری جوان دامەزراندراوە ، لە تەرزی دیوارو خانوویدا زۆر وە كەركووك دەچێت ، نێو ماڵ و حەوش و دەرگاو بانیان و رەوشتی ناوخۆو دەستووری ژوورو دیوەكانیان گەلێك لە سابلاغی موكری دەكەوێتە بەرچاوان .

خانوویەرەكانی گەلێك خۆشن ، حەوش و بانیان زۆر جوان و دەروازەیان بەرزو ناو دەرگانەیان پان و درێژ و بە سەكۆی‌و دانیشتن و داخەر لەسەر سەكۆكانی ناو دەرگانەكانیا وە رەوشتی سلێمانی دەچێت .

شكلی خواردن و سفرەدانان و بزووتنەوەی مەجلسیان لە سلێمانی نزیكە ، ئەگەر چتێكی وێ نەچووی هەبێ بێ‌دەنگی‌وورد قسەكردنیانە لەسەر خواردن .

ماڵە گەورەكانیان پتری دوو حەوشەیان بەسەر یەكترەوە هەیە یەك بۆ میوانان و دوومیان بۆ ماڵ و منداڵیان ، لە حەوشی دەرەوەدا ، كە هی میوانداری‌یە جێگەی ئەسپی سواری‌و ئاخووری لێ‌یە .

ئەهالی كۆیێ زۆر میوان پەزێرو بەنان و خوانن ، پتر میوانیان رەعیەت و رەنجبەرو كارپەزێرەكانی خۆیان كەم و كورتێك لە عەشایرانی دیش میوانیان دەبێت .

ماڵە گەورەی كۆیێ دوو بنەماڵەی زۆر ناوداریان هەیە ، یەكەمیان حەوێزی‌و دووەمیان غەفوورین . لەو هەردوو بنەماڵە زلە پیاوی زۆر گەورەیان لێ پەیدابوون ، كە لە هاتوودا لێیان دەدوێم ، بە تەرزێكی خۆم دیومەو بنەماڵەی ئەوانم پرسیاركردووە باسیان دەكەم .

كۆیی پازدە مزگەوتی ئاوەدان و سێ مزگەوتی وێران و سێ تەكیەی ئاوەدان و سێی وێرانی ئەمرۆكە تێدایە ، كە لە هاتوودا باسیان دەكەم ، سێ حەمام ودوو قەیسەریی زۆر گەورەو گەلێك دووكان و چای خانەو نادێك و مەكتەبێك و سەرایەكی جوانی حكومەت و پۆستەو تەلەگراف خانەیەك و دایرەی گومرگ و قشلەیەكی زۆر زلی لێ‌یە .

كە من چوومە كۆیێ لە ئاوی حەمامۆكەوە ئاوێكی زۆر خاوێن لە لایەن قایمقام ـ كەریم بەگ رەواندزی دەست پێكراو لە زەمانی صالح زەكی بەگ صاحب قران زادەوە كێشراوەتە نێو شارو بەسەر ماڵان دا بڵاوكراوەتەوە ، لە كەنار شار حەوزێكی زلی چەمەنتۆ بۆ ئاوی بۆریەكان كراوەتە ئەنبارەوە رێگایەكی راست بۆ ئۆتومبیل دروست كراوە .

لە دەرێی شار چاوم بە گەلێك ئاش كەوت ، كە بە ئاوی حەمامۆك دەگەڕاو لە كاردابوون و لەو ئاوەش گەلێك لە باخچەكان ئاودێری دەكران .

شاری كۆیی لە پێش دا شوورەیەكی گەورە دەورەی شاری دابوو ، ئێستە جگە لە بنچینەكەی نەماوە . بۆ شار چوار دەروازە هەبووە ، یەكەمین ـ دەروازەی «گەروە سۆزك» كەوتبووە قیبلەی شار روویە كەركووك بووە . دووەم دەروازەی «ئاشان» ، كە بۆ دۆڵی سماقلوو چووە ، سێیەم ـ «خۆشناو» ، كە بۆ خۆشناوو بتوێن چووە ، چوارەم ـ دەروازەی «قەساب خانە» روو بە سلێمانی بووە .

بە چاوێكی یەكیەتی لێ‌یان وردبینەوە بە تاوی دەستوورو خووی هەستان و دانیشتن و كردەوەیان كوردێكی خاوێن و دڵپاك و گیاندارو زیندوون ، بەڵام لە بەدبەختی میللەت ئەگەرچی زۆر حەز لە ئازادی‌و میللەت پەروەری‌و وەتەن خواهی دەكەن ، لە تەك یەكدی‌دا بەقین و رق و ناقۆلان ئەویش لە غیرەت و نەكێشانە ، هەرچەند نەدەبوو وابن و بۆیەك بوون كورتی‌و كەمی‌یە .

بەرگی پیاوانی كۆیێ دوو تەرزن . پیاوە گەورەكانیان هەروەكو پیاوەكانی سابلاغ و سلێمانی كەوای درێژی سێ ئاتەگ و سەڵتەو عەبایە . پیاوە تازە پێ‌گەیشتووەكانیان و لاوەكانیان ، كە سەر بە دەستووری موكری پشتێنی زل و كەواو كورتەك و موراد خانی‌و سەرو شەدەی زل و خەنجەر بە پشت و (سۆرانی) بەر دراوەوەن .

بەرگی ژنیان لە بەرگی ژنی موكریان نەگۆردراوە ، تەنها ئەمە نەبێ ، كە ژنەكانی موكری پشتێندی زل دەبەستن و كەوێی بچووك بەبەراوەژ ووی ژنانی سلێمانی‌و رەواندزن بەتەواوی شێوەو دەستوریان موكری‌یەو بڵباس .

كۆیێ چوار گەرەگە : ١ ـ بایز ئاغا ، ٢ ـ قەڵات ، ٣ ـ بەفر قەندیل ، ٤ ـ هەواو

ژمارەی نفوسی ئەمرۆ ، كە ٢٨ی مانگی ئەیلول (١٩٣٥) ، ئەمەیە :

| - | ذكور | أناث | هموو |
|---|---|---|---|
| قەزای کۆیێ | ٢٦٥٩ | ٢٧٤٥ | ٥٧٩٧ |
| عەشایر | ٥٧٩٧ | ٥٤٧٩ | ١١٢٧٦ |

قایمقامی کۆیێ محەممەد رامز بەگ کوڕی عەبدوڵلا سافی بەگ بەعقــوبی کەرکــوکی یــە، لە ماڵی ئەومیــوان بووم، گەلێــك بە نەوازش و محترم و زرینگ و زبان خۆش و کردەوە چاك و بێ زەرەرو مەنافع پەروەرم دیت. لەگەڵ خەلکی کۆیێ زۆر هێمن و لەسەرخۆو رەوشت چاك و بە ئیـدارەم بهیستــەوە. چوار شەوی لێ میـوان بووم هەرچــەنــدە لە کردەوەی ورد ئەبــوومــەوە عەیبێــك ویــا بەدخوویی و ناشایستەیکم لێ نەدیبوو.

ئەگــەرچی لەپێش ئەودا کوردێکی خەلکی سلێمــانی، کە ناوی عەبــدولــرەحمــان زەردەواڵــە بووە لە کۆیێ وەکیلی قایمقــام بووە لە حەقی کوردان دا زۆر بەدرەفتــاری‌و ناپــەســەنـدی کردووەو ئەزیەتی کوردپـــەرســت و وریــاکـــانی داوە، کوردەکـــانی تووشی چەنـــد موشکیلات کردووە.

بەڵام محــەممەد رامز بەگ زۆر لەگەڵ کورد خواهەکان دا چاکی‌و بە سەربەستی ئیدارەدەکات کوردەکانی لە هەموو چێك ئازادکردووە.

**مزگەوت و تەکیە و خانەقاکانی کۆیێ)**

ساڵ

١٢٦٠ مزگەوتی گەورە ـ، کە حاجی بەکر ئاغا
حەوێزی کردوویەتی.
١٢٨٠ مزگەوتی حاجی مەلا عمر ـ کوڕی جەرجیس داروغە
دروستی کردووە.
مزگەوتی پەلك ـ فەقێ جەرجیس
مزگەوتی خادم ـ مەلا ئەسعەد خادم السجادە
دروستی کردووە.
مزگەوتی حاجی مەحمود ئاغای غەفوری
مزگەوتی جامی
مزگەوتی منارە
مزگەوتی بایز ئاغا
مزگەوتی موفتی
مزگەوتی قەمیش
مزگەوتی رەشە
مزگەوتی حەتك
مزگەوتی گەرموك
مزگەوتی کونە جومعە
مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد، ئەورەحمان
پاشای بابان دروستی کردووە.

ئەوانە ئەمرۆکە هەموو ئاوەدانن و ئەمانەش هەموو وێرانن:

مزگەوتی بیرۆکە
مزگەوتی قوشخانە
مزگەوتی مەلا عومەر چاوشین
مزگەوتی یاسین ئاغا

تەکیەی ئاوەدان:

تەکیەی شیخ غەفوور تاڵەبانی
تەکیەی شیخ کەریم بەرزنجی
تەکیەی عەودەلان.
تەکیەی حەسەن ئاغا کوڕی مەحمود ئاغای غەفوری

ئەمانە وێرانن:

تەکیەی ئیرانی
خانەقا رووتە
خانەقای شیخ نەبی باویلی

**مزگەوتی گەورە**

ساڵی ١٢٦٠ لە لایەن مەلا بەکر ئاغای کوڕی مەحمود ئاغای کوڕی حەوێــز ئاغــا دروســـت کراوە، بۆخۆم، کە چووم و چاوم پێــی کــەوت حەوشێکی زۆر گەورەو لەنێــوەراستی حەوشــەکــەدا حەوزێکی ئاو لە شیمــالی حەوش ریــزە حوجــرەیــەکی فەقێیــان و ئەیــوانێکی درێــژ و لە رۆژئــاوای حەوشــەوە دەستــە حوجــرەیــەك و ژوورێکی هەیــەو هەیــوانی مزگــوتەکە بەحەوت کەمەرە هاتۆتەوە. حەوشی مزگــەوت دوو دەروازەی هەیە، یەك لە رۆژهەڵات، دووەم لە رۆژئاواوە.

لەسەر دەروازەی رۆژئاوایەوە لە بەردێکی مەرمەڕی زل نوسراوە [بانی هذا الجامع الشریف ملا أبوبکر بن محمد بن حویز آغا سنة ١٢٦٠]

لەسەر میحرابی لای رۆژئاوای هەیوانی مزگەوت نوسراوە:

تا گنبد این جامع اعلا شده برپا
صـد نازکند کوی برین قبهء خضرا

له دوای پێنج شیعری دیکەی فارسی ئەمەی خوارەوە نوسراوە :

طابع بشمر مهمل این بیت ویکی فرد
تاریخی وی نیست برین گنبد میـنا

از همت ملا ابو بکر این مسجد ممتاز
در سالی هزارو دوصدو شست شد انشا

له میحرابی دووەم لای رۆژهەلاتی یەوە نووسراوە : (قد عمر هذا المسجد في سنة ١٢٦٠ ابو بکر ابن محمد بن حویز رحمه الله) .

له دەروازەی رۆژهەلاتی مزگەوت بە دەرەوە خانوێکی زۆر گەورە هەیە . . .

سەراو خانووبەرەی حاجی بکر ئاغا، کە لە خوار مزگەوتەکەیەوە ئەمرۆکە وێرانەو هەر دیوارو بەردەکانی ماون، ئەو وەتاخەی، کە خۆی تێدا دانیشتووە چاوم پێ کەوت ژ وورەوەی هەموو بە بەردی مەرمەری شین دامەزرانـدراوەو گومبەزە بەردەکە هەموو بەگوڵ و کەندەکاری رازاندراوەتەوە، لەسەر دەرگانەی دەرگاکەی لە بەردێکی زلی هەڵکەندووەو تاریخی ١٢٥٤ لێداوە، بەلام گەلێك دووروودرێژ نووسـراوە پێویستم نەدیت لێی بلوێم، بەلام بەراستی ئەوبینایە شایانی پێدا هەڵگوتن و جێگەی عیبرەتە .

لە حەوشی دەرەوەی کۆلەکە بەردی مەرمەرەکانی هەیوانی قەسرو ژ وورێکی قەسرەکەی ماوە بە دڵێکی پر خوێن وچاوێکی گریانەوە تەماشای ژ ووری لای رۆژئاوای هەیوانەکەم کرد، ئەم شیعرە فارسیانەم کەوتە بەرچاو، کە لەسەر بەردی دەرگانەیەکی بەخەتی فارسی زۆر قەشەنگ هەڵکەندراوەو نووسراوەو خوێندمەوە :-

مبارك بـا دیـاری قـەسری انور
که دهر از وی شده پر زینت و فر

بحر هر مصرع تاریخش اینست
کـه صـدقی‌را گـرد این قصر
بناه محمد أمین حویز زاده ١٢٧٣

وا دەردەکەوێت، کە ئەمین ئاغای ئەختەر لە دوای بابی ئەو قەسرەی ئاوەدان کردووە .

بەلام تاقی ئەیوانی سەرای حاجی بەکر ئاغا، کە بە مەرمەری شین و پەلەدار دروست کراوە هەروها لە هەوا ماوەتەوە .

حاجی بەگـر ئاغـا کوری محـمـمـەد ئاغـا کوری حەویـز ئاغـا شاعرێکی زۆر گەورەبووە، تەخەلوسی شیعری (قاصد) بووە، دیوانێکی زۆر گەورەی فارسی هەیە .

### کێوەکانی کۆیێ

لە رۆژهەلاتەوە هەڵکەوتووە، لە شیمالەوە بە رۆژهەلاتی شاردا روو بە شەرقی جنووبی چیای هەیبە سولتان درێژەی بەستووە لەسەر زێی دەبرێتەوە .

رۆژئاوای شار کێوی (باواجی)یە، راستەوراست لە شیمالەوە روو بە رۆژئاواو رۆژئاوای جنووبی لە گردو تەپەو شاخ (؟) .

لە نزیك شارەوە گردی مامۆستا کەرەم و گردی کەکۆنە، کە قەبرستانەو قەلای لەسەرە .

### باغ و باخچە

لە سەرچاوەی کانی حەمامۆکەوە روو بە جنووبی شەرقی و شەرق دێتە خوارێ، کە بە دۆڵی رەزان ناوبانگی کردووە، هەموو باغ و باخچەو دارو درەختە، نزیك دوو سەعات رێگا دەکێشێت، هەموو بە ئاوی رووباری کۆیێ ئاو دەدرێن .

داری هەنارو سێوو خۆخ و هەنجیرو بادام و زەیتوون و رەزی ترێی زۆر چاکی هەنە .

### کانیی حەمامۆك و کارێزی حاجی ئاغا

لە شیمالی شارەوە نزیك نیو سەعات دوور کانیەکە لەنێو باغ و باخچەیێکی زۆر دێتە دەرێ و بەکەلکە . لە سەرچاوەی کانیەکە بۆری ئاوی تێگیراوە، بۆ شار دەبرێ .

جگە لەو کانیەو کارێزە رووبارێکی بچوکیش لەنێو باغەکان دا دەچێتە خوارێ . باخ و باخچەی کۆیێ پێ ئاو دەدرێ و ئەهالی شار دەیخۆنەوە .

لەبەر ئەو کان و ئاوە یەك لەدوای یەك هەتا دەگاتە کەنار شاری کۆیێ، نۆ ئاشی ئاو بە گیج دامەزراوە .

ئاوی کارێز لەبن شاخێك دەردەکەوێت روو بە جنووبی شەرقی دەچێتە خوار لەپاشان بەو ئاوە گەلێك ئەرازی و شینایی ئاو دەدرێت و بیستان و شیناوەرێکی قورسی لەبەر کراوە، لەو ئاوە ئیستیفادە گەلێکە .

سەرچاوەی ئاوی حەمامۆك لەشارەوە تەخمینەن سەد پتر فووت بەرز دەبێت .

ئاوی کانی حەمامۆك لەپێش دا هەموو ئەهالی شار بۆ خواردنەوە

بەکـاریـان دەبـرد، ئەمـڕۆکـە کەمێکی خەڵکی شار لە ئاوی بۆری ئیستفادە دەکەن و گەرەکێکی زلی هەروەکو جاران هەر ئاوی جۆگە دەخۆنەوە.

بۆری ئاو لە ساڵی ١٩٣٠ دا کەریم بەگ ڕەواندزی قایم قام بوو دای‌مەزراند، لەدوایی‌دا صالح زەکی بەگ صاحیبقران زادە تەواوی کرد.

لە دەری شار لە شیمالی ڕۆژئاوایەوە حەوزێکی زلی لە چەمنتو بۆ ئاوی بۆری دامەزراندوەو لەو حەوزەوە بە بۆری بچووك بەسەر شاردا بڵاوکراوەتەوە.

## ڕێگا

صالـح زەکـی بەگ صاحـبقـران زادە لە ڕۆژئـاوای شارەوە لە جنـووب ڕووبە شیمـال ڕیگـایـەکی جووانی بۆ ئوتومبیل کێشا، بە پشت کەرەکی کۆنـە قەڵا بۆ نێـو باخچـەکـانی بردووە، کە بیبـاتـە سـەرچاوەی گەرمو، بەڵام تەواوی نەکردووە، لە دوایی لەکەنار ئەو ڕیگایەدا ئەم بەرەو بەر داری گران بەهاو کالیتۆسی لێ چەقاندبوو. لەپاش چوونی صالح زەکی بەگ مدیری تعق تعق (عەبدولرەحمان زەردەواڵـە) خەلکی سلێمـانی بووبە وەکیلی قایم مەقـام، هەمـوو دارەکانی وشك کرد و خەڵکەکەی هان دابوو، کە شکایەت بکەن و ڕیگاکە تێك بدەن. ئەو ڕێگایە ئێستاش هەر بە ناتواوی ماوە.

کووچـەو کۆڵانەکانی کۆیێ هەرچەند تەنگە، بەڵام زۆر خۆشەو دڵگوشایە، ئەگەر تەماشا بکرێ.

## مایەی کوژتاری ئاغایانی غەفوری
## لە کۆیێ و تێکچوونی بەبە لە کۆیێ

عوسمان بەگ کوری مەحموود پاشای بەبە لە کۆیێ حاکم بوو، ژنی ئەو چوویووە حەمام، ئاورەحمان ئاغای غەفووری لەسەر ڕێی ڕادەوەستێ و بە ژنەکە دەڵێت:.

«ئەم شەوە نۆبەتی جێی منە»

ژنـەکـە چووە لای عوسمان بەگ پێی گوت یان تۆ مێردم بە، یان ئاورەحمان ئاغا . . .

لەسـەر ئەوە عوسمـان بەگ ڕکی هەستـاو ئاغـاکـان چوون لە قەڵا بەستـاوتـران، ئەحمەد زەنگەنە چۆلەکەیەکی لە باغەڵی ناو و چوو بۆ ئاغـاکـان سوێنـدی خوارد کە هەتـا گیـان لەو بەدەنـەدابێت، ئێـوە تووشی هیـچ نابن، ئاغـاکان بەوە لە قەڵا دەرکەوتن لە گردی سیوکە هەموویان کوژتن.

ئەوانـە بوونـە مایەی تێکـدانی حکـومـەتی بەبـە لە کۆیێ و لە ئاغـایـانی غەفـووری جگـە لە منـداڵی بچـووك کەسێکیـان لێ دەرنـەچوو، ئەوانەی ڕزگار بوون هەڵاتن پەنایان بردە لای میری ڕەوانـدز میـر محـەمـەد بەگی گەورە، کە ئەو دەمـە لە هەولێـر بوو هانیـان دا، کە بچێتـە سەر کۆیێ و بیگـرێت، مایـەی مەزبـەتـەی کۆیەکان بۆ بردنی میر بۆ کۆیێ ئەوان بوون.

(وەسیقەیەك)

> ڕۆژی چوارشـەممـە لە کۆیێ بووم، کە شیخ صالح ڕۆژێك لە پێش دا هاتبـووە کۆیـی و وەسیـقـەی دەدا بە چەتـەو جەردەو ڕێگرەکانی هەڵاتوو:
>
> ئەم وەسـیـقەیە درایە
>
> دەست فەقێ سلێمـانی
>
> نواوی ئەچێ بۆ سلێمانی
>
> بۆ دخالەت ڕەجا وایە
>
> کەس دەخلی نـەکا هەتا
>
> پانزە ڕۆژ مـەئمووری
>
> صـادق، ڕەئیسـی چـەتە
>
> ١٩٣٥/٩/٢٥

(کەلامێکی حاجی مەلا عەبدوڵلا)

تەئریخی مەوتی کچی حاجی بەکر ئاغا ژنی حاجی مەلا عەبدوللا.

کەلامی حاجی مەلا عەبدوڵلایە.

هەست تاریخی مەوتی این دلدار

بی‌کەم وبیش قمولی یا غەفار

١٢٨١

(بەیازێکی قەدیم)

لە بەیازێکی قەدیمی حاجی ئەمین ئاغای حەوێزی زادەی کۆیی وەرگیراوە:ـ

| | |
|---|---|
| | ساڵ (کۆچی) |
| شکانی سلیمان پاشای بابان | ١١١٠ |

| | |
|---|---|
| شکانی بەکر بەگی بابان (بەکرسوور) | ١١٢٧ |
| تالآنی (بانە) بە دەستی حەسەن بەگی بابان | ١١٤٦ |
| هەلآتنی حەسەن عەلی خان لە مەریوان | ١١٦٤ |
| کوشتنی حەسەن عەلی خان لە مەریوان | ١١٦٤ |
| کوشتنی محەممەد خان | ١١٦٤ |
| کوشتنی عوسمان پاشای بابان | ١١٦٤ |
| کوشتنی سەلیم پاشای بابان | ١١٧١ |
| کوشتنی سەعید بەگ برای سەلیم پاشا | ١١٧٢ |
| کوشتنی سلیمان پاشای بابان | ١١٧٨ |
| سوتانی قەسەبەی (بانە) | ١١٧٦ |
| هاتنی شیخ عەلی خان زەندی موکری | ١١٧٢ |
| شکانی محەممەد پاشای بابان و عەلی مورادخان | ١١٨٨ |
| هاتنی نەسرولّلای میرزا | ١١٥٨ |
| مردنی ئەحمەد پاشای بابان | ١١٩٢ |
| کوشتنی محەممەد پاشاو عومەر پاشای والی بەغدا | ١١٩٤ |
| بەندکردن و گرفتاری ئەحمەد پاشای بابان بەدەست محەممەد پاشای بابان دا | ١١٨٧ |
| هاتنی سلێما ن پاشای وەزیر بۆ مەحموود پاشای بابان | ١١٩٦ |
| کوشتنی مەحموود پاشای بابان | ١١٩٧ |
| کوشتنی عەباسی قولی خان بەدەستی عوسمان پاشا کوری مەحموود پاشای بابان | ١١٩٨ |
| مردنی خالد پاشای بابان لە موصل | ١١٥٦ |
| شکانی عەلی موراد خانی زەند | ١١٨٥ |
| هاتنی تقی خانی زەند بۆ کۆیی | ١١٨١ |
| چوونی سلێمان پاشای والی بەغدا بۆ سەر تەیمور پاشای مللی | ١٢٠٥ |
| کوشتنی محەممەد خان | ١٢١١ |
| لەسەر تەخت دانشتنی عەبدولرەحمان پاشای بابان | ١٢٠٤ |

### حەمە ئاغای بەناوبانگی کۆیی

سالّی (١٢٧٢) لە دەربـەنـد حاکم بوو. لەدوای ئەوە مایـەوە، هەتـا کێشـەیـان بەسەرهات. شەرەکەی لەگەڵ هەیتەکان دا سالّی ١٢٧٧ بوو کە لەشکـری هەیتـەی بەبـە کەوتنـە سەری‌وبریندارایان کرد. اسمـاعیـل ئاغـای برای حەمـە ئاغـاو اسماعیل ئاغای هەیتە باشی کوژ ران.

حەمە ئاغا پازدە سالّ لە بەغدا حەپس بوو، لە پێش دا بە ئیعدام حوکم درا، لەپاشان کرا بەموئەبەد، لە دواییدا پازدە سالّ.

لەو شەرەدا رەسـول ئاغـاو مەعـروف ئاغـای حاکمی دەربـەنـد گیـران، بیست وپێنـج سالّ لە بەنـدا مانەوە، هەر یەکی پێنج سالّ مانەوە، بەلاّم حەمە ئاغا پازدە سالّ ماوە.

لەدوای ئەوە، کە لە بەنـد رزگـار بوو سالّـی (١٣٠٧) لە (؟) قایمقام بوو.

لە حەربی، رووس دا بەغـدا وبەسـرە کەوتبوە دەست ئینگلیز، حکـومـەتی تورك زۆریـان لە حەمـە ئاغـا کرد، کە بچێتـە کۆمەگی تورکـان وبچێتـە سەر روس وبچێتـە رەوانـدز، چۆن لە نەتیجـەی شەردا لە بری چاکـەی حەمـە ئاغا تورك ناردیان لە کۆی تاهر ئاغای کوری حاجی مستـەفـا ئاغا لە (شیوان شوك) صدیق بەگ کوژتی و ئەنباری حەمە ئاغاشی تالآن کرد.

مانگی کانوونی دووەم حەمە ئاغا لە سالّی ١٩١٨ و هەتا ١٩٢٠ حاکمی کۆی بوو. مەلا حەوێـز ئاغـای برازای بۆمدیـری ناحیـەی تەق تەق هەتا سالّی ١٩٢٠، حەمە ئاغا لە سالّی ١٩٢٠دا مرد (١٣٣٨)هـ.

مردووەکانی ئاغایانی غەفوری لە (من ـ قەبرستان)ی خۆیان، کە لە دامێنی قەلاّ لەسەر گردێکە ناژراون. قەبری حەمە ئاغاش لەوێیە.

### مەلا مستەفا عاسی

سەربهوردی خۆی، کە لە خوارەوە لە خۆیم پرسیوە، نوسیمەوە:

لە سالّی ١٣١٥ هیجری لە دێی (تەلان) لە ناحیەی سورداش لە دایك بووە لەلای حاجی مەلا رەسوولی باوکی خوێندوویەتی لە پاشـان (لـەسـەرگـەڵـو) لەلای حاجی مەلا ئەحمـەد سەرگـەڵوی خوێنـدووە. لە سلێمـانی لە مزگەوتی حاجی ئەحان خوێندویەتی، لە دوای ئەوە دەستی لە خوێنـدن هەڵگـرت چووە دێی تەلان، کە نیشتمـان و زیـدەی بوو بە مەلایـەتی ئاوایی دانیشت وخەریکی مەلایەتی بوو. لە پاشان چووە (سارتکە)ی ناحیەی خضران بوو بە مەلا، چووە کۆیی لەگـەڵ کاسپی وبازرگـانی خەریـك بووە، لە پاشـان چۆتـە بانـە گولان بوو بە مەلا لەوێـوە لە شیواشوك مەلایەتی کردووە لەوێ چووەتـەوە کۆیی بۆتـە کاسب دوکـانی دانـاو ئێستـە خەریکی کاسپیە، کە چاوم پێی کەوت.

*ئەمە غەزەلێکی نیشتمانیەتی، کە دەڵێت:*

بەسیەتی ئەی قەومی کوردان با وەتەن نەبرێتەوە
ئاگری ئاساری مللەت چاك وەیە نەکوژێتەوە
بۆخەزێنەی عیلم و عیرفان جەهلە رێگای گرتووە
دەرکی دیوانی سیناعەت بۆ لە کورد نەکرێتەوە
روحی دونیا خاکی ئێمە باعسی ژینی هەموو
چاکە ماددەی عیلم و عیرفان با لەویش بکرێتەوە
خوڵمێشی خاکی ئێمە بۆتە ئکسیری زەمین
حەیفە با ئەو مەعدەنانە قەت لە کورد نەشرێتەوە
با چوغەی شمشێری غیرەت و وا بە دەستی ئێمەوە
سەد ئەمان ئەی قەوم و میللەت با لە دەست نەکرێتەوە.
خاکی ئێمە ئەی رەفیقان دارو بەردی جەوهەرە
جێی ژیانە وەك بەهەشتە با بەکەس نەدرێتەوە
هەر دوعا گۆتانە (عاصی) بۆ وەتەن وەك جان فیدا
شیعری خۆشتان بۆ دەنووسێ لاوەکان دەکرێتەوە

عاصی شیعری عیشق بازیو وەتەنی زۆرە دیوانێکی باشی هەیە بەدەستی خۆی نوسیوەتەوە، کە من لێم وەرگرت وئەم چەند شیعرەم لەبەر نووسیوە.

**شاری کۆیێ**

فەخری مولکی کوردو رومە تاجی سەرشانە کۆ
بێشکە ئیمرۆ نموونەی جەنەتی عەدنانە کۆ
بای نەسیمی سوبح و چەهچەهەی بولبول کەوی
دڵ دەبێتە شاهیدی ئەو عەینی هەر رزوانە کۆ
کێوەکانی دەوری شاری وەك بەهەشت رازانەوە
تێ بگە ئەو نا مەقامی وەك جەبەل لوبنانە کۆ
چونکە سایەی سوبح کێوی هەیبەت سولتانی هەیە
بۆ ئێواران مەقامی شەوکەتی شاهانە کۆ
جەنەتێکە هاتە دونیا (؟) گەری لێ بکەی
ساحێبی قەسرو قسورەو حورو هەم غیلمانە کۆ
بەم سەراپەردەو عروسی و دیوەخانەی شێرەکان
سوێند ئەخۆی خوبایی تەختی دەولەتی یونانە کۆ
چونکە هەم ناوی جەنابی فەخری عالەم لێرەیە
مەرکەزی زانین و عیرفان و هەموو دەرمانە کۆ

بۆ سەخاوەت حاتەمی تەی بۆتە شاگردی ئەوێ
بۆ شەجاعەت دیارە (عاصی) جێگەی شێرانە کۆ

## بلدة (كوى) في خريف ١٩٣٥

م حسين حزني موكرياني


ملخص البحث:

نشرنا في العدد ١٢٠ من هذه المجلة مقالاً للاستاذ حسين حزني الموكرياني - الكاتب والمؤرخ والصحفي المشهور - سجل فيه انطباعاته عن مدينة السليمانية عام ١٩٣٤ وننشر في هذا العدد مقالاً له يتضمن زيارته لبلدة (كوى) أو (كويسنجق) عام ١٩٣٥، وهي بلدة تابعة لمحافظة أربيل ومدينة تاريخية قديمة ورد ذكرها في كثير من حوادث المنطقة. يسجل الكاتب هنا مشاهداته عن عماراتها ومحلاتها وبساتينها وينابيعها ومساجدها وأسرها المشهورة والبعض من شعرائها. كما كتب عن بعض عادات الأهالي وتقاليدها المتوارثة فيما يخص المسكن والملبس وامور الحياة اليومية.

وقد وجد فيها مخطوطة قديمة تعود الى الشاعر الشهير (أمين آغا أختر) سجلت تواريخ مهمة تخص إمارتي بابان وأردلان بين سني ١١١٠ هـ لغاية ١٢٠٤هـ

وقد قامت الدكتورة كردستان موكرياني بمراجعة المقال وأعدته ضمن مخطوطات الكاتب.



# چەند ڕاستی یەك دەربارەی مۆرکردنی رێك کەوتننامەی سالی ١٩٢٧ لەنێوان شێخ مەحمودو کاربەدەستاندا

کمال نوري معروف

سەرەتایەك :

له سالی ۱۹۲۳ەوە .. ئەو کاتەی شەر لە نێوان کوردو ئینگلیزەوە دا گیرساو هەلگیرسایەوە .. شیخی نەمر سیاسەتی بزووتنەوەکەی لەسەر هەمان شێوەی پێشوو بەڕێوە ئەبرد .. بەلکو بەلایەکەوە شەری لەگەل ئینگلیزەکان دا دەکردو، وەک نەخشەو پیلانی خوشی هەر بارو دۆخێکی بو رەخسابێت بیبات نزیك بوئەوەو وتوویژی لەگەلدا کردوون بەو هیوایەی مافە رەواکانی کورد بدەن. ئەو مافەی ئەوەوپێش دانی پێدا نابوو. بو ئەوەی کوردی بەشەرو خوێن رشتن بهێنرێ و ئەو زیانە بەرە نەمێنێت.

بو ئەم کارەش شیخی نەمر دەیویست لەمەیدانی شەردا هەندێ سەرکەوتنی گەورە بەدەست بێنێت، بو ئەوەی ئینگلیز مل کەچی وتوویژ بکات .. ئەوەبوو لەسەرەتادا شورشگیرانی کورد لە شەرەکانی گورەدەرەقەرەو کەسنەزانی و دێی مونی و سەرای سولێمانی ئەغوا شیوەسووار بەتەروزی تەلکیون بە دوژمن هەنچی و زیانیکی گەورەشیان پی گەیاندن.

بەلام ئینگلیز ئەبری ئەوەی بیر ئەوەبکاتەوە کە گەلی کوردیش وەکو هەموو گەلانی دیکەی سەرزەمین دەبیت بە مافی خوی بگات .. هات تووی دووبەرەکی و ئاژاوە نانەوەی سەوز کردو دەستی کرد بە کرینی پیاوی سەر بە خوی لە بەگزادەو ئاغاو دەرەبەگ و پیاوانی ئایینی .. گشت ئەم جورە پیاوانەی کرد بە نوکەری خوی بو ئەوەی ترووسکەی نیشتمان پەروەری لە ناو کوردا لاواز بکات و بەرەو ئشیوو هەلدێری ببات و نەهیلی بە مافی رەوای خویان بگەن و بە شتی لاوەکی یەوە خەریکیان بکات .. ئەم پیلانەش لەبەر ئەوەبوو کە ئینگلیز زیاتر بەرژەوەندی خوی لە رژیمی پاشایی سەر بە خوی‌دا دەبینی‌یەوە .

لە لایەکی دی‌یەوە ئینگلیز دەیویست وردە وردە ئەو حوکوومەتانەی کە هاوسنوورن لەگەل عیراق دا، لە هەردوو بەشی روژهەلات و سەرووەوە لە حوکوومەتی عیراق یان نزیك بخاتەوە، بەو مەبەستەی یارمەتی کورد نەدەن و نەهیلن بزووتنەوەکە دەوام بستینی‌و سەرکەوتن وەدەست بینیت .

ئەوە بوو دوایی کێشـــەی مووســـڵ لەنێوان تورکیاو بەریتانیادا کۆتایی هات.. لە کۆتایی دووەمی ساڵی ١٩٢٦دا ویلایەتی مووسڵ گەڕایەوە بۆ عێراق..

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی تەنگوچەڵەمەی سنوور لەنێوان هەردوو حکوومەت دا نەمێنێ و بەدەرخستنی ڕەزامەندی تورکیش بۆپاراستنی یەکێتی زەوی و زاری عێراق .. بە هەردوولاشیان ئەگەر بزووتنەوەیەکی چەکداری لە سنوورەکانیان دا ڕوویدا، نەیهێڵن و لەناوی بەرن.

ئەمەش بارو دۆخێکی لەباربوو بۆ ئینگلیزەکان بەو مەبەستەی دەرهێنانی نەوتی مووسڵ بخەنە ئەستۆی خۆیان و ناوچەی موسڵیش بەدەست خۆیانەوە بێت و لەوێوە کوردستان بخەنە ژێرچاودێری یانەوە، بۆ ئەوەو دوایان و کاریان بەمەرام بگەیەنن.[١]

ئەم هەڵــوێســـتــەی تورکیــاش بووە هۆی ئەوەی دەرگــا لەســـەر بزووتنەوەکە دابخرێ.

بێ گـــومـــان ئەم کارەش زیـــانێکی گەورەبـــوو لەو بارو دۆخـــەداو سەرئەنجامی کارەکەش لەسەری بزووتنەوەکەدا شکایەوە.

هەر ئەو بارو دۆخە ناهەمواره بوو جارێکی دی پاڵی نا بە شێخەوە، کە بکەوێتە وتوویژەوە لەگەڵ ئینگلیز.. بەو هیوایەی بگاتە ئەنجامێك خۆشــی بهێنێتـــە دی بۆ گەلی کورد.. سەرەڕای ئەوەش لە یەکـــدانی کوردەکـــانی هەورامـــان و مەریـــوان بەمـــانـــای بەگـژدا چوونی هەردوو سەرکـــردەی بە ئەمـــەك و بە وەفـــا بۆ شێـخ، مەحمـــوودخـــانی دزلی و مەحمـــوودخـــانی کانی سـانـان،[٢] هۆیـــەکی دیکە بوو، بۆ ئەوەی شێخ زیاتر لە ئینگلیز نزیك بێتەوە، بە مەبەستی ئەوەی بەڵکو بیری خۆیان بەرامبەر مەسەلەی کورد بگۆڕن.

پێشەکیش شێخ دەیزانی دوژمنی زۆرەو ئەگەر ڕێگایەکی ڕامیاری زیـرەکـانـە نەگـرێتــە بەر.. ناگاتە ئەنجامێکی باش.. کوردیش وردە وردە بەرەو نشێوو هەڵدێر دەبات و باری سەرشانی قورستر دەکات.

## ناردنی سەید ئەحمەدی بەرزنجی (مەرەخەس) بۆ بەغدا

لە بەهاری ١٩٢٦دا سەید ئەحمەد ڕێگای بەغدای گرتەبەر، بەو مەبـەسـتـەی چاوی بە کاربـەدەسـتـانی ئینگلیـز بکـەوێت و وتـوویژ یان لەگـەڵـدا بکـات.. بەو ئامـانجـەی چاوێـك بە مەسـەلـەی کوردا لە «کـۆمـەڵـەی نەتەوەکان (عصبة الامم)دا بخشێننەوەو نەخشەی پیلان و ڕامیاری‌یان بگۆڕن بەرامبەری.

کاتێـك سەیـد ئەحمـەد مەبەستەکانی سەرکردایەتی بزووتنەوەکەی گەیاندە ئینگلیز.. نەیتوانی بگاتە ئەنجام لەگەڵیان داو لە گەڕانەوەیدا نامـەیـەکی دەستی هێنـا بە دوو زمـانی کوردی و ئینگلیزی نووسرابوو و بەدەمیش پێی وترابوو پێویستە شێخ واز لەسیاسەت بێنێ لە جێگەیەکی دوور لە سنـــووری عێـــراق دابنیشێ و زەوی وزاریشی پێ دەدرێتـەوەو لێبووردنیش بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لە لەگەڵیدا بوون دەردەچێت.

پوختـەی نامـەکـەش دەڵێ: «لـەبـەر ئەوەی دەخـالـەتتـان نەکـردوە بە حکوومەت، چوارده ڕۆژ لە دوای ئەوەی ئەم کاغەزەتان پێ گەیشت هەموو ئەملاکتان بەتەرەف حکوومەتەوە موافیقی قانون دەفرۆشرێ..

کە شێخ مەحمود لە هەڵوێستی ئینگلیز گەیشت، ئەم دوو بڕیارەی دەرکرد:

١ ـ تەجمید کردنی سەید ئەحمەدی مەرەخەس، لەبەر ئەوەی بەرانبەر مەرجەکانی ئینگلیز نەرمی نیشان دابوو.

٢ ـ دەست پێ کردنەوەی هێرش بۆ سەرد دوژمن.

بەهۆی بڕیاری دووەمەوە خێزانی گەورە پیاوانی بزووتنەوەکە سەرلەنوێ ڕەوانـەی دێی ولـەژێـرو باشمـاخی ناوچـەی مەریـوانی ئێـران کران. چەکدارەکانی کوردیش بڵاوبوونەوە، بۆ لێدانی دوژمن.

لە شارەزوورو دەوروبـــەری سلێمــانی و ناوچـــەی گەرمیـان، شەڕ بەگەرمی دەڕۆیشت.[٣]

هەر لەم کاتەش دا جارێکی دی شێخ مەحموود ئەم دوو بڕیارەی دەر کرد:

١ ـ لێدانی دوژمن بەتوندی.

٢ ـ نوێ کردنەوەی گفتوگۆ لەگەڵ پیاوە ڕامیاری‌یەکانی ئینگلیز.

بۆ خالی یەکەم لەشکرێك کۆ کرایەوەو بەتوندی هەڕەشە لە سوپای دوژمن کرا.. بەڵام دوژمن لەســـەر خۆو هێمن وەڵامی دایـەوەو گفتـو گۆیەکی نا ڕەسمیانە لە نێوان شێخ مەحموودو ئینگلیز هاتە گۆڕێ.. لەم گفتوگۆیەدا مەرامی ئینگلیز ئەوەبوو، دەیویـست هەواڵی دیئەکانی خۆی بزانێ.. بەو هۆیەشەوە پزیشکێك بۆ تیمار کردنی ئەفـسەرە تەیارە چی یـــەکـــان بنێـــرێت..[٤] ئەمـەش لەو نامـەیـەدا دەردەکـەوێت کە موفەتیشی ئیداری سلێمانی ناردوویتی بۆ شێخ مەحموودو دەڵێ!.. کە ئەو دوقتـــورە لەگـــەڵ موحـــافـەزەیدا بۆ ئەو شوێنـەی کە تەعین و ئینتخاب دەکرێت.. سالیمەن ئیصال و ئیعادەی بکەنەوە.[٥]

بۆ ئەو کارە دکتــورێـك بەنـاوی کاپتـەن شۆك ڕەوانـەی لای شێـخ مەحمـــوود کرا لەدێی ولـەژێـر. لەمـاوەی مانـەوەی تاکـە ڕۆژەیـدا.. کۆبوونەوەیەکی نهێنی لەگەڵ شێخ مەحموودکردو، بڕیاریان دا لەسەر ئەوەی کە:

١ ـ شێخ چاوی بە مەندوبی سامی بەریتانی بکەوێت.

٢ ـ ئینگلیزە دیلەکان بەرەڵا بکرێن.[٦]

دوای گەڕانـەوەی پزیشکـەکـە. شـێخ مەحمـوود بڕیـاریدا ماجید مستـەفـا بنێـرێت چاوی بە کاربـەدەستانی ئینگلیز بکە وێت. دوای گەڕانەوەی وتی. داوای دوو فرۆکەوانەکە دەکەن و داواش دەکەن شێخ مەحموود لە خورماڵ چاوی بە کۆرنێل واڵس ی نوێنەری موعتەمیدی سامی بکەوێت.

لە شوێنی دیاری کراودا واتە خورماڵ [کۆرنێل واڵس و ڕاوێژکاری ڕۆژهەڵات کاپتەن هۆلْت] چاویان بە شێخ مەحموود کەوت و وتووێژ لە نێوانیان دا دروست بوو. دوای ئەوەی دوو دیلە تەیارەچی‌یەکانیان دانــەوە. گفتـوگـۆی شێـخ مەحمـوودو ئینگلیـز لە خورمـاڵ لەسـەر مەسەلەی کوردو دوارۆژ ی ناوچەکە بوو.

سەرئـەنجـام هەردوولا نەیـانتـوانی بگـەنـە ئەنجام. بەهۆی ئەوەی ئینگلیز بەوەفا نەبو بۆ مەسەلەی کورد. وە لە زمانی شێخ مەحموودەوە واهـاتـووە ئینگلیـز ویستـوویـەتی شێـخ بکـرێ و بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بێنێ.[١١]

دوای گەڕانــەوەی شێــخ مەحمــوود. ئینگلیــز سیــاســەتێکی دوولایەنەی گرتەبەر

١ ـ هێـرشێکی بەرفـراوانی سوپـایی و ئاسمـانی بە یارمـەتی هێزەکانی ڕژێمی پاشایی ئەوسا کردە سەر پێنجوین و لە ٢٠ی نیسـانی ١٩٢٧دا داگیـری کرد ناوچـەکە ی کردە بنکـەیـەتی سەربـازی. بۆ ئەوەی لەوێوە بەرەو ناوچە سنووری‌یەکانی دی بڕوات.[١٢]

٢ ـ داوا کردنـی ئینگلیــز لە حوکــومــەتی ئێــران بۆ ئەوەی ناوچـــە سنـــووری‌یـەکـانی خۆی بگـرێ و پارێـزگـاری لێ بکـات و نەیـەڵێت چەکدارەکانی شێخ ڕووی تێ بکەن. ئەمەش لە کاتێك دا ڕووی دا کە نێوانی شێخ مەحموودو ڕەزاشای [تازە شای ئێران] خۆش بوو و دەرگـای سنـووری بۆ کردبـونـەوەو هەموو پێداویستی‌یەکانی خۆیان بەو هۆیـەوە جێ‌بـەجێ ئەکـرد.[١٣] پێویستە ئەوەیش بڵێین ئەو هەڵوێستەی ڕەزا شا لەبــەر خاتــری چاوی کاڵی کورد نەبــوو، بەڵکـو مەبـەستی تایبـەتی ی خۆی بوو، ئەگینـا هەمـان کات شای ئێـران بێ بەزەییـانـە کەوتبووە گیانی شۆڕشگێڕانی کوردی ئێران. بەسەرکردایەتی سمکۆ.

داگیــر کردنـی پێنجــوینیش لەو کاتــەدا کارێکی خراپ بوو، بۆ چەکــدارەکــانــی شێــخ، لەبــەر ئەوەی بووە هۆی ئەوەی شوێنــی حەوانـەوەیـان نەمێنێ، کە گرنـگ بوو، بۆ چەکـدارەکـان. بۆ ئەوەی پێنجوین لە دوژمن بسـەنـرێتـە وە شێخ مەحموود لەشکرێکی کۆکردەوەو هێــرشی بردنـەسـەر. بەڵام لەو هێـرشـەیدا دەستی تاوان نەیهێشت سەربکەوێت. ئەمەش بەهۆی:

١ ـ نوێ بونـەوەی ناکـۆکی نێـوان دوو دۆستـە ڕاستـەقینـەکـەی شێخ مەحموود [مەحموودخانی دزلی و مەحموودخانی کانی‌سانان] کە لەوەو پێش وەستانبوویان. ٢ ـ کشانەوەی هێزی عەشایەری هەورامانی سەر بە مەحموودخانی دزلی لە بزووتنەوەکەو یارمەتی دانی حوکوومەتی ئێران.

٣ ـ ناردنی بەشێـك لەسـوپـای ئێـران بۆنـاوچەی مەریوان کە خێزانی پیاوانی چەکداری بزووتنەوەکەی لێ‌بوو.

٤ ـ هەڕەشەی حوکوومەتی بەریتانیا لە کوردو بەستنی سـنوور لەنێوان وڵاتی عیراق و ئێران دا.

بەم جۆرە مەحموودخانی دزلی بە هێزێکی گەورەوە پێش سوپای ئێــران کەوت و هاتــە مەریـوان. بۆ ئەوەی تۆڵـە لە مەحمـــوودخـانی کانی‌سانان بسێنێت.

هاتنی سوپای ئێرانیش بۆ ناوچەی مەریوان. بارودۆخێکی شێواوو نالەباری خستە ناوچەکەوە. لانەش لە چەکدارەکانی شێخ شێوا.

سەرکـردەی سوپـاکـە عەبـدوڵـڵاخانی تەهماسبی نامەیەکی نارد بۆ شێخ مەحموودو تیایدا نووسیبوی و دەڵێ: «بە زووترین کات خۆت بەم سەرکـردایـەتی‌یـە بنـاسێنـەو، وەرە بۆ ئێرە، ئەگینا دەرگای دۆستایەتیت لەسەر دادەخەین و بەرامبەرت دەجەنگین».

لێرەدا شێخ مەحموود زیرەکانە وەڵامی نامەکە دەداتەوەو پێی دەڵێ: «ئێمــە چاوەڕێی ئەمـــەمــان لە ئێــوە نەدەکــرد، لەگـەڵ ئەو هەمـوو نەسیحەتانەی دۆستەکانم کەپێیان دەوتم لە ئێوە ئەمین نەبم، بەڵام من بڕوام پێ نەدەکردن، چونکە پەیمانم بەجەنابی دۆستی کۆن ڕەزاخان دابوو، کە وەفاداربم بۆ دۆستایەتی‌یەکەی وادیارە ئیتر خراپ نیە، ئەگەر واز لە شەڕی ئینگلیز بهێنم و لەگەڵ ئێوەدا بکەومە جەنگەوە».[١٤]

ئەم بارو دۆخە ناهەموارە چاوەڕوان نەکراوە. جارێکی دی ترسی خستـە دڵی خێـزانی چەکـدارەکانی بزووتنەوەکەو بەرەو هاوینەهەواری برنجـەو هەرزنـەجـار کەوتنـەڕێ و لە هەواری تازەدا سەنگـەریان لێ‌داو ئامادەی شەڕ بوون، ئەگەر سوپای ئێران نیازی شەڕی هەبوو. بەڵام نەکەوتە شەڕەوە لەگەڵیان دا، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانە:

١ ـ ئەو هێزە عەشایەرە کوردەی کە چووبوونە پاڵ سوپای ئێران، دژ ی سوپاکە دەوەستانەوە، ئەگەر دەست درێژ ی‌یان بکردایەتە سەریان.

٢ ـ سوپای ئێران نەی‌ویستووە ئاژاوە بۆ خۆی بخولقێنێ لەبەر ئەوەی ناوچەکە زۆر سوپای لێ نەبوە.

ئەمەو وەستانی هەندێ لە ئاغایانی پشدەریش دژ ی بزووتنەوەکەو چوونە پاڵ ئینگلیزو بوونە لایەنگری. هەروەها داخستنی سنووری ئێـرانیش بووە هۆی تێکچـوونی باری ئابـوری. سەرجـەم بوونە پاڵ پێـوەنـەرێـك لەڕووی شێـخ دا کە جارێکی دی دەرگای وتووێژ لەگەڵ ئینگلیزدا بکاتەوەو داوای نوێ کردنەوەی بکات.[١٥]

هەرچـەنـد بەشێ لەو نامـانـەی کە لێـرەدا دەخرێنە بەرچاو بەڵگەی ئەوەن، کە نامـە گۆڕینــەوە لە نێـوانیـانـدا لەگـەرمـەی شەڕیشـدا هەر بەردەوام بووە. ئەم نامەیەش کە شێخ مەحموود ناردوییتی بۆ ڕەئیـسی

ئەرکانی حەربی‌یەی عومومی‌یەو مودیری ئیستیخبارات کۆلۆنێل ونت بەڵگەی زیندوی قسەمانەو شێخ لە نامەکەیدا داوای تەتبیقی ئەو مەوادە ئەساسیانە ئەکا کە عوسبەتول ئومەم (کۆمەڵەی نەتەوەکان) دایناوە. (بروانە پاشکۆی ژمارە ئەلف) لە وەڵامی ئەم نامەیەدا . . شێخ مەحمود نامەیەکی دی لە مەندوبی سامی عیراق لە بەغدا، لە ١٢ی مارتی ٩٢٧ بەدەست گەیشت و مەندوب لە نامەکەیدا وەڵامی شێخ دەداتەوەو قسەکانی دەیاتە دواوەو. دواجاریش دێتە سەر ئەوەی، کە دەڵێ: ئەگەر شەرایيت نامەکە قوبوڵ نەکەن، نەسیحەت بەحوکومەتی عیراق دەدەم کە ئەملاکتان بفرۆشن. (بروانە پاشکۆی ژمارە بێ)

ئێرەدا شێخ مەحمودو ئینگلیز هەر یەکەیان بە جۆرێك ڕاڤەی ئەو مافە میللیە دەکەن . بەمانای دوو لێکدانەوەی دژ بەیەك. . بەڵام مەسەلەکەش لای ئینگلیزەکان زیاتر روون بوەو مافی کوردیش لە کۆمەڵەی نەتەوەکاندا لەسەر بڕیاری لۆزان لەوە زیاتر تێپەری نەکردوە کە بەزمانی خۆیان بخوێنن و(*) موچەخۆر لە خۆیان بێ و زمانی دادگاش بەکوردی بێت. هەر بۆ ترس خستنە بەر شێخ مەحمودو هەرەشە لێ کردنی بەوەی موڵك و ماڵی لێ زەوت دەکەن و خۆی و ئەوانەی سەربەون لە ناویان دەبەن. . جارێکی تریش نامەیەکی لە نوێنەری موعتەمیدی سامی لە عیراق «زیان براین»ەوە پێگەیشت و لە بەشێکیدا دەڵێ: ئەڵبەتە ئەزانن کە ئێستاکە پێنجوین عەسکەری حوکومەت گرتوویەتی و بەم زوانە ئیدارەی بۆ دائەنرێت. . بەم هۆیەوە ناتوانین بیکەینە شوێنی حەوانەوە بۆ خۆتان و خێزانتان. . هەروەها دێتە سەر ئەوە کە دەڵێ: ئەگەر مەرج نامەکە بدەیتە دواوە حوکومەتی عیراق دەرگای وتووێژت لەسەر دائەخات هەرچی موڵك و ماڵیشت هەیە دەستی بەسەردا ئەگرێ و خۆت و لایەنگیرانیشت لەناو ئەبات.

دواجار دوای ئەوەی شێخ مەحمود گشت دەرگاکانی بەرودا دادەخەن. . ناچار ئەگاتە ئەو قەناعەتەی کە مۆرکردنی شەرایيت نامەکە هەر دەبێ ببێت و بەو شێوەیەش بێت کە ئینگلیز دەیەوێت. . شێخ مل دەداو، ئەم نامەیەی خوارەوە بۆ قوماندانی ئینگلیز دەنووسێ و لە بەشێکیدا دەڵێ: «بەندە حازرم بۆ ئیجراو تەتبیقی مەوادی موعاهەدەی مەزکورەو ئیتاعەتی. (١٧)» دوا بەدوای ئەو نامەیە کە شێخ مەحمود ناردوویە بۆ قوماندانی ئینگلیز لە پێنجوین. . نامەیەکی دی ناردووە بۆ ئەحمەد عوسمانی موتەسەریف و گلەیی لە کاربەدەستانی حوکومەت کردووە. . لە وەڵامیدا ئەحمەد عوسمان گوناهەکە هەمووی ئەخاتە سەرشانی موعتەمیدەکانی شێخ خۆی و پێی دەڵێ: لە نەتیجەدا شەخسی خۆت و سادات موتەزەرير ئەبن. . (بروانە پاشکۆی ژمارە جیم) کاتێك نامەکە دەگات شێخ لە هاوینە هەواری هەرزنەجاری هەورامانی ئێران دەبێ.(١٨) دوای وتووێژ و گفتوگۆ کردن لەسەری. . شێخ بڕیار دەدا بەرەو پێنجوین بڕوات، بۆ ئەوەی پەیمانەکە مۆر بکات.

## کۆبونەوەی پێنجوین و مۆر کردنی مەرج نامەکە

بۆ کۆبونەوەی پێنجوین هەردوو لای ئینگلیزو حوکومەتی عیراق. . ئەحمەد عوسمانی موتەسەریفی سلێمانی‌یان نارد. . تاکو مەرج نامەکە بە شێخ مۆر بکات.

لە ڕۆژی ١٥ی ئابی ٩٢٧. . شێخ مەرج نامەکەی مۆر کرد،(١٩) ئەمەش بەندەکانێتی:

١ - خۆت و کورەکانت و ژنەکانت و فاتمە خانی خوشکت لە دێیەکدا دانیشن کە خاریجی حودودی عیراق بێت.

٢ - خۆت و ئەو کەسانەی لە فەقەرەی یەکەمدان. . زیکر کراوە بە بێ ئیزنی و موساعەدەی حوکومەت لە داخلی مەملەکەتی عیراق نەبن.

٣ - نەخۆت و نە هیچ کەس لەو شەخسانەی لە سەرەوە زیکر کراون بە هیچ نەوعێ نە لە لیوای سلێمانی نە لە جێگایەکی تردا لە عیراق دا موداخەلەی ئیدارەی حوکومەتی عیراق نەکەن و بۆ ئەم مەقسەدە خەڵقی تر تەشویق نەکەن چە خۆت و چە ئەوان لە هەموو مەسائیلێکی سیاسی‌یە کە عیلاقەی بە عیراقەوە بێ لە موداخەلە کردنی ئیجتیناب بکەن.

٤ - ئەگەر خۆت وەیا هەر کام لەو شەخسانەی کە بەحسیان کرا لەهەر وەقتێکدا یەکێ لەم نوقتانەیان بەجێ نەهێنا حوکومەتی عیراق هیچ مەسئولیەتێکی بە سەرەوە نەمێنێ. . هەر ئیجرائاتی بە لازمی بزانێ بۆ ئیتیخاز کردنی سەربەست ئەبێ.(٢٠)

جگە لەو خاڵانەش ئەم دوو خاڵەش بڕیار درابوو:

١ - ناردنی بابەعەلی بۆ بەغدا بەناوی خوێندنەوە.

٢ - شێخ مەحمود بۆ بەغدا بڕوات. . بۆ ئەوەی چاوی بە پیاوانی ئینگلیزو مەلیك فەیسەڵ بکەوێت.(٢١)

پاشان دوای گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ هاوینەهەواری هەرزنەجار بڕیاری کۆتایی هێنان بە بزووتنەوەی چەکداری درا. . ئەو ئەفسەرە کوردانەش کە هاوبەشی‌یان لە بزووتنەوەکەدا کردبوو، حوکومەت لێیان خۆش بوو و بۆ سوپای عیراق گەڕانەوە. . هەروەها لێ خۆش بوونی گشتی بڕیار درا بۆ گشت کەسانی تر. ئەو ماڵ و سامانەی شێخ مەحمودیش کە دەستی بەسەردا گیرابوو دایانەوە، بە مەرجێ بۆ ئیدارەو بەڕێوە بردنی وەکیلێکی بۆ دابنێ. دوای بڵاو بونەوەی پیاوانی چەکدارو ڕۆیشتنی بابەعەلی بۆ بەغدا. . شێخ ڕۆیشتە دێی پیران و دانیشت. پاش دوو مانگ تێپەڕبوون بەسەر

دانیشتنەکەیدا، لەسەر داوای موعتەمیدی سامی بەریتانی ڕۆیشتە بەغداو لەوی چاوی بە کاربەدەستانی بەریتانیو مەلیك فەیسەڵ کەوت. [٢٢] ووتووێژی لە گەڵداکردن.. پاشانیش گەڕایەوە بۆ شوێنی دانیشتنەکەی.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە کە ئەویش: ئایا شێخ مەحمود لە ماوەی ئەو سێ ساڵەی بۆی دانرا لەپیران بمێنێتەوەو پاشان بۆ سلێمانی بگەڕێتەوە..

وازی لە جموجوڵی سیاسی هێناو خۆی گۆشەگیر کردو ڕازی بو بەوەی تێکەڵی کاری سیاسی نەبێ؟ ئینگلیز بۆ دانانی ئەو سێ ساڵەو گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی. ئامانجی جێبەجێ کردنی گەلی کاری سیاسی بوو. چاوگێڕانێکیش بە ڕوداوەکانـدا هەمـو ئەو مەبەستانە ڕون دەبێتەوەو پیلانەکانی ئینگلیزیش دەکەوێتە ڕوو کە چۆن لە تاریکیـدا بەدوای مەرامی خۆیدا گەڕاوەو گەلی کوردو عەرەبی بەیەکتر ترساندوە.

هەمـو ئەو بەڵگەنامانەی کە لەبەردەستمـدان.. ئەو ڕاستیـیە ئەسەلمێنن کە شێخی گەورە پاش جێگیر بوونی لە پیران بە ماوەیەك دەستی کردۆتەوە بە ئیشکردن لە کاری سیاسیداو ناردنی نامە بۆ گەورە پیاوانی ئینگلیزو داوا کردن و سوور بوونی لە سەر مافە ڕەواکانی گەلەکەی.

سەرەتا دەست پێکردنەوەکەی شێخ بەو نامەیە دەست پێ دەکات کە موفەتیشی ئیداری سلێمـانی لاین لە ڕۆژی ١١ی کانـوونی دووەمی ١٩٢٨ بۆی ناردووە ئەمەش لە ئەنجامی ئەو نامەیەوە بوو کە شێخ بۆی ناردووەو نارەزایی بەرامبـەر ئەحمـەد عوسمـانی موتەسـەریفی سلێمانی دەربڕیووە تیایدا وتویەتی: کە موتەسەریف بە موافیقی حەق لەگەڵمانا مامەڵـە ناکـات.. لە وەڵامـدا لاین لە بەشێکی نامەکەیدا دەڵێ:.. ئەتوانم تەئمینتان بکەم کە بە کەماڵی ئیعتیناوە تەماشای هەمو نەوعە ئومـوارتێکی ئێـوە ئەکـات.. هەروەهـا دەڵێ: موتـەئسیفم لەوەی کە جەنابتان خەبەرتان بە موتەسەریف نەدا کە ئارەزوی چوونە بانیشارتان هەیە. فەقەت ئەمەلم وایە کە لە موستەقبەلدا ئەم نەوعە مەسائیلە زیاتر بە ئیعتینـاوە مولاحـەزە ئەکـەن».. لێرەدا قسـەی ئینگلیـز بۆ شێـخ مەحمـود ئەوەیـە کە بە گوێـرەی بەنـدەکـانی مەرج نامـەکـە هەڵس و کەوت بکات.. چونکە مەنفەعەتی بەستراوە بەوەوە.. ئەگەر ئارەزوی چوونە شوێنێکیشی هەبو ئاگاداری کاربەدەستانی میری بکات و بەبێ ڕەزامەندی ئەوان بە هیچ لایەکدا نەڕوات.. ئەمەش مانای ئەوە دەگـەیەنێت کە هەمـو ئان و ساتێ لەژێر چاودێریدا بووەو لێی ترساون. هەنـدێ جاریش ئینگلیز دڵخۆشی شێخ یان بەوە داوەتەوە: ئەگەر حاڵی حازر لە پیران مانـەوەتان موجیب غائیلە ئەبێو ئارەزوی هاتنە حودودی عیراق ئەفەرمون.. کوێ ئارەزو ئەکەن بۆ سەکەن ئیشعارم بکەن تاکو بۆ بەغدا بەسـەریعی بنووسم. [٢٤]

وەکو وتم ئینگلیز لە ماوەی ئەو سێ ساڵە دانیشتنەی کە بۆ شێخ دایان نا لە پیران بمێنێتەوە، گەلێ شتی بە دەستەوە بو لە کوردستان دا بیکات.. یەکێ لەو کارە گەورانـەی کە هەوڵ و کۆششی بۆ دەکـرد دانانی چەند کەسانێکی نەخوێندەوار بە ناوی مەبعوسییەوە کە دووربون لە خواست و ئارەزوی گەل.. لە هەمان کاتیش دا نۆکەری بێگانە بوون.. ئەمەش لەو نامەیەدا دەردەکەوێ کە لەڕۆژی ٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٢٨ نێردراوە بۆ شێخ و لە بەشێکیدا وا هاتـووە:.. دوو ڕۆژ لەمـەو پێش کوری ئەحمەد بەگی ڕیشین، عەلی بەگ چوبوە لای موفەتیشی ئیداری وتبوی: ئەمســاڵ پیاوی چاك و جەربـەزە بدۆزنـەوە، بینێرن بۆ مەبعووسی.. ئەویش جەوابی ئەداتـەوە کە من لیسان ئەزانم.. بۆچی پێرار ئەحمەد بەگی موتەسەریف منی نەکرد بە مەبعوس، کەرێکی لە جێی من نارد. [٢٥]

سەرەتـای ساڵی ٩٢٩ جم وجـوڵێکی نوێ کەوتـەوە گیانی شێخ مەحمود، بەو هیوایەی ئینگلیز چاوێك بە مەسەلەی کوردا بگێڕێتەوە.. بۆ ئەمە کەوتەوە نامە ناردن بۆیان و بیریان بخاتەوە، کە، نە شێخ و نە گەلی کورد ڕازی نین دەست لەمـافی خۆیان هەڵبگـرن.. سەرەتـا پەیوەندی کردنەکە بەو نامەیە دەست پێ دەکات کە ناردوویەتی بۆ کاپتەن هوڵت ی موستەشاری شەرق و لە بەشێکیدا دەڵێ:.. جەنابی عالیتان زۆر چاك شارەزای ڕەوشت و وەزعی من بوون کە لە هیچ کاتێکدا دەست لە حەقی میللەتەکەم و لوتفی ئێوە هەڵناگرم.. هەروەها دەڵێ: وا جارێ من هەر چاوەڕوانم بەخۆشی لوتفتان. [٢٦] هەروەها دەڵێ: «بینائەن عەلەیهی گەلێ جار عەرزم کردون کە من ئەم مەوقیعەم بۆ شەرەف و بۆ حوقوقی قەومی کوردی ئیختیار کردوە» لە کۆتایی نامەکەدا دەڵێ: «ئیتاعەتی تەواوم هەیە بە مەرجێ کە ڕۆشنایەك تەسبیت بکرێت بۆ قەومەکەم.» [٢٧]

ئینگلیزەکان بۆ وەڵامی داواکەی شێخ.. جارێکی دی نیەتی گڵاوی خۆیان نیشان داو، ئەو حوقوقەی کە لەوەو پێش دابویان بەکوردو کەوتنە بیانـو گرتن لێیو بە کارێکی نا بەجێ دایان نا.. ئەمەش لەو نامەیەدا دەردەکەوێت کە مەندوبی سامی لە عیراق.. ساڵی ٩٢٩ ناردوویەتی بۆ شێخ مەحمـوودو لە بەشێکی نامـەکەدا دەڵێ: «تەشکیلاتی سابیقە کە لەمەو پێش تەجروبەی لێ کراوەو دەرەجەی خراپی نەتیجەیەکی بۆ هەموو کەس مەعلوم بووە.. عەینی حەماقەت دەبێت جەنابت باوەر بفەرمون.. بە صەمیمیەتی تەواو نەصیحـەت دەدەم بۆ جەنابت و بۆ کوردەکان کە ئیتیفـاق و ئیتحـادی موخلیسـانـەی عومومی عەناسیری عیراق باشترین وەسیلەی تەرەقی و موفەقیەتی عومومی ئەهالی ئەم مەملەکەتەیە.» [٢٨]

پاش ئەوەی شێخ مەحمـود ماوەی دووساڵ بوو لە پیران دانیشتبو، ڕێگـایان نەدەدا بە ڕەسمی بە هیچ لایەکـدا بڕوات.. ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش بارو گوزەرانی لەگەڵ پیاوانی میری بەرەو خراپی دەڕۆیشت..

لەلـەیڵ ئەوەشدا هەر هەوڵی دەدا بۆئەوەی ئینگلیز چاوێك بە مەسـەلەی کوردا بگێڕێتەوەو لەو پروپاگندەیەش تێ بگات کە لەناو کوردا بڵاو ببوەوەو بەبێ ئەوەی شێخ لایەك بێت تیایدا.. و ئینگلیزیش هەڵوێستی خۆی لەم ڕوەوە ئاشکرا بکات.

لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ١٩٢٩ شێخ نامەیەکی نارد بۆ «سکرتێری شەرق جەنابی کاپتەن هۆڵت» کە لە بەشێکیدا دەڵێ: «تەئمینتان ئەکەم کە ئەم مولاقاتە فائیدە بەخشە.. ڕجام هەیە بەتەیارە تەشریف بهێنە دێی وەڵـەسمت کە داخـلی قەزای ئەڵـەبجەیە بۆ بەعزی موزاکەرە.. چەند سەعــاتێ مولاقـات بکـەین».(٢٩) ئەم چاوپێکـەوتنـەش بۆ ئەوە بووە گفت و: نەکب ەڵاخ وود مەژ ڕەسەل و.»

١ ـ خراپی نێوانی شێخ مەحمودو پیاوانی حوکومەتی عیراق

٢ ـ دوارۆژی کوردو مافی ڕەوای..

لە وەڵامی ئەم نامـەیەدا شێخ مەحموود ئاگادار کرا کە «جەنابی کاپتـەن هۆڵت» ناتـوانێ ئامـادەی ئەو کۆبونەوەیە بێت و داوا دەکات: «بنوسە بۆ جەنابی موفەتیشی ئیداری سلێمانی تەشریف بهێنێ و لە گەڵیا ئیشتان جێ‌بەجێ بکەن».

لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ٩٢٩ شێخ نامەیەکی نارد وەبۆ موفەتیشی ئیداری سلێمانی و تیایدا لە بەشێکیدا دەڵێ:.. «ئەوا ئێمە دێین بۆ دێی وەڵـەسمت و ئەتـرافی، لوتفەن ئێوەش تەشریف بهێنن هەتا بەخزمەتتان بگەین و لەخوسوسی بەعزێ مەسائیلی موهیمەوە چەند سەعاتێ گفتوگۆو موزاکەرە لە خزمەتتان بکەین»(٣٠) لە وەڵامی ئەم نامەیەدا شێخ نامەیەکی هاوبـەشی لەلایەن موفـەتیشی ئیداری سلێمانی و ئەحمـەد عوسـمانی موتـەسـەریفەوە پێ گەیشت و دەڵێن: «لەبەر ئەوەی کە ئوتوموبیل ڕێی هاتنی نیە بۆ وەڵەسمت.. وامان بەموناسیب زانی کە مولاقاتمان لە دێی قاینەجە بێ».(٣١)

لە کۆبـونەوەی قاینەجەدا.. کۆلۆنێل لاین و میستەر شبرتی مودیری پۆلیس و ئەحمەد عوسمانی موتەریف هاوبەشی‌یان کردو لەگەڵ شێخ دا ب کەوتنە گفت وگۆ، بەڵام نەیان توانی بگەنە ئەنجامێك.. بۆیە کۆلۆنێل لاین بە شێخ دەڵێ: «مـن بە ڕاسـتـی وەکــو دۆستێك پێت دەڵێم ئەم جموجۆڵە سیاسی‌یەی ئێستا هەیەو حوکومەتی ئێمە هێناویەتە گۆڕێ، شتێکی کاتی‌یەو هەقت بەسەریەوە نەبێت، چونکە هیچی بۆ کورد تێدا نی‌یە. هەروەهــا دەڵێ: تکـام وایە بەقســەی کەس تەفرە نەخـۆیت، فورسەتی ڕامیاری کە هات خۆی دیارە.. ئێستا ژیانی خۆت بپارێزە».(٣٢)

لەم چاو پێکـەوتنەی شێخ دا ڕاستی‌یەك دەردەکەوێ ئەویش گفت و گۆیە لە بارەی ئەو جمـوجـۆڵـە سیاسی‌یەی لەو کاتـەدا کەوتـۆتـەوە.. جمـوجـۆڵـەکەش بە تەواویتی لەو نامەیەدا ڕوون دەبێتەوە کە کۆمەڵەی سەربەخۆیی ناردوویە بۆ شێخ مەحموود.. لە بەشێکی نامەکەدا دەڵێ: «موافیقی ڕاپۆرتی ٢٧ی نیسـانی ٩٢٩ کە لە مووسڵەوە بۆ کۆمەڵە هاتووە بەیان ئەکـا، ئەڵێ: زەریف تێ بگەن وەزارەتی بەغا لە ڕیاسەتی توفیق سویدی‌دا تەشـکــولی کردو ئەمــە ئەوەڵ هەنگــاوە بۆ قوبــوڵ کردنی موعاهەدەی بێ قەیدو شەرت، (بۆ چوونە بەرەو پەیمانی ٩٣٠) بینائەن عەلەیهی ئەوەڵ زەربەیە بۆ مەسئەلەی کورد».(٣٣)

ئەمەش گومانی تێدا نی‌یە کاتێك لە تەموزی ٩٣٠دا لەنێوان عیراق و بەریتــانیادا بەیمانـەکـە بەسـترا بەو مەبـەسـتـەی عیراق دەبێتـە وڵاتێکی سەربەخۆو دەچێتە کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە.. لە هاوینی هەمان ساڵیشدا بڕیار درا هەڵـبـژاردن دەست پێ بکـات. جەمـاوەری عیراق ملی‌نەدا بۆ پەیمانـەکەو وایان ڕاڤەکرد لە جاران زیاتر وڵاتەکەیان داگیر دەکرێ و ئەو تارماییەی لەسەر ناڕەوێتەوە.(٣٤)

ئەم بارو دۆخەش بوە هۆی ئەوەی ئینگلیزەکان ژمارەیەك لە کوردەکان ڕاست بکـەنـەوە بەرانبـەر عەرەبـەکان بە بیانوی ئەوەی پەیمانەکە باسی حوقوقی کوردی تێدانیە.. مەبەستی ئینگلیزیش لەمەدا هەر بۆ ئەوە بوە کە عەرەبـەکان بە کوردەکان بترسێنێ و پەیمانەکە مۆر بکەن. ئەوەبوو لە گشت ناوچەکانی کوردستان دا بروسکەی ناڕەزایی نێردراو خۆنیشاندان هەمـوو لایەکی گرتـەوەو کۆمەڵەی نەتەوەکانیش تێگەیەنرا. ئەمەش لەو بەیان نامەیەدا دەر ئەکەوێت کە کۆمەڵەی سەربەخۆیی بڵاوی کردەوەو لە برگەی چوارەمیدا دەڵێ: «ئینگلیز بۆ غایەیەکی سیاسی خۆی لەم بەینەدا پێنـج مەبعووسی(*) هاندا کە داوای ئەو حەقە بکەن (حەقەکەش خۆی زەبتی کردوە) عیراق ئەترسێنێ بەڵکە موعاهەدەکە ئیمزا بکەن». هەروەها لە برگەی پێنجەمیدا بەرانبەر مەبعووسەکان دەڵێ: «قەومی کورد ئەگەر غیرەتی بێ پشت بەم مەبعووسانە نابەستێ.. ئومیدی چاکەیان لێ ناکا، چونکە ئالەتی دەستی بێگانەن.. خۆیان هیچیان پێ ناکرێ تا ئەمریان پێ نەکەن لە بەینی خۆیاندا ئیتیحاد ناکەن.. کە مەبعووسەکانمان وابن چۆن هیوای چاکەمان پێ‌یان بێ».(٣٥)

ئەو وەزعە نوێ‌یە بوە هۆی ئەوەی موعتەمیدی سامی بەریتانی وەڵامی ئەو داوایانە بداتەوەو ئەو گومانەش لەسەر خۆیان لابەرن بەوەی ئینگلیز کوردەکـانی ڕاست کردۆتـەوە.. ئەوەبـو باوەڕپێکراوی سامی و جێگری سەرۆك وەزیرانی عیراق لە ٨ی ئابی ٩٣٠ ڕۆیشتنـە دیدەنی لیواکـانی کەرکـوك و هەولـێرو سلێمانی.. هەر یەکێ لەو دووانـە خوتبـەیان داو لەجیاتی حوکــومـەتـەکـانیان ئەوەیان دووبـارە کردەوە کە داوای کورد بەجێ‌یەو ئەوەی کۆمــەڵــەی نەتــەوەکـان بڕیاری لەســەر داوە پێ‌یان دەدرێ..(٣٦) ئەم وەزعــە نوێ‌یەی نێوان کوردو حوکــوومــەتی عیراق جارێکـی دی بوە هۆی ئەوەی کورد باوەڕی پێ‌یان نەمـێنێ و ناڕەزایی دەربـڕن بەرانبـەریان.. ناڕەزاییەکـەش شێوەی لە یەکدانی چەکداری گرتـەخۆ. ئەوە بوو لە ٦ی ئەیلوولی ٩٣٠ ئەو لەیەکدانە لەبەر دەرکی سەرای سلێمانی ڕوی داو لە نێوان پۆلیس و خەڵکــەکـەدا بو بە شەڕو

ژمارەیەکی تێدا کوژراو ژمارەیەکیش بریندار بو. بەم چەشنە ڕۆژی ٦ی ئەیلوول لە مێژووی گەلی کوردا، وەك ڕۆژی خەبات دژی ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی تۆمار کراو بوو بە نیشانەی دەست پێکردنی قۆناغێکی نوێ لە خەباتی دژواری دوا ڕۆژدا.[٣٧]

لە کاتی هەراکەی بەردەرکی سەرادا، شێخ مەحموود لە پیران بوو، دوای دوو ڕۆژ بەسەر ئەو شەڕە خوێناویەدا دوو کەس لە خەڵکی شار لە کوڕ کوژراوان گەیشتنە لای شێخ و پێیان وت: یا شێخ قورئان چە لە دەستابێ و چە لە ناو سنگا..

بەو قورئانەوە هاتووین، تۆڵەی شارەکەت ون مەکە. شێخ مەحموود بەم کارەساتە زامدار تربو، ئەمجارەش بریاری دا تۆڵەی گوللە بە گوللە بسێنێتەوە.[٣٨]

ئەم هەواڵە بوە هۆی خۆش کردنی ئاگری شەڕ لە نێوان هەردوو لاداو بەم هۆیەوە هەندێ لە ئەفسەرانی کورد لە ناو سوپای عیراقیدابوون هەڵهاتن و گەیشتنە لای شێخ.[٣٩]

لە سەرەتادا شێخ کە شوێنی دانیشتنەکەی پیران بو بە جێی هێشت و بە شارەزوردا کەوتە گەڕان و چاوی بە هەندێ پیاوی ناسراوی ناوچەکە کەوت.. ئەمەش ترسێکی گەورەی سەر لەنوێ خستە دڵی پیاوانی ئینگلیزو هەر ئەو هۆیەش بو، جارێکی دی پاڵی نا بە کاربەدەستانی حوکومەتی عیراق و ئینگلیزەوە کە هەڕەشە لە شێخ بکەن و داوای لێ بکەن بۆ پیران بگەڕێتەوە.. ئەمەش لەو دوو نامەیەدا دەردەکەوێ کە بۆیان ناردووە:

١ ـ نامەی وەزیری ناوخۆی حوکومەتی عیراق بە ژمارەی ٢٥١٣ی ڕۆژی ٢٠ی تشرینی یەکەمی ٩٣٠ کە لە بەشێکیدا دەڵێ: «ئێستا عەینی ئەوامیرتان بۆ تیکرار دەکەمەوە کە بۆ پیران عەودەت بکەنەوەو ئەختارتان ئەکەم بە گەیشتنی ئەم کاغەزە ئەگەر دەست بەجێ ئیتاعەتی ئەوامیری سالیفولزیکر نەکەن لە حەق خۆتان و ئەتباعتان ئیجرائات ئیتیخاز ئەکرێ».[٤٠]

٢ ـ نامەی مەندوبی سامی کە لە ڕۆژی ٢٠ی تشرینی یەکەمی ٩٣٠ بۆی ناردووە، بەڵگەیەکی دیە لەم ڕووەوە هەڕەشەیەکی نوێیەو دەڵێ: «منیش ئەمەوێ ئیشتیراکی ئەو ئەمرانە بکەم کە لە تەرەفی وەزیری داخلیەوە بە ئێوە دراوە.. بۆ ئەوەی فەورەن لە خاکی عیراق بچنە دەرەوەو ئیتر واز لە موداخەلە کردنی ئوموری حوکومەتی عیراق بهێنن».[٤١]

بەڵام شێخ گوێی بەم قسانە نەداو توانی لەشکرێك کۆ بکاتەوەو لە هەمو لایەکەوە قوتابی و خوێندەوار لە خەڵکی کوردستان بڕۆن بە پیریەوەو بچنە ژێرچەکەوە. دوای ئەوەی شێخ نامەیەکی نوسی بۆ مەندوبی سامی و داوای جێبەجێ کردنی ئەو بەندانەی کرد کە کاتی خۆی دابوویان بە کورد.. سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە خەباتی چەکداری و تا مانگی مایسی ٩٣١ درێژەی کێشاو هەندێك بەرهەمی باشی لێ وەدەست هێناو ناوچەی پێنجوین و شارباژێرو شارەزور ئازاد کران.. دواجار لەسەر داوای کەریم بەگی جاف و داود بەگی برایدا بەرەو ناوچەی گەرمیان ڕۆیشت، بۆ ئەوەی خەڵکی ناوچەکە یارمەتی بزووتنەوەکە بدەن و ئاوێتەی بن.. بەڵام بەهۆی خۆفرۆشی هەندی دەرەبەگی کورد نەیانهێشت ئەو بیرە سەربگرێ و لە دێی ئاوباریك لە ٥ی نیسانی ٩٣١ شەڕێکی قورس لە نێوان شۆڕشگێڕانی کوردو سوپای دوژمندا قەوماو شەڕەکە هەتا ئێوارەی خایاندو زیانێکی گەورە لە سوپای میری کەوت.

دوای شەڕەکە شێخ مەحموودو ئەو هێزە لە گەڵیا بو بەڕێگای قەرەداغ دا گەڕایەوە بۆ پیران.. دواتر لە ١٣ی مایسدا خۆی دابەدەستەوە. حوکومەتیش ڕازی بو بەوەی لێی بیورێ و لەهەرکوێیەك دانیشێت بۆی هەیە، تەنیا ناوچەی کوردستان نەبێت. لەپێشەوە ناردیان بۆ سەماوە..

پاشان گوێزایانەوە بۆ ناسریەو لەوێشەوە بۆ قەزای عانە.. دواجار لە ساڵی ١٩٣٣دا ڕەوانەی بەغدایان کردو لەوێ دانیشت.. دەستیشیان بەسەر موڵك وماڵیا گرت.[٤٢]

بەم شێوەیە شێخ مەحموود جارێکی تریش بەناچاری دەستی لە خەباتی چەکداری هەڵگرت. بەڵام بزووتنەوەکە دوای شێخ بە ماوەیەك کوژایەوەو سوپای عیراق لەسەرەتای مایس دا توانی ناوچەی پێنجوین و شارباژێر بگرێتەوە ژمارەیەك مەخفەری لەو شوێنانەدا دروست کرد.. بۆ ئەوەی بتوانێ بەهۆیانەوە پارێزگاری لەناوچەکە بکات. پاشان گشت ئەو عەشایەرانەی لەگەڵ شێخ دا هەڵسابوون بەبێ هیچ مەرجێك خۆیان دا بەدەستەوە.. بەمە سوپای ڕژێمی پاشایی بەیارمەتی هێزی ئاسمانی بەریتانی جارێکی تر بەسەر بزووتنەوەکەدا سەرکەوت.[٤٣]

شەڕی ئاوباریك دوا نارەزایی چەکداری کورد بوو لەسەردەمی شێخی نەمردا.. ئەمەش بەراتبەر ئەو هەڵوێستە نالەبارە بوو کە ئینگلیزو حوکومەت گرتیان بەرانبەر مەسەلەی کوردو چارەسەر نەکردنی.

## پاشکۆکان

---

### ئەلف ـ بەڵگەنامەی یەکەم

ـ لەپاش عەرزی تەعزیمات و خلوسیەتی تام.. جەنابی سەید ئەحمەد ئەفەندی سەلامی عالیتانی تەبلیغ کرد.. زۆر زۆر مەمنون بووم و زۆر موفتەخیرم کە مادی و مەعنەوی ئیخلاسێتی خۆم بەرامبەر حوکومەتی فەخیمە ئیبرازکرد، وەلیتان مەعلوم بو.

تەحریراتێك لەتەرەف جەنابی کۆلۆنێل واڵسەوە بەحیمایەتی سەید ئەحمەد ئەفەندی هاتبو گەیشت.. مەعلومی کرد لە حەزرەتی ئێوە مەعلومە، ئەم کیتابە کە دەوامی ئەم حەرەکاتە ئەکات لەبەر غەصبی

مەلیك ویا تەئمینی مەنفەعەتێکی شەخصی نیە، موقابیل بەحوقوقێکی مەشروعی میلی‌یەوەیە. وەئەم حوقوقەش لەتەرەف عوسبەتول ئومەمەوە تەقەروری کردوە، کەبە مەوافیقی رەغبەتی خۆمان ئیدارەیەکمان بۆ تەشکیل بکرێ. وەرەغبەتی عومومی کوردیش لە تەقریری هەیئەتی مەبعووسەی عوسبەتول ئومەمەوە لە صەحیفەی ١٧، ٢٩، ٣٠، ٣٣، ٥٤، ٥٥، ٩١، ٩٦دا بەیانی موقەرەراتیشی لـ٥ی تشرینی ئەوەڵی ساڵی ٩٢٦ وەنومرە ٤٤٢٩ بەجەریدەی ئەوقاتی بەغدادی رەسمەن ئیعلان کراوەو لەتەرەف سەید ئەحمەد ئەفەندی‌یەوە بەتەحریراتی ٢٣ی تشرینی ئەوەڵی ساڵی ٩٢٦وە لە ٢٩ی کانوونی ئەوەڵی ٩٢٦ عەرزکراوە کە بە غەیری ئەم مەسئەلەیە بەهیچتەرقەناعەت کردن قابیل نیە.

بینائەن عەلەیهی ئیستیرحام لە ئیرادەی فەخامەتی باش قوماندانیش ئەمەیە کەتەوەسوت بفەرمون وەکو عەرز کراوە ئەم مەسئەلەیە داخلی موزاکەرە بکرێ وەنیشان بدرێ ئەم مەوادە ئەساسیانە کەعوسبەتول ئومەم داینـاوە، چۆن تەتبیق ئەکرێو شکلی ئیدارەی کوردستان چۆن ئەبێ و زمانی تەتبیقی کێ ئەبێ، تیدا بەیان بکرێ. وەبۆ ئیقامەتی ئەم کیتلەیە کە لە بەندە ئینفیکاکیان غەیری قابیلە ناحیەی پێنجوین تەرك بکرێ.. ئەو وەقتە بەندەیش تەعەهوداتێك کە لەتەرەفی جەنابی سەید ئەحمەد ئەفەندی‌یەوە کراوە، تەکالیفات و تەئمیناتێك کە لە بەندە ئیدیعا کراوە کامیلەن قوبوڵ ئەکەم.. ئیتر قوبوڵی تەعزیاتم تەمەننای ئەکەم.

## بێ - بەڵگەنامەی دووەم

کاغەزی جەنابت کە بە تەئریخی ٢٩ی کانوونی ثانی ٩٢٧ نووسراو، بیم گەیشت لەبەر بەفرو باران لەپۆستەدا تاخیر کرابو.. لە ئەم کاغەزەدا جەنابت دەفەرموون کە تەعەهوداتێك کە لەتەرەف سەید ئەحمەد ئەفەندی‌یەوە قوبوڵ کراوەو تەکالیفات و تەئمیناتێك کە لە جەنابت تەڵەب کراوە کامیلەن قوبوڵ دەکەن بەشەرتێ کە حوقوقێکی مەشروعی میلی کە لە تەرەف حوکومەتی بەریتانیای عوزماوە موقابیل بەعوسبەتول ئومەم تەعەهود کراوە داخلی موزاکەرە بکرێت.. جەنابت دەکرێ بەعزێ مەوادی تەقریری هەیئەتی مەبعووسەی عوسبەتول ئومەم دەکەنو ئیدیعا دەفەرموون کەئەم حوقوقی میلی‌یە لە ئەو مادانەدا بەیان و لەتەرەفی حوکومەتی بەریتانیاوە قوبوڵ و تەتبیقیان رەسمەن ئیعلان کرابوە.. لەپاش موتالەعەی ئەم مەوادانە وەها دێتە خاترم کە جەنابت وەها تێ دەگەن کە کوردەکانی کوردستانی جنوبی ئیدیعایان کردوە کە نابێت مەملەکەتیان داخلی عیراق بکرێت و حوکومەتی بەریتانیاش ئەم ئیدیعایان قوبوڵ کردوە.. یا عەزیزم زۆر تەعەجوب دەکەم کە جەنابت بەم صورەتە لە حەقیقەتی ئەم مەسئەلەیە تێگەیشتون و مەجبورم ئەم خیتابە بە توولی عەدەمی ئیرتیباتتان لەگەڵ ئوموری دونیا نەسەب بکەم و قەراری نیهانی هەیئەتی مەبعووسەی عوسبەتول ئومەم کە لە تەرەف عوسبەتەوە قوبوڵ کرابوە لە صەحیفەی پانزدەی تەرجومەی عەرەبی تەقریریان بەم صورەتە نووسراوە.

١ - «هناك حججا مهمة تساعد على ارتباط كل منطقة من جنوب خط بروكسل بالعراق ومن تلك الحجج خصيصا الحجج الجغرافية والاقتصادية والشعور (مع كل التحفظات المذكورة) على ان تراعى الشروط الاتية:

٢ - ويجب مراعاة رغبات الاكراد فيما يخص تعيين موظفين اكراد لادارة مملكتهم وترتيب الامور العدلية والتعليم في المدارس وان تكون اللغة الكردية لغة رسمية في هذه الامور..

بەم صورەتە عوسبەتول ئومەم گوێیان نەدەدا بەو ئیدیعایە کە جەنابت دەڵێن ئیدیعای عومومی کوردەو قەراریان فەقەت ئەمە بود کە دەبێت رەغبەتی کوردان بۆ تەعینی مەئمورانی کوردی لە مەنتیقەی خۆیان و بۆ ناسینی کوردی بە زوبانی رەسمی رابگیرێت.. حوکومەتی بەریتانیاو حوکومەتی عیراق ئەم قەرارە مەحدودەی قوبوڵ و تەتبیقیان کردوە.. هیچ قسەی ئیستیقلال وەیان ئیدارەی مەحەلی بۆ کوردستان نەبوەو نی‌یە.. وە ئەم نوقتە وازیحە بە سەید ئەحمەد بەیانم کردوە.

ئێستا دەبێت لێتان تەڵەب بکەم کە جەنابت بە بێ تاخیر جەوابێکی قەتعیم بۆ بدەن کە ئەم شەراییتە بە سەید ئەحمەد ئەفەندی دراوە قوبوڵی دەکەن یان نە.. ئەگەر قوبوڵیان نەفەرمون مەجبور دەبم فەوردن نەسیحەت بە حوکومەتی عیراق بدەم کە ئەملاکتان بفرۆشن و ئەم فورصەتە بۆ گرتنیانەوە لە دەست دەچێت.

## جیم - بەڵگەنامەی سێیەم

- لە پاش تەقدیمی ئیحتیرامات و خلوسیەت.. ئەمرۆ نامەی جەنابتان بە واسیتەی سەید ئەحمەدی مودیری سروچك گەیشت.. لە جیهەت تەبریکم کە لوتفتان فەرمو بو زۆر مەسرورو موتەشەکیر بوم.. من مودەیێکە لێرە، لە هەولێریش گەلی سەعیم کرد بۆ ئیستیراحەتی جەنابتان.. فەقەت مەعەلتە ئەسوف چونکە لیوای ئێمە غەیری لیوای ئێوەبو، بە هیچ شتێك مۆفەق نەبوم. ئەم ئەحوالاتەو ئەم حالە موئسیفە کە دەرحەقی جەنابتان و خزمتان و سادات روی داوە، من زۆر کەشفم کردوەو زۆر چاك ئەزانم هیچ لە حوکومەتەوە نیە، هەمووی لەبەر موعتەمیدەکانی خۆتە کە ئیعتیمادیان پێ ئەکەیت و بە قسەیان ئەکەیت، لەنەتیجەدا شەخسی خۆت و سادات موتەزەریر ئەبن و مەحو ئەبنەوە، ئەوی ناخۆشەویستی جەنابتان بێ موستەفید ئەبێ.

رجات لێ ئەکەم لە دونیادا هیچ شەخسێك هەیە خۆی فیدای سەعادەتی خزمی خۆی وەیا عەشیرەتی خۆی بکا بۆ ئیستیفادەی عەدوی

خۆی. . ئەمە لوتفەن خۆتان تەحلیل و حەلی بفەرموون.

من چاکم بۆ مەعلوم بووە چاکیش ئەزانم هەر کەسێ ئیستیشارەی پێ ئەکەی ئەمینم سەوقی ڕێگای چاکت ناکا. . تەریقی تەفەکور بفەرموون.

ئەو حوکوومەتە موعەززەمەی بەریتانیا کە ئەمرۆ شەرق و غەرب لە ژێر سەتوەتیا لەبەری پێ یا وەکو مێشولە وایە، چەلوتفێکی دەرحەق بە جەنابت کردو موقابیل ئەم لوتفە چە ئەزیەتێکی لە جەنابتانەوە دی. . عەلاوەتە هەر ئەزیەتێکی لە جەنابتانەوە دی ئەغماضی لێ کردو هەر لوتفی نیشان داو هەر قەرارێکی دا جەنابتان لەسەری نەوێستان و ئەباتتان نەکرد تەفسیلاتی ئەم حالاتە کە لە ئیحتیلالەوە هەتا ئەمرۆ ڕوی داوە کە حوکومەت لوتفی کردووە موقابیلت لە جەنابتان هەر زەرەری دیوە.

ئەو ئیخفـالاتـەی تورك دەرحـەقی بە جەنـابتـانی کردووە خیانـەتی مەعیەت و ئەترافتان کە لە گەڵ جەنابتان کراوە ئەگەر هەمووی بنووسم کتێبێکی لێ دێتـە وجـود. لە عیراقـد لە ئێران، لە تورکیا هەر کەسێ موخـابەرەو موکالەمە لە گەڵ جەنابتان بکاو ڕوی ئیخلاس نیشان بدا، تەصـدیقم بکـە ئارەزووی مەحویەتتان ئەکاو ئەمرۆ کەم کەس هەیە لە موعـامـەلاتی جەنابتان مەمنون بێت و لە عوموومی حوکوومەتی عیراق و ئێران و تورك ئەمین بن.

لەحوکوومەتی عیراق و بە ریتانیا بۆئێوە موشفیقتر نیەو ئەسبابی شەفەقەتیان بۆ بەیان بکەم. تائێستا حوکوومەت نەی ویستووە مەحوتان بکاتەوە، وە ئیلا دەرحاڵ مەحووی ئەکردنەوە.

مەعلومی جەنـابتـانـە ئۆزدەمـیری سەگێ کە لە ڕەوانـدوز بو، عومـومی کوردستان و بە تکە ئەنویەی سائیرەی عیراقیش زیمنەن تەرەفداری بوون.

حوکومەت بە یەك حەفتە خاریجی حودود تارومار کرد.

حوکومەت موشفیقە ئەیەوێت جەنابتان بە دەستی مەحو نەبنەوە. . وە ئەم حالاتە کە نەتیجەی هاتە سەر ئەم ئیتیفاق نامەیە کە سەید ئەحمەد لە بەغـدا کردوییتی ئێستا تەغیری ئەم ئیتیفاق نامەیە غەیر مومکینەو ڕەفز کردنیشی بۆ ئێوە ئەزانم سەبـەبی مەحـوی‌یەتـە. . غەیری قوبـوڵی ئەو موعـاهـەدەیە بە هیچ ڕێگـای تر نیە. ئەگەر ئیستیراحەت و سەعادەتی خۆتان و عائیلەتان و ساداتتان ئەوێت ئەم موعاهەدەیە ئیمزا بفەرموون و بە موجیبی عەمـەل بکـەن. مودەیێك ئیستـیراحـەت بفەرموون. . ئەو سوئی تەفاهومەی بەینی حوکوومەت و جەنابتان ڕەفع بێ و حوکوومەت ئیعتیماد بە جە نابتان بکا. . ئەو وەقتە قابیلە موراجیعەت بکەن و تەوسیعی ئیستـراحـەتی خۆتـان بکـەن و مەئموری وەکو ئێمەو حەزرەتی جەنابی موفەتیشی ئیداری حەقی کەلاممان ئەبێ کەبە مافەوقی خۆمان بگەیەنین.

فەخـامـەت مەئـاب حەزرەتی مەنـدوبی سامی زۆر ئیزهـاری لوتفی لەدەرحـەقی جەنـابتـان فەرمـو، لەنـەتیجـە قەلبی ئەو زاتـە موحتەرەمە گەورەیەشتان ڕەنجیدە کرد.

هەرتـەتیب خاتری ئەو زاتە موعەززەمە بۆ ئێوە تەئمینتان ئەکەم لە هەمو لیوای سلێمانی و لە عومومی کوردستان گەورە ترە. هەربۆ تەتیب خاتری ئەو زاتــە موحتـەرەمـە ئەبێ ئەمـری نەشکێنن وەعـەجـە لەجـەوابم بۆ بنووسنەوە.

## پەراوێزەکان:

١ ـ عبد الرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، ط٢، ج٢، بيروت ـ لبنان ١٩٨٣، ص ١٥٠

٢ ـ عبد الرحمن البزاز، العراق من الاحتلال حتى الاستقلال، ط٣، بغداد ١٩٦٧، ص ١٦٦.

٣ ـ عبد الرزاق الحسني، سەرچاوەی ناوبراو، ل١٥٩.

٤ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. . ڕۆژی ٢٥ نیسانی ٩٢٦.

٥ ـ بەڵگەنامەی ژمارە ٧٧٣/٧. . ڕۆژی ای مایسی ٩٢٦.

٦ ـ هەمان سەرچاوەی ناوبراو

٧ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. . ساڵی ٩٢٦، بێ ئەوەی ڕۆژو مانگی لەسەر بێت.

٨ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. . ڕۆژی ١٦ی ئەیلوولی ٩٢٦.

٩ ـ هەمان سەرچاوەی ناوبراو

١٠ ـ هەمان سەرچاوەی حەوتەم

١١ ـ بەڵگەنامەی بێ‌ژمارە. . ساڵی٩٢٧، بێ ئەوەی ڕۆژو مانگی لەسەر بێت.

١٢ ـ عبد الرحمن البزاز، سەرچاوەی ناوبراو، ل٢٩١.

١٣ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. . ساڵی ٩٢٧، بی ئەوەی ڕۆژو، منگی لەسەر بێت.

١٤ ـ هەمان سەرچاوەی ناوبراو.

١٥ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. . ساڵی ٩٢٧. . بێ ئەوەی ڕۆژو مانگی لەسەر بیت.

* ـ لەو سەردەمەدا تەنیا لەناوچەی سلێمانی خوێندن بە کوردی بووە.

١ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. . ڕۆژی ٤ی نیسانی ٩٢٧.

١٧ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. ڕۆژی ٦ی نایاری ٩٢٧.

١٨ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارەو ساڵ

١٩ ـ «ژیان»، سلێمانی، ژمارە ٢٦٢ ڕۆژی ٦ی تشرینی ساڵی ٩٣٠، ل١، ٢.

٢٠ ـ هەمان سەرچاوەی ناوبراو، ل٢.

٢١ ـ ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی دووەم، ل١٥٥، ١٥٩.

٢٢ ـ هەمان سەرچاوەی ناوبراو، ل١٥٨، ١٥٩.

٢٣ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. . ڕۆژی ١١ی کانوونی دووەمی ٩٢٨

٢٤ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. . ڕۆژی ٢١ی کانوونی دووەمی ٩٢٨

٢٥ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. . ڕۆژی ٣٠ی کانوونی دووەمی ٩٢٨

٢٦ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە. . ساڵی ٩٢٩. . بێ ئەوەی ڕۆژو مانگی لەسەر بێت.

٢٧ ـ هەمان سەرچاوەی ناوبراو.

٢٨ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە . . ڕۆژی ٢٣ی تشرینی یەکەمی ٩٢٩

٢٩ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە . . ڕۆژی ٢٦ی کانوونی دووەمی ٩٢٩

٣٠ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە . . ڕۆژی ٢٢ تشرینی دووەمی ٩٢٩

٣١ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارەو ساڵ .

٣٢ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارە . . ساڵی ٩٢٩ .

٣٣ ـ بەڵگەنامەی ژمارە ٤ . . ساڵی ٩٢٩ . . بێ ئەوەی ڕۆژو مانگی لە سەر بێت .

٣٤ ـ عبدالرزاق الحسني ، سەرچاوەی ناوبراو، ل٢٣٠

* ـ بۆ زانینی ناوی ئەو مەبعووسانە بڕوانە : ئەحمەد خواجە ، چیم دی ، بەرگی دووەم ، ل٥٩ ، ٧٨ .

٣٥ ـ بەڵگەنامەی بێ ژمارەو ڕۆژ . . بەیانێکە لەلایەن کۆمەڵەی سەربەخۆیی دەرکراوە .

٣٦ ـ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : «ژیان» ، سلێمانی ، ژمارە ٢٧٩ ، ٢٥٩ ، ٢٤٩

٣٧ ـ دکتۆر قاسملو ، کوردستان و کورد ، ل٨٠ .

٣٨ ـ ئەحمەد خواجە ، چیم دی ، بەرگی سێیەم ، ل٩٢ .

٣٩ ـ هەمان سەرچاوە ، ل٩٥ .

٤٠ ـ «ژیان» ، ژمارە ٢٦٢ ، ل١

٤١ ـ هەمان سەرچاوە ، ل٢ .

٤٢ ـ عبدالرحمن البزاز ، هەمان سەرچاوەی ناوبراو ، ل٢٩١

ـ لە ساڵی ٩٣٩ یاسای گێڕانەوەی ئەومولك و ماڵانە دەرچووو ، دایانەوە بە شێخ مەحموود .

بۆ ئەمە بڕوانە : عبدالرحمن البزاز ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل٢٩١ .

٤٣ ـ لغة العرب ، جـ٢ ، ص٤٧٩

ـ هەمو ئەو بەڵگەنامانەی لەم باسەدا ناویان هاتووە لای خۆم پارێزراون .

# بعض الحقـائق عن اتفاقية عام ١٩٢٧ بين الشيخ محمود والسلطة الملكية

كمال نوري معروف

يتحـدث البحث بصورة موثقة عن نضال الشيخ محمود ضد الانكليز واعوانهم في اواخر العشرينات، ومارافق ذلك من احداث مهمة ادت في نهاية الامر الى التوقيع على اتفاقية عام ١٩٢٧ بين الشيخ والسلطة الملكية القـائمـة يومذالك، وباشراف مباشر من البريطانيين الـذين لم يألوا جهدا الا وبذلوه من اجل وضع نهاية لنضال الشيخ محمود . .

ونتيجة للمعاملة غير الطيبة التي تلقاها الشيخ من رجال السلطة بعد الاتفاقية وملاحقته وبايعاز من البريطانيين . . ظهرت خلافات جديدة بين الطرفين دون التوصل الى نوع من الاستقرار والطمأنينة في ربوع المنطقة .

ومن خلال هذه الحالة برز الى الوجود رجال ضعفاء على الساحة الكردية كانواقد باعوا ضميرهم الى السلطة انذاك ليستخدموا ندا للشيخ الكبير.

ومـع هذا فقـد عاد الشيخ مرة اخرى الى مراسلة الرجـال البريطانيين ليضغط عليهم لتنفيذ مطالب الاكراد الخاصة بحقوقهم القومية . الا ان محاولاته باءت بالفشل بسبب عدم استماع الساسة البريطانيين الى مثل هذه الأقوال .

وحينما طلب الشيخ محمـود الاجتماع بهم لمناقشة الموضوع، نجح في محاولته واجتمع بهم . . الا ان طلباتـه رفضت مرة اخرى . . وأدى هذا الى ظهور انتفاضة عام ١٩٣٠ في السليمانية . . وتجـدد الاشتبـاكـات بين الطرفين وانتهت بمعركة (ئاوباريك)، وتسليم الشيخ نفسه الى السلطة ونفيه الى جنوب العراق .

# سەرەتاکانی ئەدەب

# و

# ئەدەبی گێتی ی کۆن

● دوکتۆر مارف خەزنەدار ●
مامۆستای کۆلێجی ئەدەبیات
بەشی کوردی ـ زانستگای صلاح الدین

**پێشەکی**

ـــــــــ :ـ

لە سەرەتـای هەشتاکان دا کە لە زانستگا دوور خرامەوە، هەموو شتێکم خستــە لاوەو تەنیـا خەریکی ئەدەبی کوردی بووم. بۆ ئەمـە دەبوو بیمەوە بە قوتابی ی ڕاستەقینە ـ ئەگەرچی هەمیشە هەر قوتابیم ـ و مێـژ ووی ئەدەبی گێتی فێـر ببم، چونکـە بەرهـەمی ئەدەبی لە هەمـوو گێتی دا هەر یەکێکـە، پیـاو مێـژ ووی ئەدەبی گێتی نەزانێ، نازانێ بە چاکی مێـژ ووی ئەدەبی نەتـەوەی خۆی بنووسێتەوە، ئەمە وەکـو مێـژ ووی گشتی نی یـە، بۆیـە مێـژ وونـووسی کورد دەتـوانێ مێژ ووی فیلیپین نەزانێ و لە مێژ ووی نەتەوەی خۆی سەربکەوێ.

هەر لەبـەر ئەوەش بوو ڕووم کردەوە ئاوارەیی، بۆ زانستگـاکـانی دەرەوەی وولات. لەوێ مێـژ ووی ئەدەبی گێتی و ڕەخنـەی ئەدەبی و ئەدەبی بەراووردکـاریم پێ سپێـردرا، لە پاشـانـا لە سەر داوای خۆم دوو کۆرسی ئەدەبی منداڵانیشم ووتەوە.

زانـسـتگـاکـانی دەرەوە مەشقێکی چاك بوو بۆمن، هەنـدێ شت فێر بووم بە تایبەتی بیروڕای فەیلەسووف و ڕەخنەگرەکانی ئەورووپای ڕۆژئـاوا، لە ناو ئەمـانـەش دا فەیلەسووف و ڕەخنە گرەکانی فرەنسا جێگەی دیاریان هەبوو.

ئەم باسـە نویشـك و ڕەنگـدانـەوەی هەنـدێ لە موحـازەرەکانی «مێـژ ووی ئەدەبی گێتی»یـە کە لە ساڵی سێیەم و چوارەمی بەشی ئەدەبی عەرەبی ئامـۆژگـای زمـان و ئەدەبی عەرەبی لە زانستگـای عەنـابەی جەزائیر دەمووتەوە. ئەوەی پێویـستە بووترێ ئەوەیە کە من هەر خۆشم بەرنامە و پلانی ئەم دەرزەم دانا.

## لە سەرەتادا ئەدەب تەنیا شیعر بووە

شیعـر یا هونـەر هەستی ناوەوەی ئادەمزادە بەرامبەر بە سروشت، هەر لەو کاتـەش دا ئادەمـزاد بەشێکە لە سروشت، بوون و نەبوونی سروشت ئادەمزاد دیاری دەکا؛ شیعر شەپۆلێکی نهێنی ی گیانی یە، کزەبایێك یا خورپەیێك لە مێشکەوە هەڵی دەقوڵێنێ و لە پێچ و پەنای دڵ و دەروون دا شنە دەکا، شیعر بینینی تایبەتی ی وێنەی «بوون»ە چاوی شاعیر هەستی پێ دەکا. ئەمە ڕووداوە، ڕووداویش لە جێگە و کات پەیدا دەبێ، لە پاشانا لە جێگە و کات دەچێتە دەرێ و دەبێ بە بوونێکی هەمیشـەیی (مطلق) و هەر و هەر بەکـار دەهێنرێ و کۆن نابێ و لە کەڵکیش ناکەوێ. بەم پێ یە شیعر «هەست»ە و «ووشـە» نی یە.

شیعـر هەست کردن بە جوانی یـە، دروست کردن و دۆزینـەوەی جوانیش لەگـەڵ پەیـدا بوونی ئادەمـزاد لە سەر ڕووی زەوی کەوتۆتە ناوەوەو بووە بە بەشێك لە بوونی. گەلێ میلیۆن ساڵ ئەم دیاردەیە لە

ناوەوە بووە، بێ ئەوەی ئادەمـزاد ڕێگـەیـێـك یا شێـوازێـك یا کەرەستـەیێـك بدۆزێتـەوە بۆ تۆمار کردنی. ئەمە هەمووی ئەودەورو سەردەمـە دوور و درێـژەیـە، لە ڕۆژانی پەیـدابـوونی ئادەمزادەوە تا ڕۆژگاری داهێنانی کەرەستەی تۆمار کردن، ئەو ڕۆژگارە گەورەترین جەژنی سڤیلیـزاسیـۆنی ئادەمـزاد بوو، دروشم و نیگـار و شکڵی ئەندازیاری بوو بە وێنەی «دەنگی قسە»، لە پاشانا ناویان نا «تیپ» (لە تایپەوە)، ئەو ڕۆژگارە دوور و درێژە «پێش مێژ وو»ی پێ دەڵێن.

بەم پێیـە مێـژ ووی داهێنـانی ئادەمـزاد لە هەمـوو سووچێکی ژیان دا دەکرێ بە دوو بەشەوە:

(١) داهێنانی پێش مێژ وو:

(٢) داهێنانی پاش مێژ وو.

## داهێنانی پێش مێژ وو

پێش مێـژ وو ئەو ڕۆژگـارە دوور و درێـژەیـە کە ماوەیێکی یەکجار فراوان دەخـایێنێ لە مێـژ ووی پەیـدابـوونی ئادەمـزاد لە سەر ڕووی زەوی، ئەمە لەو ڕۆژگارەوە دەست پێ دەکا کە ئادەمزاد خۆی لە سەر ئەم ئەستێـرەیـە دیـدە تا ئەو سەردەمەی کەرەستەی تۆمار کردنی بیر و هەستی داهێناوە.

بە مەزەنـدە و تاقی کـردنـەوە دەتـوانین هەست بە ژ یـانی گیـانی ئادەمـزادی ئەو ڕۆژگـارانە بکەین و لە سەر دەمی ئێستامان دا دەری برین، چونکە هیچ هەواڵێکی ئەودەورە تۆمار نەکراوە لە بەر نەبوونی کەرەستـەی تۆمـار کردن. بەم پێـیـە وەکو دەردەکەوێ ئادەمزاد تاقی کردنـەوەیێکی یەکجـار پان و بەرینی بووە، ڕاستـە تەمەنی داهاتنی «وێنە بۆ تۆمار کردن» لە پێنج هەزار ساڵ کەمتر و لە شەش هەزار ساڵ زیاتر نی یە، وە ئەم ماوەیە لە ڕووی پێشکەوتنەوە شایانی ئادەمزادی بلیمـەت و بە توانـایە، بەڵام دیارە ئەوسی وشەش هەزار ساڵەی کە لە ئادەمـزادی نیـانـدرتاڵەوە دەست پێ دەکا تا سەرەتای پەیدا بوونی وێنـە و بەڵگـەی تۆمـار کردنی «مـانـای شت»و «دەنگی قسـە» کە لە ساڵی ٣٦٠٠ی پێش مەسیـح داهـاتـووە، دەڵێن ماوەی ئەوسی و شەش هەزار ساڵە سەردەمی مەشقێکی یەکجار قووڵ و بەرز و پڕ لە تاقی کردنـەوەیـە، بە میـرات لە نەوەیێـك بۆ نەوەیێکی تر ماوەتەوە، بەبێ ئەوەی تۆمار بکرێ،

بەم جۆرە ئادەمـزاد زیـاتـر لە پێنـج هەزار ساڵ پێش ئێستـاکە لە پلەیێکی بەرزی زانستی دا بووە، نەك بە بەڵگـەی ئەو پاشمـاوەیـەی ئەرکیـۆلـۆجی (آثار) بۆمانی دەگێڕێتەوە، بەڵکو بەوەی کە ئەلفوبێ ی داهێنـاوە بۆ تۆمـار کردن. بێ گومـان داهێنـانی ئەلفـوبێ لووتکـەی پێشکەوتن و گۆڕران و سڤیلیزاسیۆن بووە.

ئەگـەر بەشێکی مێشکی ئادەمـزاد بیـر و هۆش و عەقـل بووبێ و هەمیشـە بۆ چاك کردنی باری ژ یـان و گوزەران بەکاری هێنا بێ، بە تایبـەتی دژ ی سروشت بۆ سوود وەرگـرتن لێ ی، بەشـەکـەی تری هەسـت و نەسـت و دەروون بووە، ئەمـە شاعیـرێکی بەرزی لێ دروست کردووە، لەو ڕۆژەوە کە مێ یینە و نێـرینـە بۆنی یەکتـریـان کردووە و هەر یەکـەیـان بووە بە تەواوکـەری ئەویتـریان، دڵداری ی یەکـەم پەیـدا بووە. ئەم دڵـداریـیە لە ناوخۆشی و ناخۆشی ی ژ یان تواوەتـەوە. ئنجا هەست کردن بە جوانی ی سروشت هاتۆتە ناوەوە: شەوی تاریـك و ئاسمـان و ئەستێـرەکـانی، ڕۆژهـەڵاتن و ڕۆژ ئاوا بوون لە لووتکەی شاخ و ئاسۆی بیابان و زەریا و ئۆقیانووسەکانەوە، مانگ و ڕۆژ، شاخ و کێو و هەردو دەشت و دەر، ئەشکەوت و دۆڵ و دارستان، جۆگەلە و زێ و ڕووبار و قەلبەز و سولاوکە، بەفر و باران، بڕووسکـە و هەورەتـریشقـە و تۆفـان و بوومەلەرزە و بورکان، ڕۆژ و مانگ گیران...

ڕەنگـە شیعـر لە یەکـەم بینینی جوانی ی ئادەمزاد و گوڵ دروست بوو بێ، ئادەمزاد کە چاوی بە جوانی ئادەمزاد (بە تایبەتی مێ یینە) و گوڵ کەوتووە، خورپە لە دڵی هەڵساوە و بزە لە سەر لێوی نیشتووە، ئەمە یەکەمین شیعری تۆمار نەکراو بووە، چونکە لە بنەڕەت دا شیعر «هەست»ە، پێش ئەوەی «ووشە» و «قسە» بێ.

ئەگەر ئادەمزاد هەر لەو ڕۆژەوە کە هەستی کردووە و خۆی ناسیوە شاعیـر نەبـووبێ، لەگەڵ سروشتی دروست بوونی ڕێك ناکەوێ، چونکـە ئادەمزاد بەبێ هەست ئادەمزاد نی یە. هەر لەبەر ئەوەشە ئەو تاقی کردنەوە دوور و درێژە بۆتە هۆی ئەوەی توانایێکی تەواوی هەبێ بۆ داهێنـان و بەرهـەمی نایـابی دەوری کۆن تۆمار بکا، لە وڵاتانی مێـزۆپـۆتـامیـا (وڵاتـانی نێـوان دوو ڕووبـار = عیـراق)، میسـر، هیندستان و چین ئەدەبێکی بەرز بێتە کایەوە.

## داهێنانی پاش مێژ وو

بەرهـەمی داهێنـانی سەرەتای پێش مێژ وو ناوی دەنێین «ئەدەبی ئەنتیکی» یا «ئـەدەبی گێتی ی کۆن»، ئەمـە ئەو ئەدەبـەیـە کە تۆمـار کراوە، واتـە ئەو داهێنـانـەی لە پاش پەیـدا بوونی کەرەستـەی تۆمار کردن کەوتـۆتـە ناوەوە تا دەوروبـەری بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام. ئەدەبی ئەنتیکی بە زمـان و دیـاڵێکتی جیـاوازی هۆز و میللەت و نەتـەوەکـانـی ئەو سەردەمـانـە پەیـدا بووە، هەر لە سەردەمی

سەرهەڵدانی کەرەستەی تۆمار کردن تا دەور و بەری ئیسلام گەلێ زمان و دیالێکتی زمان لە رۆژگارێك پەیدا بوون و لە سەردەمێکی تردا دوایی یان هات و رێگەیان بۆ زمان و دیالێکتی زمانی تر خۆش کرد و بەرهەم بەم زمانانەش کەوتە ناوەوە، ئەمانەش دوایی یان هات و زمان و دیالێکتی زمانی تر کەوتنە ناوەوە.

ئەم بەرهەمە کۆنانە بە زمانی سەردەمی خۆیان تۆمار کران و ئێستا باویان نەماوە و بوون بە سامانی مێژوو و بە میرات بۆ خەڵکی هەموو ئەو زمان و دیالێکتانە مانەوە کە لە بنج دا لەوانەوە لە دایك بوون. ئەمە هەموو زمانە ئەنتیکە کۆنەکان دەگرێتەوە ئەوانەی لە کار کەوتن.

بێ گومان دەسکەوتی ئەدەبی کۆن بە سامانی هەموو ئادەمزاد دەژمێررێ، بە تایبەتی کتێبە ئایینی یەکان بە تێکرایی ئەوانەی بە زمانێك نووسراونەتەوە و ئێستا لە کار کەوتوون (ڤیدای سانسکریتی، ئاڤێستای زمانی ئاڤێستایی) یا ئەوانەی زمانەکانیان زیندووە و تا ئێستا ماونەتەوە (تەورات، ئینجیل، قورئان).[1]

ئەوەی پێویستە لێرەدا بوترێ ئەوەیە کە قورئان دیاردەیێکی تایبەتی یە لە بیری ئادەمزاددا. قورئان لەگەڵ شیعری عەرەبی کە دوو سەد ساڵێك پێش ئەو پەیدا بووە، زمانی عەرەبی دەکەن بە کۆنترین زمانێکی سەر رووی زەوی کە بە زیندوویی مابێتەوە و گۆڕرانی بەسەرا تێپەڕی بێ و بەرزترین نموونەی قسەی جوانی پێ نووسرابێتەوە.

بیر کردنەوە و دۆزینەوەی راستی و داهێنانی هونەری و ئەدەبی یەکێکە لە نزیکترین خاسیەتێکی کە هەموو ئادەمزاد وەکو دیاردەیێکی وەکیەکی دەخاتە روو. بەم جۆرە داهێنانی شاعیر لە هەموو جێگە و دەوروڕۆژگارێك دا راستە داهێنانێکە بۆ ئەو نەتەوەیەی کە بە زمانەکەی نووسراوەتەوە، بەڵام هەر لەو کاتەدا بۆ هەموو مرۆڤایەتی یە. بە تایبەتی بەرهەمی ئەدەبی کۆن ئەوانەی زمانەکەیان نەماوون، بێ گومان دەبن بە سامانی ئەو زمانە تازانەی لە زمانە کۆنەکان دا لە دایك بوون.

ئەدەبی پاش مێژوو دەکەین بە دوو بەشەوە:

(١) ئەدەبی ئەرکیۆلۆجی

(٢) ئەدەبی تۆمار کراو بە تیپەکانی ئەلفوبێ.

•

### (١) ئەدەبی ئەرکیۆلۆجی

ئەدەبی ئەرکیۆلۆجی ئەو ئەدەبەیە کە بە وێنە و رەمز و نەقش و دروشم تۆمار کراوە، وەکو نووسینە هەرە کۆنەکانی سۆمەری و ئیلامی و خەتی بزماری بابلی و ئاشووری و هیرۆگلیفی میسر و دروشمەکانی زمانی چینی و تیپەکانی سانسکریتی.

بێ گومان گەورەترین داهێنانی ئادەمزاد دۆزینەوەی وێنە (شکل) بوو بۆ تۆمار کردنی شت، ئەمە پێش مێژ ووی لە پاش مێژ وو جیا کردەوە. کۆنترین تۆمار یا نووسینی هیرۆگلیفی لە وولاتی سۆمەرەوە ماوەتەوە، ئەم نووسینە بریتی یە لە وێنە، وەکو وێنەی باڵندە مانای باڵندە دەگەیێنی، وێنەی ئادەمزاد مانای ئادەمزاد دەنوێنێ. دیارە ئەم کردەوەیە ئەگەر چی بۆ مەبەسێکی دیاری کراو بوو بەڵام بە هۆی گڵی برژاوەوە بۆ دوا رۆژ پارێزرا، بەم جۆرە بوو بە دەست رەنگینی یێك هاوشانی نەقش و وێنە و نیگاری سەر گڵی برژاو بوو.

لە دەور و بەری ٣٦٠٠ ساڵ پێش مەسیح، لە خاکی وولاتانی سۆمەر و ئیلام و میسر لە ئەنجامی گۆڕرانی هەموو ئەو نەقشانەی بۆ مەبەسی مانا بەکار هێنرا بوون کۆمەڵێك وێنە کەوتە ناوەوە، ئەمە رەنگدانەوەی ئەو بیر و رایانە بوو کە لە مێشکی ئادەمزادی ئەو سەردەمە بوون، ئەم کۆمەڵە وێنانەیان ناو نا «نووسینی هیرۆگلیفی» ئەمە لە وولاتی میسر لە ساڵی ٣٠٠٠ی پێش مەسیح کەوتە پۆیە و ئەو پەڕی پێشکەوتن.[2]

گەلێ پاشماوەی هونەری و ئەدەبی میسر بە تیپی هیرۆگلیفی پارێزراو کارێکی گەورەیان کردە سەر هونەر و ئەدەبی هەموو گێتی.

#### ١ ـ ئەدەبی سۆمەری

کونترین شیعرێك کە مێژوو ئاگاداری بێ، ئەو شیعرەیە کە نزیکەی ٢٩٠٠ ساڵ پێش مەسیح شاعیری سۆمەری «دینجیری دامو» بۆ «ئینتیهاب»ی خواژنی لیگش دەلاوێنێتەوە و دەڵێ:

داخی گران! گیانم دەتوێتەوە لە حەژمەت شار و گەنجینەکانی.

داخی گران! گیانم دەتوێتەوە لە حەژمەت شارەکەم جەرسو (لیگش)و گەنجینەکانی.

منداڵان لە جەرسوی پیرۆز لە ژیانی هەژاری دان

داگیرکەر گەیشتە ئارامگای هەرە مەزن. قەرالیچە گەورەکەی لە پەرستگایەوە دەرهێنا. ئەی گەورەژنی شاری وەك بیابان و پڕ ترس کەی دەگەڕێیەوە![3]

ئاهێکی بە کوڵە لە دەروونێکی بێ گەرد و پاکەوە هەڵقولاوە، شاعیر چاوەڕوانی گەڕانەوەی بەختیاری لە دەست چوو دەکا. لە پاش هەموو رووخان و رووخاندنێك بنیادنانێك هەیە، شاعیر بە تەمای هاتنەوەی خواژنە، بەڵام نازانێ کەی دەگەڕێتەوە!

#### ئیپۆس (مەلحەمە)ی گلگامیش:

هەندێ تاتەبەردی ئەرکیۆلۆجی کەوتۆتە ناوەوە سەردەمی پەیدا بوونیان دەگەڕێتەوە بۆ ٢٥٠٠ ساڵ پێش مەسیح . کۆمەڵێك ئێپۆس و ئەفسانە لە بابەت کار و کردەوەی شاهە کۆنەکان و قسەی نەستەق و نوێژ و سکاڵاو پارانەوەی ئایینی یان لە سەر تۆمار کراوە . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە خاوەنی ئەم بەرهەمانە نەناسراوون . یەکێ لە بەرهەمە ئەدەبی یە هەرە گرنگەکانی ئادەمزادی کۆن ئێپۆسی «گلگامیش»ە . ئەم ئێپۆسە باس لە بەسەرهاتی قارەمانی سۆمەری گلگامیش Gilgamesh و هاوڕێی ئەنکیدو Enkidu دەکا . تەواوی تێکستی تۆمار کراوی ئەم ئێپۆسە لەسەر تاتەبەرد لە نامەخانەی ئاشوور بانیپال (٦٦٨ ـ ٦٢٧) پێش مەسیح) لە نینەوا دۆزراوەتەوە . تێکستی گلگامیش بریتی یە لە دوازدە پارچە ، هەر پارچەی ٣٠ دێرە شیعرە و لە سەر تاتەبەردێك تۆمار کراوە .[٤]

گلگامیش ئێپۆسێکی لیریکی (سروود، ستران، گۆرانی)یە ، چیرۆکێکی شیعری یە لە گرێ یێکی کوێر و گەورەی ژیانی ئادەمزاد دەدوێ . شاکارێکی بێ هاوتایە ، کارێکی دراماتیکی گەورەی کردۆتە سەر ئادەمزاد ، لە ٢٥٠٠ ساڵ پێش مەسیحەوە پشتاو پشت وەکو پەندی دانایی خەڵکی گیراویانەتەوە . تێکستە یەکەمە ڕەسەنەکانی بە زمانی سۆمەری لە ناوچوون ، بەڵام گێڕانەوەی سەر زار و گۆڕینیان بۆ زمانی وەکو بابلی ئێپۆسەکەیان پاراست . چیرۆکی تۆفانی نووح سەرچاوەییێکی بنچینەیی بووە بۆ ئەم کارە ، لە پاشانا گلگامیش خۆی بوو بە یەکەمین و کۆنترین سەرچاوەی تۆمار کراوی ڕووداوی تۆفانی نووح ، وەکو دەردەکەوێ پێش هەموو کتێبە ئایینی یە ئاسمانی و زەوی یەکانیشە .

ئادەمزاد لە کۆنەوە و تا ئێستاش هەموو دەم بیر لە مردن دەکاتەوە و لێی دەترسێ . ئەمە بیر ورا وخەیاڵێکی هەمیشەیی یە بەرۆکی بەر نادا . دیارە «ترسان لە مردن» ئادەمزاد ڕادەکێشێ بۆ ئەوەی بیر لە نەمری و زیندوویی و ژیانی جاویدانی بکاتەوە ، گلگامیش قارەمانی ئێپۆسەکە هەمیشە تووشی مردووان دێ . نزیکترین هاوڕێ یاریدەدەری ئەنکیدو لە پێش چاوی کۆچی دوایی دەکا . لەبەر ئەوە بریار دەدا کە بە شوێن داری نەمری بگەڕێ بۆ ئەوەی بگاتە نهێنی یەکانی لەناوچوون .

قارەمانی ئێپۆسەکە گلگامیشە ، ئەفسانە ئەوە دەگێڕێتەوە کە شای ئوروك بووە لە وڵاتی مێزوپۆتامیا (عیراق) ، فەرمانڕەواییکی بە زەبر و زۆردار بووە ، حەزی بەوە کردووە مێرد منداڵ بۆ جەنگ ڕەوانە بکا و کیژ وڵان بۆ کۆری ڕابواردن بانگە بکا . خەڵکی لە خوداکانیان دەپاڕێنەوە کە ڕزگاریان بکەن . خودایان بە دەنگیانەوە دێن و کەسێکی وەکو ئەنکیدو دروست دەکەن . ئەمە کابرایێکی بەهێز و توانا و پاڵەوان و بێ ئامان بوو ، لەگەڵ ئاژاڵ و درندە لە چۆڵ و بیابانان دا دەژیا . ئەنکیدو دێتە شار ، بۆزانینی هەواڵی شای زۆردار . شار کارێکی گەورەی لێ دەکا ، خووورەووشتی دەگۆڕێ ، سۆز و نەرمی و نیانی دەچێتە دڵیەوە و لە باتی ئەوەی گلگامیش لە ناو ببا دەبێ بە هاوڕێی . گەلێ کار و کردەوە پێکەوە دەگەیێننە ئەنجام ، بەشداریی جەنگ و شەڕ و شۆڕەکانی گلگامیش دەکا ، پێکەوە دێوی هومبابا پاسەوانی دارستان لە ناو دەبەن . کە گلگامیش بە سەرکەوتوویی دەگەڕێتەوە ئوروك دەکەوێتە بەربەرەکانی ی خواژنی شار ئەشتار . خوداکان گاجووتێکی ئاسمانی دەنێرن بۆ تۆڵەسەندن لە شا و شارەکەی . گاجووت باغ و باغات تەخت دەکا ، ئاوی زێ هەموو دەخواتەوە ، خەریك دەبێ شاری ئوروك بە تەواوی وێران بکا ، بەڵام گلگامیش لەگەڵ ئەنکیدوی هاوڕێی پاش زۆرانبازی یێکی قارەمانانە دەتوانن گاجووت بکوژن ، لەمەدا نەوەکو تەنیا بەسەر گاجووت دا زاڵ دەبن ، بەڵکو ئەشتاریش دەبەزێنن . بەڵام ئەنکیدو کۆچی دوایی دەکا ، چونکە ژیانی شاری پێ خۆش نەبوو . ئیتر گلگامیش دەکەوێتە سەر هەوەسی ئەوەی ڕێگەیێك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی ژیان هەمیشەیی و نەمر بێ . لە پاش هەوڵ و تەقەلایێکی زۆر «ڕووەکی نەمری = نبات الخلود» دەدۆزێتەوە . لە ڕێگەی گەڕانەوەی دا بۆ شار ، تووشی جۆگەلەیێك دەبێ و لا دەدا ، خۆی دەخاتە ئاوەوە بۆ پاك کردنەوەی لەش و ڕووەکەکە لە قەراغ جۆگەلەکە دادەنێ . لە پڕ مارێك پەیدا دەبێ ، ڕووەك دەرفێنێ و لە چاو وون دەبێ ، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی گلگامیش و هەموو ئادەمزادی سەر ڕووی زەوی لە نەمری بێ بەش بین .

ئەم ئێپۆسە ئەوە دەردەخا کە ئادەمزاد ئەوەندە بە هێزە هەمو کارێکی بۆ هەڵدەسووڕێ ، دەتوانێ بە سەر هەموو هێزێك دا زاڵ بێ ، تا دەگاتە ئەوەی یەخەی خوداکانیش بگرێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا دەبێ لە دوایی دا هەر خوداکان سەرکەوتوو بن .

### ٢ ـ ئەدەبی میسری :

ئەدەبی میسری کۆن (بە زمان قیبتی و بە ناوەرۆك فیرعەونی) لە پاش ئەدەبی سۆمەری یەکێکە لە ئەدەبە دەوڵەمەندەکانی گێتی ی کۆن بەوەی بابەت و هونەرەکانی ئەدەبیان ڕەنگاو ڕەنگ و هەمە جۆرە . کۆنترین تێکستێکی شیعری ئەدەبی میسری کۆن ئەوەیە کە لە سەر تاتە بەردێك هەڵکەندراوە و لە مۆزەخانەی لایدن (هۆڵەندە) پارێزراوە . سەردەمی هۆنینەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ٢٢٠٠ ساڵ پێش

مەسیح . شاعیری خاوەن ئەم پارچە شیعرە ئەوە دەردەبڕێ کە پێویستە لە سەر ئادەمزاد خۆشی لە ژیانی سەر ڕووی زەوی وەربگرێ . (٥)

جگە لەمە ئەمنحۆتپی چوارەم (١٣٨٠ پێش مەسیح) کە بە ناوی ئیخناتۆن ناسرا بوو، شاعیر بووە، هەندێ پارچە شیعری لە پێداهەلدان (مەدح)ی ئەتۆنی خودا داناوە، ئەم شیعرانە بە جوانترین بەرهەمێك دادەنرێن کە لە ئەدەبی میسری کۆن مابێتەوە . (٦)

ئەوەی لە هەمووشیان زیاتر ئەدەبی میسری کۆنی پێ بە ناوبانگ بووە «کتێبی مردووان»ە، ئەمە بریتی یە لە تەلیسم و ئەفسانە و ڕەمز و نیشانەی جادووگەریی ئایینی ، لە گۆڕی هەندێ لە گەورە پیاوانی بنەماڵەی هەژدەمینی فەرمانڕەوایی فیرعەونەکان دۆزراوەتەوە .

**(٢) ئەدەبی تۆمارکراو بە تیپەکانی ئەلفوبێ**

بەلای کەمی یەوە هەزار ساڵێك پێش مەسیح ئەدەبێکی بەرز خۆی نواند بە ئەلفوبێ یێکی ڕێکوپێك تۆمار کرا، ئەمە بریتی بوو لە ئەلفوبێ ی ئارامی و عیبری و گریکی و لاتینی و ئاڤێستایی و سانسکریتی و هی تر . بۆمەبەسی فێر کردن و لێکۆڵینەوە ئەم ئەدەبە لە دوو شێوە، یا لە دوو سەرچاوەی جیاوازدا بەدی دەکەین :

(١) ئەدەبی هونەری سەربەخۆ.

(٢) ئەدەبی هونەری لە کتێبەکانی ئایینی دا .

**(١) ئەدەبی هونەری سەربەخۆ**

لە هەزار ساڵەی پێش مەسیح بزووتنەوە و جموجۆڵی ئادەمزاد لە ڕووی ئەدەبی و هونەری یەوە خاکەکانی باکووری زەریای ناوەڕاست و هیندستان و چینی گرتبووەوە، ئەم ڕۆژگارە لە لایەن شیعر و ئەدەبیاتەوە بەرهەمێکی یەکجار بەرزمان بۆ دەور دەکاتەوە، لە دووا ڕۆژدا کاری کردە سەر هەموو ئەو ئەدەبە تازانەی کە لە ئەنجامی دروست بوونی نەتەوەکانی سەر ڕووی زەوی ئەمڕۆ پەیدا بوون .

**أ ـ ئەدەبی گریکی (یۆنانی کۆن) :**

بەرزترین نموونەی ئەدەبی هونەری تاقی کردنەوەکانی گریك و ڕۆمانەکان بوو، ئەم ئەدەبە نەوەکو تەنیا بوو بە دایکی ئەدەبی نەتەوەکانی ئەوروپا کە لە سەدەکانی ناوەڕاست دا بە تەواوی دروست بوون لە پاش خەمڵانی زمانە نەتەوەیی یەکانیان ، بەڵکو کارێکی گەورەی کردە سەر ئەدەبی نەتەوەکانی هەموو گێتی .

ئەوەی شایانی باسە و دەبێ بووترێ ئەوەیە ئەم ئەدەبە بەرزە بە زمانی گریکی دەستی پێ کرد، گەنجینەیێکی بێ هاوتای لە داهێنانی ئەدەبی خستە ژێر دەستی ئادەمزاد . لە پاش پێنج سەدە، لە بەر گەلێ هۆی کۆمەلایەتی ـ سیاسی (سۆسیۆپولیتیك) لە ناو مندالدانی ئەدەبی گریکی یەوە ئەدەبی لاتینی (ڕۆمانی) بە زمانی لاتینی لە دایك بوو. لە پاش ئەمە، هەردوو ئەدەب پێکەوە بەردەوام بوون، گریکی یەکە بەرەو کزی و لاتینی یەکە بەرەوپەرەسەندن و گۆڕران دەڕۆیشتن .

١ ـ ئیلیادە Iliade ـ ئۆدیسە Odysse

ئێپۆسی ئیلیادە لە گەورەترین شاکاری ئەدەبی هونەری گێتی دەژمێرڕێ، وە یەکەمین بەرهەمی ئەدەبی بەرزی گریکی کۆنە، لەسەدەی نۆیەمی پێش مەسیح لە ساڵی ٨٥٠ لە لایەن هۆمیرۆسەوە دانراوە و کۆ کراوەتەوە و ڕێك خراوە . ئەم ئێپۆسە بریتی یە لە ٢٤ سروود شازدە هەزار دێرە شیعر . بەشێ لە ڕووداوەکانی جەنگی تەروادە دەگێڕێتەوە کە لە نێوان گریك و تەروادی یەکانا ڕوویدا . تەروادە شارێکی کۆن بوو لە ڕۆژئاوای ئاسیای بچووك . ئەفسانە (میتیۆلۆجیا)ی گریك دەڵێ گریکەکان دە ساڵ ئابلۆقەیان دا (١١٩٣ ـ ١١٨٤ پێش مەسیح) .

ئیلیادە ئەوە دەگێڕێتەوە لەو کاتەی ئەشیل (ئەخیل) لەگەڵ ئاگا مەمنوون تێك دەچێ دەگەڕێتەوە بارەگای خۆی و بڕیار دەدا کە بچێتەوە مەیدانی جەنگ بۆتۆڵە سەندنەوەی هاوڕێی خۆی بترۆکل کە هیکتۆر کوشت بووی . لە پاش زاڵ بوونی ئەشیل بە سەر هیکتۆر و کوشتنی لاشەی ڕادەکێشێ بە دەوری گۆڕی هاوڕێیدا دەگێڕێ، لە پاشانا لاشەکە دەباتەوە بۆ باوکی هیکتۆر کە بریامی ناو بوو.

جگە لەمە هۆمیرۆس ئێپۆسێکی تریشی هەیە بە ناوی ئۆدیسە، لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش مەسیح ڕێکی خستووە، لە ٢٤ سروود پێك هاتووە، هەر سروودێکی بریتی یە لە ٣٣٠ تا ٦٠٠ دێرە شیعر . سۆزی مرۆڤایەتی قارەمانەکانی ئۆدیسە دەبزوێنێ، زمانی بەرزە، ڕەنگدانەوەی پێشکەوتن و کۆمەڵێکی شارستانی یە .

٢ ـ بەرهەمە گرنگەکانی ئەدەبی گریك ئیلیادە و ئۆدیسە ئەگەر چی لە شاکارەکانی ئەدەبی گریکی دەژمێرێن بەڵام ئەدەبی گریکی لە هونەرەکانی تری شیعر و پەخشان دا گەلێ دەوڵەمەندە و بزووتنەوەی ئەدەبی بەردەوام بووە تا پەیدا بوونی ئەدەبی لاتینی .

لەم ماوەیەدا بە کورتی باس لە شاعیرە هەرە گەورەکان دەکەین و پەنجەش بۆ بەرهەمەگرنگەکانیان درێژ دەکەین .

ـ ١ ـ

لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی پێش مەسیح شاعیرێکی گەورەی گریك هێسیۆدۆس Hesiodos خەریکی شیعری پەروەردەو فێرکردن (دیداکتیکی) بوو. ئەم شاعیرە دەیویست لە تەلی خەیاڵ و سۆز و دەروونی ئادەمزاد بدا بۆمەبەسی هاندانی بۆکار، چونکە کارمایەی ژیانە بۆ ئادەمزاد خۆی و بەشدار بوونە لە شارستانیەتی مرۆڤایەتی. کۆمەڵێك لەم بابەتە شیعرانەی لە پاش خۆی بەجێ هێشت بە ناوی «کار و رۆژگار»ەوە.

- ٢ -

لە چارەکی دوواپی سەدەی شەشەم - نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەم شاعیرێکی گەورەی تری گریك کەوتبووە جموجوڵی هونەری و ئەدەبیەوە، ئەمە ئیسخولۆس Aiskhulos (٥٢٥ - ٤٥٦ پێش مەسیح)ی شاعیر دراماتوورگ بوو. یەکێکە لە سێ شاعیرە گەورەکەی شانۆی گریکی. هەمووژیانی بۆچیرۆکی شانۆیی تەرخان کردبوو، بە هۆی هەست و خەیاڵی قووڵ و سۆزی مرۆڤایەتی، بەهێزترین و جوانترین چیرۆکی تراجیدی شانۆیی نووسیەوە، هەر لە بەر ئەوەش بوو بە باوکی هونەری شانۆ ناوبانگی دەرکرد

- ٣ -

بە هۆی ئەوەی شیعر خەریکی هەموو سووچێکی ژیان بوو و رەنگدانەوەی رووداوەکانی بە شێوەی هونەری جیاواز دەخرانە روو. لە بەر ئەوەیە دەبینین لە سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح شاعیری گریکی (لاتینی) کراتینۆس Kratinos هونەری کۆمیدیا هەڵدەبژێرێ بۆ چاك کردنی باری ژیانی ئادەمزاد و لە رێی شانۆی کۆمیدیەوە گەلێ بەرهەمی بەرز دێنێتە ناوەوە و بە دامەزرێنەری شانۆی کۆمیدی دەژمێررێ.

- ٤ -

لە سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح (٤١٠) شاعیرێکی تری گریکی نۆنۆس Nonnos کە لە میسر لە دایك بووە، گەورەترین کارێکی ئەدەبی هونەری هێناوەتە ناوەوە بە ناوی پویێم (چیرۆکی شیعری) «دیۆنیزیاك»، ئەمە بریتی یە لە دەور کردنەوەی میتیۆلۆجیای گریکی کۆن بە شێوەیێکی هونەری یەکجار بەرز، هەر لە بەر ئەوەش بوو لە پاشانا ئەم کارە هونەری یە خۆی بوو بە سەرچاوەیێکی بنچینەیی بۆ گێتی ی رەنگینی میتیۆلۆجیا.

- ٥ -

ئۆرپیدێس Euripides (دەور و بەری ٤٨٠ - ٤٠٦ پێش مەسیح) یەکێکە لە سێ شاعیرە گەورەکەی شانۆی گریکی، نزیکەی سەد چیرۆکی تراجیدی شانۆیی داناوە، بە ناوبانگترینیان: «ئەندرۆماك»، «تەروادیەتی»، «فینیقیەتی»، «ئەلێکترا»، «ئیفگینیا»و هی تر. گەورەترین ئەدگاری ئەم شاعیرە ئەوەیە کە لە دەربرینی هەستی سایکۆلۆجی ی ناوەوەی ئادامزاد سەرکەوتوو بووە.

- ٦ -

شاعیری ناوداری گریك سۆفۆکلێس Sophokles (٤٩٦ - ٤٠٥ پێش مەسیح) سەرۆکی سێ کوچکەی شیعری شانۆی گریکی یە، شیعری لیریکی و شیعری درامای شانۆگەری ی زۆرە، دەڵێن ژمارەی گەیشتۆتە ١٣٠ شانۆگەری، بەڵام تەنیا حەوت تراجیدیای گەیشتۆتە ئێمە، لەمانە شانۆگەری ی «ئەنتیگۆنە» و «ئۆدیبی شاهنشا» لە شاکارە کلاسیکی یەکانی ئەدەبی گێتی دەژمێررێن.

- ٧ -

شاعیری رووخۆش و دەم بە بزە و پێکەنین ئەریستۆفانێس Aristophanes گەورەترین شاعیری کۆمیدی ی گریك بوو لە ئاتینا، کۆمەڵێك شانۆگەری ی کۆمیدی داناوە، ناوەکانی لە سروشت و ئاژەڵ و باڵندە و زیندەوەر خواستووە، لەمانە کۆمیدیەکانی «هەور»، «زەردەواڵە»، «چۆلەکە»، «بۆق»و هی تر ئەوەی پێویستە لەم رووەوە بووترێ ئەوەیە بەشێکی کەم لە کۆمیدیەکانی بە ئێمە گەیشتووە.

- ٨ -

لە سەدەی پێنجەم - چوارەمی پێش مەسیح فیلۆکسینۆس philoxenos (٤٣٥ - ٣٨٠)ی شاعیری دەربار لە کۆشك و سەرای دیۆنیسیۆسی گەورەی خوێن رێژ دەژیا. ئەم شاعیرە داهێنەری بابەتی پێداهەڵدان (مەدح) بوو لە ئەدەبی گریکی ی کۆن دا، زۆربەی شیعرەکانیشی بۆ دیۆنیسۆسی خوێن رێژ هۆنراوەتەوە.

لە سەدەی چوارەمی پێش مەسیح (دەور و بەری ٣١٠) تیۆکریتۆس Theokritos لە سقلیا دەژیا، بەرزترین بابەتی شیعری هێنایە ناو ئەدەبی گریکی یەوە. ئەم هونەرە «ئیدیلا = Aidela» یان پێ دەووت، ئەمە هونەرێکە ناوەرۆکی لە دڵداری ی دەشت و دەر و گوند و دیهات وەردەگرێ، واتە دڵداری ی پاکی دوور لە شار و شارستانی.

(٩)

لە سەدەی چوارەمی پێش مەسیح (دەوروبەری ٣١٠) تیۆکریتوس Tneokritos لە سقلیا دەژیا، بەرزترین بابەتی شیعری هێنایە ناو ئەدەبی گریکی یەوە. ئەم هونەرە «ئیدیلا AideLa» یان پێ دەگوت، ئەمە هونەرێکە ناوەرۆکی دڵداری ی دەشت ودەرو گوندو دێهات وەردەگرێ، واتە دڵداری ی پاکی دوور لە شارو شارستانی.

-۱۰-

له سەدەی سێیەم بەم لاوە ئەدەبی گریکی کەوتە لێژ ییەوە، نالّێین لە ناوچوو بەلاّم گەلێ کز بوو، بۆیە سەدەکانی داهاتوو شاعیرێکی گەورەی وا دەور ناکاتەوە کە ناوی لاپەرەیێکی زۆر داگیر بکا لە ناو مێژ ووی ئەدەب دا، تەنیا میلیاگرۆس Meleagros (دەور و بەری ١٤٠ ـ ٦٠ پێش مەسیح) نەبێ، ئەم شاعیرە گریکی یە لە رۆژهەلاّتی زەریای سپی ی ناوەراست لە نزیك رووباری ئەردەن و شاری سوور (صور) ژ یاوە، کۆمەلێك شیعری داناوە بە ناوی «دیوانی ئیکلیل» تۆماری کردووە.[٧]

ب ـ ئەدەبی رۆمانی (لاتینی):

لەگەلّ کز بوونی ئەدەبی گریکی و رۆیشتنی بەرە و ئاوا بوون، ئەدەبی لاتینی کەوتە پەرەسەندن و بوو بە جێگر و بەردەوامی ئەدەبی گریکی. کۆنترین شیعری رۆمانی بە زمانی لاتینی دەگەرێتەوە سەدەی دووەمی پێش مەسیح، بەم پێیە داهێنانی ئەدەبی لاتینی لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەمی پێش مەسیح دەست پێ دەکا.

ـ ١ ـ

کۆنترین شاعیری لاتینی ئینیوس Ennius، لە دەور و بەری ١٦٩ی پێش مەسیح ژ یاوە. دیارترین بەرهەمی ئەدەبی ئەم شاعیرە بە ناوی «سالّنامە»یە، ئەمە بریتی یە لە مێژ ووی شاری رۆما لە رۆژ ی بنیاد نانیەوە تا دەور و بەری ژ یانی شاعیر. ئینیوس رووداوەکانی ئەم مێژ ووە بە شیعر دەگێرێتەوە.

ـ ٢ ـ

شاعیرێکی تری لاتین تیرینتیوس Terentius (لە دەور و بەری ١٩٠ ـ ١٥٩ پێش مەسیح) لە قرتاج ژ یاوە. لە وەسفی خوو رەوشتی ئادەمزاد، سەرکەوتوو بووە. شیعری تەنیا بۆ ئەم مەبەسە بەکار هێناوە، دەورێکی بالاّی بووە لە گۆرران و پەرە سەندنی هونەری شانۆگەری.

ـ ٣ ـ

هەر لە سەدەی دووەمی پێش مەسیح جوڤینال Juvenal (دەور و بەری ١٤٠ پێش مەسیح) خەریکی چارەسەر کردنی ناگزووری کۆمەلاّیەتی و خوو و رەووشتی خراپی ئادەمزادی سەردەمی خۆی بوو. بۆ ئەم مەبەسە هونەری جوێن (هەجو)ی بەکار دەهێنا، واتە بە جوێن تیماری ئەو دەردە کۆمەلایەتی یانەی دەکرد.

سەدەی یەکەمی پێش مەسیح پۆیەی گۆررانی ئەدەبی رۆمانی کۆن بوو بە زمانی لاتینی. ئەم سەدەیە گەورەترین شاعیرانی زمانی لاتینی دەور دەکاتەوە. لە سەرووی ئەمانەوە، یا خود گەورەترین شاعیر لە سەرانسەری مێژ ووی ئەدەبی لاتینی ڤیرجیلیوس Virglius (ڤیرجیل) بوو. (لە پاشانا قسەی لێوە دەکرێ)

ـ ٥ ـ

شاعیری رۆمانی لوکرێتوس Lucretus (دەور و بەری ٩٨ ـ ٥٥ پێش مەسیح) کە لە رۆما لە دایك بووە و هەر لەوێش ژ یاوە، خاوەنی ئیپۆسی «سروشت»ە، لەم ئیپۆسەدا هەولّ دەدا فەلسەفەی ئەبیکورس (ئەبیقور) پیشان بدا و خۆی دەکاتە لایەنگری و ئەوە دەردەبرێ کە خۆشی و لەزەت مەبەسە بنچینەیی کانی بوونی ئادەمزادە لە سەر رووی زەوی.

ـ ٦ ـ

پەخشانی هونەری لەم رۆژگارانەدا گەلێ پێش کەوت بوو، ئەم جۆرە پەخشانە بە زۆری بۆ نووسینەوەی مێژ وو بە کار دەهێنرا، یەکێ لە مێژ وونووسە گەورەکانی رۆمان سالوستوس Sallustus (٨٦ ـ ٣٥ پێش مەسیح) دوو بەرهەمی بەرزی بەجێ هێشتووە، یەکەمیان «ژ یانی یوگورتا»[٨] و دووەمیان «پیلانی کاتیلینا»، لەم نووسیانەدا بەرهەمێکی بتەو و روون دەخاتە بەر دەست، لە یەکەمیانا بەسەرهاتی یوگورتای شاهنشای نومیدیا دەگێرێتەوە، ئەمە بەرهەلستی رۆمانەکانی کرد، بەلاّم سەرنەکەوت، ماریوس بە دیل گرتی و لەگەلّ خۆی بردیەوە رۆما و هەر لەوێش مرد؛ لە دووەمیانا بەسەرهاتی کاتیلینا (١٠٩ ـ ٦٢ پێش مەسیح) دەگێرێتەوە، ئەمە گەورە و خانەدانێکی رۆمانی بوو، لە دژ ی ئەنجومەنی سینات بوو، لە پاش ئەوەی مەسەلە لە لای کونسولّ ئاشکرا بوو، بەربەرەکانی کرا و لە شەردا کوژ را.

ـ ٧ ـ

گەورەترین شاعیری مێژ ووی ئەدەبی لاتینی ڤیرجیلیوس (٧١ ـ ١٩ پێش مەسیح) بوو، ئەمە دیارترین شاعیری رۆما بوو. هەر لە بەر ئەوەی نەتەوەی گریکی گەورە «ئیلیادە»ی هەبوو، بە لای ئەوەوە دەبوو رۆماش شاکارێکی ئەدەبی گەورەی وەکو ئەوی ببێ. بۆ ئەمە ئیپۆسی «ئینیادە»ی لە سالّی ٢٩ی پێش مەسیح دانا لە ١٢ سروود تیادا لاسایی «ئیلیادە»ی هۆمیرۆسی کردۆتەوە، بەلاّم بە زمانی لاتینی. هۆمیرۆس لە کوێ «ئیلیادە» تەواو دەکا ئەو لەوێوە دەستی پێ دەکا. بە خەیالّی فراوان و مۆسیقای نەرم و ووشەی شاعیری «ئینیادە» دەگەیێنێتە پلەی «ئیلیادە». قارەمانی «ئینیادە» ناوی «ئیناس»ە و خەلّکی تەروادە بوو، لە پاش وێران کردنی تەروادە لەوێ را دەکا، ماوەیێك لە قرتاج دەمێنێتەوە لای دیدۆن شاژنی ئەو ناوچەیە. ژنە حەزی لێ دەکا، ئیتر لەوێوە بە دزی یەوە بۆی دەر دەچێ و روو دەکاتە خاکی ئیتالیای ئێستا و لە ناوچەی لاتیۆم نیشتەجێ دەبێ، لە پاشانا نەوەکانی شاری رۆمانی لێ دروست

دەكەن.

ڤیرجیلیوس جگە لەمە شیعرێكی زۆری هەیە لە بابەت «كاری كشتوكاڵی و پەروەردەی مەڕ و ماڵات»ەوە. ئەمە نموونەی شیعری فێركردن (دیداكتی)یە لە ئەدەبی لاتینی دا.

- ٨ -

شاعیری گەورەی ڕۆمانی هۆراسیوس Horasius (٦٥) - ٨ پێش مەسیح) جگە لە شاعیرێتی ڕەخنەگرێكی گەورەش بوو، كتێبی «هونەری شیعر» (پۆیێتیكا) تا ئێستاش لە سەرچاوە بنچینییە كلاسیكییەكانی گریك و ڕۆمان دەژمێررێ لە ڕەخنەی ئەدەبی دا. لە تەك ئەمەدا كۆمەڵێك شیعریشی هەیە، بە تایبەتی ئەو بەشە شیعرانەی كە ناوی ناوون «جوێن»و «نامە».

- ٩ -

هەر لەو سەردەمەدا ئۆڤیدیوس Ovidius (٤٣ پێش مەسیح - ١٨ پاش مەسیح)ی شاعیری گەورەی زمانی لاتینی لاپەڕەی دوایی ئەم بلیمەتیەتییە بوو. ئەم شاعیرە پڕ زەوق و ئادەمزاد پەرستە گۆرانیی بۆ دڵداری و پێشكەوتن دەووت، عەوداڵی جوانیی سەر ڕووی زەوی بوو، بۆیە هەندێ جار بوونی لەش و لاری جوان لە شیعرەكانی دەهات، دلبەری شاعیری لاتینی ئۆڤیدیوس پەیكەرێكی جوانی بینراو بوو.

بەم جۆرە لاپەڕەی مێژووی ئەدەبی ڕۆمانی بە زمانی لاتینی هەڵدرایەوە، بە تایبەتی لە دووا سەدەی پێش مەسیح كە ڤیرجیلیوس تێیدا ژیا بوو، واتە سەدەی زێڕینی ئەو ئەدەبە كە لەگەڵ كز بوونی بت پەرستی و كۆن بوونی جوولەكەیی و پەیدا بوونی ئایینی گاووری ئەویش كەوتە لێژییەوە و ئەدەبی گیتیی كۆنی ئەم ناوچەیەیە كۆتایی هات.(٩)

**هـ- ئەدەبی هیندی:**

ئەدەبی هیندی وەكو زۆربەی ئەدەبە كۆنەكان بە تێكستی ئایینی و هەموو ڕووداوێكی كە پێوەندیی بە ئایینەوە هەیە دەستی پێ كردووە. بەشی زۆری ئەم تێكستانە بە ئەزبەر و لە سەر زار لە نەوەیێكەوە بۆ نەوەیێكی تر دەمایەوە. لە ڕێگەی دەما و دەم كردن دەسكارییێكی زۆر دەكران و ناوی خاوەنەكانیشیان وون دەكرد. .

بە گشتی ئەدەبی هیندی لە دوو هەزار ساڵ پێش مەسیحەوە دەستی پێ كردووە تا سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح شێوە و ئەدگاری دوایی خۆی وەرگرتووە، هەموو ئەم ئەدەبەش بە زمانی سانسكریتی بووە كە ئێستا نەماوە و لە ناو چووە.

ئەدەبی هیندی دوو ئێپوسی گەورەمان بۆ دەور دەكاتەوە:

١ مەهابهاراتا Maha - bharata

مەهابهاراتا بە مانای «جەنگی بهاراتای گەورە» هاتووە، بهاراتا بنەماڵەی فەرمانڕەوای هیندستان بوو، ئەمە یادگارێكی هەرە گەورە و بە ناوبانگی ئەدەبی هیندوسەكانە، هەروەها یەكێكە لە داهێنانەكانی ئەدەبی گیتی، لە ١٨ كتێب پێك هاتووە، دانەری تاقە كەسێك نییە و لە ڕۆژگارێكی دیاری كراویش دانەنراوە، بەڵكو گەلێ كەس لە نەوە جیاكانی هیندستان بەشدارییان تێدا كردووە، بە زمانی سانسكریتی نووسراوەتەوە، زانیارییێكی زۆری تێدایە لە بابەت جەنگ و شەڕ و شۆڕەكانی «كورو و باندو»، هەروەها كردەوەكانی كریشنای خودای هیندۆسەكان، جگە لەمە مێژووی هیندستانی كۆن و دەستوور و یاسا و خوو و ڕەووشت و ئەفسانەی ناو كۆمەڵ دەور دەكاتەوە. لە سەدەكانی پێنجەم - شەشەمی پێش مەسیح تەواو بووە و قالبی دوایی وەرگرتووە و تا ئێستا ماوەتەوە.

٢ - ڕامایانا Ramayana

ڕامایانا بە مانای «قارەمانیەتی ڕاما» هاتووە، ڕاما خودای هیندۆسەكانە، لە ئاسمان هاتۆتە خوارەوە و چۆتە ناو لەشی (دۆنا دۆن = تناسخ الارواح، التقمص) ڤیشنۆ لە سەر زەوی، بە زمانی سانسكریتی ڕێك خراوە. مێژووی دانانی بە تەواوی نازانرێ، بەڵام لە سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح شاعیری هیندی ڤالمیكی هەموو تێكستە كۆنەكانی كۆ كردەوە و لێكی دانەوە و ڕێكی خستنەوە و شتی تریشی خستە سەریان. بەم جۆرە چواردە هەزار پارچەی لێ دروست بوو و بە سەر حەوت بەش دا دابەش كرا. ئەم ئێپۆسە بەسەرهاتی چوار برای قارەمان دەگێڕێتەوە لە خەباتیان دا، لە دژی خودای خراپە و تاریكی، لە ئەنجام دا سەر دەكەوون، یەكسانی و ئاسایش لە ناو كۆمەڵ دا بڵاو دەكەنەوە، ئەم ڕووداوانە لەگەڵ ئامۆژگاری و قسەی نەستەق و پەند و وورد بوونەوە لە ژیان تێكەڵ دەكرێن. گەلێ چیرۆك و بەسەرهاتی تریشی تێدایە بیر و ڕای هیندۆسەكان دەخاتە ڕوو لە بارەی ئایین و پێوەندیی ئادەمزاد بە كردگارەوە.(١٠)

**د - ئەدەبی چینی:**

ئەدەب لە لای چینییەكان شتێكی پیرۆزە، لە بەر ئەوە شاعیر گەورەیە لە لایان و لە سەر ئەو باوەڕەن كە شاعیر ئادەمزادێكی دانایە و لە لایەن كردگارەوە نێرراوە بۆ ئەوەی ببێتە پێوەند لە نێوان ئاسمان و ئەرز، كردگار و ئادەمزاد.

نووسینی چینی لە سەدەی چواردەمی پێش مەسیح پەیدا بووە، لە پێشانا لە پێنج هەزار تیپ پێك هات بوو، لە دووایی دا بە درێژایی ڕۆژگار و گۆڕانی زمان تیپەكان زیادیان كرد.

ئەدەبی چینیی كۆن لەم بەرهەمانەی لای خوارەوە خۆیان دەنوێنن:

١ - یادگاری هەرە بەرزی كۆنی ئەدەبی چینی دەدرێتە پاڵ

کۆنفۆشیۆس (٥٥١ ـ ٤٧٩ پێش مەسیح)، ئەم ئەدەبیاتە «کنگ»ی پێ دەڵێن، هەمـــووی لە بابـــەت خووڕەووشتی ئادەمـــزاد و ڕێـــك خستنی کۆمەڵە.

کۆنفۆشیـۆس فەیلەسـووفێکی چینی‌یـە، ئایینی کۆنفـۆشیۆسی دامەزراند، ئەمە ئایینێکی فەلسەفی ـ ئەدەبی‌یە، باوەڕی بە کردگار (خالق) نی‌یە، بەڵام داوای ژیانێکی خێزانی و کۆمەلایەتی‌ی بەرز دەکا.

٢ ـ کتێبی سروود: ئەمە «شی کنگ»ی پێ دەڵێن، لە سێ سەد و پێنج پارچە پێـك هاتـووە، لە نێـوان سەدەکـانی ١١ ـ ٧ی پێش مەسیـح پەیـدا بووە، سروودەکـان بریتین لە هەنـدێ شیعـری دڵـداری‌ی ساکـار بە شێـوەی مۆنـۆلـۆج لە نێـوان کوڕ و کچ دا، بە تایبەتی ئەمە لە کۆمەڵی کشتوکاڵی‌دا باوە. هەروەها ئەم هونەرە وەکو گۆرانی بۆ سەمـای ئایینی و پەرستن یا پێـدا هەڵـدانی خاقـانـەکانی ڕابـردووی چین بەکـار دەهێنـرێن، زۆربـەی ئەم گۆرانی‌یـانـە بە مۆسیقاوە دەووترێن.

٣ ـ کتێبی مێـژوو: ئەمـە «شـوکـنگ»ی پێ دەڵێن، بریتی‌یە لە تۆمـار کراوی ڕووداوەکـانی سەدەکـانی ١١ ـ ٧ی پێش مەسیـح. تێکستـەکـانی ئەم کتێبە فەرمانی میری و دووانی خاقانەکانی گرتۆتە خۆ، لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە دەور و بەری ئیدیۆلۆجی‌ی کۆنفۆشیۆس دەسووڕێنەوە.

**٤ ـ کتێبی گۆڕران: ئەمە بریتی‌یە لە تێکستی قورس و داخراو، لە جادووگـەری و عەزامـات و دووا ڕۆژ خوێنـدنـەوە هەڵقولاوە، لە پاشـانـا تێکستـەکـان بە گیـانێکی فەلسـەفی لێـك دەدرانـەوە. ئەم تێکستانە لە نێوان سەدەکانی ١٠ ـ ٧ی پێش مەسیح کەوتوونەتە ناوەوە.**

**٥ ـ ووتـەکـانی کۆنفـۆشیۆس: ئەمە بریتی‌یە لە قسەی نەستەق و پەنـد و ئامـۆژگـاری‌یەکانی کەونفۆشیۆس، هەموو بیر و باوەڕێکڵ پێ** دەکێشـرێ و لە ڕێگـەی ئەم ووتانەوە بیر و ڕای‌تازە بۆ چاکەی کۆمەڵ دەکەوێتە ناوەوە.

٦ ـ شیعـری ڕەشبینی: لە سەدەی چوارەمی پێش مەسیـح جۆرە شیعـرێکی تازە پەیـدا بوو، ڕەنگدانەوەی هەستی دەروونی ناوەوەی ئادەمـزاد بوو، لە دووری و ئاوارەیی و ناڵـەبـاری و ناسـۆری ژیان و مردن دەدوا، ناوەڕۆکێکی سیمبـولیـزمی (ڕەمـزی) و سۆفیـزمی و سیـاسی هەبـوو، ئەمـە لە دیـوانی شاعیـری چینی کیـویوان Kiyu Yuwan (٣٣٢ ـ ٢٩٥ پێش مەسیح)دا دەردەکەوێ.(١١)

لەمـەدا دەگـەینـە ئەنجـامی ئەوەی کە نەتـەوەکانی چینی گەورە دەورێـکـی دیـاریـان بووە لە داهێـنـانی ئەدەبی گێتی‌ی کۆن و خزمـەتێکی گەورەی ڕۆشنبیری و کولتووری مرۆڤایەتی‌یان کردووە. **تا ئێستـاش لە ناوی کۆمـەڵانی سەر ڕووی زەوی کە یادی چین دەکرێتەوە دانایی و قسەی نەستەق و پەندی پێشینان دێتەوە بیر.**

**(٢) ئەدەبی هونەری لە کتێبەکانی ئایینی‌دا**

**مەبەس لە کتێبی ئایینی ئەو کۆمەڵە کتێبەیە کە دەستوور و یاسا و مێـژوو و بەسـەرهـات و ڕووداوەکـان و بیـر و باوەڕ و ئیـدیۆلۆجیەتی ئایینیان تێدا تۆمار کراوە، بێ گومان تێکستی ئەم کتێبانە بە گشتی لە شێـوازی ئەدەبیـەوە نزیکن، جگـە لەوەی هەندێ بەش و پارچەیان شیعـرێکی تەواوە، یا شیعـرێکی پەخشـان ئامێـزە، یا پەخشانێکی هونەری‌یە. لە ڕووی باوەڕی ئایینی‌یەوە هەندێ لەو کتێبانە بە کتێبی ئاسمـانی دەژمێـررێن، واتە قسـەی خودایە و بۆ پێغەمبەری نەتەوەکە نێـرراوە بۆ ئەوەی بیکـا بە دەستـووری ژیـانی سەر زەوی و باوەڕی گیـانی ئەو کۆمـەڵـە بەرامبـەر بە گێتی‌ی نەمری داهاتوو. هەندێکی تریش لە لایـەن پێغـەمبـەر و سەرۆکی ئایین و فەیلەسـووف و زانا و دانـایـانی نەتـەوەکـان دانـراوە، دیارە لای خۆیان ئەم کتێبانە قسـەی خودان یا لە پلەی قسەی خوداکانیانن.**

بە گشتی ئەو کتێبـانـە ئەگەرچی لە بنەڕەت دا بۆ مەبەسی ئایینی هاتـوونـەتـە خوارەوە یا نووسـراونـەتەوە، بەڵام کارێکی گەورەیان کردۆتـە سەر ئەدەبی نەتـەوەکـانیـان، واتـە ئەدەبی ئەو زەمـانـانـەی کتێـبـەکـانیـان پێ نووسـراوە، یا ئەو زەمـانە تازانەی لە زمانە کۆنەکان بوونـەتـەوە. ئەم کارکردنە بەهێز بووە، چونکە جەوهەری ئەدەبی لە ناو کتێبـە ئایینی‌یـەکـان دا ڕەسەن بووە و پلەی داهێنانی هونەری‌یان یەکجار بەرز بووە.

لەم ماوەیـەدا بە کورتی باس لەو کتێبـانـە دەکـەین بە پێ‌ی پەیدا بوونیان، یا هاتنە خوارەوەیان لە ئاسمانەوە:

أ ـ تەورات

تەورات «کتێبی پیرۆز» و «ڕۆژگاری کۆن»یشی پێ دەڵێن. باس لە مێـژووی بوون و مرۆڤ دەکـا لە سەرەتاوە، واتە پێش مێژوو. لە ماوەیێکی درێـژی مێـژووی پاش مێـژووش دەدوێ واتـە دەوری پێغەمبەران تا پێش پەیدا بوونی ئایینی گاووری ئەوەی لێرەدا گرنگە بێ ڕووداوەکـانـی ١٨٠٠ ساڵ پێش مەسیحـە، واتـە سەردەمی ئیبراهیم پێغەمبەر.

ئەم کتێبە بەلای کەمی‌یەوە لە ماوەی ١٣٠٠ ساڵ دا کۆکردنەوە و تۆمـار کردنی تەواو بووە، واتـە لە دەور و بەری مووسـا پێغـەمبـەر (سـەدەی ١٣ی پێش مەسیـح)ەوە تا نزیـك پەیـدا بوونی عیسـا

پێغەمبەر. تەورات بریتی یە لە ٣٦ نامە (سفر)، ئەوەی بۆمەبەسی ئەدەبی گرنگە بێ و بۆنی داهێنان و هونەریان لێ بێ ئەم نامانەی خووارەوەن :

١ ـ مەزموورەکانی داوود : ئەمە هەندێ جار بە کتێبێکی سەربەخۆ دادەنرێ بە ناوی «زەبوور»ەوە، دەدرێتە پاڵ داوود پێغەمبەر (١٠١٠ ـ ٩٧٠ پێش مەسیح). مەزموورەکان بریتین لە ١٥٠ سروود، ئەم سروودانە جێگەی یەکەمیان هەیە لە نوێژی گاورەکان دا.

٢ ـ گۆرانی ی گۆرانی یان : ئەمە دەدرێتە پاڵ سلێمان پێغەمبەری دانا (٩٧٠ ـ ٩٣٥ پێش مەسیح)، بریتی یە لە کۆمەڵێ تێکستی شیعر ئامێزی ڕۆمانتیکی یانە لە دڵداری و جوانی دەدوێن، ناوەرۆکی هەندێکیان بۆنی شەهوەت و مێبازی لێ دێ. گەلێ لەو کەسانەی کە لەم گۆرانیانەیان کۆڵیوەتەوە بە چاوێکی سۆفیزمیانە تەماشایان کردووە. وا باوە کە لە سەرەتای سەدەی چوارەمی پێش مەسیح کۆ کراوەتەوە و شێوە و قاڵبی ئێستای وەرگرتووە،

٣ ـ ئەشعیا : ئەمە نامەیێکی تری تەوراتە دەدرێتە پاڵ ئەشعیا کە لە سەدەی هەشتەمی پێش مەسیح ژیاوە. ئەم دانەرە لەو کاتەدا ووشیار بۆتەوە و گەیشتۆتە ڕاستی کە سەنحاریب لە ٧٠١ی پێش مەسیح ئابلۆقەی ئۆرشەلیم (قودس)ی دا، گۆیا ئەشعیا لەو جەنگەدا کوژراوە. نووسینەکانی شێوازێکی شیعری تەواویان هەیە، ئەشعیا دووا ڕۆژ ی خوێندۆتەوە، بۆیە باسی ئەوەی کردووە کە لە دووا ڕۆژدا عیسا پێغەمبەر بێ باوك لە کیژ ێك لە دایك دەبێ.

٤ ـ ئەیووب : لە پلەی پێغەمبەری بووە، لە دەورو بەری ساڵی ٤٠٠ی پێش مەسیح ژیاوە. خودا ویستوویەتی تاقی بکاتەوە، بەڵام ئەو بەرگری هەموو ئێش و ئازار و ناسۆری ژیانی کردووە. مەسەلەی ئەیووب مەسەلەی خراپەیە لە گێتی دا، بە لایەوە خراپە دوایی نایە، بە خودا ناسین نەبێ. ئەم نامەیە لە کتێبی پیرۆز نموونەی بەرزی ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتە، چۆتە ناو ناخی دەروونی ئادەمزادەوە، بە شێوەیێکی شاعیری یانە ڕووداو دەگێڕێتەوە و وێنە دەگرێ.

٥ ـ پەند و قسەیٚ نەستەق : ئەم نامەیەش دەدرێتە پاڵ سلێمان پێغەمبەری دانا، بریتی یە لە کۆمەڵێك پەند و قسەی نەستەق و ئامۆژگاری، لە دەور و بەری مۆژدەدا دەسووڕێتەوە تا دەگاتە ئەو پەندەی کە دەڵێ «سەری دانایی ترسانە لە خودا» (رأس الحكمة مخافة الله). وا باوە کە ئەم پەندانە لە سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح کۆ کراونەتەوە.

٦ ـ ئەستێر : نامەی ئەستێر بەشێکی گرنگە لە کتێبی پیرۆز و چیرۆکی ڕۆمانتیکی یانەی مێرد کردنی ئەستێر دەگێڕێتەوە بە ئەخشۆرشی شاهنشای ئێران بۆ ئەوەی نەتەوەکەی لە ستەم و زۆرداری ڕزگار بکا. ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە کە ئەستێر ژنێکی جوان و داوێن پاك بووە. دەڵێن ئەم نامەیە لە ساڵی ١١٤ی پێش مەسیح نووسراوەتەوە.

ئەمە بەشە گرنگەکانی کتێبی پیرۆز بوو، ئەگینا بە ڕاستی هەموو تێکستەکانی ئەم کتێبە و ڕووداوەکانی کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر ئەدەب و کولتوری گێتی، . بە تایبەتی نەتەوەکانی ئەوروپا، لەو ڕۆژەی ئایینی گاووری تێیدا کەوتە ناوەوە تا ئێستا، چونکە تەورات و ئینجیل (ڕۆژگاری کۆن و تازە) کتێبی پیرۆزی گاوورانە. ڕووداوەکانی ئەم کتێبە ڕەنگیان لە شیعر و ئەدەبیات و وێنەکێشی و پەیکەرتەراشی و ئەندازیاری (ئەرشیتیکتوری = میعماری) و مۆسیقا و سەما و گۆرانی و هەموو بابەتەکانی تری هونەر داوەتەوە.

ب ـ ئاڤێستا

کتێبی ئاڤێستا لە کردەوە و نووسینی زەردەشتە (سەدەی حەوتەمی پێش مەسیح). زەردەشت پێغەمبەری نەتەوە کۆنەکانی ئێران بوو، یەکەمین ڕێ پیشاندەری کۆمەڵیان بوو لە ڕێی ئایینەوە.

ووشەی «ئاڤێستا» یا «ئاڤێستاك» لە ووشەی «ئوپاستا = Upasta»ی پەهلەوی یەوە هاتووە کە مانای «بن، بنج، بناغە، بنیاد» دەگەیێنێ.

کتێبی ئاڤێستا بریتی یە لە پێنج بەش، بەشی هەرە گرنگیان «یەسنا»ی پێ دەڵێن، لەمەش دا هەڤدە فەسڵ «گاتا»ی پێ دەووترێ. «گاتا» و هەندێ لە بەشەکانی «یەشت» بە شیعر نووسراونەتەوە. شیعری ئاڤێستا لە سەر کێشی «پەنجە، کەرت، برگە، سیلاب» دامەزراوە، ئەم کێشانە کێشی فۆلکلۆری خۆماڵین، لە شیعری نووسراوی کوردی کۆن و تازەش دا دەبینرێن.

بەڵام ئەوەی گرنگە بێ لە ئاڤێستا ئەو بیر و باوەڕە ئایینی ی فەلسەفی یانەن کە بە شێوەیێکی هونەری و شاعیرانە گێڕراونەتەوە، بە تایبەتی نوێژ و پاڕانەوە و سکاڵا ئایینی یەکان، جگە لەو دانایی یە بیری یەی کە زەردەشت نوواندوویەتی.(١٢)

حـ ـ کتێبی پیرۆزی هیندۆسان :

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە خودای هیندۆسەکان «برەهما»یە، ئەمە کردگارەو خاوەن و دروست کەری «بوون»ە، توانایی «برەهما» لەگەڵ «ڤیشنۆ» و «سیڤا» سێ کوچکەی خودایەتی ئایینی

بوودی دروست دەکەن .

بوودا (بوودها گەوتاما = Buddha Gautama) (دەور و بەری ٥٦٦ - ٤٨٦ی پێش مەسیح) پلەی پێغەمبەری و دانایی بووە لە هیندستان، دامەزرێنەری ئایینی بوودی‌یە لەقەبی «بوودا»ی دراوەتێ کە بە مانای «رووناکی، پرتەو» هاتووە.

ڤیدا ناوی کتێبی پیرۆزی هیندۆسەکانە، مانای «زانیاری» یە، بە زمانی سانسکریتی نووسراوەتەوە، نوێژ و سروودی ئایینی‌یان تێدا تۆمار کراوە. پەیدا بوونی ئەم سروودانە لە ٢٥٠٠ ساڵ پێش مەسیحەوە دەست پێ دەکا تا ساڵی ٥٠٠ پێش مەسیح کە لەو سەردەمەدا شێوە قاڵبی دوایی وەرگرتووە.

ڤیدا لە نووسین و کردەوەی براهمای خودای بوودی‌یانە. لە چوار بەش پێك هاتووە، بەشە هەرە گرنگەکانی ڤیدا بریتی‌یە لە:

١ - ریك ڤیدا: کۆنترین کتێبی چوار کتێبە پیرۆزەکەیە، لە کۆمەڵێك سروود پێك هاتووە بە زمانی سانسکریتی، کاکڵ و ناوەرۆکی میتیۆلۆجیا و کۆسمۆلۆجیاو فەلسەفەی ئایینی برەهمایی تێدا نووسراوەتەوە.

٢ - ئوپانیشەد: کۆمەڵە نامەیێکە لە ڤیدا باس لە بیر و باوەڕی فەلسەفەی ئاری‌ی هیندی دەکا، ئەمە بەشێکی گرنگە، لە ئەدەبی هیندی چونکە لە پەرستن و پێوەندی‌ی بیر و باوەڕی ئاین دەدوێ.

هەرچی دوو بەشەکەی تری ڤیدایە «شاندوجیا» و «سواسانکەد» کەڵکێکی ئەوتۆیان نی‌یە لە ڕووی ئایینی و ئەدەبی‌یەوە. [١٣]

### د - ئنجیل

ئینجیل ووشەیێکی گریکی‌یە بە مانای «مژدە» هاتووە، «کتێبی پیرۆز»و «رۆژگاری تازە»شی پێ دەڵێن. ئەم کتێبە بریتی‌یە لە کۆمەڵێك لە ووتەو کردەوەکانی مەسیح یا کریستۆیا عیسای کوڕی مریەم پێغەمبەری دیانان، لای خۆیان و لای موسوڵمانانان. بە چووار گێرانەوە پێمان گەیشتووە. ئەو کەسانەی هەواڵە کانیان تۆمار کردوە، دووانیان لە پلەی پێغەمبەری دان لای دیانان مەتا و یۆحەنا، دووانەکەی تریان لۆقا و مرقس لە قوتابیانی مەسیحن.

لە نیوەی دووەمی سەدەی یەکەم تۆماری هەر چووار تێکستی ئینجیلەکان وەکو لای خووارەوە نووسراوە تەواو بووە:

١ - ئینجیلی مەتا: لە ساڵی ٥٠ بە زمانی ئارامی نووسرایەوە بۆ ئەو گاوورانەی فەلەستین کە لە بنجدا جوولەکە بوون و باوەڕیان بە ئایینی تازە هێنا.

٢ - ئینجیلی مرقس: مرقس لە ساڵی ٦٤ ئینجیلەکەی نووسیەوە.

٣ - ئینجیلی لۆقا: لۆقا لە ساڵی ٦٧ ئینجیلەکەی نووسیەوە، جگە لەمە لە ساڵانی ٦٨ - ٨٥ «کردەوەی پێغەمبەرە نێرراوەکان»یشی نووسیەوە، ئەمە لە ئەدەبیاتی ئایینی گاووری‌دا لە ریزی ئینجیل دەوەستێ.

٤ - ئینجیلی یۆحەنا: لە دووا ساڵانی سەدەی یەکەم ئینجیلەکەی نووسیەوە، جگە لەمە «خەون»و «سێ نامە»شی نووسیەوە کە لە ئەدەبیاتی گاووری دەژمێررێن.

ئەم چووار گێرانەوەیە [١٤] لە ژیانی مەسیح کە لە ناوەرۆك دا هەر یەکێکن و لە روخساردا هەندێ جیاوازی‌یان تێدایە کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر ئەدەبی گێتی بە تایبەتی ئەدەبیاتی نەتەوەکانی ئەورووپا و بوون بە سەرچاوەیێکی لەبن نەهاتوو بۆ داهێنانی تازە لە ئەدەب و هونەردا لە سەرانسەری گێتی‌دا.

### هـ - قورئان:

قورئان «فورقان» و «زیکر» و «تەنزیل»و «مسحەف»و «کیتاب»یشی پێ دەڵێن، کورد «قورعان»ی پێ دەڵێ. کتێبی ئایینی‌ی موسوڵمانە، بە زمانی عەرەبی پارچە پارچە و بەش بەش بە شێوەی ئایەت لە خوداوە بۆ محەمەد پێغەمبەر نێرراوە، سرووش (جبریلی مەلایەکەت) هەڵگری ئەم پەیامە بووە.

قورئان باس لە عەقیدەی ئایینی ئیسلام دەکا، ژیانی ئەخلاقی و گیانی و کۆمەڵایەتی رێك دەخا. جگە لەمە سەرچاوەیێکی یەکجار گرنگە بۆ داهێنانی ئەدەبی و کارێکی گەورەی کردۆتە سەر رۆشنبیری و کولتوور و ئەدەبی عەرەبی و هەموو نەتەوە موسوڵمانەکانی تر، جگە لەوەی قورئان خۆشی لە ڕووی دارشتنی ئەدەبی و هونەری‌یەوە گەیشتۆتە لووتکە و گەلێ وێنەی شیعری بەرزی دەور کردۆتەوە.

قورئان لە ١١٤ سووڕەتی مەکەیی و مەدینەیی پێك هاتووە و بە سەر ٣٠ جزم و ٦٠ حیزب دا دابەش کراوە. عوسمانی کوڕی عەففان (لە ٣٥هـ / ٦٥٦م کۆچی دوایی کردووە)ی خەلیفەی سێ‌یەمی ڕاشیدی هەموو بەشەکانی قورئانی کۆکردەوە و یەکی خست و ئەو نوسخەیەی کە لە ناوەوەیە و باوەڕ پێ کراوە ئەنجامی کردەوە گەورەکەی عوسمانی کوڕی عەففانە. بەم جۆرە دەبینین قورئان یەکێکە لە کتێبە هەرە گرنگەکان وەکو سەرچاوەیێکی ئەدەبی، بێ گومان کۆنترین کتێبێکە لەو رۆژگارانەی کە ئایەتەکانی هاتوونەتە خووارەوە وەکو خۆی بە بێ دەسکاری ماوەتەوە تا ئێستا.

قورئان ئاورێکی زۆری لە مێژووی پەیدا بوونی ئادەمزاد داوەتەوە لە سەر ڕووی زەوی، گەلێ لایەنی گرنگی مێژووی کۆن و ئایینەکانی پێش ئیسلامی خستۆتە ڕوو. دیارە سەرچاوەی یەکەمی هەرە گرنگیشە لە مێژووی پەیدابوونی ئیسلام و بیر و باوەڕەکانی.

هەندێ لە سوورەتەکانی قورئان بە ناوی پێغەمبەران و دانایان و پیاوچاکانی کۆنینە هاتووە، وەکو: نووح، هوود، ئیبراهیم، یووسف، یوونس، مریەم، محەمەد، تاها، لوقمان.

ڕووداوەکانی کۆن بە شێوەی چیرۆکی هونەری تایبەتی لە قورئانا دەگێڕێتەوە، لەمانە پەیدا بوونی ئادەمزاد لە سەر ڕووی زەوی لە ئەنجامی هەڵخەڵەتاندنی ئادەم و حەوا لەلایەن شەیتانەوە، کۆتایی ژیانی هەمیشەیی‌یان لە بەهەشت و دەست پێ‌کردنی ژیانی سەر ڕووی زەوی. هەروەها ڕووداوی ژیانی دووەمی ئادەمزادیش دەگێڕێتەوە لە پاش تۆفانی نووح پێغەمبەر.

هەندێ گێرانەوەی دڵداری تەلی سۆزی ئادەمزاد دەبزوێنێ، بەوەی وێنەی هەست و مەیلێکی سۆفیزمی گەرمی ناوەوەی ئادەمزاد دەگرێ و مانایێك دروست دەبێ کە هەمیشەیی و جاویدانی دەمێنێتەوە لە داهێنتانی ئەدەبی‌دا، وەکو چیرۆکی یووسف پێغەمبەر لەگەڵ ژنی عەزیزی میسر (زولەیخای ژنی پوتیفار) و چیرۆکی سەرا و پەردەی تەختی سلێمان پێغەمبەری دانا لەگەڵ قەرالیچە جوانەکەی سەبەء (بەلقیس).

لە قورئانا باس لە خەباتی پێغەمبەران کراوە لە پێناوی بیر و باوەڕیان و هەرگیز کۆڵیان نەداوە و سوور بوون لە سەر هێنانەدی ئەو پەیامەی باوەڕیان پێ‌ی بووە، وەکو: ئیبراهیم پێغەمبەر بەرهەڵستی پیشەی باوکە دارتاشەکەی کردووە چونکە بتی بۆ نەتەوەکەی دروست دەکرد، لە پاشانا ئامادە بوو جیگەر گۆشەی بکا بە قوربانی. لە لایێکی تریشەوە مووسا پێغەمبەر بەربەرەکانی‌ی فیرعەونی کرد، زۆرانبازی و خەبات بوو لە نێوان بیر و ڕای «یەك خودا» و «چەند خودایێك». عیسا پێغەمبەر تا سەر قەنارەش بەربەرەکانی‌ی جوولەکە مێشك ووشکەکانی کرد ئەوانەی ئایینەکەیان کۆن بوو بوو و لە کەڵك کەوت بوو. محەمەد پێغەمبەر بەرهەڵستی هەموو ئێش و ئازار و بەربەرەکانی‌ی قورەیشی کرد، لە مەکەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە و کۆڵی نەدا تا بیر و باوەڕەکەی لە سەر پارچەیێکی گەورە لە ڕووی زەوی و لە ناو تیرە و هۆز و میللەت و نەتەوەی جیاواز بڵاو بووەوە.

قورئان ڕووداو و پەندێکی زۆر دەور دەکاتەوە لە بارەی خراپەوە. خۆپەرستی لە قابیلەوە دەست پێ دەکا، برای دایك و باوکی دەکوژێ لە پێناوی چاکەی خۆی. چاوچنۆکی لە قاروون دەبینێ. جەردەیی و ڕێگری و فێڵبازی و نامەردی و بگرە تا ئەو ڕادەیەی کە نێرینە بەکارهێنان بۆ شەهوەت لە باتی مێ‌ینە بە ئاشکرا لە قەومی لووت دەخاتە ڕوو.

نموونە بۆ دانایی و توانایی و یەك ڕێ گرتن لە قورئانا زۆرە، لە ئیبراهیم و یەعقووب و سلێمان و لوقمان و ئەسکەندەردا دەبینرێ گێرانەوەکانی یاجووج و ماجووج و ئەسحابی کەهف (هاوڕێیانی ئەشکەوت) نموونەی خوو و ڕەووشتی ناوەوەی ئادەمزاد و گۆڕڕانی ژیانن. ژن جێگەیێکی دیاری هەیە وەکو نیشانە و بەڵگەی گرنگ لە ژیانی ئادەمزاددا. لە قورئانا ناوی گەلێ لە ژنان هاتووە: ژنی نووح، سارەی ژنی ئیبراهیم، ژنی عەزیزی میسر (زولەیخا)، کچەکانی شوعەیب، دایکی مووسا، قەرالیچەی سەبەء (بەلقیس)، مریەم ژنی ئەبوو لەهەب.

داوود پێغەمبەر وەکو هونەروەرێکی گەورە لە قورئان دا دەکەوێتە ڕوو، دانا و زانا بووە، کە ئایەتەکانی زەبوور (مەزامیر)ی بە ئاوازەوە خوێندۆتەوە دار و بەرد و باڵندە بۆیان گێراوەتەوە و تەسبیحاتیان لەگەڵ دا کردووە، لە زیکری نهێنی‌ی ناوەوە و نادیاری سۆفیزمی بەشداری‌یان کردووە.

قورئان باسی کۆمەڵی ئادەمزاد و هۆز و قەومی پێغەمبەران و پیاو چاکان و پیاو خراپانی کردووە، هەر یەکەی کردووە بە ڕەمز و بەڵگەی کردەوەیێك و ڕەووشتێکی ئادەمزاد، لەمانە: قەومی ئیبراهیم، توبەع، هوود (عاد)، ساڵح (سەموود = ثمود)، لووت، فیرعەون، مووسا، سەبەء، شوعەیب، ئەسحابی ڕەسی، قەریە، ڕەقیم، سەفینە، ئوخدوود، فیل، باسی نەتەوەی ڕۆم و خەڵکی تریش کراوە. هەندێ لە سەر ئەو باوەڕەن کە مەبەسی لە «سَتُدْعَوْنَ الى قَوْمٍ أوْلِى بَأسٍ شَدِيْدٍ»(١٥) نەتەوەی کوردە.

بەم جۆرە قورئان وەکو شاکارێکی ئەدەبی نەوەکو تەنیا پێوەندی‌ی بە عەرەب و نەتەوە موسوڵمانەکانەوە هەیە، بەڵکو چۆتە ناو سامانی هەموو مرۆڤایەتی‌یەوە.

## ئەنجام

لەو ڕۆژەوە کە ئادەمزاد خۆی لە سەر ڕووی ئەم زەوی‌یە دیوە هەستی ئیستێتیکی بووە بەرامبەر دیمەنی سروشت و کار و جوانی خۆی. مەشق و تاقی کردنەوەی زۆر بووە، بەڵام تۆمار نەکراوە، هیچ جۆرە کەرەستەیێکی نەبووە بۆ تۆمار کردنی هەموو تاقی کردەوەکانی. ئەم سڤیلیزاسیۆنەی ئەوکووون بووبێ وایە، بەڵام بە مەزەندە دەتوانین هەست بە هەندێ لایەنی بکەین.

پاش مێژوو گەورەترین شۆرش بوو لە ژیانی ئادەمزاد دا، بەو وێنە و دروشم و نەخشی ئەندازیاری لە مێزۆپۆتامیا (عیراقی کۆن) و قەراغ ڕووباری نیل (میسری کۆن)، بەرهەمی ئەدەبێکی بەرزیان

تۆمار کرد، ئەمە نە تەنیا ئەدەبی نووسراو بوو (ڕەسمی)، نە ئەدەبی میللیش بوو (فۆلکلۆری) بەڵکو هەردووکیان بوو.

بەرهەمی ئەدەبی تۆمار کراو بە تیپەکانی ئەلفوبێ سەرەتای پەیدا بوونی ئەدەبی نەتــەوەیی (الادب القــومي) بوو، ئنجــا مێــژ ووی ئەدەب. ئەمــە لە هەنـدێ ئیقلیمی پڕ جمـوجۆڵ و جووڵانەوە پەیدا بوو. ئەو ئیقلیمـانـە پێشکـەوتوو بوون، بۆیە ئەدەب و هونەریان لێ پەیدا بوو وەکو بەشێکی گرنگ لە سڤیلیزاسیۆن. داهێنانی ئەدەبی و هونــەری گریـك (یـونـانی کۆن) و ڕۆمـان و هینـدستـان و چین و جزیـرەی عەرەب و ڕۆژهــەڵاتی زەریای ناوەڕاست گەیشتە لووتکە، ئەمـە بووە دایـك و سەرچاوە بۆ هەموو ئەو ئەدەبە نەتەوەیی یە تازانەی هەموو گێتی کە تەمەنیان لە هەزار ساڵ کەمتر نی یە.

## پەراوێز و سەرچاوە و بیبلیوگرافیا

(١) ئەوی ڕاستی بێ زمـانی عیبـری و لاتینی لەگـەڵ زمـانی عەرەبی بەرامبەر و بەراوورد ناکرێن، چونکە زمانی عیبری ی کۆن کە زمانی تەوڕاتە لە ماوەی زیاتر لە دوو هەزار ساڵ گۆڕ ڕانی سروشتی بەسەردا نەهاتووە و ئەدەبیاتی بەرزی پێ نەنـووسـراوەتەوە، بەم جۆرە زمانی زانسـتی نەبووە، بە زۆری زمانی قسە کردن بووە، بۆیـە زمـانێکی لەڕوو نەبـووە؛ هەرچی زمـانی لاتینیشـە کە ئینجیلی پێ نووسـراوەتـەوە ئەویش لە سەدەکـانی ناوەڕاسـتـەوە لە پراکتیك کەوتووە و کەس قسـەی پێ ناکـا، بۆیـە نەتـەوەکـانی دیـانی ئەورووپا و هەموو گێتی ئینجیلیان لە لاتینی یەوە گۆڕیـوەتـە سەر زمـانی نەتـەوایـەتی ی تازەی خۆیـان. بەڵام زمانی نووسینی عەرەبی ئێستـا بەلای کەمی یـەوە زیـاتـر لە شازدە سەدەیـە پەیدا بووە و پەرەی سەنـدووە و گۆڕ ڕانی بە سەردا هاتـووە تا سەردەمی ئەمـرۆشمـان هەر لە پێشکـەوتن دایـە وەکـو هەمـوو ئەو زمـانانەی ئێستای گێتی کە لە ناوەون، بەڵام ئەوەندە هەیە عەرەبی لە هەموویان کۆنترە.

(٢) ول دیـورانـت، قصـة الحضـارة، الجزء الاول، ط٣، القاهرة، ١٩٦٥ (ترجمة الدكتور زكي نجيب محمود)، ص١٨٣،

(٣) سەرچـاوەی پێشـوو، الجـزء الثـاني، القـاهـرة، ١٩٧١، (ترجمة محمد بدران)، ص ١٨.

(٤) بۆ زانیاری ی زیاتر لەم بابەتەوە بڕوانە:

J.pirenne, Le Civilisation Sumerienne, Lausanne, 1962; J.B. Pritchare, Ancient Near Eastern Textes, Princeton, 1969;

ملحمة جلجامیش، حققها ونقلها الى الانكليزية ن.ك. ساندرز ترجمة محمد نبيل نوفل وفاروق حافظ القاضي، القاهرة، ١٩٧٠، أصل الكتاب:

THis is a translation of the Eric of Gilgamesh, English Version, by N.K. Sanders (Penguin Books), 1960;

طه باقر، ملحمة كلكامش، بغداد، ١٩٧٥.

(٥) ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الثاني، ص ١٥٣.

(٦) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٩.

(٧) بۆ زانیاری زیاتر لە بابەت ئەدەبی گریکەوە، بڕوانە:

A.et M.Croiset, La Litterature Greque, 5 vol. nouv.ed., Paris, 1967; R.Flacellere, Histoire litteraire de la Grece, Paris, 1962; H.C. Baldry, Ancient Greek Literature in its Living Context, New - York, 1967.

(٨) یوگـورتـا Jugurtha (دەور و بەری ١٦٠ ـ ١٠٤ پێش مەسیح) شاهنشـای نەومیـدیـا بوو؛ نەومیـدیـا هەرێمێکی فراوان بوو لە نێوان قرتـاج (تـوونس)و مەراکیش (مـەغریب) واتە جەزائیری ئێـستا، ڕۆمانەکان کردبوویانە ناوچەیێکی سوپایی سەر بە ئیمپراتۆریەتی خۆیان.

(٩) بۆ زانیاری زیاتر لە بابەت ئەدەبی ڕۆمانی (لاتینی)یەوە، بڕوانە:

J. de Ghellinck, La Litterature Lanine au Moyen - Age, .2 vol., (Bloud et Cay), 1939; G. Cagnac, Pitite histoire de la Litterature Latine (P.U.F), Paris, 1946; Ph. Poullain, La Litterature Latine (P.U.F), «Quesaisje», nouv, ed., 1960

(١٠) بۆ زانیاری زیاتر لە بابەت ئەدەبی هیندی یەوە، بڕوانە:

L.Renou, La Posele religieuse de 'Linde antique, (P.U.F), Paris, 1942; H. de Glasenapp, Les Litteratures de 'Linde, des Origines a 'Lepque Contemporaine (Payot), Paris, 1963.

(١١) بۆ زانیاری زیاتر لە بابەت ئەدەبی چینی یەوە، بڕوانە:

O.kaltenmark - Ghequier, Le Litterature Chinoise, Paris, 1948; Feng Yuan - Chun, A ShortHistory of Classical Chinese Literature, Pekin, 1958; Chen Show - yi, Chinese Literature, A HistricalIntroduction, .New - York,1961.

(١٢) بۆ زانیـاری زیـاتر لە بابەت ئاڤێـستاوە، بڕوانە: پورداود، گاتها، بمبیء، ١٩٢٧؛ جلیـل دوسـختـواه، آوستـا ـ نامـه مینوی آیین زرتشـت، چاپ أول، تهران، ١٣٤٣هـ. ش. [١٩٦٤م].

(١٣) بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١٠)ی ئەم باسە.

(١٤) ئەمـانـە ئینجیلە باوەڕ پێ کـراوەکـانی کلیسـەی دیانانن، لە لایەن زۆربەی هەرە زۆری هەمـوو تیـرە و مەزهەبە وورد و درشتەکانیان، جگە لەمانە ئینجیلی تریش هەیـە، بەڵام باوەڕی پێ نەکـراوە چونکـە بە هەڵبەست و دروست کراو و نارەسـەن دانـراوە وەکـو ئینجیلی «بـرنـابـا» گۆیا بە زمانی ئیتالی لە پاش سەدەی سێزدەم لە لایەن نووسەرێکی ئیتالی یەوە تۆمار کراوە.

(١٥) سورة الفتح، آیة ١٦.

# بدايات الأدب

# و

# أدب العالم القديم

● الدكتور معروف خزنەدار ●
الاستاذ بكلية الآداب ـ القسم الكردي
جامعة صلاح الدين ـ أربيل

لازم الحس الجمالي الانسان منذ أن وعى وشعر بأنسانيته على وجه البسيطة، فكانت الطبيعة العارية، والكدح في سبيل العيش، والحب لاشباع النفس والروح والجسد من المنابع الاساسية التي دفعته الى الابداع.

غير انه لم تصلنا حصيلة الابداع البدائي للانسان لان وسائل التدوين لم تكن متيسرة، وهكذا ضاع الشيء الكثير للانسان المبدع في المجالات الحيوية التي اتخذها وطناً يعيش فيه، غير انه من الممكن ان نتصور بعض المعاني التي أبدع فيها، والأعمال التي قام بها.

ثم كان الانقلاب الاكبر في تطور الحياة حينما توصل الانسان الى استخدام الرموز والعلامات والاشكال الهندسية لتدوين الاحداث والمعاني. فكان العراقيون الاوائل (سكان بلاد الرافدين) أول من أبدع في الفن الملحمي وتصوروا الحياة ومصير الانسان في ملحمة گلگاميش، ثم كان المصريون القدماء (سكان وادي النيل)، وهم أول من دوّن الشعر.

وقد حكم التطور على الكتابة الهيروغليفة ان تنتقل الى مراحل متقدمة، فكان الحرف وكانت الكلمة المدونة. ثم ظهرت الكتابة الفلسفية والادبية والفنية في مجالات حيوية أخرى، وقد تهيأت لها ان تكون مراكز حضارية متقدمة، ومن أهم هذه المراكز بلاد الاغريق والرومان والهند والصين وجزيرة العرب وشرقي المتوسط وغيرها.

وبمرور الزمن ظهر تراث ضخم من الابداع تتمثل في الاعمال الكبرى إلياذة وأوديسيا هوميروس، وإنيادة ڤيرجيلوس، ومهابهراتا ورامايانا الهنديتين، والأناشيد والحكميات الصينية.

فإذا كان الابداع الادبي المعين الاول لظهور الحياة الروحية في المجتمع الانساني فأن الكتب السماوية والكتب المقدسة للاديان المختلفة لاتقل في أهميتها عن ذلك الابداع وهي بدون شك تعتبر منابع ومصادر أساسية للابداع الادبي أيضاً، وبالاضافة الى ذلك ان تلك الكتب نفسها لاتخلومن الروح الشاعرية والنفس الرومانتيكي. وبهذه المناسبة ينبغي ان نميز القرآن كأثر أدبي عن الكتب السماوية والكتب المقدسة الأخرى، وذلك لأن لغته أقدم لغة حافظت على كيانها وتطورت تطوراً طبيعياً دون ان تفقد أصالتها، في حين ان اللغات التي نزلت بها الكتب السماوية أو التي دونت بها الكتب المقدسة قد اندثرت أو انحصرت في أدبيات المراسيم والطقوس الدينية المتباينة فقط، وهكذا فإن السانسكريتية (لغة الڤيدا)، والميدية (لغة الأبستاق)، والعبرية (لغة التوارة)، والآرامية (لغة الانجيل) قد اصبحت من اللغات الآثارية أو توقفت عن التطور ابتداءً من منتصف الألف الاول لما قبل المسيح وانتهاءً بالقرون الوسطى لما بعد المسيح.

وما يتصل بالابداع في مجال النتاج الادبي نستطيع ان نتصور بعض ما لقبل التاريخ غير المدون في نتاجات مابعد التاريخ بمرحلتيها الآثارية والقديمة، واننا نعد نتاج الابداع الانساني في جميع المجالات الحيوية منذ ان خلق والى حدود ألف سنة أو اكثر قبل الآن من التراث الانساني، فعلى سبيل المثال نقول ان الادب الاغريقي الذي ظهر في المجال الحيوي للارخبيل اليوناني لم يؤثر فقط في ظهور الادب اليوناني الحديث وإنما أثر في ظهور آداب الشعوب الاوروبية خاصة والشعوب العالمية عامة، وهذه الظاهرة تنطبق على آداب جميع الشعوب التي ظهرت في مجالات حيوية أخرى عبر التاريخ الانساني الطويل.

# پێنج هوزان ددەستنڤیسەکا پربهادا

* محسن ابراهیم احمد
دوسکی

گەلەك جهێ کەیفخوشیێ ودل خوشیێیە دەمێ مروڤ دەستنڤیسەکێ د بینت یان پەرەکێ دەستنڤیس هوزانەکا کوردی ل سەر هادبیتە نڤیسین، یان مالکەکا هوزانێ ومروڤ ڤێ هوزانێ ژ مرنێ قورتال کەت وبێختە سەر بەرپەرێت روژنامەکا کوردی یان گوڤارەکێ وپێش کێشی خوەندەڤانێ کورد بکەت.

بەری دەمەکی چەند دەستنڤیسێت دیوانا مەلایێ جزیری ب دەست من کەتن، ئێك ژێ ئەوبویا سەیدایێ هێژا مەلا محمدێ کوڤلی ـ خودێ ـ هاریکارێ ویبت ـ پێش کێشی من کری.

ئەڤ دیوانە ل رەمەزانا پیروز ل سالا ١٣٦٩ مشەختی هەڤبەری سالا ١٩٤٩ ژ دایك بونا عیسای، یا هاتیە نڤیسین ل گوندێ خویلێ سەیدایێ مە مەلا طاهایێ کوڤلی یا نڤیسای ـ رەحمەت لێ بن ـ دەمێ فەقی ل وێرێ.(١)

د گەلە جهادا سەیدایێ کوڤلی داخازا لێ بورینێ د کەت و دبێژت ل من نەگرن ئامیرێت نڤیسینی هەمی من نینن، یان ژی یا ل بەر طاقە هەیڤێ نڤیسای، هەروەکی گوتی:

(لا لوم علی بأس الخط لأني کتبته بضیاء القمر في لیلة من لیالي البیض المصادفة الثالث والعشرین من شهر رمضان المبارك في قریة خویلة، هي قریة من قرئ السورچیة عند الشیخ عطاء الله شیخ من شیوخ السورچیة، سنة ١٣٦٩هـ).(٢)

د گەل ڤێ چەندێژی گەلەك ب نڤیسینەکا قەشەنگ وسپەحی یا هاتیە نڤیسین، وڤێ باش نڤیسینا سەیدایێ کوڤلی وەلمکر کو ئەز هویرك هویرك بخوینم وپەر پەر ڤەدەم ژ سەری هەتا دوماهیێ.

پشتی خاندنا ڤێ دەستنڤیسێ بو من دیار بوگەلەکا پربهایە ژ بەر ڤان خالیت ژێری:ـ

١ ـ هەر هوزانەکا تێدا هاتیتە نڤیسین د پێشیا وێدا یا گوتی کێشا وێ ئەڤەیە، وئەگەر گهورینەك د هندە مالکادا هەبت ل پێشیێ یا دیار کری. بو نموونە هوزانا:

نێرگزێن شەنگ د مەستن چەپ وراست

ساقیان جام د دەستن چەپ وراست

ل پێشی یا هوزانێ یا گوتی:

میزان: فاعلاتن فَعِلاتن فَعِلاتن «مرتین» فَعِلُن في البعض.

ئانکو تەفعیلا دوماهیێ د هندە مالکادا دبیتە فَعِلْنْ

٢ ـ سەیدایێ کوڤلی ئەڤ دیوانە یا ل بەر دیوانا شیخ طاهرێ



شوشي نڤيساى ـ هەر وەكى دێ ديار بيت د ڤان خالێت بێت دا ـ و شوشـي بێ زڤـريـە گەلـەك دەستنڤيسـا ، هەر وەكى يا ديـارە د دەستنڤيسێـدا ، ل سەر گەلـەك پەيڤا د گەلە هوزانادا دبێژت : (وفي بعض النسخ) ئەڤەژى گروڤەيە كويا ل بەر گەلەك نوسخا نڤيساى.

٣ ـ سەيدايێ كوڤلي ل سەر گەلەك پەيڤێت گران بێ راوستياى و يێت راڤـەكرينـە سەر ئەزمـانێ عەرەبى ، چ پەيڤ كوردى بت يان فارسى بت د بندا ئانكوياوێ ب عەرەبى يا نڤيساى.

٤ ـ سەيـداى ل پێشيـا ديـوانێ پێشـەكيـەك يا نڤيسـاى وديڤـدا بناغێت رێ نڤيسا ديوانێ يێت ديار كرين ، وئەڤە ژى گروڤە كە كو سەيـدايێ مەلا طاهـا ديـوانـا جزيـرى يا ل بەر وێ نڤيساى يا شێخ طاهـرێ شوشـى نڤيسـاى ، چونكى ئەڤ بنـاغـە ئەون ئەوێت رەحـمـەتـى شوشـى د نڤيسينـا خويا ب كوردى دا ب كارتينت ، نەخـاسـم د (ريـاض النـور)دا ، ودويڤ ڤان بنـاغـا دا ياهـاتى د دەستنڤيسێـدا : , جامع الكلمات الملا الشيخ طاهر الشوشي ، هەر وەسا د پێشەكيێ دا يا گوتى : (فقد اخترعت لضبطه علامات ورموز لم يسبقني إليها أحد) وئەڤ عەلامەتە ئەون ئەوێت شوشي ديوانا جزيرى ل سەر نڤيساى ل پێشى نڤيسينا سەيدايێ كوڤلي .[3]

٥ ـ پێشەكيا ديوانێ پەخشانەكا گەلەكا جوانە سەيدايێ كوڤلي يا نڤيساى ب زمانێ عەرەبى ، ويا ئەز دبينم ئەڤ پەخشانە ژى هەر يا رەحمەتى شوشى يە .

٦ ـ يا ژ خرا پر بها تر ئەوە كو سەيدايێ مەلا طاها هوزانەكا تێدا نڤيساى ل دويڤ زانينا من تا نهو نەهاتيە بەلاڤكرن ، ويا گوتى : ئەڤە

هوزانـا جزيـرى يه و د گەل چار هوزانێت دى يێت رەحمـەتى شێخ طاهرێ شوشى.

د بيت كارێ سەيدايێ كوڤلى دڤێ ديوانێدا بەس نڤيسين بيت، و دانانا (بەحرا) ژ ى يا هەر هوزانەكێ. و راڤەكرنا پەيڤا ژ بەر ديوانا رەحمەتى شوشى ڤە گوهازتين.

ئەڤ دەستنڤيسە ٢٧٧ بەرپەرە ١٢٧ هوزانێت تێدا، قەوارێ وێ ٢١ سم × ١٦ سم.

هەر بەرپـەرەكى ژ نەهـ مالكـا هەتـا دەهـ مالكـا يێت تێـدا ب ئانەهيا خودێ نهو دێ وان تشتێت ب مفا دانمه بەر چاڤێت خويندەڤانا.

بەرى هوزانـا دانمـه بەر چاڤێت خويندەڤانێ هێژا، حەزدكەم. وێ پێشـەكيـا مه بەر نهـو بەحس ژ ێ كرى دانمـه بەر چاڤێت خويندەڤانا. ژ بەر كو پەخشانەكا جوان و تازەيه. و ئەڤەيه دەڤا پێشەكيێ: .

[بسم الله الرحمن الرحيم]

(الحمد لله الذي رشح بستان معرفته برياض البقاء، ووشحها بأشجار قلوب العارفين، وأزهار ضمائر ذوي الصفاء، وسناهم من رحيق رياض محبته كؤوس الهناء، فسبحانه لا إله إلا هو يفعل ما يشـاء، لا سيمـا لذي هو معـدن جواهـر الانس، وبلبـل حظيـرة القدس، وتاج رؤوس الأنبياء، مدينة العلوم والفصاحة، المنتخب من ضضيء[٤] الشرف والسماحة، المبعوث إلى كافة الثقلين[٥] بلا امتراء، صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه، بدور برج الهداية، وشموس فلك السيارة، أما بعد:-

فلما كان الديوان المنسوب إلى عمدة العلماء وزبدة الفضلاء، وقدوة الأدباء، سلطان العاشقين، وفخر شعراء الكرد، الملا الشيخ أحمد الجزري البهتي «قدس سره العزيز ونور ضريحه، و لم أطلع على ترجمة حاله، ولا على تأريخ حياته، سوى مايستفاد من مكالمة بينه وبين فقي طيران القائل: (، هزار ويك و سهان) يعني في سنة ألف واحدى وثلاثين، حديقة المعاني والحقائق، ومنهل الرموز والدقائق، أردت أن أكتب على نمط بديع بالضبط والتصحيح، إلا أن الآلات والأدوات لم تكن جيدة، ولأن النسخ المنقولة عنها مخطوطة، نقلت من يد إلى أخرى، وهلم إلينا فقد وقع فيها كثير من الأغلاط، وركاكة السجع، وأني تصرفت في مواضع عديدة حذفاً وزيادة وتبديلاً ومع ذلك فقد تقف في مواضع شتى، واذ تقرر في الأصول أن لكل أحد أن يصطلح على ما يشاء، فقد اخترعت لضبطه علامات ورموز لم يسبقني إليها أحد.

ولما كان الفرق بين الياء العربي والكردي بمعنى الكثير الورود في لغة الأكراد والفرس وغير العرب، لا أنه لا يوجد في العربي إذ الألفات الممالة من «قالوا بلى»، «والضحى والليل إذا سجى» بالامالة كلها ما اسمية الياء الكردي عسيرا إلا على الأذكياء، وكذلك الفرق بين الكسرة الكردية والعربية، بمعنى أنها لا توجد في العربية، وإنما أقول كرديا في الموضعين، لأن الكتاب كردي، وكذلك بين الراء الكبرى والصغرى، وغير ذلك مما يجيء أردت أن أنبه الناظر على ذلك، وأما الفرق بين الياء والجيم والزاء والفاء والكاف[٦] العربيات بالمعنى المذكور فشائع رائع).

## هوزانا ئێكێ

سەيـدايێ مەلا طاهـايێ كوڤلى رەحمـەت لێ بن د بەرپەرێ (٨٤)ێ دا هوزانـەك يا نڤيسـاى ول پێشيێ يا گوتى: [ وله ـ ئانكـو جزيرى ـ قصيدة مقطعة تعاد في آخر كل ثلاثة أرباع البيت الأخير من القطعة الأولى، مع ربع يوافقها في الوزن والتقفية].

ل دويڤ زانينـا من د هوزانـا جزيـرى دا ئەز نا بينم ئەڤ هوزانـه هێـژا وێ كێمتـره ژ هوزانێت مەلێ، لێ موخـابن جزيـرى نه پەيڤا «مـەلا يان مەلێ» و نه ناسنـاڤێ خوه «نيشـانى» ل دويمـاهيـا ڤێ هوزانێ نەينـايـه، وئەڤەژى نەبويه كوجزيرى هوزانەك راچاندبت وناڤێ خويان ناسناڤێ خول دويماهيێ نەئينت.

پەيڤا «مەلا» يا ل دوماهيا هوزانێ هاتى لێ ژێ ناهێته زانين كو بەحسێ جزيرى يه.

## دەقا هوزانێ

وله قصيدة مقطعة تعاد في آخر كل ثلاثة أرباع البيت الأخير من القطعة الأولى مع ربـع يوافقهـا في الـوزن والتقفية، ولايوجد في بعض النسخ القطعة الثانية.

ميزان: مفتعلن فاعلن مفتعلن فاعلن «مرتين»

### القطعة الأولى

چومه تەماشا چيمەنێ تازە گول و نەستەرن

غونچە و بشكو ڤەكەنێ چيچمك و نەسرين سەمەن

تێك سەحەر مەستبون موحبەتەكێ خواستبون

زولفەكێ ئەو بەستبون عەقرەبيان گەستبون

یەك ب یەك ئەو خەمملین بەغچە بوان کەملین
بلبلی صوهتی دلین تێك ژ وان دەست بلین
دل ب مەیێ ییتە ساز رەوضەئێ باغێ مەجاز
مەست و خەرامان ب ساز لێ د مەشن سیی و قاز

* * *

## القطعة الثانية

بولبولێ حەیران هزار نالێ یە وان زارەزار
غونچە لەب و گولعوزار نازکێ زێرین هزار
هن گەش و هن غونچەنە پێش یەکەنی غونچەنە
پور سەر و پور عیشوەنە عاشقێ حوسنا خوەنە
پەرتەوێ عشقێ ژ حەق صەد صیفەت و صەد نەسەق
ئەو ددەرن یەك شەفەق لەو مەرەوان تێن سەبەق
مەعریفەتێ رەمز و ناز رەوضەئێ باغێ مەجاز
مەست و خەرامان ب ساز لێ دمەشن سیی و قاز

* * *

## القطعة الثالثة

موغنی و سازندەین لێ ب مەجالا مەین
خەف ژ سەرا پەردەین بێژە مە تو موژدەین
زێدە ب حوسنن د قەنج شوخ و شەپالن د غەنج
لێ مە ئەوان زێر و گەنج دا مە ئەوان صە د شکەنج
جان ب دە وان دل کران گەوهەر و لەعل و دوران
بەخشە ب شیرین سوران دل بخو بر تالان
زەرمەکرین ئیحتراز رەوضەئێ باغێ مەجاز
مەست و خەرامان ب ساز لێ د مەشن سیی و قاز

* * *

## القطعة الرابعة

لات و بت و سیم بەر قامەت و قەد نەی شەکەر
گوفتێ ب قەندێ د تەر وان ل مە کەر کر جەگەر
وەی کو چ شیرین لەبن غەبغەب و دێم کەوکەبن
کاکل و گیسو شەبن ظولم و جەفا مەشرەبن
حوری و شەهزادەیەك دێم گول و لەب غونچەیەك
بوری یە حەق شێوەیەك سەرناز نەمان غونچە یەك

رم مە ددل چو و گاز رەوضەئێ باغێ مەجاز
مەست و خەرامان ب ساز لێ دمەشن سیی و قاز

* * *

## القطعة الخامسة

پور خەجلین سیم و زەر غەیری ل تەرحین د تەر
بەلك و وەرەق تاج و سەر زولف ل سەر چونە گەر
دل ب دەوان بشکوان لۆلۆ و عەقد و گوان
عەرعەر و سەروا جوان دا تو بوان یی جوان
نازك و خوب و زەری رەنگە مەلەکن سور پەری
دێم دور و لەب گەوهەری لێ بیە جان موشتەری
حوسن و جەمالا بخواز رەوضەئێ باغێ مەجاز
مەست و خەرامان ب ساز لێ دمەشن سیی و قاز

* * *

## القطعة السادسة

گولشەنێ باغێ ئیرەم نەی شەکرن موحتەرەم
جوملەتێ نەهلێ حەرەم زەمزەمە وان صوبح و دەم
پەردە نشینی خومار دێم ژ خەططێ غوبار
روژ ب حوسنێ ڤەشار پر ل مە کەرکر کوبار
عەرعەر و سەروا جوان یاسەمین و ئەرغەوان
روحن و ئەو هەم رەوان دێ دل و جان دەین ب وان
لات و بوتێ دل نواز رەوضەئێ باغێ مەجاز
مەست و خەرامان ب ساز لێ د مەشن سیی و قاز

* * *

## القطعة السابعة

دل ب شەپالان بدە ب ئاسك و غەزالان بدە
سینە ب تالان بدە روحێ ب خالان بدە
نورێ چرایێ دلن چهرە گوشایێ دلن
شێخ و مەلایێ دلن قیبلە نومایێ دلن
کەعبە و (أسود حجر) پەردە هلینن ژ بەر
لازمە یەك سوجدە فەر سوجدەئێ شوکرێ بەر
دا تو ببی سەرفەراز رەوضەئێ باغێ مەجاز
مەست و خەرامان ب ساز لێ د مەشن سیی و قاز

* * *

## هوزانا دووێ

هوزانا دووێ هوزانەکا شێخ طاهرێ شوشی یە خودێ ژێ رازیبت ب راستی دەمێ من ڤیای پێشەکیێ بوڤێ هوزانێ بنڤیسم من نەزانی دێ ب چ رەنگ بەحسێ هوزانڤانیا شێخ طاهرێ شوشی کەم، وقەلەم ما راوەستیای ژ پەسندانێ، ژ بەرفلی یا (ابداع) رەحمەتی شوشی د ڤێ هوزانێدا کری.

ئەڤ هوزانە ژ دەهـ مالکا یا پێکهاتیە، هەر مالکەك سینگێ وێ (الصـدر)ب کوردی یە، ودوماهیا وێ (العجز)ب عەرەبی یە، رەحمەتی مەلا طاهایێ کوڤلی ئەڤ هوزانە ب دوو رەنگا یا نڤیسای د دەستنڤیسێدا:

١) ب رەنگێ هوزانێ مالك ل دویف مالکێ.

٢) ب رەنگێ گولێ، وئەڤ رەنگەیە یێ کوفلی یا مەزن تێدا ژ بەرکو ئەڤ هوزانە ب ڤان هەر دوورەنگا یا هاتی ددەستنڤیسێ دا، ئەم ژی دێ ب ڤان هەر دوو رەنگا دانینە بەر چاڤێت خوێندەڤانا.

### دەقا هوزانێ

ل موما دلێمن تازە شوعلەك وەلێ هلبو
بوجد أليم من حبيب مجمل

ل مەجمەر هەوایێ یارێ بێ لوطف و بێ مەیلێ
ليبكي فؤادي بالدموع المسلسل

ل سەلسالێ خون بەر صەفحەێ رویێ من سایل
يلوح عليها رسم حب بجدول

لمو د جەڤایا من چو بولبول ب نالآنم
نموج ونشتاق لأزهار كلكل

ل گول گول قەبایێ نازکێ من عەجایب دین
ينوط على الخدين من حب فلفل

ل فولفول دوو خالێ عەنبەرین بون و سیم بازو
زوائبها مثل الحرير المفتل

ل تەڤ مسکە وێ دێم شوبهێ ماهێ کو دە صەفا
فاحسن بصدغ من مثنى و مرسل

ل سەر مل دخونن طوطی سەر تایێ قەد سەر وێ
ويرمي سهاماً من عيون مكحل

ل حکمێ تەجانا دل جەگەر سوژ و غەمناکم
كما تحرق النار الغضى ثم تنجلي

ل (جنة) رەحیڤا وەصلێ (طاهر) ڤەخور یەك جام
أمان وتسليم لراج و مؤمل

رەنگێ دووێ :ـ

ئەڤ رەنگەیە یێ کو هوزانڤانیا شوشیێ نەمر تێدا دیاردبن وکا چەندێ شارەزابو د راچاندنا هوزانێدا. سەیدایێ کوڤلی (حلّ)ا ڤێ لوغزێ ب عەرەبی یا نڤیسای.

ئەڤ هوزانە وەکی گولەکێ یە، هەر دەهـ مالك وەکی دەهـ بەلگا لێتێن پێڤە، هەر مالکەکا ڤێ هوزانێ ب پیتا (ل)ی دەست پێدکەت وبپیتا (ل)ی ب دوماهیك تێت، وهەر مالکەك سینگێ وێ (الصدر) ب دووپیتا ب دوماهیك تێت، وهەروسا پارچە دووێ ژ مالکێ یا ب عەرەبی بە وان هەر دووپیتا دەست پێدکەت، وهەر مالکەك دەست پێدکەت ب چار حەرفێت دوماهیا مالکا بەری خو، و مالکا ئێکێ ب چار حەرفێت مالکا دوماهیێ دەست پێدکەت.

(قصيدة على هيئة الدائرة لها عشرة أركان، أربعة أحرف، أولها اللام المركزي تقرؤ باللهجة الكردية لأول كل مصرع كالحرفين آخره، ثم يبدأ بهما لأول المصرع الثاني العربي إلى الحروف الأربعة وآخرها اللام، فتلك الأربعة مشتركة بين أول بيت وآخره، والحرفان المشتركان بين آخر كل مصرع، وأول المصرع الثاني، وأولها:

ل موما دلێمن تازە شوعلەك وەلێ هل بو

بارك الله لمن يعرفها سريعاً.

### شوشی و جزیری :ـ

ئەڤ هەرسێ هوزانێت بێن سێ پێنج مالکینە رەحمەتی شێخ طاهرێ شوشی یێ ل سەر سێ هوزانێت جزیری دانایین.

یا ئێکێ تەخمیسا هوزانا

ئەز نزانم سەبەبی یارێ چرا دور کرین

یا دووێ تەخمیسا هوزانا

ئەی نەسیمێ سەحەرێ ما د مەجالا صوبەهێ

ویا سییێ تەخمیسا هوزانا

جانا ژ جەمالا تە موقەددەس قەبەسم ئەز

شوشـی هوزانڤـانـەکێ خودێ ترس بوو، تەمـەنێ خو هەمی بورانـدبـو د نڤیسینا کتێبێت ئایینی دا و هوزانێت بوسرمانەتیێ دا وژ خودێ ترسیێ، و ئەڤ هەرسێ غەزەلێت شوشی نڤیسـاین ل دەمێ فەقیاتیێ بێت راچاندین ل سەر هوزانێت جزیری.

یێ هوزانێت شوشی بخوینیت نەخاسم کتێبا (ریاض النور) دێ بینت کو هوزانا خانی گەلەك كارێ د هوزانا ویدا کری، لێ د ڤان هەرسێ هوزانادا دیار دبت کو هوزانا جزیری گەلەك كارێ دهوزانا شوشی دا کری، ودێ دیـاربت کا هوزانـا شوشی چەنـدا پر هێزە ژ لایێ رەهـوانبێـژیێ ڤە، نەخـاسـم ژ لایێ (تشبیـه)یێ ڤە، ودێ بو مروڤی دیاربت کو شوشی ژی ئێکە ژ شاگردێت خاندنگەها جزیری.

هەروسـا یا خویایە کوهوزانڤانەکێ رابی هوزانەکا هوزانڤانەکێ بەری خو تەخـمیس کری یا خودیتی ل رێـزا وی، وخودبینت کو دێ پێنچێیت تازە هوزانا خو ئینت لەورا تێت هوزانێ پێنج مالکی د کەت.

بەری دەڤێت هەرسێ هوزانا ب دانمە پێش چاڤێت خوینەڤانا م پێخـوشـە ڤەکـولینـەکـا سەریێ د هەرسێ هوزانـا دا بکەم وکاجا هوزانا جزیری چەند کار د هوزانا شوشی دا کریە.

خانـدنگەها جزیری یا هوزانێ گەلەك خاندنگەهەکا بەرفرەهە، هەر هوزانڤانەکێ پشتی وی هاتی یێ (متأثر) بوی ب هوزانا وی، و یێ بویە شاگردە د خاندنگەها هوزانا ویدا، وەکی پەرتویێ هەکاری و شێـخ نورالـدینێ بریفکی و شوشی و ئەنـوەر مایی و نالبـەنـدی و جەگەر خوینی، و هەتا هوزانڤانێد نهو ئەوێت هوزانا کلاسیکی د نڤیسن.

و هەر هوزانڤانەکی ب رەنگەکی هوزانا جزیری کارێ (تأثیر) د هوزانـا ویـدا کری، وب رەنگـەکی هوزانڤانی مفایێ ژ هوزانا وی دیتی، چ پەیڤێت جزیـری ب کارئینـابن، ویان وەکیەکێت (تشبیه) وی ب کار ئینابن، ویان خووەکی جزیری کربت دهوزانێدا وخو بو یاراخو شکاندبت.

دەمێ مروڤ ڤان هوزانێـد شوشیێ نەمـر بخـوینت دێ بینت هوزانـا جزیـری ب گەلـەك رەنگـا كارێ د هوزانـا ویـدا کری، و هەروسا گەلەك پەیڤێت جزیری یێ ب کار ئینایین د هوزانا خوەدا.

شوشی ژی وەکی جزیـری هەر نالینـە ژ بەر بەژن عەعـەرێ و کول و کەسـەرا وی بەس فیـراقـا حەبیبێ یە، یێ هاتیە گەزاندن ب دوو رەشمـارا، لێ موخـابن هەریێ دویرە ژ دیدارا یارێ رێکا صەد



قوینـاغـا، وخەمـا ویـژی هەر ئەوە وچ خەمێت دی لێ نینن ژ وێ خەمێ پێڤەتر، ژ بەر هندێ خود کەتە فیدا و قوربان د رێیا وێدا، هەتا د کەفتە داڤێت دووزولفا، ودویماهیێ دبیتە ئێخسیرێ زیندانا دلبەرێ و دوماهیێ دبیتە شەهید درێیا وێدا.

شوشیێ نەمـر ژی وەکی جزیـری ب چاڤـەکێ بلند یێ بەرێخو دایە دلبەرێ، ومەقامێ دلبەرێ گەلەکێ بلند بول نك، وهەریا خو بو شکاندی، وهەر ژێ دخازیت مەدەدێ وهیڤیا ژێدکەت وددەتە سیندێ بەس جارەکێ بێتە تەماشا وی.

نهـو چەند مالکێت شوشی دێ هەڤبەرکەین د گەل یێت جزیری دا رونتر لێ بێت کو هوزانا جزیری گەلەك كارێ د هوزانا ویدا کری.

شوشی دبێژت:

**وەك جەرەس نالە ژ من تێن ژ سەما طەوق و چەکان**

**دل ژ من بر ب غەدر غەمزەئێ وان چاڤ بەلەکان**

نالینا جزیری ژی هەرا هویە دەمێ دبێژت :ـ

**حوبیا تەیە من رادەهەژینی کو بنالم**

**شەب تا ب سەحەر ناڵە ژ رەنگێ جەرەسەم ئەز**

و هەر نالینا شوشی ل نك زێدە دبت ژ شەڤێ هەتا سپێدێ هەتا وەکی عود و نەیێ لێبێت.

**وەکو نەی ناڵە ژ من تێن ب ئەنا وەصفێ تەیە**

**لێ ب شەب تا ب سەحەر ناڵە مە وەك عود و نەیە**

نالینا جزیری ژی ب ڤی رەنگی یە دەمێ دیار د کەت :ـ

**لەو مە شەب تا ب سەحەر ناڵیە وەك موغنی و عودێ**



**گەر حەزازیلی ب دیتا نە دبر غەیری سجودێ**

**هەر وەسا شوشی شتی جزیری دلبەرێ د دانت روح و جان**

و مانا وی یا دمانا وێرا و چ غەم نینن ژ وێ پێڤەتر دەمێ دبێژتی :ـ

**عشقێ رویێ تەنە عالەم ژ سەما تا ب سەمەك**

**مە تویی روح و رەوان غەیری تە نینن چ غەمەك**

یان دەمێ د بێژتێ،

**ب تەماشەی مەنە عالەم ژ سەمەك تا ب سەما**

**مە تویی روحێ شرین بێ تە مە ناژین چ دەما**

جزیری ژی هوسا دلبەرێ د دانت:ـ

تویی روح و رەوانا من بییت قوربان تەجانێ من

دەمێ شوشی تێت وپەسنێت دلبەرێ د بێژت، هەر وێ وەك هەڤییێ (تشبیە)ێ، دکەت یا جزیری کری، و قەد و قامەتا وێ پێ تەشبیە کری:

**لێ ژ دل کەفتیە گاڤا تو کەنی لامعی بەرق**

**مە نەدین میثلێ تە عەرعەر قەد و زێر تاجی ل فەرق**

بەری شوشی مەلایێ جزیری بەژنا یارێ یا تەشبیە کری ب دارا عەرعەرێ ڤە دەمێ دبێت:ـ

**عەرعەرا قامەت ئەلیف نەی شەکرا شوخ و شەپاڵ**

**نازکا سیم تەن و خوسرو زێرین کولەهێ**

ژ بەر ڤێ رندا سپەحی و هێژا و دەلال، هەر دوو هوزانڤانا یا خو گوری و قوربان کری، شوشی دبێژت:ـ

**ل مە حەی کر جەسەد و قەلبێ تەژی زام و برین**

**ب فیدا سەر وێ جەمالا تەبتن جانێ شرین**

مەلایێ جزیری ژی دبێژت:ـ

تویی روح و رەوانا من بییت قوربان تەجانێ من

جزیری دەمێ بەحسێ دویراتیا خوژ یارێ د کەت د بێژتێ:

صەد قویناغا ئەزێ ژ تە دورم، و ئەزێ بێ بارم ژ دیداراتە:ـ

**عیدە و هەر کەس ژ دیدارا تە لێ پیروزە عید**

**ئەز تنێ مەحرومێ دیدارم ب صەد مەنزل بەعید**

دویراتیا شوشی ژی هەر هندەیە ژ دیدارار یارێ دەمێ دبێژتێ

**ب طەمەع وەصلێ تە جانا غەمێ هیجران دخورم**

**صەد بەریدان ژ تە دورم ژ خوێ باڵ و پەرم**

بەری شەهید بونێ دێ بینین شوشی ژی وەکی جزیری ئیخسیرێ زیندانێ یە، و هەر داد و مەدەدێ د خوازت کو بەس جارەکی دلبەر بێتە تەماشێ :ـ

**مە ئەسیرین ژ دەرێ تە ب دەوام ناڵە مەدی**

**مەتویی داد و ئەمان هەر ژ تە د خوازین مەدەدێ**

**وەرە جارەك ب تەماشەی مە فەقیران تو خودێ**

جزیری ژی درێ یا ئەڤینێدا ئیخسیرێ زیندانێ یە و مرادا وی ئەوەی جارەکێ ناڤێ وی ژ دەڤێ یارێ دەرکەڤت:ـ

**دلبەرێ سەرداریێ خوبان ئەز نزانم ئاگەهـ هەیە**

**د حەبس و زیندانێ ئەسیر و گرتیێ دەرماندەیە**

**گرتیم مایم د حەبسێ کی گەلۆ مەهدەر بکت**

**جارەکێ ناڤێ مە بینت پر ئەوابەك زێدەیە**

پشتی ڤێ مانـا د زینـدانێ دا دێ بینین میـرێ ئەڤینـدارا مەلایێ جزیـری شەهیـدێ ڤینێ یە وداخـازێ ژ دلبـەرێ د کەت بێتـە سەر تەرمێ وێ :ـ

**وەرە پێشی «مەلایێ» خوە   شەهید و موبتەلایێ خوە**
**بشەفقەت کە لیقایێ خـوە   بلا نەمریت ب دایێ خوە**

هەر ب ڤی دەردی شوشی ژی شەهید دبیت و دخوینێرا صور دبیت :ـ

**دلبەرامن ب دوو موژگانێ خو مەنقور کرین**
**بێ خەطا کرمە شەهیدێ خو ژ خونێ صور کرین**

هەروەسا ژ لایێ ب کار ئینانا وەك هەڤێی (تشبیه) ڤە د ڤان چەند هوزانا دا دیار دبیت کو هوزانا جزیری گەلەك کاری د هوزانا شوشی داکری، و شوشی گەلەك مفایێ ژ هوزانا جزیری وەرگرتی، بەلکی شوشی وەك یەکێت جزیـری ب خوینـد ب کارئینایی وئێخستینە د کراسەکێ دی دا، بو نموونە دەمێ شوشی دبێت :

**بەندەئێ حەلقە بگوشم هەچی ئەمرێ توبکی**
**حازرم گەر دبری سەر چ دەما ئەمری بکی**

ئانکـو: ئەز ئەو عەبـدم ئەوێ خەلـەك ب گوهیڤـە، چ فەرمـانـا تو بکـی، ئەزێ حازرم ل بەر ئەمـرێ تە چی دەمـا تە دڤێت سەری ببـری، هەرب ڤی رەنگێ جزیـری ژی یا خوئامادەکری بو ئەمرێ یارێ دەمێ دبێت:

**گەر تە دڤێتن ببری سەر بکە فەرمان**
**داڤێ سەعەتێ سەر ببرم خوەش مەقەسم ئەز**

یان دەمێ جزیری دبێژت :

**صەد جەور و جەفا دەی بمە ناچین ژ دەرێ تە**
**یەکسەر تو نەباتی و ل طەبعێ مەگەسم ئەز**

هوسا هوزانڤان دمینتە ل بەر دەرێ یارێ ودبێژتێ ئەگەر صەد جارا ب خورتـی وزوری م بکـەیـە دەرێ ئەز ناچم، چونکی تووەکی مێشێ مە چەوا دادەتـە شرینـاهی، وچەند تو مێشێ ب کەیە دەرێ هەر دێ زڤریتە نك شریناهییڤە.

هەر ب ڤی رەنگی شوشی ژی خو ددانتن ل نك یارێ، لێڤێت یارێ د دانت هنگڤین وخود دانت مەگەس ل دوور شریناهیا وێ :

**مە گوتی: ئەم مەگەسین، لەعلێ تە گوت: ئەم عەسەلین**
**روخی تو شوبهی شەماڵ ئەم وەکی شەمعێ د کەلین**

پشتی دانـانـا هەرسێ دەقێت هوزانا بو پێش چاڤێت خوێندەڤانا دێ پتر دیاربت کو شوشی ئێکە ژ شاگردێت خاندنگەها جزیری، و گەلەك پەیڤێت ب هێز یێت جزیری شوشی یێت هوزانێت خودا ئینایین .

## هوزانا سیێ

**دلبەرامن ب دوو موژگانێ خوە مەنقور کرین**
**بێ خەطا کرمە شەهیدێ خوە ژ خون صور کرین**
**شوبهی بولبول ب لەبێ غونچە تە مەجبور کرین**
**ئەز نزانم سەبەبێ یارێ چرا دور کرین**
**شەهـ و شیرین و هەمێ ئەم ژ خوە (مهجور) کرین**
**وەك جەرەس ناڵە ژ من تێن ژ سەما طەوق و چەکان**
**دل ژ من بر غەدر غەمزەئێ وان چاڤ بەلەکان**
**کەفتیمە دامێ دوو زولفان د قەید و خەلەکان**
**شوبهی گویێ سەر و پابووم ل بەر (ضرب) و شەکان**
**لەو ب چوگانێ جەفایا خو ژ دل هور کرین**
**غەیری دوو خالێ سیاهی تە چ طالب نەبوئین**
**خو ژ بل کەوثەرێ عیشقاتە چ شارب نەبوئین**
**چەند جەڤا دامە بغەمزا ژ خو تائب نەبوئین**
**دامە صەد جامێ فیراقێ ژ خو غائب نەبوئین**
**ژ ویصالێ قەدەحەك دامە و مەخمور کرین**
**نەغەمیا حود و نەیا لازمی مەیخانە کرین**
**ل مەحەی کر جەسەد و قەلبێ تژی زام و برین**
**ب فیدای سەر وێ جەمالا تە بتن جانێ شرین**
**نورێ چەشمێ مە کو عالەم مە ب چەشمێ تە دین**
**ب جەمالا خو تە وەك دیدەئێ بێ نور کرین**
**مە ژ غەیری لەب و لەعلێن تە نەدین غونچە فەمەك**
**عیشقێ رویێ تەنە عالەم ژ سەما تا ب سەمەك**
**مە تویی روح و رەوان غەیری تە نینن چو غەمەك**
**نەفەسەك بێ تە مە ناچی نە دژین بێ تە دەمەك**
**ژ تەهات ئەمرێ هومایون و تەمأمور کرین**
**بەندەئێ حەلقە بگوشم هەچی ئەمرێ توبکی**
**حازرم گەر دبری سەر چ دەما ئەمری بکی**
**بێ خەبەر هاتمە تەماشەی لەبێ خوش خەندەکی**
**مە نزانی کو تو دێ (عاقبة الأمر) چکی**
**لەب و لەعلێن شەکەرین آهـ کو مغرور کرین**
**جانێ من صوتیە جانا ب حال فولفەلەکی**
**عەقل و هوشێت مە تە بر ئەڤرو ب جام و فرەکی**
**وەصلەکر ماچی ژ نەخدانی تو سەر با فەلەکی**
**ئەمرەیەك بوم ب هەوایاتە د وێرانە یەکی**
**مێلێ روژێ ب شوعاعا خو تە مەشهور کرین**

بنیگەهـ چەشمێ عینایەت کو نەزەردار بوئین
ژ خەوا غەفلەت و جەهلێ ژ خو هشیار بوئین
ب زەلالا قەدەحا عیشقێ پر (أسرار) بوئین
ژ (أنا الحق) ب لەبێ لەعلێ خەبەردار بوئین
ب گولابا سەرێ زولفا خوە تە منصور کرین

مە د گوشێری تو طاهر سەری نادەی بەطەلا
هو ب سەهلی کەتیە دالێ دوان بسك و بەلا
مەنزانی ژ تە دل بەر بو دەما (قالوا بلێ)
مونصەرف ما د بویین ئەم ب دوو صەد جار مەلا
لێ ب وێ کەسر و ئیضالێ فەخوە (مجرور) کرین

## هوزانا چارێ

دل ژ دل عاجزە بەر هیجر و غەما خال سیەهێ
نازك و لەب شەکەر و سەر و قەدە بێ شویەهێ
روحی شیرین مە ل ژێری قەدەمان خاکێ رەهێ
ئەی نەسیمێ سەحەری بادی مەجالا صبەهێ
صەد سەلامان بگەهینە ژ مە وێ لەب شەکەرێ

طوطی یا خوش خەبەر و ئەنەریا قەنج و دەلال
دێم دورا غونچە دەهان و پەریا ئەبر و هیلال
شلك و شل کەمەر بسکێ مسك چالێ غەزال
عەرعەرا قامەت ئەلیف نەی شەکرا شوخ و شەپال
نازکا سیم تەن و خوسرو زێرین کولەهێ

ئەی دل ئەگەر چی گرفتاری بوان دالێ دوو زولف
شویهی مورغێ قەفەصێ گرتی ب صەد عەقد و خلف
صەد شوکر یار ژ تەهات ئەڤرو ب جان خازی و ئولف
دلبەرێ داتو بیوسی ب دوو صەد زاری و لوطف
ئاستان و دەرو دیوار و شوباکێن قولەهێ

ژ فیراقێ لە دنالم مە ژ سەر عەقل نەمان
دوو هزار طەعنە ل جەرگێ مە د دەن تیر و کەمان
صەد رجا بایێ سەحەر تو بیە غونچە دەمان
نامەیا جەور و جەفا و ئەلەم و دەرد و غەمان
دە ب دەست وی صەنەمێ موحتەشەم و سەر و سهێ

کو صیفاتێت وێ دخوینم دەم و گاڤ و سەعەتێ
مەفکر حەرفێ لەب و مەشقێ بەر و خال و خەتێ
کا ژ دەرگێ کەرەما وێ چ نەصیبەك ژ مەتێ
بەلکی دلبەر ژ رویێ عادلی و مەرحەمەتێ
رەحمەکێ کەت ب فەقیران و بپرسیت گلەهێ

مە ب دەست جامێ شەرابێ تژی گول ئاب و مەیە
وەکو نە ی نالە ژ من تێن ب ئەنا وەصفێ تەیە
لێ ب شەب تا ب سەحەر نالە مە وەك عود و نەیە
ما ژ بەر ضەربێ فیراقا تە سکونەك مە هەیە
جەرگ و دل هەر دوو بنالینە وەکی چەنگ و ژەهێ

ئەم ل سەر چەشمێ غەزالی تە د خوین هندە غەما
ب تەماشەی مەنە عالەم ژ سەمەك تا ب سەما
مە تویی روحێ شرین بێی تە مە نازین چ دەما
ژین ئەگەر بێ تەبیا جان د درم لێ أما
صەد هزار جانێ عەزیزێ دێ هێلیتن د بەهێ

بەندەئەم دەست ل سەر دەست خو ئەمرێ تە بەرەم
ب طەمەع وەصلێ تە جانا غەمێ هیجران دخورم
صەد بەریدان ژ تە دورم ژ خو بێ بال و پەرم

(حجر أسود) بلەرت دەستێ زیارەت بگرم
نەذرێ من بیت بگرم خاس و طەریقا مەگەهێ

ژ غەم و دەردێ فیراقێ بکو جا داد و ئەمان
درێیا وەصلێ حەبیبێ د دەرم روح و رەوان
صوتیە جەرگ و دولێمن دوو سیەهـ خالێ تەجان
حەق دزانیت کو شەڤان شوبهەتی ئالێن د رەوان
مە ب دل زاری و کالی نە حەتا صوبح گەهێ

مە گوتی: ئەم مەگەسین لەعلێ تە گوت: ئەم عەسەلین
روخی تو شویهی شەمال ئەم وەکی شەمعێ د کەلین
ئەم و عالەم ب تەماشەی روخی تو پور ئەمەلین
پەردە و خێلی و چار شەڤ تو ل سەر دێمی هەلین
دا ژ شەوقا تە ب خەف بت شەفەقا مەهر و مەهێ

مە ژ حەسرەت رەشە زولفێت تە دهێن ئاهـ ژ حەرق
لێ ژ دل کەفتیە گاڤا تۆ کەنی لامعی بەرق
مە نەدین میثلێ تە عەرعەر قەد و زێر تاج ل فەرق
قەد دبن وەك تە شەپالْ نە دشام و نە د شەرق
کێنیشان دا د جهان میثلێ تە خوندکار و شەهێ

سەمەنا باغێ ئیرەم رەونەقێ گولزار و چەمەن
نازکا عیشوەکەر و سەر و قەدا سیم بەدەن
ما ب من دچنە سەری وەصفی تو ئەی زولف سەمەن
عالەمەك شاهدی یا حوسن و جەمالا تە د دەن
تو زولەیخایا زەمانی و چ حاجەت مەدەحێ
مە نەسیرین ژ دەرێ تە ب دەوام نالە مەدی

مە تویی داد و ئەمان هێژ تە د خوازین مەددێ
ومرە جارەك ب تەماشەی مە فەقیران تو خودێ
حەق نیگەهدارێ تەبت پادشەها سەر و قەدێ
بکنارێ مە فەقیران بکە جارەك نیگەهێ

کو مە دل صوتیە عیشقاتە و هیجران د کەشین
وەکو سولینە د خوین خونێ نەومك گول د گەشین
مەستێ وان لەعل و لەبانین و دوو سێ خالێ رەشین
خویی و دلبەری و ناز و (تلطّف) بتەشین
خوسرو وا پادشەهانی و خودانا جەبەهێ

د دەما (قالوا بلیٰ) یار بمە بەخشی فەرەحەك
لەو مە دل صەفحەتێ ئەلماسە وەکی عشقێ مەحەك
ب مورادا خو گەهشت (طاهر)ی قەد نین تەرەحەك
ژ ئەزەل حەق ب (مەلێ) دایە ژ عیشقێ قەدەحەك
تا ئەبەد مەست و خەرامین ژ مەیا وێ قەدەحێ

## هوزانا پێنجێ

ئەڤ هوزانا پێنجێ و یا دیماهیێ سەیدایێ هێژا حمزة شوشی یا بەلاڤکری دروژناما هاوکاریدا هژمارا (٩٤٥)ی ل ئێکی شواتا سالا ١٩٨٨ .

لێ ئەڤ هوزانــە ئەوا رەحمــەتی مەلا طاهـایێ کوڤلی نڤیســای چەند جوداهیەك پێد هەین د گەل وێ یا سەیدایێ حمزة بەلاڤکری .

ژ بەرڤێ چەنـدێ وژ بەربهـا بینـا ڤێ هوزانێ مە ڤیا ل سەربەر پەرێت گوڤـارەکا کوردی بەلاڤکەین، دا خویندەڤانێ کورد چێتر ب شێـت ل نك خوە بهـێلیت وب پارێــزیت، ووەکی دبێــژ ن : دوو بارەکرنێ مفا پترە .

ئەڤەیە دەقا هوزانێ :-

یارا ژ فیراقاتە ژ دل تەنگە نەفەسم ئەز
دەر راهێ گولان سینە تەژی خار و خەسم ئەز
هەر چەندی د کوشم کو بدامن بەرەسم ئەز
جانا ژ جەمالا تە موقەددەس قەبەسم ئەز
گەر حور و پەری زادە نەزەرکەی تە بەسم ئەز

ئەز هندە کەسەر دارم و تو هندە ب کینی
صەد گەزمە ل وان قەوسێ هیلالان د رەشینی
شەهزادە و شیرین قەد و مەیخانە نشینی
میثلێ (مەمێ نو) گەر تە دڤێتن مە ببینی
مێزێ بکە جامێ تو دزانی چ کەسم ئەز

من جان ب دوو وان چەشمێ سیاهی تە ب کول دا
لێ سەر ب فیدای عەرعەر و بەژنا شل و مل دا
نێچیر تە کرین غەمزە ل جەرگێ مەیێ کول دا
یەغما ژ مە جان کر کو تەجەللا تە ژ دل دا
من روحێ د قالب تویی تەنها قەفەسم ئەز

ومك بولبول و قومری ژ فیراقاتە د کالم
خونێ ل رویێ خوییێ هیلالی ڤە دمالم
دێوانەئێ زولفێت خەلەك رویێ بخالم
حوبیا تەیە من رادهەژینیت کو بنالم
شەب تا ب سەحەر نالە ژ رەنگێ جەرەسم ئەز

ئەی دل چ حەزینی ب دەوام گریە وزاری
غەمناك و جەگەر سوژ و پەریشانی و ژاری
قامەت چ هیلالی چ زەعیفی و چ خواری
من گو (مەمێ نو) : جاشنی لێ ئەبرویێ یارێ
گو: من چ حەددە شوبهەتی نەعلێ فەرەسم ئەز

باری کو نەصیب دا ژ ئەزەل شادە بمن دا
قەلبەك ل هەمو (غلّ) و غەشان سادە بمن دا
خەیری سوبلان عیشقێ حەبیب جادە بمن دا
ساقی ژ أزل یێك دوو قەدەح بادە ب من دا
حەتتا ب ئەبەد مەست و خومار و تەلەسم ئەز

یەك بوسە لەب و عاشقی صەد (حجّ و حرم) بی
صوتن ب غەما عیشقێ چو باغێ د ئیرەم بی
رەنجی کو نەبەی گەوهەر و گەنجینە چ غەم بی
جانا تویی من جان گولی بێ خار چ کەرەم بی
میننەت کو نەومك بولبولێ میحنەت عەبەسم ئەز

سەودایی کرم سەر و قەدێ ســت کەمەرێ تە
سێ گەردەنێ دل بر ژ مە ئەی لەب شەکەرێ تە
بێ سوج و خەطا تیر و خەدەنگە دان جەگەرێ تە
صەد جەور و جەفا دە بمە ناچین ژ دەرێ تە
یەکسەر تو نەباتی و ل طەبعێ مەگەسم ئەز

دل صوتی مە ئولفێ شەبێ وەصلا تەیە دەرمان
زور پێ د خوشین چەندی ب دەی غەمزە و ضەربان
فەرمان د بەرم حازرێ دەرگا ئەمە قوربان
گەر دێ تە دڤێتن ببری سەر بکە فەرمان
دا ڤێ سەعەتێ سەر ببرم خومش مەقەسم ئەز

من سەر د رێیا یارە سەر و جان ب فیدایی
لەو شوبهەتی مەجنون دگریم دین و هوایی
دل خەستەیێ (طاهر) و ژ روحا خو بەلایی
سەر تا ب قەدەم ئەز ب صوژم شوبهێ (مەلایی)
پەروانە صیفەت صوتم و بێ صەوت و حەسم ئەز

## تێبینی

ئەڤ هوزانێت جزیری ئەڤێت ڤی گوتاریدا هاتین گەلەك جوداهی یێد هەین د گەل وا ئەوێت د دیوانێ چاپکری و دەستنڤیسدا هەین و مە نە دیت یا فەر کو جوداهیا دیار کەین و هیڤی دارم نەبیتە جهێ رەخنێ

م . د

**دەهمەن :**

١) سەیدایێ مەلا طاها خودێ ژێ رازیبت سالا ١٩٢٨ یێ هاتیە دونیا یێ . فەقیاتی یا ل گەلەك گوندێت کوردستانێ یا کری و ل گەلە دەڤەرا یێ گەریای ل ٢٧ هەیڤا دوازدە سالا ١٩٨٢ یێ چویە بەر دلوڤانیا خودێ، و خودێ جهێ وی بکەتە بەهەشت

٢) دەسیتنڤیسا سەیدایێ مەلا طاها بەرپەرێ ١٥٢

٣) سەیدایێ هێژا حمزة شوشی دبێت : رەحمەتی شیخ طاهرێ شوشی دیوانا جزیری هەمی ب خەتێ خویێ تازە نڤیسابو هەر وەسا د گەل دیوانێ گەلەك پێنج مالکی یێد خوٚل سەر هوزانێت جزیری تێدا نڤیسابون و ئەڤ دیوانە د سەرێ سالێت چلێدا شوشی نڤیسابو موخابن ئەڤ دەستنڤیسە نهو نە یا دیارە .

٤) ضضی : ئەصل ـ بنیاد

٥) الثقلین : مروڤ و ئەجنە .

٦) مەبەست یێ پ و چ و ژ و گە یێ کوردینە .

فەرهەنگوك

نەسترن : جوینەکێ گولانە
غونچە : بشکوژ
سەمن : یاسەمین
بەستبون : گرێدابون
عەقرەبیان : دیشکان
گەستبون : گەزاندبوون ، پێڤەدابوون
سیی : تەیرەکێ ستو درێژە، (هوسا د دەستنڤیسێدا یا هاتی)
عیشوە : نازك

رەوان : روح ـ جان
پەرتەو : تیروژك
موژدە : مزگینی
غەنج : نازك . لطیف
لەب : لێڤ
شکنج : ئەشکەنجە، ئازاردان
بەخشە : بدێ، اعطە .
آفران : ئاوران، إلتفاتات
قەد : بەژن، قامة .
گوفت : ئاخفت : تکلم .
قەند : شەکر
غەبغەب : گوشتی بن حەفکێ یە
کاکول : پرچا سەری یە .
گیسوشەب : بسکێت رەش، ئانکو بسکێت تە وەکی شەڤێ درەشن

سینە : سینگە
سیم : زیڤ
تەرح : تا، چەق
خوب : جوان
ئەرغەوان : گولە سور
زەمزەمە : قەرەبالغ .
ئاسك : غەزال .
چهرە : سەروچاڤ، دێم .
گوشا : گرێك ڤەکرن .
موژگان : مژ یلانك
شهو : شاهـ
دهەن : دەڤ
چەکان : کاشویان
غەمزە : ئاڤریدان
شەکان : کاشویان
چوگان : کاشویان
زام : برین

چەشم : چاڤ ـ عین
همایون : سوڵتان
بەندە : کوٚلە ـ عبد
گوش : گوهـ ـ گوچك
زەنەخدان : چەناگە ـ حەفك
راهـ : رێك
دگوشم : دگڤێشم
قەبەس : گوری
گەزمە : تیر ـ سهم
مەهـ : هەیڤ
مەیزێ : بنێرە
یەغما : تالان
قومری : باڵندەیەکێ جوانە
دێوانە : دین ـ شێت
جاشتی : وەکی، شتی ـ مثل
شادە : کەیف و خوشی
جادو : سحر
تەلەسم : طلسم، سحر
مەگەس : مێش
پەروانە : بەلاتینك
خاکێ رەهێ : ئاخا رێکێ
سیم تەن : لەش زیڤ
مورغ : طیر
أستان : دەرازینك
قولەهـ : کەلهێ
گلەهـ : گازندە
زەهـ : ژێ، تێلێت ئامیرێت موسیقێنە ژ ریڤێت پەزی چێدکەن

بەندەئەم : ئەز عەبدم
مەهر : روژ
خون کار : سلطان
نیگەهـ : ئاڤر و بەرێخوەدان

# خمس قصائد في مخطوطة نفيسة

محسن ابراهيم أحمد الدوسكي
كلية الشريعة ـ بغداد

## ملخص البحث

مما يسر به الخاطر في يومنا هذا أن نرىٰ أشعاراً كلاسيكية كردية على مخطوطات أشفقت عليها الأيام فحفظتها، ونقدمها لقراء الشعر الكلاسيكي ـ الذي قل رواده ـ علىٰ صفحات مجلاتنا الكردية.

قبل فترة حصلت على عدة نسخ خطية من ديوان الشيخ أحمد الجزري ـ مەلایێ جزیری ـ فكانت من بين تلك النسخ نسخة أهداها الي الأخ الفاضل ملا محمد الكوفلي ـ جزاه الله خيرا ـ.

والمخطوطة بخط أستاذنا المرحوم طه اسماعيل الكوفلي رحمة الله عليه كتبها سنة ١٣٦٩هـ ـ ١٩٤٩م في قرية خويلة ـ من قرىٰ السورجية ـ حينما كان يدرس هنالك.

وعندما تصفحت المخطوطة وقرأتها عدة مرات، تبين لي أن أستاذنا المرحوم قد نقلها من نسخة للشيخ طاهر الشوشي ـ حيث أن الشيخ طاهر رحمه‌الله كان قد كتب ديوان الجزيري في أوائل الأربعينيات وكتب في آخره مجموعة من أشعاره ـ على ما أخبرني به نجل الشيخ الأخ حمزة ـ ومما يؤسف له أن هذه النسخة مفقودة الآن.

وتكمن أهمية مخطوطتنا فيما يأتي:

١ ـ مامن شعر كتب في المخطوطة إلا وقد بين ميزانه العروضي.

٢ ـ في كثير من الأماكن يذكر الاستاذ المرحوم الخلافات بين النسخ الخطية، ويقول: وفي بعض النسخ كذا، وهذا مما يزيد في أهمية المخطوطة، إذ يشعر القارىء بأن الناسخ لم يعتمد على نسخة واحدة فقط بل اطلع على عدة نسخ. والذي أراه بأن جميع ذلك من نسخة الشيخ طاهر الشوشي، ودور المرحوم ملا طه هو نقل المخطوطة فقط.

٣ ـ كثيراً ما نجد في المخطوطة ترجمة بعض الكلمات الغريبة، ويذكر الناسخ تحت تلك الكلمة: بالكردي كذا، أو يقول: كلمة فارسية ومعناها بالعربية كذا.

٤ ـ في أول المخطوطة مقدمة نثرية حسنة كتبها المرحوم الشوشي وقد نشرناها في أول مقالنا لما فيها من الفائدة.

٥ ـ ذكر الناسخ بعد هذه المقدمة علامات ورموز الكتاب مما ييسر للقارىء قراءتها، حيث يقول: (فقد اخترعت لضبطه علامات ورموزاً لم يسبقني إليها أحد).

٦ ـ والأهم مما ذكرنا كله أن في المخطوطة خمس قصائد لم تنشر أربعة منها، ثلاث منها للشيخ الشوشي، وقصيدة نسبها للشيخ الجزيري، مع أنني لا أرى مستواها أقل من مستوىٰ قصائد الجزيري، ولكن ما من شعر من أشعار الجزيري إلا والجزيري يذكر (ملا أو نيشاني، أو يذكر اسمه ـ أحمد) في نهايتها إلا أن الناظم لم يذكر في هذه القصيدة اسمه ولا لقبه ولقد ورد في اخرها كلمة (ملا) فقط إلا أنه لا يفهم منها أن المراد بها الجزيري.

المخطوطة تقع في ٢٧٧ صفحة فيها ١٢٧ قصائد، في كل صفحة تسعة أو عشرة أبيات.

وذكرت دراسة مختصرة عن مدىٰ تأثير الشيخ الشوشي بالجزيري، وهو يعد تلميذاً في مدرسة الجزيري الشعرية التي نرىٰ أن كثيراً من شعرائنا القدامىٰ قد تأثروا بها، كالشاعر پرتو الهكاري، والشيخ نورالدين البريفكاني وأنور المايي ونالبند، وحتىٰ الشاعر الخالد خاني وبينت في هذه الدراسة المتواضعة بأن الشوشي متأثراً جداً بالجزيري، وكثيراً مايذكر تشبيهاته واستعاراته.

وبعد نشر ثلاث قصائد للشاعر الشوشي وضعت قاموساً لبعض الكلمات الغريبة الواردة في القصائد.

وأخيراً أرجوا أن اكون قد قدمت شيئاً يسيراً لمكتبة الشعر الكلاسيكي الكردي، ولقصائد كادت أن لاتخرج من زوايا النسيان، أو أن يطويها غبار النسيان ولا ترىٰ النور.

# گەشتی ژیانم

ئاڵقەی (١٤)

مسعود محمد

چەند رۆژێك دوای پێك هاتنی وەزارەت د. ئەکرەم جاف کە بوویـوو بە وەزیری زەراعـەت داوەتێکی شەوی رێك خست لە ماڵـەکـەی، لە کوردان فوئاد عارف و محمد سعید خفاف و من بانگە هێشتن کرابـووین، ناشـزانم کەسی دیکەی‌کورد لەگەڵمان بوویێت، چەند وەزیرێکیش هاتنە داوەتەکە لەنێوانیاندا عزیز عقیل وەزیری دفـاع هەبوو ئەوانی دیکەم لەبیرنەماون. مەبەست نزیك خستنەوەی کوردو حکومەت بوو لەرێی یەکتر دیتن و وتووێژەوە. هەوڵـەکـە بێ‌سوود نەبوو ئەگەر داوەتی دیکەو یەکتردیتنی دیکەی بەدواداهـاتبـایە بەڵام هەر لەوەنـدە وەستـا. لەنـوختـەیەکی سەر بەناکۆکی نێوان عبدالکریم قاسم و عبدالسلام عارف، بەتایبەتی هی دەمی دەمـانچـە هەڵکێشـانی عبـدالسـلام لە ژوورەکـەی عبدالکریم و بە حزوری فوئاد عارف نەگونجانێك هەبوو لەنێوان راوێژی فوئـادو قسەکانی عزیز عقیل. نەگونجانەکە وەکوو خۆی مایەوە بەڵام دانیشتنەکەی پێ تێك نەچوو

عبـدالسـلام لە دارالبیضـا وەیا ربـاط وەیا شوێنێکی‌دیکـەی ئەفـریقـای عەرەب بوو لە کۆبـوونـەوەی تۆقـەڵـەکاندا کە عارف عبدالرزاق ویستی ئینقیلاب بکات بەڵام تێیدا سەرنەکەوت. . . عبـدالسـلام گەڕایەوە، د. عبـدالـرحمان بزاز کە جێگری سەرەك وەزیران بوو لە وەزارەتەکە ئەمجارە بوو بە سەرەك وەزیران.

بەیانی چووم بۆ پیرۆزبـایی لێ‌کـردنی. ساڵۆنەکەی بەر دەمی ژووری خۆی خەڵقێکی زۆری لێ‌بوون هاتبوونە موبارەکبادی. من جێگەم گەوتە بەرانبەر خۆی لەو بەری ساڵۆنەکە. وەها رێك کەوت د. بـزاز بۆ یەك دوو دەقیقـە سالـۆنـەکەی جێ‌هێشت لەو بەینەدا جمیلی عەلی‌ئاغاو هاواری مشیرئاغای دزەیی هاتنە ساڵۆنەکە. کە د. بزاز گەڕایەوە ئەو دوو کوردەی دیت زۆری بەخێرهێنان و ئەحواڵی پرسین لەوەڵامدا سپاسیان کردو گوتیان ئەحواڵمان باشە. من لەبەری خۆمـەوە بەدەنگە هاتم گوتم: ئەو برایانە هاتوونەتە پیرۆزبایی تۆ نایانەوێ سەغڵەتی خۆیان تێکەڵ بە موجامەلە بکەن دەنا کەسی لەوان تەنکەتاوتر پەیدانابێ: چەند ساڵە دەربەدەرن ئاوایی‌یەکانی خۆیانیان لە دەشتی دزەیی بەجێ‌هێشتووە هاتوونەتە هەولێر نە یەك فلس داهاتیان هەیە نەهیچ ئیشێك هەیە بی‌کەن. کە وەهام گوت، لە وەڵامدا گوتی با بەچاکی بتناسمەوە تۆ فلانەکەس نیت؟ گوتم هەوم. هەندێکی موجامەلە کردم کە لەدەمی نیابەتمدا لە شوێنی گوێ‌گران بووەو دیتوومی قسـەدەکەم. . . ئنجا گوتی: بەری لای تۆ بەتالای تێدانی‌یە من بێمەلات زەحمەت نەبێ تۆوەرە لام جێگە لە تەنیشتمەوە هەیە. . . پەڕیمەوە لای ئەو گوتی: من کەم وزۆر لە وەزعی ئەم برایانەو عەشرەتەکەیان ئاگادار نیم. گوتم ئەم ڕاستی‌یە یارمـەتیت دەدات کەوا چی بەچـاکی بزانیت بۆیان ئەوە بکـەیت چونکـە لێرە بەپێشـەوە پابـەنـدی قسـە وەیا هەڵوەستێك نەبوویت لەکێشـەی ئەوانـدا دەستت ببەستێت. گوتی: دەبینیت رۆژەکەم دەرفەتم نادات لەگەڵت بدوێم، سبەینێ سەعات هەشتی بەیانی چاوەنۆرت دەبم لەم جێگەیە، وەختیشم بۆ تۆ تەرخان دەکەم.

سبەینێ کەچووم لە (سیطرە)ی لای شەقامەوە هەتا لای خۆی رای‌سپـاردبـوو نەوەخرێم. سکرتێری تێ‌گەیاند کەس مەشغووڵی نەکا هەتا من هەڵ دە ستم.

وای لەم جیهـانـە سەیرە: هەمـوو ئەم گەرم و گوڕی‌یەو بەخێرهێنانەو ئامێز کردنەوەو بایەخ پێ‌دانەو رێزلێ‌نانە کە لە رواڵەتدا بێ‌کـۆتـایی بێت لەسـەعـات هەشتی بەیانی‌یەوە هەتـا هەشت و چارەگێکی بەردەوام بوو، کتوپڕ گۆرا ئەمما چۆن گۆرانێك:

بۆ بێ‌تاڵعی ئەو شتانەی منی‌تێدا پەرۆشدار بووم کارێکی زێدە

بێ بایەخی تایبەت بەخۆم هەبوو کە دەشیا هەر باسی نەکەم، لەبەر تەنگەتاو بوون بەدەست ناگوزورییەوە پێش قسە بنەرەتیەکانم خست و گوتم بەر لەوەی بچینە ناو کێشەی دوورو قووڵەوە فلانە شت هەیە حەز دەکەم لێی ببینەوە بەدوو قسەی سەرپێیی. مەسەلەکەم باس کرد، وەڵامێکی خۆشی دامەوە. گوتم پەلەی لێ مەکەو پتری سەرنج بدەیێ.

ئەم (پەلەی لێ مەکە)یە کە بە عەرەبی (ارتجال)م بۆ بەکارهێناو لەوپەری دڵسۆزیمەوە بۆ ئەویش بوو، یەك خەندەقی خستە نێوانمانەوە لێپەرینەوەی مومکین نەبێت. دوای ئەو قسەیە لە تروکەیەکی چاودا هەڵستا سەر پێیان و گوتی بەداخەوە وەختم نەما، چیدیکە ناتوانم لەگەڵت بدوێم. حاجەت نەبوو کەس تێم بگەیەنێ لەخۆوە زانیم ئەو وشەیە کاری ڕوخێنەری خۆی کرد.

«منیش گەرامە دواوە ئەمما بەعاجزی»

دەڵێن زمان بەلای سەرە: قسەکەراستە ئەمما دەشیا دڵ ساڕییەکی منی خستە سەر قسەیەکی بێ توێکڵی نیازپاك چاوپۆشینی لێ بکرێت لەلایەن مرۆیەکەوە کە مامۆستای قانوون و سیاسییەکی ناسراوو سەرەك وەزیران بوو. من نامەوێ خۆم بپەرێنمەوە لەوەندە گلەیییەی حەقە لێم بکرێت، بەڵام چ بکەم لەگەڵ تەبیاتێکی خۆش باوەڕی بە خەڵقدا ڕاپەڕمووی بێ فرت و فێڵ کە بە هەموو عومرم ڕەفتاری ڕاستگۆیانەی ناسیاسییانەی پێ کردووم. من لەو دەمەدا کە ئەگەر دڵی د. بزازم ڕاگرتبایە ڕەنگە بوو هەر لەڕێی (تعویض)ی بێ فێڵەوە هەموو گرفتێکم بڕەوێتەوە، چاوم بڕیبوە حەقێکی کەم بایەخی بێ تەئویل و بێ مەنەت و چ حیسابێکم بۆ قسەی دیپلۆماسییانە نەکرد کەوا بایی سەد ئەوەندە حەقە خاترانەی تێدا دەبوو. بەڵام واز لە هەقوهوقی خۆشم بهێنم، گەلێك بەرژەوەندی گشتی و نیوەگشتیی وەك موشکیلەی دزەییەکان لەوانە بوون بەرەو چارەسەرکردنەوە بڕۆن ئەگەر ئەو وشەیەی من نەبوایە لەمپەر. ڕۆژی پێشتر د. بزاز دیتی لە نێوان ئەو هەموو خەڵقەی دێنە پیرۆزبایی لێ کردنی تەنها کەسێك بیری لە سوودی گشتی کردبێتەوەو دوو لێوەی لێبزاوتبێ من بووم، هەر بۆیەش بوو ئەو هەموو بایەخەی بە دیدەنی سبەینێیان دا: چی دەبوو دڵ فەراحیەکی بەخشندانەی لەو وشەیەی من بەکارهێنابایە لەبەر خاتری کێشەی ئەوتۆ پێوەندی بە سیاسەتمەداری خۆیشیەوە هەبوو!! دوای دوو ساڵێك دەرفەت بوو بۆ ئەو ڕووداوەی بگێڕمەوە...!

قسەی پێشینان هەیە دەڵێ: کە خوا بدات پێغەمبەریش چەنگێکی دەهاوێتە سەر. ئەم قسەیە بۆ من بە زیادبوونی سەغڵەتی بەڕاست گەڕا.

لە کەرکووك بووم، سەردانێکی ماڵی شێخ ڕەئووفم دەکرد لەگەڵ دەوەن و محەممەدو دایکیان ڕۆژێکیان ئافرەتێکی ماڵی خۆمان لەپڕ هاتە ژوورەوەو گوتی: دوێنێ یەك مەفرەزەی حکومەت لەگەڵ مودیرێکی پۆلیس هاتنە ماڵەوە بۆ گرتنت، چاك بوو لێرە بوویت ئیتر خۆت دەزانیت چ پەسەند دەکەیت.

سەیر لەوەدا بوو ئەهلی ماڵەوەش وەکوو خۆم بە دڵ ساڕییەوە دەڵێن: لێرە نییە وا لە کەرکووکە لە ماڵی شێخ ڕەئووف ئەم قسەیە ئەگەر غەیری ئەهلی ماڵەوەم بیکردایە دەگوترا خەبەری لێداو بۆی دەبوە عەیب. ماڵی ئاوابێ مودیر پۆلیسەکە دەڵێ: من چ حەقم هەیە بەدوای بکەوم بۆ کەرکووك، حکومەت (جنێوێکی بە حکومەتیش دابوو) با خۆی بەدوایدا بگەڕێ من هەر ئەوەندە دەڵێم لە ماڵەوە نەبوو.

بڕیارم دا خۆم بەدەستەوە نەدەم. لە بەغدا کۆمەڵێکی کوردییان گرتبوو لەوانەی ناویان هەبوو وەك فوئاد عارف، مجید علي، زەیدی ئەحمەد ئەفەندی، عەبدوڕڕەحمان موفتی، أحمد کمال، فتاح شاڵی، رشید جودت دووریش خرابوونەوە بۆ (عین تمر) لەو چۆڵ و بیابانەی خوارووی بەرەو ڕۆژاوای عیراق. منیش گیرابامایە هەر بۆ ئەوێ دەچووم.

خۆم نەوەخراند خێرا چوومە ماڵی کاکە حسێنی خانەدا. ئەو شەوە لەوێ بووم بۆ سبەینێ وەها بەرژەوەند دیترا لە جێگەیەکی پەنهانتر بم ئیتر چوومە ماڵی شێخ ئاورەحمانی شێخ صالح لەبەری قەلا. دە ڕۆژ وەیا زیاتر لەوێ بووم. ساڵی نوێم (هی ١٩٦٦) لەو خۆشێرکێیەدا پێشوازی کرد. لەگەڵ شێخ ئاورەحمان زۆر زۆر بەخۆشییان دەبردە سەر. دواتر دەمگوت هەرچی حەزی لە شتی خۆشە با خۆی لە ماڵی شێخ ئاورەحمان بشارێتەوە.

خانەخوێم حەزی دەکرد زەڵلەی زمانی خەڵق باس بکات و منیش لەگەڵ ئەودا ئەو حەزەم هەبوو، ئێستاش هەیەتم. جارێکیان شێخ ئاورەحمان شیعرەکەی شێخ محەممەدی خالصی دەخوێندەوە کە ڕووی لە شێخ مەحموودە. لەجیاتی ئەوە بڵێ (فەلەك مل شۆڕ ئەکا...) گوتی (شەلەك فل مۆڕ ئەکا...) گوتم: دادەی خێرا بینووسەوە هەتا لەبیرمان نەچووە..

زانییان هیچ موراقەبە بەدەوری ماڵی شێخ ڕەئووفەوە نییە، غەریبی منداڵەکانم دەکرد گەڕامەوە بۆ ئەوێ بەڵام خۆم بە خەڵق نیشان نەدەدا. هەندێك دۆست بۆم خەریك بوون یەك لەوان (منعم

المصرف) كه ئەوسا متصرفی هەولێر بوو. دەیزانی لە کەرکووکم خەبەری بۆ ناردم کە لە سەردانێکی عزیز عقیل، وەزیری دیفاع، لە هەولێر قسەی لەگەڵدا کردوە لەبارەی منەوە. گوتبووی وەعدی شەرەف بێت. بچێتەوە ماڵی خۆی‌و دەرنەچێت. عبدالمنعم گوتبووی ئەمە قسەو وەعدی شەرەفی ئەو پیاوەیە خۆیشی بڕیار بدات لە متمانە پێ‌کردنی. ڕەنگە دەوری دوومانگێك لە کەرکووك مامەوە، ڕۆژێکیان مرحوم نجم الدین عونی پەیدابوو. هاتەلام، گوتی حەز بکەیت دەتبەمەوە بەغدا، ئۆتۆمۆبیلەکە خصوصی‌یە شوبهەی کەمتری لێ‌دەکرێت. لەو بەینەشدا دەمزانی موراقەبە لەسەر ماڵم هەڵستابوو ئیتر لەگەڵ نجم الدین گەڕامەوە بەغدا بەڵام یەکسەر نەچوومەوە ماڵێ لای صمدی حاجی محمد دابەزیم شەوێ پاش سەعات دە بەبێ دەنگی چوومەوە ماڵێ.

گەیشتینە نیسان. وابزانم لەو مانگەدا بوو تەیارەی عبدالسلام کەوت، خۆی‌و چەند کەسانێکی لەگەڵی‌دابوون تێدابوون بە خەڵووز. هەموو دەمان زانی عبدالسلام پێ‌گیربوو لەسەر گرتنی ئەو خەڵقە. بە مردنی ئەو ترس نەما خۆم ئاشکراکرد.

عبدالرحمان عارف بوو بە سەرەك کۆمار لە جێی برای. چوومە لای وپرسەم لێ‌کرد. دوای ئەو چوومە لای د. عبدالرحمن البزاز کە بوو بۆوە سەرەك وەزیران. بیستبووم حەزی بە گرتنیان نەکردبوو بەڵام عبدالسلامی پێ ئیقناع نەکرابوو. عوزری خواستەوە لەوەدا کە یەکێکی وەکوو من بێ‌لزوم دووچاری سەغڵەتی بێت گوتی: ئایەتی قورئان دەڵێ (آتقوا فتنة لاتصيين الذين ظلموا منكم خاصة).

گوتم من لە کولانەی حەدیسێکەوە سەیری ئەم وەزعەم دەکەم کە جارێکیان دوویشکێك بە پێغەمبەریەوە دا وەهای ئێشاند ناوی خوێی لەبیر بردەوە تائەوەی گوتی: هاتونی ماتضعوه في الطعام. ئنجا گوتی: لعن الله العقرب انها لاتفرق بين من يصلي ومن لا يصلي. منیش هەروەها دەڵێم لەعنەت لەخەبەر دەر بێ کە دەیەوێ من پێوە بکات کە مومکین نی‌یە خەریکی کارێك بم جەزای ئیعدام بێت هەموو ئومێدی سەلامەتیشم ئەوە بێت حکومەت ڕەحمم پێ‌بکات. انا أرفض هذه الرحمة وأقعد في بيتي . . .

بزاز خەریکی ڕێك کەوتنەوە بوو لەگەڵ کورد تا گەیشتە ئەوەی وەفدێك لەسەرەوە هات بۆ تێك گەیشتن. زەیدی ئەحمەدە فەندی پێوەنارد. وەفدەکە لێرەبوو، بەیانی ٢٩ حزیران خوێندرایەوە ١٢ مادەبوو، سبەی ئینقلابی دووەمی عارف عبدالرزاق سەرلەنوێ شکستی هێنا. ئەو ١٢ مادەیە بەلای منەوە خراپ نەبوون.

بەر لەو ڕێك کەوتنە چەند کۆبوونەوە لە قصری جمهوری کرا عەرەب و کورد تێیدا بەشدار بوون، هی کوردانیش بەتەنها لە (مجلس وطني)کرا. من لە هەردووکان بەشدار بووم بەڵام قسەم نەکرد.

لە شەوی ١٤ی تەمووز داوەتی قصری جمهوری کرام. لەگەڵ بزار تووشی یەکدی هاتین سەلامان لەیەکتر نەکرد.

وەفدێکی صحفي مصر هاتبوون داوایان کرد ببینین: لە ١٧ی مانگە چوومە لایان لە ئوتێل بەغدا. نوێنەری روزاليوسف ومصور وجريدەی الجمهورية بوون ٤سەعات قسەمان کرد. لەبارەی بەیانی ٢٩ی حزیران پرسیاریان کرد حەزیان لێ‌بوو رام لێ‌نەبێ چونکە بزازیان خۆش نەدەویست گۆیا وحدوی نەبوو. گوتم من بەر لە دوو شەو بە بزاز گەیشتم سەلامان لەیەکتر نەکرد، لەبەر ئەمە قسەم بۆ دۆستایەتی ئەو نی‌یە. من کە سەرنج لە شۆرشی کۆن و نوێ دەگرم و دروشمەکانیان و ئەنجامەکانیان بەراورد دەکەم کە چەند لێك دوورن بە قیاس لەوان دەتوانم سێ مادەش لەو دوازدە مادانە بە قوربانی نۆیەکەی دیکە بکەم.

دواتر مصور و روز اليوسفم باسی منیان کردبوو. هەرچی الجمهورية) بوو دوای پتر لە ساڵێك سەرۆك نووسەرەکەیم دیتەوە گوتی، بە درێژی ئەو قسانەتم بلاوکردەوە. قسەکان وەختی خۆی لە هەموو مەیدانێکی دەپشکنیەوە هەتا هونەرو گۆرانی‌و (ترتيل)و. . و هتد. . ی مصر.

بزاز دەستی نەبەسترابایە عیراقی دەهێنایەوە باری ئاسایی بەڵام عەسکەریەکان لێی بێ‌زار بوون هەر لە ساڵی ١٩٦٦ وەهایان کرد إستقاله بدات. وەزارەتی ناجی طالب هات، وابزانم، لە مانگی یازدە یان دوازدەی ١٩٦٦. رجب عبدالمجيد جێگری سەرەك وەزیران و وەزیری داخلیە بوو. ناجی و رجب دۆستم بوون. هەتا بشڵێی سەغڵەت بووم لەلایەن گوزەرانەوە. ئەندامەتیەکی (مجلس الخدمة) بەتاڵ بوو، رووی تەکلیفم لێ‌نان و مرسومیان دەرچواند بە دامەزراندنم لەو مەجلیسە. ڕۆژی ٢٧ وەیا ١٩٦٦/١٢/٢٨ دەوامم کرد. . .

ماڵەکەم لە منصور گوێستەوە بۆ مدينة الشرطة. جیرانەتی حسێن شێروانی بۆ ئەوێی ڕاکێشام. حسین مدير شرطة بوو وەك دەڵێن (عصامي) بوو، دەمێکیش بوو دۆست بووین لە کۆتایی شوباتی ١٩٦٧ لە خانوێکی نزیك ماڵەکەی ئەو نیشتەجێ بووین. کرێ خانووی منصور ٥٠٠ دیناری ساڵانە بوو، هینەکەی مدينة الشرطة ٢٤٠ دینار بوو.

هەندێ برادەرم دەمێك بوو لێم بزربوون پەیدا بوونەوە. . .

لە ساڵی ١٩٦٦ کۆمەڵەی مەکتەبی سیاسی کە زۆربەیان هاتبوونەوە لای چەکدارەکان و تەنها سکرتێریان لە تاران مابۆوە، تا ئەو کۆمەڵە بە پێی قسەی خۆیان لە ترسی ئیعدام هەڵاتن بۆ ناو حکومەت و هێنرانە بەغدا. سکرتێریش هاتەوە بەغدا. من کەزێکم دیت بە ئیمزای سەرکردەی چەکداران لە ١/١/١٩٦٦ فەرمان دەدا بە کوشتنیان. . . من لە کولانەی کوردایەتی بەرفرەوانەوە سەیری کەسان و رووداوان دەکەم، کەمتر نیگای (موسمی) کژکات دەخوازمەوە: مەکتەبی سیاسی لەو رۆژگارانەدا پارچەیەکی مێژووی کورد بوون، چاکەو خراپەیان لە دەست دەهات.

هەرچەند لە تەمووزی ١٩٦٠ من رەخنەی توندم لێ گرتن بەوەدا کە لەبەر تیشکی (چینایەتی)دا بە چاولێکەری چەپ خەباتی کوردایەتی بەرێوە دەبەن هەر لەو نووسینانەشدا گوتبووم کە ناشێ بۆ هیچ کوردێك کۆسپ و لەمپەرو تەگەرە بهێنێتە بەر هەنگاوی حیزب وەیا حیزبێکی دیکە قوت بکاتەوە. پاشتریش لە ١٩٦٣ بە تەواوی ئاشت بووینەوە. ئەمجارەش کە هاتنەوە بەغدا من پێوەندیم پێوەکردن و هاتوچۆ لە نێوانیاندا هەبوو. تەنانەت کە خەبەربلاو بۆوە زەعیم عبدالوهاب أمین داوای لێکراوە وەزارەت پێك بهێنێت چوومە لای، هەرچەند لە ناسینێکی دووربەدووی پتر لە نێوانماندا نەبوو: دەمزانی بۆ لایەنی وتوویژکردن لەگەڵ کورددا دۆستی نزیکی هەیە لەکوردی بەغدا مەکتەبی سیاسی یان خۆش ناوێ، مومکینە بەرەو تێنەخوێندنەوەی ئەو گرووپە راوێژی بۆبکەن. من پێم گوت سوودی گشتی لەوەدا نییە دووبەرەکی کورد لە چەژی سیاسەتی حکومەت خۆش بێت چونکە هێمنی و ئارامی وڵات و حوکم لە یەك بووندایە. وەها پەسەند دەکەم کە تەکلیف کراویت بۆ سەرەك وەزیرایەتی هەر نەبێ رووکەش بێت نەبزێکیان بگریت و بایەخیان پێ بدەیت بایی ئەوەی بەشی ئۆقرەگرتن بکات. گوتیشم من بەنیازی خۆهەڵقوتاندن لە شتی لابەلایی نەهاتووم بۆ لات، دەبوو ئەم تێبینییەت پێ بگەیەنم. لەوەڵامدا گوتی، راستە تەکلیف کراووم زۆریشم حەزکرد ئەو پەرۆشەت دەربری، خۆیشم پێوەندیم پێوە دەکردیت ئەمەش نومرەی تەلەفۆنتە لەو رۆژانەم وەرگرتووە. عبدالوهاب أمین نەبوو بە سەرەك وەزیران قسەکانمان نەزۆك مانەوە.

زۆربەی هەرە زۆری کوردە سیاسییەکانی بەغدا وەیا ئەوەی بیروڕای هەبوو لە کاروباری کوردایەتی‌دا مەرحەبایان لەو گرووپە بڕیبوو هەتا جارێکیان چوار کەس لەو کوردە ناسراوانە هاتبوونە سەردانم لە (مجلس الخدمة). کاتێك ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی هاتە ژوورەکە، ئەو چوار کەسە تێکرایان دوعاخوازییان کردو لە ژوورەکە دەرچوون. هەرچەند هەستی قەومایەتی لە حاڵ و باری ئەوتۆیی‌دا بشکوڵێت، شتێك دەمێنێت لە هەستی شەخسی گرنگترە پێی دەڵێن بەرژەوەندی قەومایەتی. کوردیش ئەوە نییە لە فیزونازی هێزو سامانـدا خەتێك راکێشێت بەسەر ناوی صەدەها کەسانی تێکۆشەر کە ئەگەر سەهووشیان کردبێت دەبێ بە رێنموونی و رەخنەی دۆستانە لە سەهوو بگێردرێنەوە نەك بە شکاندنیان شێرگیرەتر بکرێن. کاتێك میللەت ئەوەندە بە دەسەڵات و چەسپاوبوو پەکی بە هەڵەی هەڵەکردووان نەکەوت حیسابەکە دەگۆڕێت، خۆ ئەوساش دوژمن بکات بە دۆست سوودمەندتر دەبێت لەوەی بە ئەرك و مەسرەف لەناویان ببات. . هەر ئەم بیروڕایەم بوو وەهای لێ کردم کە دوای دوو سێ ساڵ ئەو گرووپە ویستیان بچنەوە بۆ لای چەکدارەکان و پرسیان پێ کردم، بێ سێ‌ودوو لێ کردن پێم گوتن ئەمە هەلی عومریانەو نابێ ئاوی لێ بخۆنەوەو دوو دڵی تێدابکەن. تێیاندا هەبوو لەم باوەڕە نەبوو، سکرتێریان قسەکەی منی زۆر پێ خۆش بوو چووشنەوە ئەولا. .

لە زۆر بارو جاردا گوتوومە: من کوردم بە کورد قبوولە هەتا رۆخی خیانەت. دیسان قبووڵە لە خیانەت بێتەوە دەرێ چونکە کورد وەك هەتیمی هەژارە لەوەدا نییە کولێرەی بێ رۆن بەلاوەبنێت.

لەگەڵ ئەمانەشدا من بەو گرووپەم گوت نەدەبوو ببنە لەمپەر. گوتم من بوومایە لە جیاتی ئێوە خۆم (تحیید) دەکرد. لەبیرمە وشەی (neutralize)م بەکار هێنا. لەقسەی کوردی (خۆم بە نەبوو دەکرد)م گوت.

بێگومان شەرعییەتی حیزبایەتی و پارتایەتی هی مەکتەبی سیاسی بوو، شەرعییەتی لەوە فرەوانتر هی چەکداران بوو. ئەم راستییەشم هەموو دەم گوتووە هەرچەند دەشێ هیچ لایەکیان لێی رازی نەبن چونکە کەم وەها دەبێ خەڵق بەو پشکە رەوایە رازی بێت کە نیوە بە نیوەیە. .

مەجلیسی خدمة چونکە ئیشێکی رووتینی وەکوو دامەو شەترەنج دەباتە سەر بەهرەی مرۆی بەهرەدار دەکوژێنێتەوە بۆیە بوو پێم دەگوت (مقبرة القابلیات). لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر کاروباری بە رێکی و بێ خوارەکەو خێچەکە رۆیشتبایە و کەمێك نیگافراوانی تێدا بەکارهاتبایە بۆ خەڵقێکی زۆر لەوانەی موحتاجی وەزیفەن دەبوە مایەی خێروخۆشی. ئەندامەکانی بە سەرۆکەوە، چ ئەوانەی من

بەگەڵیان کەوتم چ ئەوانەی دواتر بوون بە ئەندام لە جێگەی ئەندامە کۆنەکان، سەرلەبەریان دەست خاوێن بوون. بەڵام ڕێك خستنی کاروباری دایەرەو دیارخستنی بەرپرسی ی هەریەك لە مومزەفەکان کەلێنی دەدا بۆ بەدرەفتاری. هەتا تصلیحی دەفتەرەکانی ئیمتیحانی تەعین و تەرفیع لەدەست لیژنـــەیەکی بەرەژێرتـــری ئەنـدامـانی مەجلیس بوو کاری بـــەد هەبـــوو کەمیش نەبـوو، تا ئەوەی هەر تەعیینێکی بەندبایە بەو ئیمتیحانەی لیژنەی بەرەژێر کردوویەتی من ئیمـزام نەدەکـرد. سەیر لەوەدا بوو دەبـوو ئیمتیحـانی تەرفیع بە قەڵـەمی خۆنووس وەڵام بدرێتەوە: کەسێکی تصلیحی دەفتەری کردبایە بە ئاسانی دەیتوانی چی نووسراوە بی سڕێتەوەو هی دیکەی لە جێگەدا دابنێت توومەز لە بنەڕەتدا ئەوانەی مەرجی ئەوتۆیی یان داناوە بە بەرچاوی خۆیانەوە گرتووە کە بتوانن مامڵەت لەگەڵ ئەو مومزەفانەدا بکەن کە دێنە ئیمتیحانی تەرفیع، مەرجەکەش لە کۆنەوە دانـدرابـوو بۆ ئێمـە سەرەژێر بوویـۆوە. کەتصلیح کەوتە دەست ئەنـدامانەوە ئەشەدوبیللا هەتا لە مەجلیس بووم نەم هێشت یەك مومزەف بکەوێت. منیش دەهاتم بابی دەرچوونیان دەسکاریم لە وەڵامەکانیاندا دەکرد بێ ئەوەی بزانم کابرا چی یەو کێ یەو خەڵقی کوێ یە. بەلامەوە لە زوڵم زوڵتر بوو بابایەکی موەزەفی هەناسەسارد بەتەمایە لە سی دینارەوە بۆ ٣٦ دینار هەڵکشێت هەر چونکە نازانێ جەزری ١٥٣٧٥٤٥ چەنـدەو تأبطّ شرّا کێ یەو جزر القمر چەند پانـایە بکەوێت کەچی ئەو ئیشەکەی خۆی بریتی یە لە (ضـبط)ی محاکمەی دادگە. بەڵێ ٤٠ پلە داندرابوو بۆ مادەی (اختصاص)و ٢٠ بۆ زمان و ٢٠ بۆ حیـساب و٢٠ بۆ زانیاری گشتی بەڵام دەبوو بۆ مادەی اختصاص ئەوەندە دابندرێت کەئەگەر کابرا تێیدا سەرکەوت پەکی بەئەواتی دیکە نەکەوێت. من ئەوەندەم پێ کرا حیسابەکە لە ٢٠ پلەوە بهێنـە ١٠ پلەو دەیەکـەی دیکـە بەسەر مادەکانی دیکە دابەش بکرێن.

هێشتا ئیمتیحان لەدەست لیژنەی بەرەژێردا بوو کاتبی تحریری ڕەواندز کە لە بنەماڵەی مەلا ئەسعەد ئەفەندی ڕەواندزی بوو ئیشی هەرە گەورەشی ئەوە بوو لە کۆبـــوونـەوەی قۆمیسـێری سنـووری عیراق و ئێران و تورکیادا لە سی ساڵەوە تەرجەمەی کوردیو فارسیو عەرەبیو تورکی دەکـــرد کە هات بۆ ئیمتیحـــان لاگهـڵ هەبـوو سفارشێکی لای لیژنە کردم هەر خستیان، جاری دووەم خستیان. . کاغەزم نووسی بۆ متصرّفی هەولێر کە ترشیحی بکاتەوە بۆ تەرفیع چونکە دوای دووجار کەوتن دەبوو ترشیح بکرێتەوە دیسانەوە دوو جاران خستیان دیســانـــەوە لەســـەر داوای خۆم ترشیح کرایەوە هەمیـــان خستیان. ئەم جارە بە مدیر عامم گوت، بەسەو تەحەمول نەمـــا. سەرت نەیەشێنم بەخـێری خۆیان ٥٠ نومـرەیان دایێو دەرچوو تەرفیعەکەشی بۆ ٣٦ دینار بوو دەی ویـست لەو مەعاشەدا خۆی تەقاعود بکات. ئەم کەین و بەینە ساڵێك و سێ مانگی برد. هەرچەند من و تۆ بەرپرسی چاکەو خراپەی ئەم جیهانە نین بەڵام لە سنـــووری هەست کردنمان بە چاکـەو خراپـە، بابی دەسـەڵات ڕاشکان دەبێ یاریدەیەکی چاکە بدەین. من دەمدیت دەسـەڵاتی گەورە بە پای پیلان سامـان بەســەر یەکەوە دەنێت مومزەفی گەورە هەبـوون ساڵانە لە سەفەری کەیف و بەزم بە مەسرەفی حکومەت تەردەمـاغی یان دەکـرد ئیتر بۆچی مەلا شەفیعی ڕەواندزی لەسەر نەزانینی جەزری تەکعیبی هەمـوو ئومێدی بە تەقاعودی مەعاشی ٣٦ دیناری بپووچێتەوە ئەویش دوای خزمەتی سی ساڵ. هەر لەو دەمانەدا بوو نوسخەی بریارێکمان بۆ هات لە وەزارەتی داخیلیەوە دەڵێ. فلانـە مامـۆستـای قوتابخانەی سەرەتایی ناحیەی (ق) کە شەهـــادەکـــەی هی دار المعلمـــین ریفیەو مەعـاشی ٣٠ دینـارە دەستی دایە فەرمانی نوێی لە وەزارەتی خارجیە بە وەزیفەی سەفیرو مەعـاشی ١٦٠ دینار مانگانە. . کە بچیتەوە بۆ قانوونی (سلکی خارجی) دەبینیت یەکێك کە بکـــرێ بە سەفـــیر دەبێ هەرنـەبێ زمانێکی زیندووی بێگانە بزانێت و شەهادەکەی لەگەڵ سەفارەت بگونجێت و مەعاشیشی لە ١٠٠ دینار کەمتر نەبێت.

زۆر جاران وەهـا دەبـوو لە سنـووری ئەو قانوونەی مەجلیس پەیرەوی لێ دەکرد هیچم پێ نەدەکرا بۆ یارمەتی دانی موراجیعەکان. ئەگـەر ڕێم هەبـایە هانام دەبردە بەر دایەرەی دیکە: لە نموونەدا دەڵێم، دەوری ٤٠ کەس لە ماموستایانی کە دەبوو بگەڕێنەوە بۆ وەزیفەو نەگەڕانەوەو لە کچانی دەرچووی دار المعلمات کە وەزیفەیان بەرنەکەوتبوو کەوتنە سەر ساڵی ١٩٦٧و گەیشتنە نیسان و مایـیش کە ئیتر تەعیین بوونیان بەپێی (نظام وەیا قانوون) مومکین نابێت هەتا مانگی ئەیلوول. لەمانە کچی محمود ندیم (خەڵقی کفری) کە ناسیاوم بوو لەو دەمەڕا کە کاتبی یەکەمی دادگەی کۆیێ بوو بەر لە ١٥ ساڵ زیاتر، ئەم کچە لە کفری یەوە سبەینە زوو بەڕێ کەوتبوو تابگـاتـە (مقـابلە)ی دامـەزران لە مەجلیـسی خدمـة: لە ڕێگـە ئۆتـۆمۆبیلەکەی وەرگەڕابوو. . موقابەلە بەسەرچوو ڕۆژی دواتر کە هاتەلام خۆڵ و دۆی دنیای بەسەردا کرا بوو دەتگوت لە لێوی قەبرە هەر ئێستـــا دەی شـــارنـــەوە. . دایە گریانێك و هەنیسکێك باس نەکرێت. . . حەقیشی بوو: خۆیشی و باوکیشی لە تەقاعوددا بە تەمای ئەو مەعاشە بوون ئاهێك لە جەرگیان بگێرێ. . نموونەیەکی

دیکـه: حکـومـەت بە موجـادەلـەی کوردان لە ۱۰۰ درجـەی موعەلیمەی کچ ٥٠ درجەی بۆ کچانی کورد دانا کە زمانی کوردی بزانن. دوازدە کچی کەرکـووك دەبـو دامەزرێن کەچی لەمانە دە کچیان کوردی‌یان نەدەزانی.. ویستم یارمەتی‌یان بدەم بەوەدا فێڵ بکەم لەو عضوەی لەگەڵم دانیشتبوو بۆ ئەزموونی کچەکان لە زمانی کوردی: هەر کچێك دەهـات بەکـوردی لێم دەپـرسی: کوردی دەزانـیت؟ مەڵێ نازانـم! کەچـی بەگـیانـی بێ‌منـەت کردنـەوە دەی‌گوت و بە عەرەبیشی دەگوت: ما أعرف کردی خو احنا مو من کردستان.. بە مەدا عضوەکەی تەنیشتم ئاگادار دەبوو منیش پێم نەدەکرا بە درۆ بڵێم کوردی دەزانێت. کچێکیان نەوەی مەلا قادری إمـام قاسم بوو کوردی دەزانی، یەکێکیشیان بەدەنـگە نەهات و توانیم درۆی بۆبکـەم، دە کچـەکـەی دیکە بێ‌بەش بوون و ئەو بەشەی ئەوان خرایەسەر پشکی هەولێرو سلێمانی و قەزاکانی کوردی سەر بە موصـل.. دەوری ۲۰ معلمێك ئەوراقیان پێ‌تەواو نەکرا بوگێرانەوەیان بۆسەر وەزیفەکانیان.. خولاسە چل کەسێك زۆر بە مەغدووری مانەوە. چوومە لای رجب عبدالمجید، وزیری داخلیە ونـائیب رئیس الـوزراء، و پێم گوت: ابـو محمد، ٤٠کەسێك لەوپەڕی مەغدووریەتدان دەبێ چارەیان بکرێت حەقیشم بەسەر قانـوون و مانـوونـەوە نی‌یە.. قسـەکـەم چوە دڵیەوە. تەلـەفۆنی هەڵگرت لەگەڵ ناجی طالب رئیس الوزراء قسەی کرد گوتی فلانم لایە لەگەڵی‌دا هاوباوەڕم کە دەبێ ئەو کەسانە [شەرحی حاڵی کردن بۆ ناجی] تەعین بکرێن. ئێمە لە قسەکردندا بووین سلطان أمین، وەکیلی وەزارەتی دیوانی وەزارەتی داخلیە، هاتبوە ژوورەکە کاغەزی رەسمی پێ بوو وەزیر ئیمزای بکات هەر بەسەر پێیانەوە گوتی: کە هەر ئەو خێرە دەکەن دوو صەد کچی (دار المعلمات)ی تازە دەرچوو هەن ئەوانیش حەقە بەر ئەم رەحمەتە بکەون. گوتم هەڵبەت ۲۰۰ چاکترە لە ٤٠.. ناجی طالب بێ دوودڵی گوتی منیش لەگەڵتانم پارەیان بۆ پەیدا بکـەن لە بۆدجەی ئەمسـاڵ. رجب قسـەی لەگەڵ وەزیری مالیە کرد گوتی هەر ئێستە خەریك ببە بۆ خستنەسەری ۹۰ هەزار دینـار بۆ بۆدجـەی ئەمسـاڵ لە حیسـابی (تـربیە). مایەوە تەگەرەی قانوون کە نابێ مامۆستا لە نیسانەوە دابمەزرێن ئێمەش، وابـزانـم، کەوتبـووینە مایس. رجب گوتی: فلان وەعد بێ هەر مانگی ئەیلوول داهـات تەعیین دەکـرێن. گوتم أبـو محمـد چ سیگـۆرتـە هەیە کە ئێوە هەتا ئەیلوول لە حوکمدا دەبن؟ گوتی، راســت دەکــەیت با چاری بدۆزینــەوە. سەرت نەیەشـێ ئەو ڕێگەیەمان دۆزیەوە کە ئەمری تەعیینیان دەربچێ بە (کاتب) لەو قوتـابخـانانەدا کە لە یەکی ئەیلوول ببن بە مامۆستا تێیاندا.. لە هەموو مێژووی حکومەت شتی وەها نەکرابوو رجب گوتی ئیقناع کردنی مەجلیسی خدمة بەمل خۆتەوەیە..

کە دەرچووم دیتم دەوری ۲٥٠ کەس لە کچ وکوڕ، زوربەشیان کچ، چاوەنۆڕمن. هەر کە گوتم هەمووتان تەعین بوون، بوو بە قیامەتی شادی. گومانت نەبێ لەوەدا کە کۆشەشی ئەوتۆییم کەلێك گەلێك بەتامتر بو لە یارمەتیەکی بە دەسەڵاتی وەزیفەمەوە پێشکەش بە ئەم و ئەوم دەکرد.

ڕۆژێك لەو ڕۆژانـە معـاونیکی شرطـەی کورد کە لەسـەر کوردایەتی فصل کرابوو هات بۆ مراجعەی ئیشەکەی. بەخێرم هێناو ڕێزم لێ‌ناو لە ماوەی کەمتر لە دوو سەعات هەموو (اجراآت)م بۆ تەواو کردو بڕیاری بوونـەوەی بە معـاونی سێ ئەستـێرەییشم بۆ دەرهێنـا. هاتـەلام مفصـول بوو، پێش دەرچـوونی معـاونی سێ‌نەجمەیی بوو. گوتی: فلان قەت لە چاکەت دەرناچم.. گوتم کاکی خۆم، ممنوون بوونم ناوێ: تۆ چەند لە ئیستیراحەتدایت کە ئیشت یەك چرکـە نەوەستـا و زۆریشی خێرایی لێ‌کـرا خۆ ئەگەر ئازەزۆم کردبایە چەند مانگان هاتوچۆم پێ دەکردیت. لە پاداشدا ناڵێم وەکوو من ببە لەگەڵ مراجعی کە دێنەلات، هەر ئەوەندە لێ داوادەکەم: تو شەرەفت لە هیچە ئیشی خەڵق مەوەستێنە.... ئەم برا کوردە ناویشیم نەهاتە بەر.

یەکێکی عەرەب کە هەر نەمـدیت، بڕیاری تەعیینی دەرچوو کەچی ئەمـرێکی مەجلیسی قیادەی سەورەمـان پێ‌گـەیشت بە تەئـریخێکی پێش ئەو تەعیینـە ئیمـزا کرابـوو لەسـەر ڕاگـرتنی تەعیینـات. تەعینەکەی هەڵوەشایەوە. ئەرزو حاڵی دابوە قصری جمهوری کە تەعیینەکەی ئەو بەر ئەو ڕاگرتنە نەکەوێت. لێی داوا کرا بوو لە مەجلیسی خدمەوە (إستشهاد)ێك ببات بۆیان کەڕاست دەکـات. ئەرزوحـاڵی دایە سەرۆکی مەجلیس، داخـوازی‌یەکەی ڕەت کرایەوە، بەوەدا کە مەجلیسی خدمة (استشهاد) دەرناکات، با قصر پرسیار بکات.. من نەمتوانی سەرۆکی مەجلیس ئیقناع بکـەم بەڵام بڕیارێکم لەگەڵ خۆم دا. بەدوا ئەو کوڕەمدا هەنارد تومـەز پاش بێ‌ئـومـێدی ڕۆیشتبـوو. نامـەیەکی شەخسی و نیوەرەسمیم بۆ سەرۆکی دیوانی قصر نووسی کە ئەو کوڕە ڕاست دەکات لەوەداکە ئەمری تەعیینی دەرچوو بەڵام ڕەش کرایەوە.. لە نامەکەدا نووسیم، حەدیسی پێغەمبەر دەڵێ: من رأی منکم منکرا فلیغیره بیده فان لم یستطع فبلسانه فان لم یستطع فبقلبه وذلك أضعف الایمان. منیش (منکـر)ێکی گەورە لەوەدا دەبینم

هاونیشتمانی دەرگەی موراجەعەی لەرووودا بیەسترێت لە ناو نیشتمانەکەی وا قەلەمم لەجێی زمانم ئەو (منکر)ە لەسەر شانم هەڵ دەگرێت بۆسەر شانی لە خۆم بەدەسەلاتتر.

دوو رۆژی نەبرد لە قصضرەوە بە نامەی رەسمی داوای فایلی ئەو گورە کراو ئەمرەکەی تەعینی تەنفیزکرا.. من نەپێشتر سەرۆکی دیوانی قصرم دیتبوو نە دواتریش دیتمەوە بەلام بیستمەوە کە ئەو دەی ناسیم و نووسینەکانمی بەدڵ بوو. ئەوساش هەر لە سنووری کاغەزی رەسمی و هەندێك لە گوتارەکانی هاوینی (١٩٦٠)م مومکین بوو منی ناسیبێت بە نووسەر.. ئەگەر ئاگای لەنیابەتم نەبووبێت.

لەم بابەتە کۆششانە گەلێك بەولای تاقەتی خۆمەوە دەرۆییشتم: هەرچەند ماندووبوون و ناوناوە مەسرەفیشم لەکیس دەچوو بە هاتوچۆی تاکسی دیسانەوە هەتا بڵێی دەبووژامەوە بە سەرکەوتنی هەر یەکێك لەو کۆششانە

حاجی رسول چون تەرفیعی کرد؟ داخلیە قایمقامێکی تەرشیح کردبوو بۆ تەرفیع، حاجی رسول هاتەلام گوتی چ بکەم تەرشیح نەکراوم؟ گوتم ئیعتیراز بگرە. مەجلیسی خدمە گوێی نەدایە ئیعتیرازەکە: کابرای تەرشیح کراو دوو مانگ بەر لە حاجی بووبوە قایمقام حاجیش هەشت (شکر وتقدیر)ی هەبوو کابرای دیکە دووی هەبوو. چوومە لای وزیر داخلیە د. شامل سامرائی، کەونە زمیلم لە وەزارەت، گوتم: أبو أندلس متى تقبلون الولاء من الكردي؟ حاجی لەناو شاخ و راخی کوردەواری و لەدەمی حەرەکاتدا هەشت جاران تەقدیرکراوە، کابرای دیکە لەبەر سێبەری قەزای وەکوو نەجەف دوو تقدیرکراوە هەر چونکە پشتیوانیشی هەبوە دوو مانگ زووتر بۆتە قایمقام. یا ابا اندلس والله لو كنت أنا وزيراً بدولة كردية و جاءني عربي في مثل وضع حاجي رسول لمافضلت عليه كردياً. گوتی. فلان بەس بێ ئابرووم چوو. تەلەفۆنی هەڵگرت بە یەکێکی بەرپرسی وەزارەتەکەی گوت: حيا مابقي: لەبن ئەرزیش بێت بایی تەرفیعی قایمقامێك پارە پەیدابکە..

دوو رۆژی نەبرد تەرشیحی حاجی هات و تەرفیعی پێ کرا.

جەلالی حاجی عەولابەگ، کەونە هەڤالی قوتابخانەی سەرەتایی و دۆستی هەمیشەییم، چۆن تەرفیعی کرد؟ دەبوو لە پلەی حەفتاوە بۆ پلەی صەد دینار مەعاش بەپێی نظام داخلی مەجلیس دیدەنی لەگەڵدا بکرێت پاش تەرشیح کرانی لەلایەن وەزارەتی عەدلیەوە. قسەم لەگەڵ وزیری عدل کرد گوتی: لە وزیر مالیە پارەم بۆ پەیدابکە هەتا هەر ئیستا تەرشیحی کەم. رێکەوت وەها بوو وزیری مالیەی ئەو دەمە دەیەویست لەگەڵ ئاشت ببمەوە، یەك دووجار هەوڵی‌دا نەم بیست! بۆ ئەم ئیشە چوومە لای. کە گەیشتمە ژووری سکرتێرەکەی بێ ئەوەی ئیزنم بۆ وەربگرێت گوتی فەرموو. گوتم ئەدی ئیزن؟ گوتی تێی گەیاندووم هەر دەمێك هاتیت لە هەر بارێکدا بێت یەکسەر دەرگاکەت بۆ بکەمەوە.. دەرگای کردەوە. وەزیر بێ وەخران پارەی پێویستی خستە سەر بۆدجەی عدلیەو جەلال بەگ تەرشیح کراو دیدەنی لەگەڵدا کراو هەڵکشا بۆ پلەی صەد دیناری:

چوار وەزیفەی کاتب ناحیە لە داخلیەوە داواکرا پر بکرێنەوە بە مەرجی زانینی زمانی کوردی. ئیعلان کران، هەشت کەسی بۆ هاتن. لە ئەزموونەدا چوار کەس بەپێی پلەی دەرچوونیان تەعین بوون چواریشیان مانەوە بە (احتیاط). یەکێك لە دەرچوە تەعین بوەکان (علی دەرویش مەشوور بە عەلی درێژ) هاتەوە لام بۆ سپاسگوزاری، گوتم لەجیاتی سپاس ئەگەر دەنگت دەگاتە ئەو چوار إحتیاطە با بزانن ئایا وەزیفە هەن لە ناوچەی کوردەواری شاغر بێت و بۆ ئە وان دەست بدات، خەبەرم بدەنێ من مەمنوونت دەبم. خەبەریان هێنا ئەو وەزیفانە هەن. کاغەزم نووسی بۆ متصرفی ئەو ناحیانەی وەزیفەکان تێیاندا شاغر بوون و رجام لێیان کرد کە داوابکەن لە مەجلیسی خدمە وەزیفەکان پر بکرێنەوە. بە زوویی کاغەزی رەسمی‌یان لێوەهات و ئەو چوار (احتیاط)ە یەکسەر تەعین بوون چونکە (احتیاط) نە ئیمتیحان دەکرێتەوەو نە (منافسە)ش قبوڵ دەکات. لەو ماوە کە دەوری ٢٠ ساڵێکی بەسەردا تیپەڕیوە عەلی دەرویش دۆستی گیانیمە. لە دوورەوە دوعای بێ دەسەلاتانم بۆ دەکات منیش بێ دەسەلاتانە مەمنوونی دەبم. هەر ساڵەش دیاریەکی بە سەنگ سووکی لە واتادا گرانم بۆدەنێرێ. ساڵێکیان هەنگوینی بۆ هەناردم لە سلێمانی‌یەوە: ئەو هەنگوینە لە عادەت بەدەر بەپێز بوو، ئەو داوەی وەکوو ریسی جاڵجاڵۆکە لە هەنگوین دەچۆڕێتەوەو درێژ و باریك دەبێتەوە لەم هەنگوینەدا وەها شریتەی دەکێشا دەتگوت پسانی بۆ نی‌یە. لێم پرسی هەنگوینەکە لە کوێوە هاتوە بەخۆیی و ئەو سیفەتەیەوە وەلامێکی وەها روونم وەرنەگرت بتوانم بڵێم فلانە هەرێم هەنگوینی ئەوتۆیی لێ پەیدا دەبێت. لەم تەرزە دیاردەم دیتوە و ویستوشمە هۆیەکەی بزانم بەلام بێ‌سوود: لە سی‌یەکاندا، ساڵێك لە سالان، توتنی یەکێك لە توتنەوانەکانی دێی (پێ‌بازۆك)ی سەر بە کۆیێ وەها خێرا دەسووتا هەتا جگەرە لە توتنی دیکە دەگەیشتە نیوەی جگەرەی ئەم توتنە تەواو دەبوو، سۆتووشی زۆر سپی بوو. نەم دیتەوە جارێکی

دی ئەو تووتنــە دەربکــەوێتەوە. . لەو ساڵانەدا چوێلەکەی وڵاتی کوێی بەچکــەی خۆی بەخێو نەکردو لە هێلانە فڕێیدەدا بۆ سەر زەوی. . کەس نازانێ، ڕەنگە زاناکانیش نەزانن، بۆچی بوو ئەم بەچکە کوشتنە! من خۆم لەو کۆەدا لەکۆیێ نەبووم بەڵام لە مرۆی ڕاستگۆم بیست، هۆی گومان لێ کردنیش پەیدا نی‌یە. .

لە مەجلیسی خدمــە بووم مارف خەزنــەدار هانیدام بۆ دوان لەبارەی ناڵی‌یەوە، وەها بوو چەند دانیشتنێك بە یەکەوە دانیشتین بە تەلــەفزیۆن لە کەرکووك بڵاو کرایەوە. . دوو جاری دیکەش هەر جارە بە ڕەفاقەتی یەکێك لە بەرپرسانی تەلەفزیۆن لە بارەی حاجی قادر و شتی هەمــە بابــەتــەوە دووام. . لەســەر شتێکی بێ‌بــایەخ پێوەندیم بە تەلەفزیۆنەوە بری خەتای منیشی تێدا نەبوو. (مەبەس تەلەفزیۆنی کوردی‌یە).

ڕۆژێك لەو ڕۆژانەی کەوا جاریێ ناجی طالب سەرەك وەزیران بوو لەگــەڵ رشید مصلح چووینە سەردانی فەریق طاهر یحیی. ئەوان هەردووکیان بێ ئیش بوون.

فریق طاهــر زۆری بەخــێرهێنــام، هەر زووش دەرکــەوت چوونــەکــەم بۆ لای کەوتــە کاتێکی لەبــار بۆ حیسابی خۆی. بە مجامەلە لەتەنیشتمەوە بەلای خوارەوە دانیشت. گفتوگۆ هاتە سەر وەزعی (حکم) فریق طاهر گوتی پێویستە حکومەتێکی بەهێز بێت چارەســەری گیروگــرفتی ئابــووری و رامیاری. . و . . . و. . . هتد بکات. ڕووی قسەی لەمن ناو وەهای نواند کە منیش لەو هەوڵە بەشدار بیم وەك کوردێکی خاوەن باوەڕو تەجرەبەو. . و. . دیار بوو دەیەویست لەگەڵ کوردێك پێوەندی بکات ئیتر نازانم بیری لە من کردبۆوە یاخود ڕێکەوت منی نامزەد کرد.

من دۆستی ناجی طالب و رجب عبدالمجید بووم، ئیمکان نەبوو بە وەهم و خەیالیش دژیان بوەستم. . گوتم: أبو زهیر حەز دەکەم بزانیت من کە هاتــووم بۆلات تەنها سەردانی دۆستانەم مەبەست بووە چ پێوەنــدی‌یەکی بە سیاســەتەوە نەبوە، پێشی ناوێ بڵێم بۆ- خۆت دەزانی، قسەیەکی ئێستا. بیستم لە منەوە وەپاڵ تۆ نادرێت کە زانی من تێکەڵ بەو هەوڵە نابم دوای چاو قوچێنێك جێگای خۆی کواستــەوە بۆ ئەو بەری کە رشید مصلح بەتــەنها لێی دانیشتبوو. لەســەر قســەکــان بەردەوام بوو گوتی: هەموو شتێك ڕێك خراوە ماوەتــەوە أحمــد حسن البکــر قسەی لەگەڵدا بکرێت. سبەی لە پێشوازی فلانە سەرەك دەوڵەت دێتە فرۆکە خانە قسەی لەگەڵدا بکە [ڕووی لە رشید مصلح بوو] بۆ ڕێك کەوتن لەگەڵمان، تۆی خۆش دەوێت. .

سبەینێ منیش داوەت کرابووم بۆ ئەو پێش وازی‌یە. دیتم رشید مصلح أحمد البکری جودا کردەوەو لەگەڵی دوا. لە دوورەوە پێوەی دیار بوو وەڵامی ڕەفز دەداتەوەوە.

زۆری نەبرد وەزارەت گۆڕا: وەك لەبیرمە سەرۆك کۆمار خۆی بووە سەرەك وەزیرانیش، طاهر یحیی یەکەم نائیبی سەرەك وەزیران بوو. فوئاد عارف یەك بوو لە (٤)یان (٥) نائیب سەرەك وەزیران. [بەپرسیار کاك فوئاد گوتی چوار بووین]

ئەم ئاڵ وگــۆڕە کەمێك پێش پێنجی حوزەیرانی ١٩٦٧ بوو کە شەڕی سینای تێدا هەڵایسا.

لە زســتــانی نێوان ساڵی ١٩٦٦و ١٩٦٧ وەهــا ڕێك کەوت ساردایی نێوان د. عبــدالرحمان بزاز ومن نەمێنێت: لە موناسەبەدا مامۆستا هادی چاوشلی داوەتێکی نیوەڕۆژەی لە ئوتێلێکی قەشەنگ کرد کۆمەڵێك لە محامی و پیاوانی قانوون و وەزیفەی سەر بە قانوون تێیدا بەشــدار بوون لە نێوانیادا وزیری عدل و سەرۆکی دادگەی تەمیز بەغــدا، بوون. وەهــا ڕێك کەوت د. بزازو مامۆستا حسین جمیل و من کەوتینە پەرگێکی مێزەکەوە، حسین جمیل لە بەینداو من و بزاز بەرانبەر یەکتر. .

قســەیەکی ئەودەمەمم بەبیردا دێتەوە لەبارەی وەزعی عیراق کە گوتم: عیراق (دوگۆل)یکی گەرەکە دابینی‌بکات. حسین جمیل گوتی: د. بــزاز چ قصوری نەکرد لەو ماوەیەدا کە بەرپرس بوو. گوتم: چونکە (دوگۆل) نەبوو لەگەڵ هەموو دڵسۆزی‌و ڕوون بینی خۆی لێ‌نەگەڕان بەردەوام بێت.

د. بزاز ڕووی لە حسین جمیل کرد گوتی: گلەییم لە مامۆستا کامل چادرچی هەیە: من کە بووم بە سەرەك وەزیران چوومەلای، ئەو سەرێکی لێ‌نەدام و ئەحواڵیشی نەپرسیم. .

من ئەم گلەیی‌یەم کرد بە هەلی گلەیی‌کــردن لەخۆی، گوتم: جیلی ئێمەش گلەیی هەیە لە جیلی پێش خۆمان [مەبەستم ئەوبوو، تێشی گەییشت] کە لەگەڵمان بێ‌تەحەمولن. . لەمەوە دەرگەم کردەوە بۆ ئەوە کەبڵێم: من بابی ئێرادیتنم لە نیگــافــراوانی و باڵ قووڵی کەسێکی لەگــەڵی دەدوێم صەریح دەبم، چەنــدێکی قســە گل بدەمــەوە، بەلامــەوە دەبێتــە تۆمەت گرتن لە سینەفەراحی و هۆش کراوەیی ئەو کەســەی دەی‌دوێنم. . خولاســە زۆر بە ئەدەبــانــە تێم گەیاند کە ئەو بەیانی‌یەی لە وشەی (مرتَجل) قەڵس بوو لەوەدا حەقی نەبوو چونکە ئاشکرا بوو کە نیازم پاکە. . هەڵبەت بەرەمزو هێما مەبەستم دەربڕی نەك پەنجە بۆ ئەو ڕۆژە ڕاکێشم. .

لەو ڕۆژەوە بووینــە برادەری ڕاســتەکی بێ‌فێڵ. پاش چەنــد

رۆژێك هاته لام له مجلس الخدمة، گوتیشی بەتەما دەبم ناوناوە سەرم لێبدەیت.

شەوێکی رەمەزان چوومە لای میوانی زۆر بوون: له موناسەبەدا گوتم، ئەو تیژ رۆیی‌یەی برا ئەفەریقاییەکان دەی‌کەن لە بەرانبەر رۆژاواییەکان بێ‌لزوم و نابەرژەوەندیشە. دەفتەری کۆن خوێندنەوە چاکەی لێ پەیدا نابێت... د. بزاز گوتی تەجرەبەی تاڵیان لەگەڵ ئیستیعمار هۆی ئەو توندوتیژی‌یەیان بە سەهلی رابوردوو لەبیر ناکەن. گوتم (أبو عامر! هذا تفسير للموقف وليس تبريراً). گوتی. هەندێ جار تەفسیرو تەبریر یەك دەگرنەوە گوتم: لێرەدا یەك ناگرنەوە..

د. بزاز بێ‌ئەوەی بایی زەررەیەك قسەکانمی پێ ناخۆش بێت لەشێوەی سەلماندن وسکت بوو. دواتر لەسەر داخوازی خۆی کاتێك دەچوومە لای کەسی غەیری من لای نەبێت.

کەوتبوینە ساڵی ١٩٦٧، لە دانیشتنێکی مەحرەمانە باسی هەمە جۆرە بابەتمان دەکرد تا قسەمان گەیشتە سەرۆك (جمال) من گوتم (ئێستاش دەڵێمەوە) سەرۆك جمال لە لایەن (ألمعيّة)وە چ سیاسی‌یەکی نەگەیشتوێ: هەتابڵێی زیرەك، خطیب، بەرچاو، بەشەخسییەت.. بەڵام هەتابشڵێی بەخۆوەگلاوە، لەخۆدا رووچووە. ئەگەر هەندێکی (ذاتية)ی گۆرابایە بە (موضوعية) گەورەترین چاکەی بە وڵاتی خۆی‌و هەموو عەرەب دەگەیاند. لە میسالدا گوتم: مەلەوانان کە لە ئاو دەبرنەوە دوو جۆر پەرینەوەیان هەیە، ئەوی لەخۆرازی‌یە وەکوو کەسانێکی بە مەلە لە مانش دەپەرنەوە بە هێز ی بازوو یەکسەر و راستەوراست نوختەی بەرانبەریان لەو بەری رووبار دەگرنە بەرچاو و وەك ماسی بێ‌خوارەکەو پێچەکە ئاوەکە دەبرن. هەندێکی دیکە خۆدەدەنە ئاوەکەو وردە وردە مەودای لێ‌دەدزنەوە هەتا دەگەنە کەناری ئەوبەری بە ماوەیەك لە خوار نوختەی بەرانبەریانەوە. هەرچی سەرۆك جمالە بەرەو هەوراز مل لە لووزەوی ئاو دەنێت. بێ‌گومان خۆی‌و عەرەبیش لەگەڵی‌دا ماندوو دەبن. د. بزاز بێ ئەوەی دەنگ بکات قسەکانی راڵێبوون. زۆری نەبرد شەری سینای ١٩٦٧ بەو جۆرە هەڵایسا کە دیتمان.

ئەم جیهانەی سێیەمی خۆمان بە جۆرێکی شەیدایانە عاشقی نامومکین و ناواقیعیەتە. لە خوێندنی سەرەتایی‌یەوە مەشقی پەرگیری‌و تیژ رۆیی‌و نەسەلماندن و لاساری دەکەین هەر بۆیەشە تێکۆشەرانمان تێکرایان قارەمانی (تطرف ـ پەرگیری)ن و شەرم دەکەن واقیعی بن. حیسابی جەماوەر کە خەریکی کەسابەتە جودایە، هێندەش جودایە بەلای سری‌دا بۆتەوە.

شەری (٥)ی حوزێران بە تێشکانی عەرەب برایەوە. بێ ئەوەی عیراق یان هەر نەبێ گەلی عیراق هیچ گوناحێکی هەبوو بێ لەو تێشکانە، حکومەتمان بایدایەوە سەر ئەو خەڵقە، شتی لێ گران کردن و مەعاشی مەئموورانی داشکاند.

مانگێکیان سەیرم کرد بە هەمووی ٩٠ دینار لە مەعاشم داشکاوە. گوتم: خزمینە چەند وەتەنیم و ئاگاشم لەخۆم نی‌یە.

لەو سەروبەرەدا بوو ناجی طالب و رجب عبدالمجید، لە ماڵی ناجی، وێنەی داخوازی‌یەکیان نیشان دام کە لەلایەن ١٣ ئەفسەری گەورەوە ئیمزاکراوە دراوەتە سەرەك کۆمار، عبدالرحمان عارف [وەیا خەریك بوون بی‌دەنێ] یەکێك لەو داخوازییانە هەڵبژاردنێکی ئازاد بۆ دیارکردنی نوێنەرانی میللەت و کۆتایی هێنان بە حوکمی عەسکەری‌و (فترة الانتقال). ساڵی رابوردو کە ناجی طالب سەرەك وەزیران بوو، رجب عبدالمجید وەزیری داخلیەو جێگری سەرەك وەزیران، لە ژوورەکەی وەزیری داخلیە بە رجبم گوت: بۆچی نایەن تەجرەبەیەك بکەن کە هەرگیز لە عیراق نەکراوە؟ گوتی: وەك چی؟ گوتم هەڵبژاردنێکی بێ‌فێڵ.. گوتی لەوانەیە (مشبوهين يندسون...) گوتم: تاکە یەك کەس لەوانەی سەر بەزەمانی مەلیکن وەیا لەخۆیان گوماناوین ناوێرن سەر دەرکەن. گریمان تێکرای ئەو نائیبانە (خائن) بوون خۆتو وەك قورئان بەپێغەمبەر دەڵێ (لست عليهم بمسيطر) میللەت کە رای لە خائینان بوو، چاوی دەرێ، بالی موبارەك بێت.. ئێستا کە داخوازی‌یەکەیان نیشان دام پێم گوتنەوە، هەلی ئەم داخوازی‌یە لەدەست خۆتاندا بوو دۆراندتان. وەك لەبیرمە ئەو داخوازی‌یە لەلایەن أحمد حسن البكرو ناجی و رجب و حردان و اسماعیل مصطفی و عماش، هەتا سێزدە کەسەوە ئیمزاکرا بوو درایە سەرەك کۆمار. هەر ئەو جوولانەوەش بوو شکڵی تازەی وەرگرت و گۆرا بە شۆرشی حەڤدەی تەمووزی ١٩٦٨.

ساڵی ١٩٦٧ جارێ نوێ بوو وەفدێکی گەورە لە میسرەوە هاتە سەردانی حکومەتی عیراق بە دەمراستی‌ی زکریا يحيى الدين. داوەتێکی شەوانە لەسەر شەرەفی وەفدەکە کرا لەو شوێنەی ئێستیا پێی دەڵێن قصر السلام. لە ساڵۆنێك دانیشتبووین کە زکریا بە خۆی‌و هەڤاڵەکانیەوە هاتنە ژووری: لەبەر دەرگاوە کەوتە مصافحە لەگەڵ ئەو خەڵقە. أمین هویدی کە ئەوسا وەزیر بوو پێشتر سەفیر بوو لە عیراق شناسایی هەبوو لەگەڵ عیراقەکان، بە یەکتر ماچ کردن لەجیاتی تۆقە تێ‌هەڵکشی کە گەیشتە لام زۆر بە گەرمی‌و رەنگی

بەرز چاکـوچـۆنی کرد گوتم: هەتـا گەیشتی‌یە من ئەوەنـدەیان ماچ کردیت تامـیان لێ بـــڕیت. لەو سەفـــەرەیان دابـــوو سەرەك نووسەری (الجمهورية)ی قاهیرە سامی‌داود (وەك ناویم لەبیربێ) پێمی‌گرت کە دانیشتنە دوورو درێژەکەی ڕۆژی ١٩٦٦/٧/١٧ی بە تفصیل لە (جمهوريه) بڵاوکردۆتەوە. وەعدی دا نوسخەیەکم بۆ بنێرێ بەڵام هیچم نەگەیشتێ. دواتریش مەرگ پێچایەوە، بەداخەوە.

زکریا محیی‌الدین خزمی خالد محیی‌الدینی بەرەی چەپ و لە بنەماڵەیەکی کوردن بەڵام زکریا بەلای ناوەراستدا بوو، کەمێکیش لە دیوی جغـزی ڕاستدا: سەرۆك جەمال هێنای بە سەرەك وەزیران بەڵکوو تیژایی ناکۆکیەکەی میصر و ئەمەریکا کەم بیێتەوە، وەهاش چاوەنۆڕ دەکرا پارەدارانی ئەمەریکا هەلەکە بقۆزنەوەو هەندێ گرێی ئابـووریی میصر بکەنەوە کەچی مەرجی وەهایان دانا بۆ خستنە ئیشی پارەیان لە میصر گەلێك قورستر بوو لەچاو هی وڵاتی دیکە، بەمـەشدا تەجرەبەی زکریا محیی‌الدین بێ‌سوود پووچایەوە. هەر لەو ساڵانەدا جارێکیان لە ماڵی زەیدی ئەحمەد ئەفەندی کە باسی سیاســەتی جیهـــانی کرا گوتم ئەمـــەریکـا لە سیاسـەت پیادەیە [وشەیەکی قورسترم بەکارهێنا]. . هەندێك لە دانیشتووان گوتیان: چۆن وەهـا بە ڕەهـایی دەوڵەتێکی هەرە گەورەی جیهان بە نەفام حیساب دەکەیت؟ هەتا زۆرەی قسەم گەیشتەوە نەختێکی پێ‌چوو ئنجـا گوتم: بەر لە من (دین ئەچیسن) کۆنـە وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمـــەریکـــا لە کتێبی خطءشط سضش ششطضطضسشء دەڵێ: موشـکـیلەی ڕۆژاوا ئەوەیە، بەریتـانـیا شارەزایەو هێزی نی‌یە ئەمەریکاش هێزی هەیەو نەشارەزایە.

من لە وتـووێژدا ئەم لایەنـەم لەگـەڵ سەفیری ئەمەریکا مستر سترۆنگ دەربڕی‌بوو. مستر سترۆنگ خۆی زۆر قووڵ نەبوو بەڵام موستە شارەکەیان (لێك لاند) پیاوێکی زیرەك بوو دەی‌سەلماند کە خارجیەی ئەمـەریکـا بێ‌باکەو زۆر شت بە هەند هەڵ ناگرێ. . دەی‌گوت نازانم چۆن (اهتمام)ی خارجیە بۆ هەندێ پرسیاری سەر بە کورد ڕاکێشم لە عەرەبیەکـــەی وشـەی (اهتـمام)ی بۆنـەهـات دەی‌گوت (اتهام) و دەی‌زانی ڕاست نی‌یە بە ئینـگـلیزی گـوتی: how can I make them interested.. هەر تێ‌بینی ئەوتۆیشە لە کتێبەکەی (game of nations) دا بەدەر دەداتـەوە لە لووت بەرزیی بەرپرسە زلەکانی خارجیەی ئەمەریکا.

لەو دەربـڕینانەی من، بەهۆی تێ‌گەیشتوویی لێك لاندەوە، ئاکامێکی بچووك پەیدابوو کە ئەمەریکا پێنج زەمالەتی بە کوردی چەکدار دا بەڵام کەسی پێوە نەچوو بۆ خوێندن، ئەم حیکایەتانەش هی پێش حوزێرانی شەست و حەفتە چونکە دواتر پێوەندی سیاسی عیراق و ئەمەریکا بچڕا، میصریش پێوەندیی پێ‌کردەوە ئێمە هەر ماین هەتا هەشتاکان. .

ڕۆژی پێنجی حوزێرانی ١٩٦٧ لە کۆبـوونـەوەی مەجلیسی خدمەدا بووین کە دەنگوباسی ڕەوی ئیسرائیل بۆ سەر دەوڵەتەکانی جیرانـی خۆی، مصرو سوریەو أردن، بڵاو بۆوە: سەرۆکـی مەجلیس مشکور ابو طبیخ و ئەندامەکان د. ناجی معروف و فرید علی غالـب و من و ناجی عیسی الخلف هەر پێنجـمان یەك ڕای بووین لەوەدا کە سەرەنجامی ئەو دەوڵەتانە تاریکە چونکە هیچیان خۆیان تەیار نەکـردبـوو بۆ شەڕ مەگـەر لە لایەنی خوتبەو قسەی گەرم و گوڕەوە. . . لە ڕۆژان زووتـر دەرچـووم بەرەو نیقـابـەی محامیان. لای فایق سامرائی کە ئەوسا نەقیب بوو بەینێك دانیشتم محـامیەکـان پەیتـا پەیتـا خەبـەری تێك شکـانی فرۆکـەکـانی جوولـەکـەیان لە ڕادیوی قاهیرەوە وەردەگرت تا گەیاندیانە دەوری ٣٠٠ فرۆکـە. من ئەوەنـدەم گوت، ڕەنگـە ڕۆژی وەهـا کەوتبێ تەیارەیەك لە چەنـد لایەکـەوە بدیترێت و خەبـەری بە حکـومەت ڕابگەیەندرێت ئیتر یەك بە چوار و پێنج لەقەڵەم بدرێت دەنا سێ صەد فرۆکـە بەو چەنـد سەعـاتە ناخـسترێت. کەس ئامادە نەبوو قسـەکـەم بسـەلمێنێ. . دواتر زانیمان نەك ٣٠٠ بگرە ٣ فرۆکەش نەکەوتبوو چونکە لەپێش هەموو شتێك هەرچی فرۆکەی میصر بوو سووتێندرابوو ئیتر خۆ مامر نی‌یە بە دندووك شەڕ بکات). .

لە سەردانـەکـەی ساڵی ١٩٦٤ کە لە میصرمان کرد من مشیر عبـدالحکیم عامرم لە ماڵی سەرۆك جەمال دیت: ماڵم حەقە قسە خۆش و نوکتـەبازو پیاوی کەیف و بەزم بوو بەڵام هەرچی گیانی جەنگـاوەری هەبـوو تێیدا نەبـوو. مشیر عامر یەکێك بوو لە دوو قوماندانی هەرە هەرە تێ‌شکاوی مێژووی جەنگ کە دەشێ بڵێین لە دەمی جەنگـدا نەبـوونیان چاکـتربـوو بۆ سپـایان لەبـوونیان، ئەوی‌دیکـــەیان مارشـــاڵ بۆ دیێنـــیی قومـــانـــدانـــی مەیدانـی ئۆکرانیاوپۆڵۆنیای شەڕی نێوان ڕووسیاو ئەڵمانیا بوو لە ساڵی ١٩٤١. ئەوەی لەسینـا ڕوویدا و ناویان لێنـا (نکسـە) ئەگەر پێی‌گوترابا (هزيمه منكرة)ش هەر بە مەدح حیسـاب دەکرا چونکە هیچ ناوێك بە خۆیەوە ناگرێت بابی ئەو هەمووبێ‌فەریەی (قیادە) بکات. .

لە عیراق دەردە کوشندەکەی خۆفش هەڵێنان وەهای کرد سەرۆك کۆمـار لە بەرێ‌کـردنی سپـای یاریدەدەر بۆ شـەڕی حوزێران، بە گیانی یەکێکی بچێتـەراوە پۆڕ دنیای تێ‌گەیاند: کورینە ئەواهاتم

خۆتان بگرن . . له نیوەی ڕێگه سپای بێ سایەبانی هێزی ئاسمانی بوو به باشترین نیشانه بۆ فرۆکەی دوژمن .

پەحا که ساواین و به خۆمان نازانین . ئەری خوێنەری ئازیز، چ دەبوو بابایەکی سەرۆك کۆماری عەسکەری بابی هۆشی راوکەری سوێسکەوکەو خۆپارێزی کردبایه له گەردەن هەڵکێشان و نەرەنەرا!! له نووسینی (محمـد حسنین هیکل)م خوێندۆتەوه دەڵێ ئیسرائیل سێ ڕۆژ پێش هجوم هەرچی لاسلکیەکی هەی بوو رای گـرت و خەبـەری به نامـه دەنـارد بۆ ئەو شوێنی پێویستـه، نەکا شیفرەی لاسـلکیەکـەی بخـوێنـدرێتـەوه. ڕۆژی هجـومیش هەرچی لاسلکیەکی هەی بوو خستیەگـەڕ بۆ شێوانـدنی جیهازی بێ تەلی دوژمنەکانی . بێ گومان بەرپرسی خۆمانی به سێ ڕۆژ خامۆش بوون شەق دەبات: حەیف نی یه وەکوو عەلی شیش لەسەر شانۆچەتر لێ نەدات؟

له ماوەی دوو ساڵ و مانگێك که کەوته نێوان ١٩٦٥/٥/١٤ ، ڕۆژی هاتنم بۆ بەغدا، و ١٩٦٧/٦/٥ کۆمەڵێك ڕووداوی گرنگ ڕوویان دا: پێنـج وەزارەت کەوتـن: هی طاهـر یحیی و عارف عبـدالـرزاق و د. بـزاز ناجی طالب و عبـدالرحمان عارف. سەرۆکێکی کۆمـار بەهـەواوە سووتـا. شەڕ له کوردستان دەستی پێ کردەوه. ئاشتی پەیدابۆوه. عارف عبدالرزاق دوو جاران دەستی دایه ئینقیلاب و سەرنـەکـەوت. شەڕی سینا هەڵایساو له شەش ڕۆژانـدا ئاوەڕۆی چارەنـووسی ناوچـەکـەی گۆڕی. ئەنـدامانی مەکتـەبی سیاسی لەگـەڵ ئەو حیزبی یانـەی دۆستیان بوون هاتنه سنـووری دەسـەڵاتی حکومەت. . سێ دۆستی پژدەریم کۆچی دوایی یان کرد: بابـەکـراغـای سەلیماغـاو باپیراغـای بابـەکـری مەحموداغاو بایزی بابەکری سەلیماغا [ئەم ڕووداوانه بۆخۆم بەسۆز بوون. پێوەندی یان به سیاسەتەوه نەبوو].

بایزی بابـەکـری سەلیماغـا دووچاری قەدەرێك بوو کێشایەوه نەسـاغیەکی که لێی ڕزگار نەبوو. له ١٩٦٦ هێنرایه بەغدا. له خەستەخانه بوو لەگەڵ کاکه حسێنی خانەقا بەیەکەوه چووینەلای. بایزاغا گەیشتبوه قۆناغی هەرە دوایی ژیانی، لەهۆش دەچوو و به هۆش دەهاتەوه کەچی لەو گیانەلاوەدا مەردایەتی و جوامێری ی خۆی لەدەست نەدا که بەهۆش هاتەوه کاکه حسێنی دیت گوتی: کاکه حسێن، کاکه حەمەی پشتی هەموانیی شکاند. . تومەز لەوەتەی ١٩٦٣ که کاکـه حەمه له گەڕانەوەی بۆ ڕانیه تەیارەکەی کەوت و تێداچوو بایزاغا کاکه حسێنی نەدیتبوو سەرەخۆشی لێ بکات، ئیتر بەر له مردنی خۆی بەیەك دوو سەعات ئەو سەرە خۆشی یەی وەها قارەمانانەی لێ کرد. لەو تەرزە هەڵوەستەدا پیاوەتی دەردەکەوێت. هەرگیز نەم دیت ئەم بایزاغایه عەسەبی بێت. ئەوپەڕی دڵ گەرمی کردبێت ئەوه بوو دەی گوت: پیاوی چاك به باوەهاو وەها بکەین نەك وەك تۆ دەڵێی .

باپیری بابەکری مەحموود اغا دۆستێکی بێ فێڵ بوو، متمانەی پێ دەکراو زۆر شتیشی لەدەست دەهات: کوردی گوتەنی مرۆیەکی به زیـپـك بوو. دیوەخانێکی عومدەی هەبوو له دێی نوورەدین که پژدەری پێ هەڵ دەدرێتەوه تا ئەگەر گوتت (نوورەدینی) وەك ئەوەیه گوتبێتت پژدەری .

ساڵی ١٩٦٨ داهات. حکومەتیان زێده له هەموو وڵاتی عەرەب بەردەوام بوو لەسەر (تقشف)و له مەعاش برین. گرنەی عەجاییبان دادەگـرت له سیاسـەت و ئابووری، له نموونەدا دەڵێم مادەیەکی پەیینی دەسکرد هەبوو له ئەمەریکاوه دەهات کیلۆی به ٢,٥ دینار بوو که پێوەندیان به ئەمەریکاوه بری ئەو مادەیەشیان ئافەرۆز کرد بەڵام هەمان مادەی ئەمەریکاییان (وابزانم) له هۆڵەندە دەکڕیەوه به هەشت دینار کۆڵێکیش کەیفیان بەخۆمان دەهات:

دانیشتن چەنده خۆشه بەرانبەر چاوی لەیلایێ!!

خۆگێل کردنیش چەنده بەتامه لەسەر حیسابی خەزینەی دەوڵەت!!

لەیەکی شوباتی ١٩٦٨ کامل چادرچی کۆچی دوایی کرد.

لەیازدەی شوبات صمدی حاجی محمدی بەنناى برادەرم ئۆغری کرد.

لەو ساڵانـەدا به جەژنـه پیرۆزانـه لەگـەڵ احمد حسن البکر یەکدیمان بەسەر دەکردەوه هەرچەند یەکتریشمان نەدەدیت مەگەر له مونـاسـەبـەی پێشوازی کردن له مێوانان. . جارێکیان له سەفەردا بووم، که گەڕامـەوه گوتیان به تەلەفۆن داوای ئەدرەسمی کردبوو تاکـوو کارتی جەژنـانـەم بۆبنێرێ، کارتەکەشی گەیشت. ئەم پێوەنـدی یەی موجـامـەلـەی ڕووت له ڕۆژی ١٩٦٨/٧/٢٢ ڕەنگی دایەوه وەك که نەختێکی دیکه بۆت باس دەکەم.

بێ ئـەوەی کووچـەو بازار هەسـت بکـات، لەژێر پەردەوه هەوڵ وتـەقەڵای مەیلەو ئاشکراو بێ ووچانیش هەبوو بۆ گۆڕینی باری سیاسـی. ریوایەت زۆرن لەبـارەی جۆری هەوڵ دان بۆ بەلاوەنـانی حکـومـەتی سەرۆك عبـدالرحمان عارف. ژمارەیەکی بەرچـاو له زاپتـه گەورەکـان و ئەوانـەی له چواردەی تەمـووزەوه خەریکی سیاسەت بوون به نیازی جۆراجۆرەوه حەزیان له گۆڕین دەکـرد. تێیانـدا هەبوو دەیانەویست ئینقیلابێکی سپی بکرێت و

ژیانی ئاسایی (مەدەنی) بگەڕێتەوە، جەیشیش بە زاپتەکانیەوە بۆ ئوردووگایان بچنەوەو واز لە سیاسەت بهێنن بۆ ئەفەندییان. وەك بیستوومە لە کەسانێکی بەشداری ئەو هەوڵە بوون، گەلێك لایەن بەرواڵەت ئەو ئامانجەیان پەسەند کردوە بەڵام سیناریۆیەکی نهێنی تریان لەدەستدا بووە. هەتا ئێستا بەچاکی و ڕەوانی باسی ئەو گۆڕانە نەکراوە وەك بشزانم جاریٔ ماویەتی بۆ ئەو ڕۆژەی نهێنەکانی پلان و پرۆژەی لادانی (عارف) بخرێتە بەر ڕووناکاییەوە.

لە دۆستانی طاهیر یحیام بیستووە، عبدالرحمان عارف بیٔ ئاگا نەبووە لە کەین و بەینی ئەو هەوڵە تا ئەوەی طاهر یحیی خۆی ویستوویەتی بە جووڵەی بهێنیٔ بۆ بەرهەڵستی لێکێرەنی، ئەو نەیسەلماندوە. گۆیا کەسانێك بە طاهر یحیایان گوتبێت کە ئەو نابزوێت تۆ خۆت بەلاوەی بنیٔ ئەویش گوتبێتی سوێند خۆرم لەسەر هێندیٔ کە خیانەت لەوماڵە ناکەم ئەمانەم بیستووەو هیٔ دیکەش کە ناشیٔ لێی بدوێم، بەڵام دوارۆژ کە هێزوپێزی بەزانینی چەندوچۆنی گۆڕانەکەوە نەهێشت پەردەی لەسەر هەڵ دەگرێت.

## ملخص البحث

# رحلة حياتي

بقلم: مسعود محمد

هذه هي الحلقة الرابعة عشرة من سلسلة مذكرات الاستاذ مسعود محمد تبدأ بتولي السيد عبدالرحمن البزاز منصب رئيس الوزراء فكان صاحب المذكرات من جملة الحضور في ديوانه لتقديم التهاني بمناسبة تسنمه المنصب الجديد. ويروي مفارقة طريفة بهذه المناسبة فقد طلب منه مقابلته في اليوم الثاني للتباحث معه بالتفصيل فيما يتعلق بامور خاصة بالشمال. وحين حضر لمقابلته وجد الحفاوة والتكريم بشكل متميز إبتداءاً من نقطة السيطرة الى المكتب الخاص والسكرتير. وما أن بدء الحديث لبعض الوقت القليل حتى توقف رئيس الوزراء عن الكلام وقال له: متأسف. المقابلة انتهت. ويعزو الكاتب سبب هذا التحول المفاجيء من حال الى حال الى ضعف في التعبير جاء عفوياً وعن حسن نية ولسوء الحظ! فقد استخدم كلمة (ارتجال) بدلاً من (الاسراع). وهكذا أصبحت الكلمة غير المقصودة مانعاً لاكمال التباحث في مسائل سياسية مهمة في ذلك الوقت.

وفي ٢٩ حزيران ١٩٦٦ توصلت الحكومة مع وفد من الكورد الى اتفاق حول معالجة الأوضاع الاستثنائية واصدرت بياناً تضمن (١٢) مادة، كانت صالحة برأي كاتب المذكرات في ذلك الوقت..

وعند تقييمه للبيان ولحكومة البزاز لم يمنع نفسه من ابداء الرضى في حديث له مع مندوبي صحف مصر: المصور وروز اليوسف والجمهورية وبيان قناعته بان البزاز لوكان مطلق اليد لأرجع العراق الى حالته الطبيعية. لكن العسكريين لم يرضوا عنه فقدم استقالته من الوزارة.

وفي سنة ١٩٦٦ عاد مؤيدوا جماعة المكتب السياسي للحزب الديمقراطي الكردستاني من إيران الى بغداد حيث إلتجأوا إليها خوفاً من بطش المسلحين الكورد. وكان رأيه في الخلاف الحاد بين هذه الجماعة وجماعة المسلحين وتفاقم الوضع بينهما يتلخص في وجوب اتخاذ موقف التحييد بالنسبة للجماعة الاولى حتى لو كانت الشرعية الحزبية تعود لها.

وفي هذه السنة عين عضواً في مجلس الخدمة العامة ويذكر اعمال المجلس وسير اموره فيما يتعلق بشؤون الموظفين والتعينات والترفيعات وغيرها.

ويتطرق الى الوضع السياسي في العراق سنة ١٩٦٧ ويتحدث عن نكسة حزيران المريرة فيعود بالذاكرة الى سنة ١٩٦٤عندما قابل المشير عبدالحكيم عامر في منزل الرئيس جمال عبدالناصر وانطباعه الشخصي عنه: انه كان فكهاً ورجل عشرة ومرح يخلو من كل أثر للمقاتل. فكان أحد قائدين هزما في الحرب الحديثة هزيمة منكرة والآخر هو المارشال بوديني قائد جبهة اكرانيا وبولونيا في الحرب بين روسيا والمانيا سنة ١٩٤١

ويتطرق الى الاوضاع السياسية بعد وفاة عبدالسلام عارف.. وكيف انها كانت تمهيداً لانبثاق ثورة ١٧ ـ ٣٠ تموز عام ١٩٦٨.

# ژمارە وەك
# بەشێكی سەربەخۆی ئاخاوتن وجۆرەكانی
# ژمارە لە زمانی كوردی دا

د. عبدالرحمن حاجی معروف

بەشە ئاخاوتنی ژمارە ئەو كۆمەڵە وشەیەیە كە واتەركی تەجریدی ناوی ژمارە (دوو+ سێ = پێنج) دەگەیەنێ، یان چەندێتی بەسەریەكەوە (هەشت كراس) كەیاخود كەرتێكی شتی دیاریكراوی هاوڕەگەز (سێ یەكی گەنمەكە) نیشان دەدات. یان پلەی شتێك لە ڕیزدا (نهۆمی سێیەم) دیاری دەكا.

ژمارە وەك بەشە ئاخاوتنێك خاوەنی خاسیەتی واتای ژمارەیە بەگشتی، كە وەك دیاردەیەكی تایبەتی ـ واتە وەك ژمارە بەتەنیا یان ژمارەی شتێك... واتای گشتیی ئەم بەشە ئاخاوتنە لە خاسیەتی ڕێزمانیدا ڕەنگە دەداتەوە. وێڕای ئەوە ژمارە لە ڕووی پێكهاتنەوە خاوەنی تایبەتێتییەكی دیاریكراوی وەهایە، كە لە بەشە ئاخاوتنەكانی دی جیادەكاتەوە.

لە باسی ژمارەدا پێویست دەكا جارێكی دیش بەتایبەتی ئەوە دووپات بكرێتەوە، كە ئەوەی لە دیاری كردنی گرووپی وشەدا گرنگە و لەسەر بنەمای دابەش دەكرێن بەسەر بەشە ئاخاوتنی جیاوازدا، ئەوەیە كە پێویستە پێوەندی هاوخاسیەتی ڕێزمانی لە نێوان وشەكانی هەر گرووپێكدا هەبێ. وا پێویست دەكا گرنگییەكی تەواو بەم لایەنە بدرێ لێرەدا پەنجە بۆ ئەوە ڕادەكێشین، كە هەندێ جار ئەم لایەنە لەبەرچاو ناگرن و تەنیا لە ڕووی خاسیەتی واتاوە بەشە ئاخاوتنی ژمارە جیادەكەنەوە و وەك وشەیێك كە واتای ژمارە بدات پلەی ژمارە ڕابگەیەنێ، دیاری دەكەن. بەوپێیە هەندێ وشە كە واتای ژمارەیان تێدایە، دەكەونە ئەم بەشە ئاخاوتنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو جۆرە وشانە تەنیا واتای ژمارەیان تێدایە، دەنا ژمارە نین. بەوێنە ئەگەر تەماشای وشەكانی «حەفتە»، «سەدە»... و «حەفت»، «سەد»... بكەین، دەبینین هەرچەندە لە هەردوو دەستەدا وەك یەك مانای ژمارە هەیە، بەڵام لە ڕووی خاسیەتی ڕێزمانییەوە جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە و سەر بە بەشە ئاخاوتنی جیاوازان.

لە ڕاستیدا لە باری خاسیەتی ڕێزمانییەوە وشەی «حەفتە»و هەروەها «سەدە»ش جیاوازییان لەگەڵ هیچ ناوێكی ئاساییدا نییە. چۆن دەوترێ «چوارپیاو» هەربەو چەشنەش دەشی بوترێ «چوار حەفتە»، «چوار سەدە»... چۆن دەوترێ «پیاوێك»، پیاوەكان...» بە هەمان جۆر دەشوترێ «حەفتەیەك، حەفتەكان... سەدەیێك، سەدەكان...»... هتد.

ئەگەرچی لەباری چەندێتییەوە «حەفتە» لەگەڵ «حەفت»و «سەدە» لەگەڵ «سەد» وەك یەكن، بەڵام «حەفت»و «سەد» ژمارەن و «حەفتە»و «سەدە»ش ناون و لە ژمارەوە بوونەتە ناو.

بۆپتر ڕوونكردنەوە، ئەوەش دەڵێین، كە ژمارە لە باری واتاوە بریتییە یە لە تەجریدی ناوی ژمارە بێ ئاڵۆزبوونی واتا. بەوێنە وشەی «چل»و «چلە» چەندێتی ڕادەگەیەنن، بەڵام تەنیا وشەی «چل» دەكەوێتە نێو بەشە ئاخاوتنی ژمارەوە. هەرچی «چلە»یە سەر بە بەشە ئاخاوتنی ناوە. وشەی «چل» ژمارەیە، چونكە واتای تەجریدی ژمارەی تێدایە. ئەم وشەیە یەك مانای هەیە و ماناكەی لە چوارچێوەی نیشاندانی ژمارەیێك لە ژماردنی دانەی دیاری كراودایە. وشەی «چلە»، ئەگەرچی دیسان واتای چەندێتی هەڵ گرتووە، بەڵام مانای لە سنوورێكی بەرین و فراواندا پێوەندی بە زۆر شتەوە هەیە: ١) بە ژماردنی «چل» ەوە؛ ٢) تێپەڕبوونی چل ڕۆژ بە سەر لە دایك بوونی منداڵێكدا یان مردنی یەكێكدا یان هێنانی بووكێكدا؛ ٣) چل ڕۆژ لە ناوەڕاستی هاوین وزستاندا... هتد. ڕاگەیاندنی واتای چەندێتی لە وشەی «چلە»دا بێبەشە لەو خاسیەتی تەجریدەی لە ژمارەدا هەیە.

ژمارە كاتێ لەگەڵ ئەو جۆرە ناوانەدا دێ، كە لە ژمارەوە وەرگیراوە، دەبێتە دیارخەری وەك: چوار حەفتە ـ حەفتەی چوارەم؛ حەوت سەدە ـ سەدەی حەوتەم...

له زۆرزمان دا کاتێ تەماشای ئەوشانە دەکرێ کە سەر بە ژمارەن، پتر وا باوە بەسەر ژمارەی بنجی (چوار، شەش، بیست. . .)وژمارەی پلەیی (چوارەم، شەشەم، بیستەم. . .)دا دابەشی دەکەن، کە خاوەنی هەندێ خاسیەتی جیاوازن.

له زمانی ئینگلیزیدا ئەوەی پێوەندی بە ژمارەی پلەیی یەوە هەیە، ئەوەیە بەئاسانی هەست دەکرێ خاوەنی هەمان خاسیەتی ڕێزمانی یانەیە، کە ئاوەڵناو هەیەتی وهیچ تایبەتێتی یەکی ئەوتۆ نی یە لە ئاوەڵناوی جیا

بکاتەوە بێتە هۆی ئەوەی بەبەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆدابنرێ. وێرای ئەوە، بنەمای وا نی یە بێتە بەڵگەی دانانی لە بەشە ئاخاوتنی ژمارەدا[1]. . . «ژمارەی پلەیی جیاوازی لەگەڵ ئاوەڵناوی ئاساییدا تەنیا لە ڕووی واتاوەیە، ئەویش ئەوەیە کە ژمارەی پلەیی تەرتیبی شت لە ڕیزدا دیاری دەکا. ژمارە پلەی تایبەتێتی یەکی ڕێزمانیشی نی یە، کە ئەومانایەی پێ دەربڕێ. وەك هەموو ئاوەڵناوێکیش حاڵەتی کۆ دۆخیان نی یە. . .

ڕاستە لەو تایبەتێتی یە ئاشکرایەی ئاوەڵناو، واتە ـ پلەی بەراورد و پلەی ـ بێ بەرە، بەڵام ئەمە پێوەندی بە تایبەتێتی واتای ئەو وشانەوە هەیە و ئەمە ڕێگە لەوە ناگرێ کە لەڕیزی ئاوەڵناو دابنرێ وەك ئاشکراشە، وەنەبێ هەموو ئاوەڵناوێك پلەی بەراورد وپلەی باڵای هەبێ. خاسیەتی واتای لێکسیکی ژمارەی پلەیی، لەوەشدایە کە دەبێتە بەشە ئاخاوتنی دی»[2]

ئەگەر لە زمانی ئینگلیزیدا بتوانین ئەو چەند وێکچوونە ڕێزمانی یە کەمەی نێوان ژمارەی پلەیی و ئاوەڵناو بە بەڵگەی دانانی ژمارەی پلەیی بە ئاوەڵناو وەربگرین، ئەوە بە هیچ چەشنێك ناتوانین ئەو ڕایەی هەندێ نووسەرانی دی پەسەندبکەین، کە ژمارەی بنجیش بە ئاوەڵناو لە قەڵەم دەدەن. . . ئەگەر لە زمانی ئینگلیزیدا لە نێوان ژمارەی پلەیی و ئاوەڵناودا کەمێ وێکچوونی ڕێزمانی هەبێ، ئەوە لە زمانی کوردیدا ئەو وێکچوونە زۆر کەمترە، کەچی هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لەسەر پەیڕەوی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی چاولێکەریی ئینگلیزی گشت جۆرەکانی ژمارەیان لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناو داناوە[3]. . . وێرای ئەوە برێکیش لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لەبەر ڕووناکیی ڕێزمانی عەرەبی ژمارەیان بە ناو لەقەڵەم داوە[4]. . . وا دەردەکەوێ هیچ یەکێك لەو دوو دەستەیە خاوەنی لێکۆڵینەوەی سەربەخۆی خۆیان نین و تایبەتێتی زمانی کوردییان نەخوێندووەتەوە.

له زمانی کوردیدا گرنگی ژمارە لە تایبەتێتی پێکهاتنی دایە. بەوێنە بۆ گەیاندنی واتای ژمارەی شتێك ـ واتە کاتێك ژمارە لەگەڵ ناودا دێت: (پێنج سێو. . .) وا باوە کە هەریەك ڕێگە دەگیرێ، ئەویش ڕێگەی لێکدانە. لە حاڵەتی (پێنج سێو. . .)دا، مەرج وایە ضەربی پێنج بکرێ: سێو× ٥.

بۆ دەربرینی ژمارەکانی زمانی کوردی ڕێگای هەمەجۆر هەیە.

ڕێگەی هەرە باو (کۆکردنەوە) و (لێکدان)ە.

ڕێبازی، کۆکردنەوە:

له ژمارە (١١)ەوە تا (١٩)، بەوێنە ژمارەی (چواردە) بەپێی پێکهاتنی واتایی بریتی یە لە (چوار+ دە).

ئەم ڕێگەیە هەروەها بۆگەلێك لەوژمارانەش بەکاردێنرێ، کە لە سەروو (بیست)ەوەن: (بیست و دوو) ـ واتە (٢٠ + ٢)؛ (چەل و شەش) ـ واتە (٤٠ + ٦). . .

لەگەڵ ئەوەش دا، پێویستە سەرنج بۆئەوەش ڕابکێشین، ڕێگەی کۆکردنەوەی ژمارەکانی وەك (بیست و دوو)؛ (چل و شەش). . . هەندێ جیاوازی لەگەڵ ڕێگەی کۆکردنەوەی ژمارەکانی وەك (چواردە)دا هەیە. ژمارەی وەك (بیست و دوو)؛ (چل و شەش). . . بەیاریدەی (و)ەوە پێکەوە بەستراون. چۆن دەشێ وابیربکرێتەوە، کە وشەی لێکدراون لە دوو ژمارە پێکهاتوون و بە یاریدەی ناوبەندی (و)پێکەوە بەستراوان، هەروەها دەلوێ وا لێك بدرێتەوە، کە وشەی لێکدراو نەبن و دووەوشە بن و (و)ی پێوەندی لە نێوانیان دا هەبێ. هەرچی بۆژمارەکانی جۆری (چواردە)یە، چۆن دەشێ وا بیربکرێتەوە کە وشەیەکی لێکدراوەو لە دووژمارە بێ یاریدە پێکهاتبێ، هەروەها دەلوێ بوترێ کە بەشی دووەمی ئەووشە ناسادەیە شتێکە لە نێوان وشەو پاشگردا.

بەڵام خاسیەتی ژمارەی وەك (بیست و دوو) وەك وشەی کۆکراوە لە ڕووی پێکهاتنی واتاوە جیهاوازی لەگەڵ ناوی کۆکراوەدا زۆرە. ئەو جیاوازییەش لەوەدایە، کە وا ژمارەی وەك (بیست و دوو) لەسەر بناغەی کۆکردنەوە پێك دێ، بەڵام پێکهاتنی ناوی کۆکراوە لەسەر بناغەی کۆکردنەوە بە ئەنجام ناگەیەنرێ. بەوێنە (کۆبوونەوەی خێزان)لەباری واتاوە، ئەوە ناگەیەنێ کە لە (کۆبوونەوە + خێزان) سازبووبێ.

* ڕێبازی لێکدان:

هەرچی ژمارەی وەك (دوو سەد)؛ (چوار هەزار) ٥٠٠٠ لە ڕێگای لێکدانەوە سازبووە ـ واتە: (٢ × ١٠٠)؛ (٤ × ١٠٠٠). . . لێرەشدا ئەگەر لەگەڵ لێکدانی ناودا بەراوردی بکەین، هەندێ جیاوازی بەدی دەکەین. . . .

بەو چەشنە بۆگەیاندنی واتای ژمارە لە سیستەمی بەشە ئاخاوتنی ژمارەدا ڕێگەی ئەوتۆ بەکاردێنرێ، کە لە سیستەمی بەشە ئاخاوتنی ناودا بەکارناهێنرێ ئەم تایبەتێتی یانەش خاسیەتی ژمارە دیاری دەکەن و وەك بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ جیای دەکەنەوەو نیشانی ئەوە دەدەن، کە ڕاست نی یە بخرێنە بەشە ئاخاوتنی ناوەوە.

وەك پێشتر وتمان هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی، بەپێی پەیڕەوی کردنی نووسەرانی ڕێزمانی ئینگلیزی ژمارەیان بە ئاوەڵناو داناوە. ڕاستە لە زمانی ئینگلیزیدا لە یەکەم سەرنجدا ڕەنگە وا بێتە

پێش چاو، کە هاتنی ژمارە لەگەڵ ناودا، وەك «two boys - دوو کوڕ» جیاوازی، لەگەڵ هاتنی ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا «little house - کوڕی بچووك» نەبێ... بەڵام ئەگەر قووڵ لەو مەسەلەیە وردبینەوە، بە ئاسانی هەست بەوە دەکەین، کە لە نێوان ژمارە و ئاوەڵناودا جیاوازی زۆرە. ئەو جیاوازییەش بە ڕوونی لە پێوەندیی واتای پارچەکانی ژمارەی پێکەوەبەستراو وپێوەندیی واتای پارچەکانی ئاوەڵناوی پێکەوە بەستراو بەدەردەکەوێ[٥]. وەك پێشتر وتمان بۆ پێکهێنانی ئەو جۆرە ژمارانە، دوو ڕێگەی (کۆکردنەوە)و (لێکدان) باون. بەڵام هەرچی پێوەندیی واتای پارچەکانی ئاوەڵناوی پێکەوە بەستراوە، لە سەر بناغەی ئەو دوو ڕێگەیە سازناکرێت. بەوێنە، کە دەوترێ (شینی کاڵ) هیچ ئەوە ناگەیەنێ کە لە (شین + کاڵ) یاخود (شین × کاڵ) پێکهاتبێ.

هەروەها جیاوازی لە بوونی ژمارە بە ناو وبوونی ئاوەڵناو بە ناویشدا زۆرە. ئەمانە و هەندێ لایەنی دی هەن، کە بڵێین، کە برێ لە نووسەرانی ڕێزمانی ئینگلیزی ڕاست نین، کە ژمارەیان خستووەتە ناو بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناوەوە. هەرچی هەندێ نووسەری ڕێزمانی کوردییشە، کە لاسایی زمانی ئنگلیزی کردووەتەوە، ئەگەر گوێ نەدەینە دەرك نەکردنی بەو جیاوازییانەی لە زمانی ئینگلیزی، و زۆر زمانی دیدا لە نێوان ژمارە و ئاوەڵناودا هەیە، وکە بەشێکیمان لە سەرەوە باس کرد، خۆ دەبوو هەست بەوە بکا کە لە ڕستەی کوردیدا ئاوەڵناو بە دوا ناودا دێت: (ژنی جوان)...، بەڵام هەرچی ژمارەیە دەکەوێتە پێش ناو: (چوار ژن)...

لە ڕووی ڕستە سازییشەوە ژمارە بە شێوەیێکی سەربەخۆ خۆی دەنوێنێ... ڕاستە وەك ئاوەڵناو بە زۆری لەگەڵ ناودا دێت و ئەم پێکەوە هاتنەش، پێکەوە هاتنی ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا دێنێتەوە یاد (پێنج گوڵ؛ (گوڵی سوور)...، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لەو جۆرە بەکارهێنانەدا ناشێ ژمارە ناوبنرێ دیارخەر، بەڵام هەرچی ئاوەڵناوەکەیە، لەبەر ئەوەی خاسیەتی شتێك دەردەخا دەبێ بە دیارخەر. لە دەستەواژەی (پێنج گوڵ)، ژمارە دەورێکی تایبەتی دەبینێ وخاسیە شتێك ئاشکرا ناکا، بەڵکو تەنیا ئیشارت بۆ چەند شتێك دەکا.
ژمارە لە ڕووی وشەسازییەوە خاوەنی ئەم خاسیەتانەیە:

١ـ تەنیا لەگەڵ ناودادێ وپارچەکانی ئەو جۆرە دەستەواژانەش بەپێی دەستووری ڕستەسازی دابەش ناکرێن وسەرپاکیان بەسەر یەکەوە دەبنە ئەندامێکی ڕستە، وەك: «دوو ڕۆژ؛ چوار کچ؛ شەش مەڕ...»
٢ ـ ناتوانێ ئاوەڵناو دیاری بکا[٦].

مەفهوومی ژمارە لە ئەنجامی مێژوویێکی درێژی پێشکەوتنی ئادەمیزادەوە پەیدابووە. ف. ئینگلس دەڵێ: «مەفهوومی ژمارە وتەنەکان لە شوێنێکی نادیارەوە وەرنەگیراوە، بەڵکو لە واقیعی دەوروبەرەوە هاتووە»... «دە پەنجە، کە مرۆڤ لەسەری فێری ژماردن دەبوو ـ واتە یەکەم عەمەلییەی حیسابی دەکرد»[٧]... لە کاتی ژماردندا توانستی لادان لە شتی دیاری کراو «بریتییە لە ئەنجامی پشت بەستنی دوور و درێژ بە تەجرووبەی پێشکەوتنی مێژوویدا». بۆ نموونە، وشەی «پێنج، دە، سەد...» دەشێ بۆ هەر شتێك بەکاربهێنرێ کە بژمێردرێن. بەوێنە: پێنج پیاو، پێنج مریشك، پێنج بەرد، پێنج شەقام، پێنج باوەڕ... هتد ئەمەش ئەنجامی گشتی بوون و تەجرید بوونە[٨]

نووسەرانی ڕێزمانی کوردی وزمانانی دی، کاتێ لە ڕووی تایبەتێتی واتاوچۆنێتی بەکارهێنانەوە ژمارەدابەش دەکەن بەسەر جۆری جیاوازدا، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان دابەش کردنەکانیاندا بەدی دەکرێ. بەوێنە هەندێ نووسەر ژمارەی کەرتی (کەسری) بە جۆرێك لە ژمارە دانانێن؛ برێك ژمارەی پلەیی (تەرتیبی، ڕوتبەیی) ناخەنە نێو بەشە ئاخاوتنی ژمارەوە... بەپێچەوانە شەوە نووسەری وا هەیە تەنانەت ئاوەڵکرداری (یەك یەك، دوو دوو، سێ سێ...) و وشەی چەندێتی نادیاری وەك (زۆر، کەم...) یش بە چەشنەکانی ژمارە لە قەڵەم دەدەن.
لە ڕێگەی هەڵسەنگاندنی ئەو کارانەی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی (ژمارە)دا کراون و بەپێی بۆچوون ولێکدانەوە وتۆژینەوەی تایبەتیی خۆمان و بەهۆی کەڵك وەرگرن لە تیۆریی زمانناسییەوە، گەیشتوونیەتە ئەو ئەنجامەی لە زمانی کوردیدا سێ جۆر ژمارە دیاری بکەین.
١ـ ژمارەی بنجی.
٢ـ ژمارەی پلەیی.
٣ـ ژمارەی کەرتی.

# العدد قسما من أقسام الكلام المستقلة، وأنواعه في اللغة الكردية

د. عبدالرحمن معروف

قسم اللغة الكردية، كلية التربية بجامعة بغداد

عند الحديث عن العدد ينبغي أن نتذكر ان المهم في تحديد اصناف الكلمة والذي نقسمه على اساسه على اقسام الكلام المختلفة، هو وجوب وجود رابطة الاشتراك في الخصائص النحوية بين كلمات اي صنف. قد يتحتم اعطاء اهمية كاملة الى هذا الجانب. وهنا يجب الاشارة الى انه قد لايؤخذ هذا الجانب بنظر الاعتبار وانما يجري تمييز صنف العدد من الكلام لخواصه المعنوية فقط ويحدد ككلمة تعطي معنى العدد او مرتبة حسابية لاغيرها. وعلى هذا الاساس فان بعض الكلمات التي تحتوي على مدلول العدد، تدخل ضمن اطار هذا الصنف من الكلام، ولكن هذا النوع من الكلام، في الحقيقة، انما تحتوي على معنى العدد حسب، وهي ليست عددا في الواقع ،وعلى سبيل المثال فاذا نظرنا الى كلمات (الاسبوع)و (القرن)و(سبعة)و (مئة) رأينا ان المدلول العددي يتوفر في الصنفين على مستوى واحد، الا ان هناك فرق بينها من حيث الخصائص النحوية و ينتمي كل منها الى صنف خاص من اصناف الكلام.

في الحقيقة ليس هناك اي فارق من حيث الخصائص النحوية بين كلمتي (اسبوع) و (قرن) واي اسم اعتيادي اخر، فكما يصح قول (اربعة رجال) يصح كذلك قول (أربعة اسابيع) أو (اربعة قرون).. وكما يصح قول (رجل) و (رجال) يصح كذلك قول (اسبوع) و (أسابيع) و (قرن) و (قرون).. الخ..

ولئن كان كل من (اسبوع) و (سبعة) و، (قرن) و (مئة) متماثلين من حيث المدلول العددي، الا ان (سبعة) و (مئة) اسما عدد و (اسبوع) و (مئة) اسما جنس وتحولا من اسمي عدد الى اسمي جنس.

عندما يقسم كتاب النحو الكردي ونحو اللغات الاخرى اسم العدد على اصناف عديدة من حيث الخصائص المعنوية وكيفية الاستعمال ، نلاحظ اختلافات كثيرة في التقسيمات. وعلى سبيل المثال هناك كتاب لايحسبون الاعداد الكسرية ضربا من أسماء العدد، وهناك اخرون لايصنفون الاعداد الرتبويه ضربا منها، وعلى العكس فهناك من يعتبرون ظروف (احاد) و (مثنى) و (ثلاث) و (رباع) والكلمات الدالة على الكمية مثل (قليل) و (كثير) ضربا من ظروب أسماء العدد[1]

وعن طريق تقييم الاعمال التي الفت في ميدان دراسة اسماء العدد، ووفق تحليلاتنا وارائنا الخاصة ومن خلال الاستفادة من نظريات علم اللغة، فقد توصلنا الى نتيجة تقول أن بالامكان تحديد ثلاثة انواع من أسماء العدد في اللغة الكردية وهي:

١- العدد الاصلي
٢- العدد الرتبوي (نسبة الى رتبة)
٣- العدد الكسري

وبعد هذا درس الكاتب بالتفصيل الاصناف الثلاثة لاسماء العدد وبذل جهدا لتحقيق اصولها وكيفية تكونها واستعمالها ومهامها وخصائصها المتنوعة، وقارن قدر ما اسعفته الامكانيات المتوفرة بين شكل وصيغة كل اسم عدد مع نظائره في اللغات القديمة والحديثة التي ترجع مع اللغة الكردية الى أصل واحد، وقد تمكن من استنساخ العديد من النتائج.

(١) المقصود بهذه النماذج نظائرها في اللغة الكردية.

# ڕێبازی مێژووی زمانی کوردی

محمد أمین هەورامانی

## پێشەکی:

دەربارەی سەرگوزەشتەی باو باپیری دێرینی کورد (میدیەکان)ەوەو کەلەپوری سامانی رۆشنبیریی دێرینیانەوە، هیچ جۆرە سەرچاوەیەکی راستەوخۆو یەکسەرە ، کەوەك ؛ هەڵکەندراوو نەقش و نقووشی نووسراوی کۆنی سەردەمی خۆیانەوەو بە ناویانەوە بێ ، تائێستە بەردەست نەکەوتووە ، یان نە دۆزراوەتەوە، یان ئەگەریش دۆزرابێتەوە دەستی خاوەنی دڵسۆزی خۆی نەکەوتووە!

ئەگەر دەست یەکێکی بێگانەو نادۆستیش کەوتبێ ، ناتوانێ پەردەی شاراوەیی لەسەر لابدات چونکە هەرگیز نایەوێ چاوی بە رۆشنایی زیندەگی بپشکوتێ نەوەك بەناووهەوای خۆشەویستی ی خۆشەویستانی پاراو بێ ! !

ئەوزانیاریانەی ، کە لەم رووەوە ، دەستمان بکەوێ‌و زۆر نەبێ کەم توانای رێگا رۆشنکەرەوەیان بۆمان هەبێ ، ئەگەرچی زۆر کەم و ناتەواویش بن ، مەگەر لە قورگی بێگانەو نا دۆستانی کوردەوە بیا نهەینینە دەرەوە .

زانیاری بەوجۆرە، خۆی لە خۆی دا، بەهایەکی بێ‌هاوتاو سەنگێکی یەکجار مەزنی بۆ ئێمە هەیە، ئەگەر زانیمان بیرمان بەرەو دێرینی داپۆشراومان دەگەڕێتەوەو بەو هۆیەوە ، دێنە سەر ئەو بریارەی کە جەوهەرەکەی دەمانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی کە ئەو سەرچاوە بێگانەو نادۆستانە کە ناوبەناوو لێرەولەوێ. شتێکی کوردی‌یان بە دەستەوە دابێ ، هەر لەبەر ئەوە بووە کە بەرگەی بەربەست کردنی هورۆژمی لافاوی زانیاریی کوردی‌یان نەکردووەو بۆیە ؛ سەرگوزەشتەو بەسەرهات و سامانی رۆشنبیریی راستەوراست و دەست هەڵبەستی خۆیان ، بە مەبەستی بە تیرێ دوو نیشان شکاندن، شتێکی زور کەم بەوێنەی مشتێ لە خەرواری - یان، خستووەتە روو!

بە هۆی لێ‌ورد بوونەوەو تۆێژ هەڵدانەوەو بەراورد کردنەوە، بۆ گەیشتن بە راستی‌یەك ، کە باوەڕو بروا دانی خۆیان پیای‌دا بنێن و دوور بکەوینەوە لە یەکسەرە لارەملی بوون ، بۆهەر بیروڕایەك ، کە لەورووەوە بڵاو کراوەتەوە، وا هەندێ لەوزانیاریانە ، کە لە هەندێ سەرچاوەی زۆر نزیك دا هاتوون، دەخەینە بەر زاری دەمەتەقێ خوێنەر ، بۆدڵنیابوون بۆ لەوەی کە ئەمە وێنەی یەکێکە لە دەیان و بشگرە لە سەدان! .

لە سەرچاوەی جۆری جۆری پارسی‌دا ، وامان بۆدەردەکەوێ ، کە نەتەوەیەکی ئاری نەژاد بە ناوی میدیەکانەوە ، لە نیشتمانی میدیا(کوردستان)دا نیشتەجێ بوون و لە کاتێك و سەردەمێك دا، بۆ ماوەی چەند سەدەیەکیش خاوەنی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەکی یەکجار فراوان بوون. بە شێوەیەك، کە جگە لە سەرپاکی ناوچەکانی کوردستانی ئەمرۆ ، سەرپاکی ناوچەکانی دیکەی ئێرانی‌یان بە دەستەوە بووەو ناوچەی پارسیش یەکێ لەو ناوچە ستراپنشینانەی میدیەکان بووە، لە چەرخ و دەمێکیش دا ، وڵاتی ئاشووریەکانیش دەکەوێتە ژێر دەستەلاتیانەوە (نەینەوا)ش دەبێ بە یەکێ لە ستراپنشینەکانی میدیا.

لە لایەکی دیکەوە ، لە پەراوێزو داوێنی سەرچاوە پارسی‌یەکان دا ، ئەوەمان بەرچاو دەکەوێ، کە میدیەکان، جگە لەوەی کە خاوەنی زمانی تایبەتی خۆیانیان بوون، کە زمانی میدی بووە، بە نووسینی میخی نووسراویان هەبووە. هەروەها خاوەنی یاسای کشت واکاڵی‌و ئەندازیاریی‌و یاسا ناسی‌و کارگێریی‌و سامانی رۆشنبیریی دینی‌و رۆشنبیریی ئەدەبی ی خویان بوون و لەورووەشەوە ، دان بەوەدا دەنێن و پێشی لەسەر دادەگرن ، کە وڵاتی میدیا مەڵبەندیی خوێندەواریی دینی بووەو لەوێ‌وە، بە سەدان پیری دینی هەموو ساڵێ بەملاو بەولای وڵات دا ، بۆ ناوچە جۆر بە جۆرەکان نێردراون ! !

کاتێ ، کە ئەو سەرچاوانە دێنە سەر باسی کەلەپووری دینی‌وهی رۆشنبیریی میدیەکان ، وای لە قەڵەم دەدەن ، کە میدیەکان خاوەنی سامان و کەلەپوریکی ئەدەبی بوون و چەندان نووسراویان لەورووەوە هەبووەو ئەدەبی گەلیی لە فراوان کردنی ئیلهامی شاعیرەکان و نووسەرەکانیان دا دەورێکی باڵای هەبووە لەگەڵ ئەوەش دا، وامان پێ دەسەلمێنن، یان نیازیان وەهایە پێمان بسەلمێنن، کە هەرچی ئەو جۆرە کەلەپوررو سامانە وێژەیی‌یە ئەدەبیانە هەبووە، سەرپاکی لەلایەن گریکەکانەوە چەپاو کراوەو ئەوەی بەسوود بووە، وەك نووسراوو مۆری هەڵکەندراوو کتێبێ ئەستێرەناسیی‌و یاساناسی‌و ئەندازیاریی بۆخۆیانیان بردووەو ئەوەشی دەردی ئەوانی نەخواردووە، یان مانەوەی زیانی بۆئەوان هەبووە، هەموویان ، یان بە سووتاندن، یان بەهەر جۆرێکی دیکە لەناویان بردووە!

ئێمە، ئەگەر سەرچاوەکانی تر ، لەورووەوە بە وردیی بخوێنینەوە، تێ دەگەین، کە هەندێ لەوزانیاریانە لەگەڵ یەکتری‌دا هاوسەنگن و پارسەنگ نابەن و زوربەی زۆریشیان بەیەکتری زۆر دژ وارن !

کەواتــە، پەردە لادان لەرووی زانــیــاریـیــە راســت ورەوان و بێ گومانەکان، بەهۆی بەراوردکردنی زانیارییە هاوجۆرەکانی بڵاوکراوەی ناو سەرچاوە جۆراوجۆرەکانەوە بە ئەنجام دێ.

هەروەك، هەنـدێ سەرچـاوەی پارسی، گەلێ سەرچاوەی بێگانەش، کەوەك سەرچاوەی رۆژ ئاوایی بن، باسی چەپاوکردنی گریکەکان دەکەن و بە دریــژی باسی سووتـانـدنی هەزاران کتێبی دینی دەگـەن کە لەلایـەن گریکەکانەوە کراوە، ئەمە جگە لە تەفرو توناکردنی هەزاران پیری دینیو لەناوبردنیان. . . .

دیـارە، جۆرە هەواڵی وەهـا، نەختی لە لای خۆی رامـان دەگـرێ و بە هۆیــەوە بیــرمـــان بۆ ئەوە دەچـێ، کە بڵێـن: ئەی باشـــە، کەوەختـێ هەخـامـەنشیـەکـان بە ناوی خزمـایـەتییـەوە نیشتنە سەرتەخت و تاراجی کەلەپووریی و سامانی نەتەوەیی دینیی و رۆشنبیریی میدیەکان، بۆچی ناو بەنـاوێ، لەمـلاو لە ولاوە بەسـەری نـاکەنەوە! ئەوجا ئەگەر وەها بوویێ، دەبێ لەوانـەوە (هـەخـامـەنشیـەکـان) بۆ گریکـەکان بەجێ مابێ! ئەگەر زانیمـان، گریکـەکان لە تاف وگەرمەی فەرمانرەوایی هەخامەنشیەکان دا شاڵاویان بۆئێران و ناوچەکانی کوردستان هێناوە!

یان، لەبارەی زمانی کوردیی ئەمرۆو زمانی میدیەکان و هی ئاڤێستاوە، ئەگەر یەکێکی زمـانـنـاسی وەك مەکـەنزی لەگەڵ ئەوەدا نەبێ، کە زمانی ئەمرۆی کوردیی وەچەی نوێی زمانی میدی بێ، دەبێ دەستی لۆمەی بۆ رانـەکێشــرێ، چونکـە لە بۆجوونـەکـەیدا، دەبێ پەنـای بۆ هەنـدێ سەرچـاوەی رۆژئـاوایی ـ (بـۆوێنـە، وەك ـ تراث فارس ـ ئەی، جی، ئاربـەری) بردبێ کە زۆرتـر بروایان بە هەندێ سەرچاوەی پارسی بوو، کە ناوبانگیان بە هەمان بیروراوە دەرکردووە!

ئەو بیروراپانەی مەکەنزیو ئەی جی. ئاربەری، کە لە بارەی زمانی کوردیـیـەوەن، لەگـەڵ تۆژینـەوە زمـانـنـاسیانەکەی (کەنت)دا دژ وارن و لێکۆڵەری دڵسۆزو نیهاتووش، بە هۆیانەوە، توانای دەست نیشانی کردنی زانیاریی راستورەوانی لەو رووەوە دەبێ!!

دیارە، جگە لە خۆمان مەبەست هەر کوردێکی دڵسۆزو خوێندەوارە کە بتـوانین بە دڵســۆزانــە خۆمـــان بدۆزینـــەوە، کەسی بێگـــانــە نە ئەو بەرەوژوورکەیە بەرخۆی دەداو نە دڵسۆزیش دەبێ!

بەهـەرحـاڵ بەبێ دەمە تەقێ گەڵە ئاریەکان، هەر لەدێرین دەمەوە، لە ناوچەکانی ئێران و کوردستانی ئەمرۆدا، ژیاون.

زمـانـەکـانیـان، لەرووی بەراوردکردنی نێوانیانەوە، وامان بەدەستەوە دەدەن، کە تا نزیکـەی پێنـج سەدەیـەکیش پێش زایین، لە شێـوەی شێوەزاری زمانێ بەولاوە، هیچکامێکیان (زمانی رۆژهەڵاتی ئێران، هی رۆژئاوای ئێران ـ کوردستان، زمانی خوارووی ئێران) رووالەتی زمانێکی سەربەخۆی تەواوی وەر نەگرتبێ!!

واتــە، زمـانی میـدیی و هی ئاڤێستـایی وەك زمـانی دینی و هی پارسی کۆن و تەنـانـەت هی (پـەرتی)یش، تا ماوەیـەکی دووروودرێـژ، بەلای کەمی یـەوە، بۆ نزیکـەی چەنـد سەدەیەکی کەم پێش زایین، وەك شێوەی جۆارو جۆری زمانی ئێرانی ئەو ماوەیەو ئەو دەمە بوون.

ئەوەش، کە وتـەی وەهـا بـەلمێنێ، ئەوەیە، کە فەرمانی شاهی یان نوسینـە هەڵکـەنـدراوە شاهی یـەکـانی شاهانی هەخامەنشی، نەبە شێوە زمـانی رۆژهـەڵات، نەبـەشێـوەزمانی رۆژئاوا ـ (لەدوایی دا، ناوی زمانی پالــەوی رۆژهــەڵات و ناوی پالــەوی رۆژئــاوایـان هەڵگـرت) ـ لێـك نەداربوونەوە، یان وەر نەگێردرابون.

ئەمــەش ئەوە دەگــەیــەنێ، کەســەرپـاکی ئەوخەڵکـانـە، واتـە، خەڵکەکانی ناوچەکانی ئێران و کوردستان، لە ناوەرۆکی ئەو نووسراوانە تێ دەگەیشتوون.

هەروەهــا زمـــانی دینی یـــان، کەزمـانی ئاڤیستـا بووە لەسـەروکـلاو هەخـــامـــەنشیـەکـــان دا هیـچ جۆرە لێکـدانـەوەیـەکی بۆنەکـراوە، یان وەرنـەگێـردراوەتە سەر زمانی هەخامەنشی، ئەمەش، بەڵگەیەکی دیکەی بەهێزکەری ئەو وتەیە

هەرهەمان دەستوور، لەگەڵ ئەوەدا، کە دینی زەردەشتی دینی رەسمی وگـەلی پەرتیـەکـا ن بووە هیـچ جۆرە لێـك دراوەیـەك بۆناوەرۆکی زمـانی ئاڤێستا لەلایەن پەرتیەکانەوە نەکراوە!

ئەمـە، بەبێ دڵـەچرکێ و گومـان، ئەوە دەگـەیەنێ، کە ئەوزمانانەی ئێـرانی ئەو سەردەمـەو لەوکـاتەدا، هێشتا، هەروەك وتمان، لە چوارچێوەو سنـووری شێـوەزاری جۆارو جۆاردا بوون و بە باشـی و رەوانی لەلایـەن خەڵکـەکـەی سەرپـاکی ئەو دەمـەی ئێـرانەوەو کوردستانەوە هۆگر بووەو بە ئاسـانی لە یەکتـری تێ گـەیشتـوون و پشکێنـەری زمـانی کۆنی ئێـرانی، بەتـایبـەتی ئەوانـەیان، کە خەریکی مۆرفۆلۆژ ین وەك راستی یەك، بەمە، لەلایان جێگیر بووە.

هەنگاوی جیاوازیی هەرە گرینك، ئەگەر لەنێوانیان دا، بەدیی کرابێ، لـەچـوارچێـوەی چۆنیەتی دەنگدانەوە هەندێ دەنگەبزوێنی کۆتایی وشە بەولاوە نەچووتە دەرەوەو ئەگەریش لەو رووەوە بەو جۆرە زۆریش هەبووبێ لە بەکار هێنانی وشەو گەرەستەی زمانی بێگانە کە لە ژێر تەنگ و چەڵەمەی گیـرمـەوکێشەی دراوسێـیەتی لەگەڵ نەتەوەی بێگانەدا بەولاوە، کە ناوبەناو، لەشێـوەی رۆژهـەڵات و لە شێـوەی خوارووی و هی رۆژئـاوادا خۆیـان دەرخستبێ چی دیکە بەرچاو نەکەوتووە، یان تێپەری نەکردووە!

ئێمــە وای بۆدەچین کە ئەوجۆرە رووالــەتی وێـك چوونـە، لەنێـوان زمانەکانی رۆژهەڵات و هی رۆژئاوادا هی ناوچەکانی خوارووی ئێران دا، بۆ ماوەیـەکی دوورو درێـژ خـایـەن مایـەوە تاوەکو شاڵاوی یۆنانیەکان بۆ

سەرناوچەکانی کوردستان و ئێران وبنج بەست بوون و بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی یان تیایان داو شان بەشانی و لەگەڵی داو بە درێژایی تەمەنی ئەودەسەڵاتی فەرمانڕەوای یە، زمانە ئێرانیەکان بەرەو زۆرتر جیاوازتر لەیەکتری یەوە هەنگاویان دەنا، چونکە دەوروبەری تایبەتی بۆ ئەو جۆرە هەنگاوانە ئامادە بووبوو ، هەریەکە لەوانە تادەهات بەرەو دوورکەوتنەوە رووبە جیاوازیی تر، پتر هەنگاوی، دەنا .

داگیر کردنی وڵاتانی ئێران و ناوچەکانی کوردستان ، لەلایەن ئەسکەندەرو یۆنانیەکانەوەو چەسپاندنی فەرمانڕەوایی هێلینیەکان، بوو بە هۆی لە ناوبردنی رۆشنبیریی دینی و سەرنگوم کردن و قەدەخە کردنی و هەر جۆرە رۆشنبیری یەکی تر، کە بۆنی ئێرانی یەکانی لێوە هاتبێ بەومەبەست و نیازو خەیاڵەی کە هێشتنەوە یان و سەرلە نوێ گەشە کردنیان، واتای بێکهێنانەوەی یەکیەتی و یەکگرتنەوەی ئێرانی یەکانی تێدایە .

بەم هۆیەوە، بەزۆرو بەحەز، بەخواست و بەنەخواست، بەدەیان وشەو کەرەستە زمانی یۆنانی و هی ئارامی بەسەر زمانە ئێرانیەکان دا سەپێنراوە، بەتایبەتی ئەو وشەگریکیانەی کە پەیوەندی یان، بەکارگێریی و کارسازیی و ئایین و خوالەی دوژنی یۆنانی یەوە هەبووبێ ، ئەمە جگە لە جۆرە کەرەستەی زمانی دیکەیان ، کە پەیوەندیی بە فەلسەفەو فەلسەفەی دینی یەوە هەبووبێ !

یەك نەکەوتنی ، فەرمانڕەوایی یە ناوچەی یە هیلینیەکان لە ناوچەکانی ئێران و کوردستان دا، کە بە هۆی جۆری رەگەزو نەتەوەی جۆربە جۆرو ژن خوازیی هەندێکیان لە خێزانە ئێرانیەکان ولایەنگیری کردنیان ، لە لایەکەوەو رەگەزپەرستی هەندێکی دیکەیان، لەلایەکی دیکەوەو بن بڕ کردنی هۆی سەرەکی کە دەبێتە هۆیەکی پتەوو قایم بۆیەك گرتنەوەی یەکیەتی ئێرانیەکان، بێ گومان بوو بەهۆی سەپاندنی کەرەستەی زمانی جۆر بەجۆرو زەقق ـ ی یۆنانی (کەبۆ ماوەی سێ سەدەیەك ، یان نەختێ پتر خایاندی) ـ بەسەر زمانە ئێرانی یەکان داو کاریگەرێکی وەها بوون، کە تا حاڵی حازریش شوێنەواری کرداری یان هەر ماون .

ئەوەی کە سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە ، کە ئەو جۆرە دەسەڵات و فەرمانڕەوایەی هیلینیەکان و رەخساندنی ئەو دەوروبەرە جۆر بەجۆرانە ؛ لە ناوچە جۆر بەجۆرەکانی ئێران و کوردستان دا ، بوون بە هۆی ئەوەی ، کە تا رادەیەك جۆری گوزەران و چۆنیەتی گرتنەبەری رێگای دینی بە ئاشکرایی و نەنهێنی و تەنانەت هەڵس و کەوتی مرۆڤایەتی دیکەی خەڵکی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئێران، لە هی خەڵکی ناوچەکانی رۆژئاوای ئێران و لەهی ناوچەکانی خواروی ئێران ، بەرەو جیاوازی یەکی هەست پێ کراوو سنوور دیاریی بوو، بەرن!

بوونی دەسەڵاتی پەرثیەکان ، لە ناوچەکانی رۆژ هەڵاتی ئێران دا، لە سەرەتای ساڵەکانی (٢٥٠)ی پێش زایین دا لە کاتێك دا کە هیلینیەکان زوربەی زۆری، ناوچەکانی رۆژئاواو خواروی ئێرانیان بە دەستەوەیەو خەست بوونەوەی دژ ایەتی و دوژمنایەتی نێوانیان ، وەك خاوەن نیشتمان و نیشتمان داگیرکراوو وەك داگیرکەر و درێژەکێشانی ئەو دوژمنایەتیە بە تینەی نەسرەوتەی نێوانیان ، بووبەهۆی، یلخود هاندانێ بوو، بۆدەست پێوە گرتن و بەرنەدانی هەست و نەستی نەتەوەیی و یەکێکیش لەوانە، جێگیربوونی زمانی پەرثی بوو ، کەوەك زمانێکی سەربەخۆی رۆژهەڵاتی سەربەخۆی رۆژهەڵاتی ئێران، چووە چوارچێوەیەکی دیارییەوە .

کەوابوو، زمانی پەرثی یەکان، ئەوەی رۆژهەڵاتی ئێران، لەچاو زمانانی ناوچەکانی رۆژئاواو هی ناوچەکانی خواروی ئێران دا، بە پاکی مایەوە، کەچی زمانەکانی ناوچەکانی رۆژئاواو هی خواروی ئێران، بەدەیان وشەو کەرەستەی گریکی و هی ئارامی و ئاشۆری یان وەرگرتبوو، یان پێ یان متوربە کرابوون!

پاڵپشتی ئەم وتەیەش تێکستەکانی (مانی)یە، کە هی رۆژهەڵاتی بە زمانی پەرثی و لە هەموو جۆرە (هزوارش)یکەوە دوورن، ئەمەش بە تەواوی بەپێچەوانەی تێکستەکەی (شابورقان)یەتی ، کەپڕە لە وشەی ئارامی و جۆری دیکە .

ئەم جۆرە رووالەتە جیاوازی یەی زمانی پەرثی رۆژهەلات ، لە شێوەزمانەکانی خوارووو هی رۆژئاوای ئێران، تەنانەت بە چۆنیەتی شێوەی نووسینی تێکست و رێنوسی یەوە دیاریی بوو.

شایانی باسە، مانەوەی زمانی پەرثی رۆژهەلات بۆماوەی شەش سەدەیەك وەك زمانی فەرمانڕەوایی ئەشکانیەکان، بوو بە هۆی ئەوەوە ، کە گەشە بسێنێ و بەرەو ئاسان بوون هەنگاوبنێ و یەکێ لەو هەنگاوانەش بەرەونەمان و قرتاندنی کۆتایی (ناو) و (راناو) و (ئاوەڵناو)ە، کە هەریەکە لە هەشت حاڵەت دا، کۆتایی جۆر بەجۆری پێوە دەنووسا! بەڵام زمانی ناوچەکانی رۆژ ئاواو هی ناوچەکانی خوارووی ئێران، لەبەر متوربە بوونیان بە دەیان وشەو کەرەستەی زمانیی ئاشوریی و گریکی و هی کلدانی و بابلی و عیلامی یەوە، زووتر بەرەوون کردنی ئەو کۆتاییانە چوون. بۆپاڵپشتی ئەم وتەیەش ، جگە لەوەی کە لەپارسی کۆن و کوردی کۆن(میدی و ئاڤێستایی وەك زمانی دینی)دا ، بە دەیان لەو وشەو کەرەستە جۆربەجۆرانە بەدیی دەکرێن، لە پارسی نوێ و لە کوردیی نوێ ـ ش دا، ئاتێستەش ، شوێنەواری ئەو کەرەستەیانە، هەر ماون .

ئەم جۆرە رواڵەتی بەسەرهاتانە، ئەوەمان بەدەستەوە، دەدەن ، کە :ـ زمانی پەرثی رۆژهەلات بەرەو زمانێکی سەربەخۆ ـ لەبەر ئەو هۆیانەو رووالەتانەی سەرەوە ، کە باسمان لێوە کردن ـ هەنگاوی ناوەو گەشەی سەندووە .

زمانی ناوچەکانی رۆژ ئاوای ئێران، کەوەك زمانی کوردیی کۆن (یاخود زمانی میدیی )بێ ، سەر لەنوێ بووژایەوەو بەرەوگەشە سەندنەوە چوو بەوەی ، کە زمانە گەلی یەکەی لە قەرزکردن و وەرگرتنی وشەو کەرەستەی

بێگـانـه سەرفراز بوو، ئەمە لە لایەکەوەو لە لایەکی دیکەشەوە زمانی دینی کوردیی (زمـانی ئـاڤێستـا) سەرلـەنـوێ پەرەی سەنـدەوەو قوتـابیانی دینی پەرەیان سەندو ، بەسەدان کتێب، لەو رووەوە، روونووس کرانەوە .

ـ ئەمـەهۆیـەکی زۆر گرینـگ بوو، بۆ ئەوەی پارێـزگـاریی قەوارەی زمانی دینی کوردیی (ئاڤێستایی)و هی گەلی بکرێ.

بنـەڕەت و بنـەتـۆوی زمـانی پارسی ساسـانی ، کە بە (پـارسیـك) ناوبـانگی دەرکـردووە، کە لەسـەر زەمینـەی زمـانی (پـەرتی ئەشکانی) و پارسی کۆن وزمـانی کوردیی کۆن (زمـانی گەلـی مـیـدیـەکـان وزمـانی دینی یـان ـ زمـانی ئاڤێستـا ـ )ەوە روێنـراوە، پوختـەیـەکی گوڵ بژێـری ئەوانـەیـە، ئەمـە لە لایـەکـەوە، لەلایـەکی دیکـەشـەوە، زمـانی ناوبراو رووالەتێکی تایبەتی خۆی هەیە کە ئەوانی تر رووالەتی وەهایان نی یە!

ئەم جۆرە رووالـەتانەی زمانی(پارسیك)بێ گومان، هەندێ زمانناسی بە هەڵـەدا بردووەو خستـوونیـەتـە سەر ئەو بیروڕایەی کە زمانی کوردیی بە شێوەیەکی زمانی (پارسیك) بزانن!!

لەسـەردەمـی فەرمـانـرەوایـی ساسـانـی دا، بگـرە لە سەرەتـای دامـەزرانـدنی دا، بۆیەکگـرتنـەوەی میـرایـەتی یـەکانی ئێران وداخستنی یەکیـەتی یـەکی بتـەوو ئەستـوور لەنێوانیان دا بیر لە کۆکردنەوەی (ئاڤێستا) کرایـەوە . ئەوەبـوو، لە لایـەن ئەردەشێـر ـ ەوە فەرمـان ، بۆ(پیـری پیران ـ تەنسـەر) دەرکرا، تاوەکو کاری کۆکردنەوەی ئاڤێستا بخاتە ئەستۆی خۆی .

هەرچی چۆنی بوو، (ئـاڤێسـتـا)کـۆکـرایەوە، واتە؛ بەهۆی (تەنسـەر)و چەنـدان پیـروزانایانی دینی ترەوە، لێکیان دایەوەو پەراوێزی جۆراوجۆری لێکدەرەوەی بۆکرا، بۆ ئەوەی لە لایەن ، هەموانەوە تێ گەیشتنی ئاسان بێ .

لێـرەدا واتـە، لەم پلەیـەدا، جۆرە دیـاردەیـەك دەرکـەوتـووە، ئەویش ئەوەیـە، کە زمـانـی پارسـی ساسـانـی هەنگـاوێکی بەرەو زمـانێکی سەربەخۆی رووالەت دیاریی ناوە، کە لە زمانەکانی تری ئێرانەوە جوێ ی دەکـاتـەوە ئەمەش هۆی سەرەکی یە، کە زمانی ئاڤێستا لە لایەن سەرپاکی خەڵکـەکـەی ئەو سەردەمـەی ئێـرانـەوە (مەبەست لە خەڵکی ناوچەکانی خوارووروژهـەڵاتی ئێـرانـە) نەزانراوە و(زوربەی زۆری خەڵکەکەی ئەو سەردەمەی ناوچەکانی رۆژ ئاوای ئێرانیش ، کە کوردستانی ئەمرۆیە، زۆر کەم لێ ی تێ گەیشتوون).

لەبـەر ئەوە ، (زەند) و(پازەند) و(ئاڤێستای بچووك)، وەك شی کەرەوەو لێکدەرەوەو رۆشنکەرەوە هاتوونەتە کایەوە.

لێکدانەوەی زمانی ناوکتێبێ دینی ئاڤێستا، بە هۆی (زەند)و(پازەند) و (ئـاڤێسـتـای بچـووك)ەوە، بە روشنیو بەبێ گومان، ئەوەمان، بە دەستەوە دەدات، کە:

ـ زمانی کتێبی زەردەشتی ، کە زمانی ئاڤێستای پێ دەوترێ، وەك زمانێکی دینی تەواوو سەر بەخۆو جیاواز لە زمانی (پارسیك) تەماشا دەکرێ، واتە، وەك زمانێکی سەربەخۆی دینی سەر ژمێردەکرێ .

ـ زمـانی گەلـی ناوچـە رۆژ ئاوایی یـەکـانی ئێـران(کـوردسـتـان)، وەك زمـانـەکـانی دیکەی ناوچەکانی دیکەی ئێران ، هەنگاوی بەرەو جیاوازیی ناوە، کە لەگـەڵ زمـانی ئاڤێستـادا دوو شێوە زمانی زمانێکیان پێك هێناوەو ئەم وتەیەش لەسەر ئەو بنەڕەتەیە ، کە ئەمرۆ بە دەیان وشەی زمانی کوردیی (هاو ئاوازو هاوواتا) لەگەڵ زمانی ئاڤێستادا هەن ، کەچی هاو ئاوازو هاو واتـایـان ، لە ناو زمـانی پارسی ئەمـرۆدا دەست ناکـەون و ئەگەریش هاو ئاوازیـان دەست کەوت هاوواتـا نابن و ئەگ ریش هاوواتایان هەبوو، هاو ئاواز نابن!!

ـ بوونی (زەنـد) و(پـازەنـد) لە دەمی ساسـانیـەکـان دا، هەروەهـا بوونی لەگەڵی دا نی یە!

+ چونکە، (زەند) بۆ لێکدانەوەی (ئاڤێستا)کراوە .

+ (پازەند)یش بۆ لێکدانەوە (زەند) کراوە.

+ کەوابوو ، زمانی (زەند) لەلایەن ساسانیەکانەوە (نەزانراو) بووە، ئەگەر وەها نەبوایێ ، (پازەند) چ سوودێکی هەبوو!

ـ بەم پێیـە، بۆمـان، دەردەکـەوێ، کە زمـانی (زەند) زمانێکی تایبەتی بەو هەنـدێ بیـروڕای وەهاش هەیە ، کە (زەند) زمانی ناوچەی (باختریا)بێ و زەردەشت خۆی بۆ رۆشنکردنەوەو لێکدانەوەی زمانی ناوئاڤێستا بەکار هێنابێ !

دیـارە، پاش گرتنە دذەستی دەسەلات، لەلایەن هەخامەنشیەکانەوە، نە تۆوی میـدیـەکـان یەکسـەرە برراوەتـەوە (وەك هەندێ لایان وایە) ، نە ئەوانیش دەسـەوسـان وەستـاون . بەڵکـو زوربـەی زۆری هۆزە بەهێـزە میدیایەکان، خاوەنی ناوچەو دێهات بوون . لێرەو لەوێ؛ هۆزێ یان پتر لە هۆزێ، هێزو توانای خۆیان گلێرکردووەتەوەو ناوبەناو ئازادیو سەربەستی خۆیـان لەسنـووری ناوچەکانی خۆیان دا ، دابر کردووەتەوە دەسەلات و سنـوریـان بۆخـۆیـان دابەستووەو بە ناوی سەرۆکی هۆزەوە، یان بە ناوی ناوچـەکـەیـانـەوە، ناوبـانگی ئەو دەسـەلات و فەرمانرەوایی یان ناوبانگی لەمێژ ووی دێرین دا، تۆمار کراوە.

وێنـەیـەکیش ، لەو رووەوە، کە لە مێـژ وودا، بەرۆشنیودیـاریی تۆمار کرابێ ، کاردۆخیەکانن، کە لە ناوچەکانی (بۆتان)ی ئەمرۆدا، ل نەقشیو نقـوش و هەڵکـەنـدراوەکـانی دراوسێ کـانیـان دا ، ناویـان، بەخـاوەن دەسەلات و خاوەن خاك و ئاو ، هاتووە!

هەروەها ، دەوڵەتی (ناو دواو) کە بە (ئەحدیاب = ئاهـ ـ دیاب = ئاخ ـ دیـاو = ئاخ ـ دواو) لەمێـژ ووی دێـرینی بێگـانـەکـان دا ناوی هاتـووە، وێنـەیـەکی دیکـەی ئەوبەڵگـانـەن . ئەم ،دوڵـەتـەش، لە ناوچـەی هەردووزێدا بووە، کە ناو جەرگەکەی هەولێری ئەمرۆ دەگرێتەوە).

بەهەرحاڵ، بوونی سترابنشینی وەهاو ، لێرەو ، لەوێ ، لە ناوچەکانی کوردستـان داو هەوڵـدانی سەرەمەریان بۆ سەندنەوەی ئازادیو سەربەستی

خۆیـان لە ناوچـەکـانیـان داو جەنگـان لە پێنـاوی مانـەوەی دەستەڵات و سنـووری ئەو ستـرابنشینـەو هەریەکە بەناوی (سەرەك هۆز)، یان بە ناوی (نـاوچـە) یەکەوە، بووبە هۆی دابەش بوونی، یاخود پەیدا بوونی شێوەی جۆراوجۆری زمانی گەلی میدی (کوردیی کۆن)،

لێرەدا، بە تایبـەتی بۆ لابـەنگری ئەم خاڵـە، دەبێ یادی (پـرۆفیسۆر رۆلانـد . جی کەنت) بکـرێتـەوە ، کەلـەکـاتی دیـاریی کـردنی (پارسی ناوەراست)دا، وای بۆ دەچێ ، کە زمـانی (پـارسی نـاوەراست) دەکرێ، بەسێ بەشەوەو ئەوانیش:

- پالەوی رۆژهەلات و
- پالەوی خوارەوو
- پالەوی سەرووی رۆژئاواو هی رۆژئاوا.

مەبـە ستیشی لەو (پـالـەوی رۆژئـاوا)یـە، ئەو زمـانـە ئێرانی یەیە، کە لەو کاتەدا، لە ناوچەکانی کوردستانی ئەمڕۆدا باو بووە.

هەروەهـا، پرۆفیسـۆر کەنت، لە بارەی مۆرفـۆلـۆژ ییـەوە، وای بۆ دەچێ، کە زمـانی پالـەوی رۆژ ئاواوزمـانی ئاڤێستـا لەیـەکتـرییـەوە، نزیکترین، تا نزیکی هەر جۆرە زمانێکی دیکەی ئێرانی لە زمانی ئاڤێستاو زمانی میدییەوە!!

بەرپـا بوونی دینی ئیسـلام و بلاوبـوونەوەی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ئیسـلام، سەر لەنوێ، بووبە هۆی لەناوچوونەوەی پاشماوەکانی ئاڤێستاو لێکـدراوەکانی و قەدەغەبوونی دینی زەردەشتی و دروست بوونی شێوەزاری کوردیی بەڵـەکـاوی لە ناوچـەکـانی رۆژ ئاوای ئێـران (کوردستان)دا، بە جۆرێکی وەها کە هەر یەکە، لە ناوەرۆکی ئەو شێوەزارانە، چووەتە بەرگی زمانێکەوەو بەشێوەو قەوارەو رووالەتێکی وەها، کە خاوەن زارێ (ئەوەی بە شێوە زارێ وت و وێژ دەکا) ئەگەر خوێندەوارێکی کوردیی باش و لێهاتوو نەبێ، ناتوانێ لە ئاخافتنی یەکێکی خاوەن شێوەزارێکی دیکە تێبگات!

ئەمـە، لەلایـەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، ناوەرۆکی ئاڤێستا (ئەوەی کەوەك هۆنـراوەو رازو سەرگـوزەشتـەی دینی بووبێ) سەر لە نوێ کەوتـەوە ناوسنگی پیـرانـەوە (پیـرانی دینییـەوە)، کە ئەوانیش، پەیتـا پەیتا، لێرەو لەوێ، راودەنـران و لە ناو دەبـران . ئەوانـەشیـان، کە لەو جۆرە راونـانە، دەربـاز بوون، مەگـەر زۆر بەنهێنی و لەناوچەی دوورە پەرێزو شاخاویە سەختەکان دا، خۆیان گرتبێتەوەو تیایدا خۆیان هەشار دابێ!!

ئەو بەڵگانەی، کەلەم رووەوە دڵنیامان دەکەن؛

- زوربـەی زۆری پیـرە دینییـە راونـراوەکـان، لە چەم و دۆڵـەکـانی ناوچـەکـانی هەورامـانی تەخت دا، ناویـان هەیـەو یەکێکیش لەو پیـرە بەنـاوبانگانە، پیرشالیاری یەکەم (پیرشالیاری زەردەشتی)یە، کە خاوەنی کتێبی دینی و فەلسەفەی دینی (ماریفەت پیرشالیاری)یە.
- ئەو (ئاڤێستا) دەستنووسەی، کە لەلایەن (میهرەبان خاتوون)ەوە لەیەکێ لە ئەشکـەوتەکانی ناوچەکانی هەورامان (نەوسوود)دا دۆزراوەتەوەو حاڵی حازر لە کتێبخانەی (کۆپنهاگن) پارێزگاری کراوە.
- یاخـود، مانـەوەی شێوەی زمانی دینی ، لە (ئاڤێستا)وە، ئەوجا، وەك زمانی دینی (ئەهلی هەقق)و تاوەکو ئەمڕۆ!

ئەمـە، بێگـومـان، ئەوە دەگـەیـەنێ، کە زمانی کوردیی ئەمڕۆ، دەبێ خۆی زۆر قەرزاری زمـانی ئاڤێستـا (یـاخـود کتێبی ئاڤێستـا - بەتـایبـەتی هۆنراوەکانی کە بە - گات - ناویان دەبرێ) بزانێ، چونکە زمانی دێرینیان لە چوارچێـوەیـەکی دینی دا پارێـزگاری کردو بۆیە وەك کەلەپووری دێرینی باووباپیران، زۆر نەبێ کەمی، بۆ ئەمڕۆ ماوەتەوە.

بوونی گومان، لە لایەن هەندێ زماناسەوە، یان مێژ وو ناسانەوە، کە زمـانی (میـدیـەکـان)و زمـانی (ئاڤێستا) یەك نین و دووزمانی جیاوازن، جێگای سەرزەنیشت نی یە ئەگەر هاتوو بەڵگەی سەر لەبەری لەگەڵ دا بێ!

بە پێچـەوانـەشـەوە، بوونی هەنـدێ بەڵگـەی سەرلـەبـەر، کەزمـانی ئاڤێستاو زمانی میدیەکان، بەجۆرێ لەیەکتری دەکەن، کەیەك زمان بن و پشت گوێی خستنیان، جێگای سەر زەنیشتە، بەتایبەتی ئەگەر زانیمان کە:

- سەرلـەبـەریی زمـانی ئاڤێستـا، تاوەکـو کۆتـایی فەرمـانـرەوایی هەخامنشیەکان، هەر بەردەوام بوو، ئەمەش ئەوەمان بۆروون دەکاتەوە، کە زمـانی میـدیـەکـان وزمـانی دینییـان (زمـانی ئاڤێستـا) هیـچ جۆرە جیـاوازییـەکیـان پێشـان نەداوەو لەم رووەشـەوە، لەسـەرچـاوەی گریکـەکـان دا، باسی هیـچ جۆرە (لێکـدراوە)یەکی زمانی ئاڤێستا، یان کتێبی ئاڤێستـا نەکـراوە!! ئەگـەر هاتـووزانیمـان، یەکـەم هەنگـاوی گریکـەکان، بۆدابین کردنی ناوچەکانی ئێران وخەڵکەکەی، لە ناوبردنی دینی ناو ئاڤێستا بووە!

لەبـەر ئەوە، ئێمـە، ئەم هەنگـاوە (سەرەتای فەرمانڕەوایی میدیەکان، تاوەکـو کۆتایی دەسەلاتی هەخامنشی یەکان) بە هەنگاوی کوردیی کۆنی دادەنێین، ئەو کوردییـە کۆن ودێـرینـەی کەلەسەر کەلەپوورێکی دێرینی ناوچەکەوە بنج بەست کراوە.

لەسـەرەتـای فەرمـانـرەوایی و ئەسکـەندەرو خەلیفەکانی لە ناوچەکانی ئێـران و کوردستـان دا، تاوەکـو کۆتـایی فەرمـانـرەوایی ساسانیەکان، کە نزیکی . . نۆسـەدەیـەك دەکـاتـەوە، بووبەهۆی رەخساندنی دەورووبەری جۆراوجـۆری زۆر سەیـرو سەر سوڕهێنـەری وەهـا، کە بتوانێ زمانی رۆژ ئاوای ئێران (کوردستانی ئەمڕۆ) بەرەو چەند شێوەیەك، لە شێوەزار بەرێ.

واتە، پەیدابوون و سەرهەڵدانی ستراپنشینی جۆر بە جۆرو هەریەکێك لەوانـە، بە ناوێکـەوەو هەنـدێکیشیـان بە باوەڕو دینێکی تری بێگـانـە لە دینـەکـەی خۆی، کە بەزمـانێکی دیکەی بێگانە بە زمانەدینەکەی دانراوەو پەیـوەنـدی پەیـداکـردن، لەگـەڵ دراوسێی جۆر بەجـۆری بێگانەدا، لە رووی زمـان و دینەوە، ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە، سەپاندنی

دینی پووچەڵی بێگانەی بت پەرست ڕەنگانەو ڕاونان و لەناوبردنی ئاڤێستا لە بەرکەرەکان و پەیرەوی کەرەکاڵ و هۆی تریش، زاری جۆراو جۆریان هێنایەکایەوە، شان بە شانی ئەو زارانەش، زاری دینی هەمەجۆر لەلایەن ئەو ئاڤێستا لەبەر کەرانەو پیرە دینی یانەوە، سەری دەرهێنا.

بۆیە، بیروڕا، بۆ ئەوە دەچێ، کە کۆکردنەوەی ئاڤێستا بۆ یەکەم جار، لە لایەن ئەشکانیەکانەوە (بلاشی یەکەم ـ ئەشکی بیست و دووەم) لە دواتریش (کە لەلایەن ساسانیەکانەوەو بۆچەند جارێکیش کۆکرابێتەوە) چەند شێوەزارێك تیای‌دا، بەشداریی کردبێ! بۆ وێنەی شێوەزاری دینی، هۆنراوە دینی یەکانی پیرشالیاری زەردەشتی، کە سەرگوزەشتەی ئەنجامی بەسەرهاتەکانی شاڵاوی ئیسلام بۆسەر ناوچەکانی شارەزوورو هەوارامان، دەخەنەڕوو شێوەزارێکی دینی بەدەستەود دەدەن، کە دینی ئەهلی هەق، تا ئەمڕۆش، هەر بەکاری دەهێنن!!

بەم پێیەو هەروەك بە باوەڕێکی تەواوەوە دەیڵێم، ناوەڕۆکی قەباڵەکانی هەورامان ـ (کە هەندێ وای بۆچوون کە بە زمانی پەرثی نووسرابن لەراستی یەوە زۆر دوورە) ڕوواڵەتی پەیدا بوونی شێوە زمانی گەلی میدی یەو لەبەر ئەم هۆیانەش:

ـ زمانی نێو قەباڵەکان، وشەی ئارامی بەشێوەی (هزوارش)ی تێدایەو ناو بەناویش هی یۆنانی.

ـ ئەووشانەی، کە بە کەرەستەزمانی (وشە) پەرتی لەقەڵەم دراون، هەندێکیان هەروەك لە پارسی کۆن و پالەوی ڕۆژهەڵات دا بەشدارن هەروەها لەزمانی ئاڤێستایی و هی میدیش دا بەشدارن. هەندێکی دیکەشیان تەنیا، تایبەتین بەکوردیی (کۆن)و (نوێ)وەو لە زمانەکانی دیکەی ئێرانی دا بەرچاو ناکەون.

ـ شێوەی نووسینی قەباڵەکان، ئەگەرچی بە ئەلف و بێ ی ئارامی یە، هەر لەبەر نەگونجاوی تەواوی پیتەکان لەگەڵ دەنگدانەوەو ئاوازەی کەرەستە زمانەکەدا، بۆیە هەندێ نیشانەی سەروبۆر ڕەنگی بۆخراوەتە سەر، بۆ ئەوەی لەگەڵ مۆسیقای زمانەکەدا بگونجێن.

ـ ئەوشێوە زمانەی ناو قەباڵەکان، بریتی بووە، لە شێوەیەکی گەلی ناوچەکانی کوردستان (هەورامان)، چونکە کاری کڕین و فرۆشتن، کارێکی ڕۆژانەی ناو مەیدان بووەو زمانەکەشی دەبێ لەلایەن کڕیارو فرۆشیارەوە ئاشنابێ، ڕەسمی نەبووە، دەبێ زمانەکەش لە ڕەسمیەتەوە دوور بووبێ، یان زمان گەلی بووبێ!

ئەوەی، کە بۆ ئێرە سوودی خۆی هەبێ بوترێ، ئەوەیە، کە:

ـ ڕۆشنبیریی میدیەکان ـ (لە هەموو ڕوویەك و گۆشەیەکەوە، جگە لە گۆشەی ڕامیاری) لە سەرانسەری دەسەڵاتداری هەخامەنشیەکان دا، هەر بەرەو گەشە سەندن چووە.

ـ میدیەکان، وەك دەوڵەت، بەسەر کەلەپووری کۆنترەوە نیشتەجێ بوون. ئەمەش بووەتە کێشەیەك لەڕێگەی پشکنینی هەندێ پشکێنەری زماناس و مێژ وو ـ نووس دا.

ـ ئەگەر زانیمان، قەوارەی دەوڵەتی ئەوسا، وەك قەوارەی دەوڵەتی ئێستا نەبووەو توانیشمان لەرووی جیاوازی یانەوە بەراوردیان بکەین، بێگومان دەگەینە ئەوەی، کە بە شێوەیەکی ساکارو کورت بڵێین، کە دەوڵەتی دێرینی ئەوسای ناوچەکانی کوردستان، هەمیشە لە شێوەیەکی هۆزگەریەتی و تایفەگەریەتی وەرگرتووە. سەرۆکی گەورەی هۆز (دەمڕاست) لەشاردا، یان لە دێیەکی گەورەدا، نیشتەجێ بووەو لەگەڵ چەند گوندێکی دیکەی ناوچەیەك دا، یان هێنی چەند ناوچەیەك دا، کە هەریەکە لەوانە، خاوەنی ناوی تایبەتی و خاوەنی دەسەڵاتی ئابووریی و ڕامیاریی خۆی بووە، ئەمانە هەموویان (هۆزی سەرەو هۆزی وەچە) بەشێوەیەکی یەکگرتوو دەڵەتێکیان پێك هێناوە.

واتە، لەم پشکنینەدا، چەندان ناوی جۆراوجۆرمان، لەکات و دەمێك دا، لەچەند ناوچەیەکی وڵاتێك دا، بەرچاو دەکەون و هەروەها، بە دەیان وشەو کەرەستەی زمانی ڕەنگاوڕەنگ ـ مان دێنە بەر ڕێ، کە خۆیان لە خۆیان دا، سوودی بەهاداری خۆیان دەبەخشن، ئەگەر توانیمان لەهەموو ڕوویەکەوە ڕۆشنیان بکەینەوەو ئەگەریش بەپێچەوانەبوو، ئەوە ئەنجامەکەی بە پێچەوانەوەیە!!

بەپێی ئەو دەمەتەقێیەی سەرەوە، ئێمە، بەم جۆرەی خوارەوە، هەنگاوەکانی ڕێبازی مێژ ووی زمانی کوردیی، دیاریی دەکەین:

* کوردیی کۆن.

ئەم هەنگاوە، لەگەڵ سەرەتای فەرمانڕەوایی میدیەکان دا دەست پێ دەکات، لەگەڵ کۆتایی فەرمانڕەوایی هەخامەنشیەکان دا، کۆتایی پێ دێت.

باشترین وێنەو نزیکترین نموونە، هۆنراوەی ناو گاتەکانە.

* کوردیی ناوەڕاست.

ئەم هەنگاوە، ئەگەرچی زۆر تاریکە، بەڵام وای بۆچووین، کە سنووری لە سەرەتای فەرمانڕەوایی هیللینەکانەوە دەست پێ بکات و کۆتایی، لەگەڵ کۆتایی ساسانیەکان دا، بێت.

ئەو بەڵگە نووسراوەی، کەلەم ڕووەوە بە دەستەوە هەبێ، تەنها ناوەڕۆکی قەباڵەکانی هەورامانە، بۆنیوەی یەکەمی ئەم ماوەیەو بۆنیوەی دووەمیشی ناوەڕۆکی ئاڤێستا (جگە لەگاتەکان) دەگرێتەوە

* کوردیی شێوەزار.

ئەم هەنگاوە، لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلامەوە دەست پێ دەکات و تاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەم دەخایەنێ!

لەم هەنگاوەدا، شێوەزاری جۆراو جۆرو لەیەکتری یەوە دوورکەوتوو دێنە کایەوە.

* کوردیی نوێ.

کوردیی نوێ، یاخود دەوری بژارکردنی زمانی کوردیی لە کەرەستە زمانی بێگانەو هەنگاونانی بەرەو دوو شێوە زمانی ئەدەبی و شێوەزاری دینی و هەندێ شێوەزاری دیکەی کوردیی.

## بەشی یەکەم

### (١) ئەو دەوروبەرەی، کە کار دەکاتە سەر گەشەکردنی زمان.

ئەو دەوروبەرانەی، کە توانای ئەوەیان هەیە، کاربکەنە، سەر گەشەکردنی زمان، زۆرن و بەلای منەوە، ئەمانە گرنگترینیانن:

**(١) ئازادیی و سەربەستی گەل.**

گەلی ئازاد، ئەگەرچی، لەرووی گۆشەکانی ژیانەوە، زۆر دواکەوتوویی، بەلام، توانای پارێزگاری کردنی زمانەکەی خۆی لەزۆر رووەوە هەیە، بە تایبەتی، لە رووی پارێزگاری کردنی (قەد) و (ریشە) و وشەی سەرەو کەرەستەی دیکەی زمانەکەیەوە، کە لە باووباپیریەوە یەکسەرە، بۆی بەجێ ماوەو ئەمیش، هەمیشە خۆی بە کامەران دەزانێ، ئەگەر بە پامان و زامانی توانای پارێزگاری ئەو کەلەپوورەی بکات و گەشەی پێ بدات و ئەگەر هاتوویش، ئاڵ و گۆڕێکی پێویستی ژیانی رۆژانەی بەسەردا هات، لە لایەوە، شوێنەواری ئاڵ و گۆڕەکە، دیاریی و ئاشکرایە.

گەلی ئازاد، ئەگەر دوواکەوتوویش بێ، رەچەڵەکی زمانەکەی لە سەرەوە بۆخوارەوە (لەکۆن و دێرینەوە بەرەو نوێ و ئەورۆژەی) شان بەشانی مێژووی بەسەرهاتی (ئەو گەلە) لەبەر چاویەوەو دیارەو کەس ناتوانێ هیچ جۆرە تەگەرەیێ بخاتە بەر رێبازی زمانەکەی، یان بە زۆر کەرەستەی زمانی بێگانە، بەسەر زمانەکەیدا بسەپێنێ!

هەروەها، گەلی خاوەن نیشتمان و ئازاد، دەربایسی (بەتەنگە) ئەوەوە نییە، کە کەرەستەی زمانی بێگانەی پێویست بە گەشەکردن و پێشکەوتنی زمانەکەی بهێنێتە ناو زمانەکەیەوە.

بۆ وێنە، ئەوەتا عیراقی ئەمرۆ، هەر لەبەر هۆی ئەوەی کە خۆی بە خاوەنی ئازادیی و سەربەستی تەواوی خۆی دەزانێ، دەیەوێ سەرلەنوێ بەرێبازی مێژوویداو بەو جۆرەی کە خۆی دەیەوێ و پێی رازییە بڕواتەوەو دای بڕێژێتەوە.

ئەوەتا، پارسەکان، جگە لەوەی کە هەرچی خاك و ناوی کورد هەیە لە کوردستانی ئێران دا، کردوویانە بەهی خۆیان و سەرپاکی کەلەپوورو شوێنەواری کۆنی ناوچەکانی کورد (میدیایەکان) هەن، لە تۆمارگەی پارسی خۆیان دا، بەهی پارسی تۆماریان کردوون ـ (تەنانەت زمانی کوردیی ئەمرۆیشیان، بە شێوە زمانێکی پارسی سەرژمێر کردووەو لەم رووەشەوە فەرهەنگەکانیان بەئاشکرایی شاهیدی ئەدەن) ـ کەچی لەکولەکەی تەریش دا، ناوی کەلەپووری دینی و رۆشنبیریی بەجێ ماوی میدیەکان، ناو نەبراوەو ناویش نابرێ، ئەگەر زانیمان گریکەکان لەسەرچاوە جۆر بەجۆرەکانی خۆیان دا، زۆر بەسەرسورمانەوە تەماشای کەلەپووری رۆشنبیریی جۆراوجۆری میدیەکانیان کردووەو بەرێزەوە ناویان هێناوە.

**(٢) لایەنی جوگرافیایی.**

لەنیشتمانێك دا، لە ناوچەیەکەوە، بۆ ناوچەیەکی دیکە ـ (ئەگەر جیاوازیی جوگرافیایی لە نێوانیان دا هەبێ) ـ جیاوازیی لە چۆنیەتی گۆکردنی هەندێ دەنگە بزوێنی وشەدا، بەدیی دەکرێ هەروەها هەندێ جاری وەهاش هەیە، کە لە زمانی ناوچەیەکی شاخاویدا هەندێ وشە ـ (بەتایبەتی ناوی هەندێ گژ و گیا، کە لە کوێستانەکان دا هەن و لەگەرمیان دا، نازین) ـ بەدیی دەکرێن، کە لە ناوچە دەشتاییەکانی گەرمیانەکاندا و لەیەك ولات و نیشتمان دا بەرگوێ ناکەون، یان ئەگەریش بەری گوێ کەوتبن، بە لایانەوە واتایان نارۆشن بووە.

ئەم جۆرە، دەوروبەرە، ئەگەرچی زۆر کاریگەر بێ، کاریگەریەتی لە سنووری ئەکسنت و جۆری ئاوازەی دەنگ بەولاوە، ناڕواتە دەرەوە.

کاتێ. دەوروبەری جوگرافیایی کاریگەرتر دەبێ، ئەگەر هاتوو ولاتێ، یان، بابڵێین نیشتمانێ، لە هەر چوار لاوە، یان لەچەند لایەکەوە دراوسێی بێگانەی، چ لە رووی زمانەوەو چ لەرووی نەتەوەوە هەبێ و ئەو دەمە، بێ گومان، هەر ناوچەیێ لەو ناوچانە، بە شێوەیەکی تایبەتی و یەکسەریی لەگەڵ ئەو ولاتە دراوسێیە بێگانەیەدا، کار دەکەنە سەر یەکتریی و ئاڵ و گۆڕی قەرزکردنی وشە، لەنێوانیان دا روودەدات و بەهۆی درێژەکێشانی ئەو دەوروبەرەیەوە، شێوەی زمانەکەی ئەو ناوچەیە، لەشێوەی هەمان زمانی و لەناوچەیەکی دیکەی دراوسێ لە نەتەوەیەکی تری بێگانە جوێ دەبێتەوەو بەوجۆرە هەر لایێ لەو لایانە شێوە زمانێ پێك دەهێنن!!.

ئەوجا، ئەگەر دەوروبەرە جوگرافیایەکە، لە چوارچێوەی دراوسێیەتی چووە دەرەوەو گەیشتە بازنەی دابەش کردن و دابچراندن، بێگومان بەپێی ئەو جۆری بەسەرهاتە، زمانەکەش وەچەزمانی دیکەی لێ دەبێتەوە.

**(٣) لایەنی دینی و رۆشنبیریی دینی.**

لە پارێزگاری کردنی یەکیەتی و یەکگرتوویی زمانی نەتەوەیی دا، دین دەورێکی ئیجگار مەزن و بەسوودی هەیە. بەتایبەتی ئەگەر ئەو دینە خاوەنی کتێبێکی دینی بێ و بەو زمانە دینییە نووسرابێتەوە.

باشترین وێنە، لەم رووەوە، بوونی قورئانی پیرۆزە، کە بە هۆیەوە

یەکگـرتـووی زمـانی عارەبی پارێـزگـاری کراوەو لەو رووەشـەوە بە سەرچاوەیەکی سەرلەبەر بروا پێکراو لەقەڵەم دەدرێ. کەی کێشەیەکی زمـانیـی هاتە پێشەوە، بۆ راست کردنەوەی، یان چۆنیەتی پێکهاتنی وشەیێ، یان لێکدانەوەی واتای، یان ناسینی رەسەنی، یەکەرە، بۆ سەرچاوەی بەنرخی عارەبی دەگێردرێتەوە، کە ئەویش (قورئان)ە.

لەگەڵ بوونی (قورئان)یش دا، لە زمانی عارەبی گەلیی دا، شێوەزاری جۆراوجۆر و رەنگـاورەنـگە بەرگوێمـان دەکـەون و بۆ ماوەیـەکی لەمەوبەرتریش خاوەنی هەنـدێ شێوەزار لە زمـانی عارەبی (عـارەبی ئێستگەی رادیـۆ و تی. ڤی) تێ نەدەگەیشتن، یاخود، تائێستەش خاوەنی هەنـدێ شێوەزار لەوی دیکە تێ ناگات! ئەمە، ئەگەر زانیمان، کە هۆی سەرەکی یەکگرتنی زمانی عارەبی لەم گۆڕە پانەداهەن و کاری خۆیان دەکەن!!

ئەگەر لەروانگەی ئەم گۆڕەپانەوەو بەم پێوەرانە، تەماشای زمانی کوردیی بکرێ، دەبێ بەوە رازی بین و لە خۆشیا گەشکەش بکەین، کەبەم جۆرەی ئێستا بە ناوی زمانی کوردییەوە چاوونام دارە.

ئەمە، لەلایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، هۆی هەرەسەرەکی مانەوەی زمانی کوردیی، وەك زمانی کوردیی ئەمڕۆ و بەردەوام بوونیشی و کۆڵنەدانی لە پێناوی مانەوەیدا، بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ بوونی گەلی کورد وەك کورد زمـان و بۆ بەردەوامی لایـەنی دینیش، وەك خاوەن کتێب و کتێبـۆڵکەی دینی، ئەگەرچی ئەمانە لە قەوارەیەکی زۆر لاوازتر، لە پێویست دا بووین!!

کەواتـە، مانەوەی زمانی کوردیی، بەم جۆرەی ئەمڕۆ، کە هەیە، دەگەڕێتەوە، بۆ بەردەوامی زمانی (ئاڤێستا) و مانەوەی وەك زمانێکی دیی بە درێژایی ئەو رێگایە دوورو درێژ و هەڵەتاویی و ناهەمووارەی، کە زمانی کوردیی لە میدیەکان بەماروە تا ئەمڕۆ پیایدا دەروات!

زمانی کوردیی لە میدیەکان بەملاوە تا ئەمڕۆ پیایدا دەروات!

بەشێوەیەکی ئاشکراترو روون تر، بوونی زمانێ بەناوی زمانی میدییەکانەوە، وەك زمانی دینی و هی رەسمی و گەلیی، بە درێژایی سەرانسەری فەرمانڕەوایی یان و ئەوجا، وەك زمانی ئاڤێستاو وەك زمانی رەسمی و گەلیی و هی دینی هەخامەنشییەکان (جگە لە هەندێ فەرمانی شاهی، کە بەپارسی کۆن نووسراوو هەڵکەندراون و زووربەی زۆری کەرەستەکـانیشی رەگ و قەدو وشـەی سەرەی میـدین). ئەوجـا، بەردەوامیی، وەك زمـانی گەلیی و وەك زمـانی دینی و گەشە سەندنیان لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەشکانییەکان داو تاوەکو کۆتایی فەرمانڕەوایی ساسانییەکان و پەیدابوونی شێوەزاری جۆراوجۆرو بەردەوام بوون و سەرلەبەر بوونی شێوەی دینی، لە زمانی ئاڤێستاو لە دەفتەرەکانی ئەهلی هەقی داو تاوەکو ئەمڕۆ، رێبازێکی نەبچڕاوو دیاریی پیشان ئەدات.

**(٤) لایەنی ئابووریی.**

پەیدابوونی پەیوەندیی ئابووریی، لەگەڵ وڵاتانی بێگانەداو هەوڵدان، بۆ گەشە سەندنی باری دارایی، خۆی لەخۆیدا، شۆڕشێکی رامیارییەو هەروەهـا شۆڕشێکی کۆمەڵایـەتی بێ هـاوتـایەو ئەنجامـەکەشی گەشەسەندنی هەموو گۆشەیەك و لایەنێکی کۆمەڵە.

بەرز بوونەوەی باری ئابووریی، بێ گومان دەبێ بەهۆی پێشکەوتنی کشت وکاڵ، پیشەسازیی، بازرگانی، رۆشنبیریی و رامیاریی و هەروەها دەبێتە هۆی هێنانە ناوەوەی کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی نوێی دروست و گونجاو لەگەڵ ئەو بارە پێشکەوتووەدا.

زمانیش دیاردەیەکی سروشتی زیندووە، بەهۆی نانی جۆرە هەنگاوی وەهـاوەوشان بەشـانیان، بەشێوەیەکی سەرەمەرە لە بووژاندنەوەو گەشە سەندن و پێشکەوتن دایەو هەمیشە بەکەرەستەی پێویست بەو دەمەو بەو رۆژەو بەو جەنجاڵیەو بەو ژیانە نوێیە، خۆی دەرازێنێتەوە.

ئەوجا، لەهەر هەنگاو و پلەیەك لەوانەدا، بە دەیان وشەو کەرەستەی زمـانی بێگـانـەی پێـویست بە ژیـانی هاوچـەرخی کۆمەڵـەکەی و کۆمەڵگاکەی، دێنە ناوەوەو ئەمەجگە لەوەی، کە بە دەیان وشەو کەرەستەی زمانیی نوێ، بە هۆی پاشبەندو پێشبەندو داتاشین و لێکدان و گەردانەوە دێنەکایەوە.

هەواڵی باری ئابووریی خەڵکەکەی ناوچەکانی کوردستان لەدێرینەوە تاوەکـو ئەمـڕۆ، بەتێرو تەسەلەیی ئاگاداری نین! لەگەڵ ئەوەش دا، بۆمان هەیە، لە دوو لایەنەوە، زۆرنەبێ، کەم دەربارەیانەوە بخەینە بەرچاو، واتە بەم جۆرە:

یەکەم، لەرووی باری ئابووریی ناوەوە.

ئەوەی، کەلـەم رووەوە پێمـان گەیشتبێ، ئەوەیـە، کە میـدیـەکـان، زووربـەی توانـاو هێـزی دارایـیان سەر بەرهەمی کشت وکاڵ کەوتووە، بەوەی، کە ناوەرۆکی ئاڤێستـا رێـزێکی زۆر لە لادێ و کشت وکاڵ کەران مەڕومـالات بەخێوکەران، دەگرێ رێز لە پیاوی ئازاوژیکەڵ و لێهاتوو ئیشکەر دەنێ!!

ئەمە لەلایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە، ئاوهەواو جۆری ئاخ و خاکی سەرپاکی ناوچەکانی کوردستان، دەوروبەرێکی تایبەتی و بەنرخن بۆ بەرهەم هێنانی داروردەخت و جۆراوجۆری میوەو کشت وکاڵ، بۆیە فەرمانەکانی ناو ئاڤێستا سەرپاکیان بەجێن!

بەم پێیە، کۆمەڵەکانی کۆمەڵگاکانی ئەوسای ناوچەکانی کوردستان، بەهـەموو جۆرێ خاوەنی دارایی خۆیان بوون و بەئاسانی و بەباشی و

بەکەفەسەریی ژیاون، بەپێچەوانەی ئەو کۆمەڵانەی کە لە کۆمەڵگای دەشتاوی‌و بیابانی‌دا دەژین. بۆیە، دەبێ خەڵکەکەی ناوچەکانی کوردستان هەمیشە ئامادەی ئەوە بن کە بەرگری لەخۆیان و نیشتمانیان و دارای‌یان بکەن.

دووەم، لە رووی باری ئابووریی دەرەوە.

لەم رووەوە، لە بارەی ئەو خەڵکە دێرینەی ناوچەکانی کوردستانەوە، تەنها لەسەرچاوە ئاشوورییەکان دا نەبێ، کەشتێکی زۆر کەممان دەست دەکەوێ، زانیاری زۆر کەمە.

سەرەڕای کەمی ئەو زانیاریانە بەڵام بەهۆیانەوە توانامان هەیە، کە وێنەیەکی ساف و بێ‌گەردی ئەو سەردەمەو ئەو جۆرە پەیوەندیانەوە، بە هۆی تابلۆیەکی ئەو سەردەمەی ئاشۆریەکانەوە، بەدەستەوە بدەین و ئەویش بەم جۆرە:

لەسەرو کلاوی سەرگۆنی دووەم ـ ی شای ئاشوورییەکان دا هێرش بەرەو وڵاتانی میدیا، کراوە، وڵاتی (خارخار = خورخورە) داگیرکراوە، خەڵکی ناوچەگیراوەکانی دیکە، وەك خەڵکی بەزێنراو بۆ ئەوێ گوێزرانەوەو بیست وهەشت ستراپنشینی دیکەی میدی گیراون و سەرانەیان لێ سەنراوەوچی زێڕو سەروەت ماڵیان هەبووە، هەموو هێنراوەو ئەوانەشیان، دەرچوون، بۆلایەکی دیکە براون، یان بەدیل گیراون!!

هەواڵی جۆراوجۆری لەم وێنەیە، لەسەرانسەری فەرمانڕەوایی ئاشوورییەکان دا بەرچاو دەکەون و ئەم جۆرە هەواڵانەش جۆرە پەیوەندییەك پیشان دەدەن کە بە شێوەیەکی سەرەمەرە، زانیاریی، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە هەڵ گیرساندنی شەڕو کوژاندنەوەی‌و ئامێرو ترۆتفاقی‌و سەرانەو تاڵان و دیلایەتی‌یەوە هەبێ، لەیەکترییەوە، وەك کەرەستەی زمان، ئاڵ وگۆڕ کراوە!

## (٥) لایەنی رۆشنبیریی.

لایەنی رۆشنبیریی، لایەنێکی خاوەن تیشك و پرشنگدارو رۆشنە. بەهۆیەوە، رادەی پێشکەوتنی هەرگەلێ‌و سەرپاکی سەرگوزەشتەکانی دەزانرێن و ئاوێنەیەکی راستەقینەیە، کە هەن و نی‌یەی پشتاوپشتی گەل و نەتەوە، بە راست و رەوانی‌و بە پامانی‌و زامانی تیای‌دا، رەنگ دەدەنەوە.

لایەنی رۆشنبیریی، وەك هەر لایەنێکی دیکەی پێویست بە ژیانی پێشکەوتنی گەل و نەتەوە، شان بەشانی پێشکەوتنی لایەنەکانی تری پێویست بە ژیان و کۆمەڵ بەرەوپێشەوە، هەنگاو دەنێ‌و گەشە دەسێنێ‌و بە دواکەوتنی هەرلایەنێ لەو لایەنانەش، یان لاوازبوونی هەر یەکێکیان کار دەکاتە، سەر لاوازبوونی پلەی رۆشنبیریی.

لەسەردەمی فەرمانڕەوایی میدیەکان دا، یەکەم هاندەری لایەنی رۆشنبیریی‌و لایەنەکانی دیکەی پێویست بەژیانی رۆژانەی کۆمەڵ و کۆمەڵگا دینی ئاڤێستا بووە، کەتیای‌دا، داوای بەرگری‌کردن لە نیشتمان دەکات و داوای ئاوەدان کردنەوەو بنیاتنانی نیشتمان دەکات و هەروەها داوای لەش ساغی‌و تەندروستی‌و فرمانی سوود بەخش و بەردارو جەنگان لە پێناوی لە ناوبردنی نەخۆشی‌داو پەرەپێدانی کشت و کاڵ و فرەکردنی مەڕو ماڵات دەکات.

بەم پێیە دینی میدیەکان، هەموو مەرجەکانی پەرەسەندن و پەرەپێ‌دانی لایەنی رۆشنبیریی‌یان هێناوەتە دی‌و لەو رووەشەوە (هیرۆدۆت)و (دەینوون) باسی پلەی رۆشنبیریی میدیەکانیان کردووەو بەم بۆنەشەوە، (دکتر پرویز خانلری) بەدەمی هێرودۆتەوەوای دەردەخا، کە میدیەکان خاوەن قانوون ویاسایەکی رێك وپێك و مرۆڤانە بوون و شێوەی (دادگەریی) تیای‌دا رەنگی داوەتەوەو بڕیاری دادموان لەکۆتایی‌دا، چووەتە کۆشکی شاهـ، بە تایبەتی لە سەروکلاوی شاهـ (دیاناکۆ)دا، بۆئەوەی بڕیاری دوایی لەسەر بدرێ.

یان، بەدەمی (دەینوون)ەوە، وای دەردەخا، کە لەدەوروبەری نیوەی سەدەی شەشەمی پێش زاین دا، شاعیری زۆری میدی هەبوون و ئەو شاعیرانە لەکۆشك و دیواخانان‌دا، شەڕەشیعریان کردووە، یان شیعریان بە (شاهـ)و بەنیشتمان و بە پاڵەوانی جەنگ وپاڵەوانی تیربازیی‌و سوارچاکی‌دا هەڵداوەو زوربەی زۆری شیعرەکانیشیان وەك رازی میللی وەهابوون و شێوەی سەرگوزەشتەو داستانیان هەبووە.

شایانی باسە، کە مۆرخانە یۆنانیەکانی سەردەمی هیرۆدۆتس، وا بەدەستەوە دەدەن، کە میدیەکان نوسینیان بە ئەلف وبێ‌ی مێخی بووەو ئەوەی کە فەرمانەکانی شایانی هەخامەنشی پێ نووسراوەتەوە لەسەر ئەلف وبێ مێخی میدیەکانەوە دانراوە.

بەهەرحاڵ، رۆشنبیریی بە هەموو گۆشەکانی‌و جۆرەکانیەوە و هەروەها رۆشنبیریی دینیش، تاوەکو کۆتایی فەرمانڕەوایی هەخامەنشیەکان، بە شێوەیەکی ئێرانیانەی (بەلای زۆرییەوە) بێ‌گەردەوە، مایەوە.

رێگا بڕینی رۆشنبیریی میدی بەرێگای تەسك و تروسك وتاریك دا، لە سەردەمی هیلینەکان وتاوەکو ئەمڕۆ، لەملاولەولاوە، بەدەیان و بە سەدان کەرەستەی زمانیی جۆراوجۆرورەنگاورەنگ ولەهەموو جۆرە روویەکی ژیانەوە هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوەو ئەمانەش و هۆی دیکەش، ئەگەر توانیبێتیان شێوەزاری جۆراوجۆر دروست بکەن نەیان توانیوە زمانی کوردیی لەناوبەرن.

کەوابو، دەبێ، ئێمە، سەرمان لەوە سوڕنەمێنێ، کە زمانی کوردیی ئەمڕۆ، کەرەستەزمانی ئاشووری‌و هی یۆنانی‌و هی پارسی‌و هی عارەبی‌و هی مەغۆلی‌و هی تورکی تیادابێ، هەروەها، دەبێ سەرمان لەوە سوڕ نەمێنێ، کەشێوەزاری کوردیی ئێران کەرەستە زمانی پارسی زۆرتری

تیادابێ، تاوەکو کوردیی عیراق، کە کەرەستەزمانی عارەبی لەوی زۆرتری تێدایە، یاخود سەرمان لەشێوە کوردیی تورکیا سورنەمێنێ، کە پرە لە کەرەستەزمانی تورکی و بەوجۆرە.

ئەوەی، کەلێرەدا، دەبێ بوترێ، ئەوەیە، کە زمانی ئاڤێستا (زمانی دینی میدیەکان) هەروەك ناوی پێشدادی و کیانی تیادا بەدیی دەکرێ، هەروەها، بەلای کەمی یەوە، دەبێ هەندێ ناوی کۆنتری (ناوی هەرچی شتێ بێ و لەو ناوچانەدا، کە لە دێرینەوە، لەلایەن دانیشتوان و کۆمەلی دێرینی ئەو ناوچانەوە بەکار هاتبێ . . ). تیادا بەدیی بکرێ.

ئالەم دەرفەتەدا، ئەگەر هەندێ کەرەستەی رەنگامەی زمانی جۆراوجۆری بێگانە، کەناو بەناو، ئالێرەو ئالەوێ، لەشێوەزاری کوردیی دا بەدیی دەکرێن، بخرێنە بەرچاو و سوودیان نەبێ، هیچ جۆرە زیانێکیان نی یە!

ـ هەندێ وشەی یونانی، کە لە زمانی کوردیی دا (بەسەرپاکی شێوەزارەکانیەوە) بەدیی دەکرێن.

* ئاتریلال. ئەمە وشەیەکی یونانی یە (یونانی کۆن) و بەو گیایە دەوترێ کەلە دەشتایی کان دا دەروێ و چێشتێکی تەڵخی هەیەو بەرزی یەکەی، کەلە بەهاران دا سەر دەردەهێنێ، نزیکەی (٣٠) سانتیمە ترێك، برندەیەو لەهەندێ ناوچەی کوردیی واریش دا، جگەلەو ناوەی خۆی بەناوی (کاردوو) و (هاز) و (غاز)ەوە ناو دەبرێ.

* بازەڵە (Basileu). ئەمە، وشەیەکی یونانی یە، بە واتای (شای گەورە)، یان (شای سەرفران) هاتووە. لە کوردەواری دا، شێوەی (لەخۆبایی بوو)، (سەرکێش)ی وەرگرتووە. زۆرتر بە یەکێ دەوترێ کە لەپێستی خۆی بچێتە دەرەوەو سەرکێشانە، هەڵس وکەوت بکات!!

* ئافرۆدایت. وشەیەکی یونانی یە، بە واتای خوای (پیت وبەر) و خوای (ناسك و جوانی و نازداری) بەکار هاتووە. وایاوبووەکە لەپێشی پێشەوە (ئافرۆدایت) بەسەر دەریای سپی ناوەراست دا بەرەو دوورگەکانی یونان رۆیشتووەو ئا لەوێ نیشتەجێ بووەو بووە، سەرپاکی دوورگەکانی یونان هەمیشە رازاوەو جوانن و خاوەن بەروبوومن.

ئەم وشە یونانی یە، حاڵی حازر بەزۆری لە ناو کوردەواریی دا شێوەی (ئافرەت)ی وەرگرتووەو (مێرد) بە زۆری، ژنەکەی خۆی، بە ناوەکەی خۆیەوە بانگی ناکاو بە ناز و خۆشەویستی یەوە بە ناوی (ئافرەت)ەوە بانگی دەکات.

* تاووس. ئەم وشەیە، هەرچەندە لای خەڵك وا دەرکەوتووە، کە عارەبی بێ، بەلام لەراستی دا و لەبنەرەت دا، وشەیەکی یونانی یەو لە قەوارەو ئاوازی (تەفۆس = tavos) دا بووە. حاڵی حازریش، لە کوردەواری دا، وەك خۆی و بەواتاکەی خۆیەوە بەکار دەهێنرێ.

ـ هەندێ وشەی تورکی.

بەشێوەیەکی گشتیی، لە زمانی کوردیی ئەمرۆدا، کەرەستەزمانی تورکی، بە شێوەیەکی قەرزکراویی، لە شێوە کوردیی یەکان دا، بە زۆری بەدیی دەکرێ، بە تایبەتی لەشێوەی کوردیی تورکیادا.

بۆ ئەم مەبەستەش، وا وێنەیەکی زۆرکەم، بەنموونەی خەرواری و کە لە هەموو شێوەکان دا بەکار دێن، دەخەینە بەرچاو.

* قازان، کە لەبنەرەت دا (قازغان)ە.
* ڤاپو، کە بەواتای (ڤاپی) یان بەشێوەی (ڤاپی)دا بەکار دێ.
* قاچاق، کە لە کوردیی دا، بووە بە (قاچاغ).
* قلدر، کە لە کوردیی دا، بووە بە (قۆڵدر) یان (قۆڵتر)
* قەنداخ، کە لە کوردیی دا، بووە، (قۆناخ)، مەبەست لە قۆناخی تفەنگە.

ـ ئەبارەی وشەی (پارسی) و (عارەبی)یەوە، پێویست بە هێنانەوەی وێنە ناکات، چونکە لە سەر ژمێرکردن بەدەرن!!

ـ هەندێ وشەی سۆمەری و بابلی.

* توون، یاخود (ئاتوون)، لەشێوەی بابلی دا، بە واتای (دەربەند)ی تەسك، یاخود رێرەوی (تەسك وترووسك)، یان بەواتای (توون)ی حەمام هاتووە. لە شێوەی سۆمەری دا (ئودون = udun)ە. لە کوردیی ئەمرۆش دا، وەك وشەیەکی تایبەتی بەشێوەی (توون)ی (حەمام) بەکار دێ.

* ئەشکارتە (شکارتە). لە (ئاکادی)دا وشەی (ئەشکارۆ) یاخود (ئشکارۆ = Ishkaru) بە (ئەرکی) جووتیار هاتووە. هەروەها بە واتای بەرهەمی ئەو پارچە زەوی یە دێ، کە کراوە بە (گەنم) یان بە جۆ، بۆ نانی خێزانی، بۆ ئەوەی نان نەکرێ!

جگە لەم واتایەش، بە واتای (داستان) و بەرهەمی ئەدەبی هاتووە، بۆ بۆ وێنە، (مەلحەمەی گەلگامێش)، بە (ئش ـ گار گەلگامش) ناو دەبرێ.

حاڵی حازر وشەی (شکارتە)، بەو گەنم و دانەوێڵەیە دەوترێ کە جووتیار بۆ خواردنی خۆی و ماڵ و منداڵی دەیچێنێ، یاخود پارچە زەوی یەکی بچووکە، کە جوتیار بەشی ماڵ و منداڵی خۆی گەنمی تیادا دەوەشێنێ (دەچێنێ).

* (گش = gish) وشەیەکی سۆمەری یە، بەواتای (گژ وگیا)، (درەخت)، هاتووە. ئەم وشەیە لە کوردیی ئەمرۆدا (گژ) بە هەمان واتا هاتووە، بەلام بەلێکدراوی (ناساکاریی) بەکاردێ، واتە، دەوتری (کشت وکاڵ)و (گژ وگیا).

هەندێ وشەی ئاشووری:

* قۆخ. هەروەك دەردەکەوێ، ئەم وشەیە، لەبنەرەت دا، لەلایەن ئاشوورییەکان و بابلیەکانیشەوە بەشێوەی (خەخۆ = khakhkhu) بەکار هاتووەو لەعارەبی عیراقیش (ئەمرۆ) بە شێوەو ئاوازی (خوخ) بەکار دێ

ئەگـەرچی لەعـارەبی‌دا بە شێـوەی (بـرقـوق)و (دراقن)یش هاتـووە (ن. ط. ب. ٨٣)

* زافـەران. بەشێـوەی زەعفـەران (زعفـران) لەعـارەبی‌دا بەکـاردێ، لە نووسینەکانی ئاشوری‌دا، بەشێوەی (ئازۆپرانو = azupuranu) هاتووە.

* کەڵـەك. وشـەی (کەڵەك) لەلایەن ئاشوریەکانەوە بەئاوازی (کەڵەکۆ = kalakku) بەکـار هاتـووەو بەواتـای (کـونـەی فوودراو) هاتـووە کە بۆ پەرانـدنەوەی کەل وپەل لەم بەری رووبارەوە بۆ ئەوبەری. تا ییستەکانیش لە ناوچەی دوو زێ‌دا (کەڵەك) بۆ پەڕینەوەی خەڵك بەکار دەهات.

ئەوجـا، ئەم جۆرە ئامێـرەی سەر رووبـار، لەنـاو کوردیشـاو لەلایـەن ئاشووریەکانیشـەوە بەکار هاتووە.

* کیـسـە. وشـەی (کیس) لە عارەبی ئێستـادا بەکـار دێ، لە لایـەن ئاشـووریـەکـانیشـەوە بەشێـوەی (کیـسو = kisu) بەکار هاتووە لەم جۆرانە، کەردەستـەزمـانی جۆراو جۆر و رەنگـامـە لەزمـانی کوردیی ئەمـرۆدا، لەسـەرپاکی شێوەزارەکانی‌دا، بەدیی دەکرێن، ئەمەش، لایەنی لاوازیی زمان نی‌یە، بەڵکو لایەنی زیندوویەتی زمانەو زیندوویەتی هەڵگرانیەتی.

بەهـەرحـاڵ، ئەم وێنـانـەی سەرەوە، تەنیا بۆ لایەنی بیرخستنەوە بوو، بەتایبەتی لەڕووانگەی پەیوەندایەتی‌و دەوروبەری زۆر سەیر درێژخایەنەوە.

## (٦) باری دینی ناوچەکانی کوردستان

(١) ـ باری دینی ناوچەکانی میدیا پێش دامەزراندنی دەوڵەتی میدیا: [1]

ئاری نەژادەکـان، ئەوانـەیـان، کە لەنـاوچـەکـانی ئێـرانی ئەمـڕۆو کوردستـانی ئەمـرۆدا دەژیـان، هەر لەدێـرین دەم و کاتـەوە، لە پەیڕەوی کردنی جۆری دین و ئاین دا ئازاد بوون و هیـچ جۆرە کۆسپێ بەر ڕێگـای دینی نەگرتوون.

ئەو جۆرە دینانەش، لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە، جیاوازی‌یان هەبووە. بەهەرحاڵ دینی زوربەی ئەو ناوچە پرژ وبڵاوو جۆر بە جۆرانە لە پەرستنی بوونەوەری سروشتی بەولاو زۆر کەم دەرباز بووە.

ئەو دینـانـە بریتی بوون لە پەرستنی رۆژ، ئەستێرە، ئاو، ئاگر، باران، هەور، شەو، خۆر، هەورەتـریشقـە. . . . . . هتـد لەم رووەشـەوە، بەردێکی بەنـەقش لەسـەر نووسراو، کە لە باختەران دۆزراوەتەوە وا دەری دەخـات، کە دانیشتـوانی ئەوێ پێش هەزارو چوارسـەد ساڵێ پێش زایین رۆژ یان پەرستووە.

بەهـەرحـاڵ، پێش سەر دەرهێنـانی دینی زەردەشتی و شان بەشانی ئەو دینـە جۆر بەجـۆرە سروشتیـانـە، لە یەکێ لە ناوچـەکـانی میـدیـادا، لە ناوهـۆزی ماگـاکـان دا، دینێکی باو هەبـووە، کە نزیـك بووە لە ناسینی خوداو یەکـایـەتی و تاکـانـەیی خوداوە، گوایـا، ئەوەش یەکـەم هۆیـەکی سەرەکـی بووە، کە لەدوایـی‌دا، پاش سەردەرهـێنـانی دینی زەردەشتی دەست بەجێ لەلایەن ئەوانەوە قۆزراوەتەوەو بوون بەرابەری دینی. چونکە دینی نوێ، بەهۆی ئامۆژگاری‌یە کرداری‌یەکانەوە، توانی یەکانەیی خودا بخاتە بەر چاو خەڵك و بەرجەستەیان بکات.

بەو دینـەیـەی کەلـەسـەر بنەڕەتی تاکانەیی بوونی خودایەك دامەزرابوو دەوترا دینی (مەزدی) یاخود (یەزدان پەرستی).

سەر دەرهێنـانی دینی زەردەشتی، لە میـدیادا، کە ناوچەی (رەزائیە)ی ئەمـرۆی کوردستـانی ئێرانی بۆ دیاریی کراوە، ئەگەرچی لەسەر جەوهەرو بنـەڕەت و بنچینـە دینی مەزدی‌یـەوەبـووە، یاخـود دانـراوە، بە ئاسـانی پێشوازیی نەکراوە!!

واتە، هیچ کەسێك ناتوانێ، بەئاسانی دینەکەی خۆی وەك کراسێکی کۆن و دڕاو دابکـەنێ و فرێ‌بـداو دینێکی دیکە، وەك کراسێکی نوێ لەبەر بکـا، ئەگـەرچی ئەو دینـە نوێ‌یـەش دینێکی زۆر ڕاست و ڕەوان بێ‌و دینـەکـۆنـەکـەی ئەویش دینێکی هیچ و پووچ بێ! چونکە ئەو، دینەکەی خۆی، لە هەمـوو دینێ بەراست تر و سەرلـەبـەرتـر دەزانێ‌و پتـر لەوەیش، چونکـە ئەو، دینـەکـەی خۆی، لەکـۆشی دایـك و بابیـەوە، بە درێـژایی تەمەنی، وەری گرتووە.

لەبـەر ئەو هۆیـەی سەرەوە، دینـەکـە نەیتـوانێ، یەکسـەر لەنـاوچـەی لەدایکبـوونی دین و خاوەن دینەکەدا[2] بڵاو ببێتەوەو بۆیە، لەبەر ایژ بوونی جێگاو ستەمبوونی دەوروبەرەکەی خاوەن دین هەوڵی هەشاردانی خۆی‌و دینەکەی‌دا.

(ب) ـ بڵاو بوونەوەی دینی زەردەشتی لەباختریادا.

هەروەك، لەمـەوپـێش ترو تـمـان، لەپـێش سەر دەرهـێنـانی دینی زەردەشتی‌دا، دینی جۆراو جۆر و ئاینی هەمـە چەشن هەبـوون. زوربەی زۆری ئەو دین و ئاینانە لە چوارچێوەی بت پەرستی‌دا بوون. لەبەر ئەوەی ترس و لەرزێکی بێ پایانیان خستبوە دڵی خەڵکەکەی ناوچەکانی ئێران و کوردستـانـەوە، بۆیـە دەڵاقـەیـەکی رۆشنایی و داماڵێنەری تاریکی لەهەر لایەکەوە، ئەگەر کرایەوە بەزووترین کات خەڵك بەرەو ڕوویەوە دەچن!!

خاوەن دین، لە خۆ هەشاردان دا، توانی خۆی‌و پەیڕەوی‌کەرەکانی لە ماگـاکـان بگـەیـەنێتـە خاکی شایـەکی زانـاودانـا، (کەی ویشتـاسپ) لە باختـریـاو ئالـەوێ‌دا، بەهـۆی ئەوەوەو بەهۆی کرداریی دینەکەیەوە ـ (کە دروشمی هەرە سەرەکی کردەوەی باشی سوودبەخش، ئاوەدان کردنەوەی وڵات، کشت وکـاڵ کردن، مەڕو ماڵات بە خیـۆنـەکـردن، درۆنەدان بوو. . . ) ـ توانی، بە هەموو ئاوەزێکەوە، دینەکەی لەوێ‌دا بڵاو بکاتەوە.

هەر لەبـەر ئەوەی کە ئەو دەم وکـاتـە، زمانەکەیان زمانی (زەند)یان پێ وتووە، لەبەر نارۆشنی زوربەی زۆری کەرەستە زمانیە دینەکەی ناو ئاڤێستا

زەردەشت خۆی ئاڤێستای بە زمانی (زەند)ی لێك داوەتەوەو بێگومان، ئەم لێکدانەوەیەش (زەند)[1] بووە، نەوەك ئەوەی سەردەمی ساسانیەکان، هەروەك پارسەکان وای لەقەڵەم دەدەن.

(حـ) ـ دینی زەردەشتی لە ناوچەکانی میدیادا.

دینی زەردەشت، وەك دینێکی کرداریی سوود بەخش، بەخەڵکی ناوچە شاخاویەکانەوە، بەهۆی یارمەتیدەرانی زەردەشت، کە هۆزی (ماگە) بوون و گرتنە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی لەلایەن یەکێ لە هۆزە سەرەکیەکانی (ئێریەن فاچ)، کە هۆزی (ماد) بوون، بە شێوەیەکی روسمی و گەلیی، لە سەرپاکی ناوچەکانی میدیادا، وەرگیرا.

ئا لەو ناوچانەدا، بە تەواوەتی، دروشمەکانی دینەکە، بەرجەستەکران؛ لەرووی ئاوەدانی یەوە، لەرووی کشت وکاڵەوە، لەرووی بەخێوکردنی ئاژەڵەوە، لەرووی سوودبەخشی مرۆڤەوە... هتد.

خوێندنگای تایبەتی لەلایەن هۆزی (ماگا)وە، بۆ (پیری دینی) پێگەیاندن و ناردنیان، بەپێی پێویست، بەملاو بەولادا، بۆ ناوچەکانی دەورویەری میدیا، کرایەوە تا ئێستەش، وەك ناو، شوێنەواری ئەو جێگا دینی یانە، کە وەك (موگان) بێ، لە ناوچەی رەزائیەو (موان) لە ناوچەی شارەزوورو (شاری هەورامانی تەخت) لەناوچەی هەورامان دا، هەر ماون.

(د) ـ دینی زەردەشتی لە سەروکلاوی هەخامەنشی یەکان دا.

لەسەردەمی فەرمانڕەوایی هەخامەنشی یەکان، دەست لە کەلەپووری میدیەکان نەدراو ئەمانە، بە شێوەیەکی سەرمەرەو بەپێی توانایان، گەشەیان بە هەموو لایەك و هەموو گۆشەیەك دا، بەڵام گۆشەی رۆشنبیریی دینی، بەپێی پێویستی رۆژانەیان بووا!

بەشێوەیەکی رۆشنتر، دینی زەردەشتی، لەکاتی تەنگانەدا، پەنایان بۆ دەبردو لەکاتی رەهایشا پشت گوێیان دەخست.

لەکاتێك، کە هەستیان بەوە دەکرد، کە وڵاتەکانی ئێران بەرەو لەیەکتری پچڕاندن دەچن، دەستبەجێ پەنایان بۆ دینی زەردەشتی دەبردو دانی رەسمیەتیان پیادا دەنا، بۆئەوەی بەهۆیەوە بتوانن یەك بگرنەوە، دژ ی دابچڕاندنی ناوەوەو دژ ی دوژمنی دەرەوە.

ئەوەتا، لە سەروکلاوی (داریوش)دا، بووە بە دینێکی رەسمی، بەڵام، لەسەروکلاوی کۆرش دا، ئەو رەسمیەتە نەماوە، یان پشت گوێخراوە، یان هەر بەقەدەر پێویست پەنای بۆ براوە.

(هـ) ـ دینی زەردەشتی لەسەردەمی ئەسکەندەرو هیلینیەکان دا.

سەرکەوتنی ئەسکەندەرو یۆنانیەکان، بەسەرهەخامەنشیەکان داو جێگیربوونی فەرمانڕەوایی هیلینیەکان لە سەرپاکی ناوچەکانی ئێران دا، بوو بە هۆی لەناوبردنی سەروەت و سامانی دینی و رۆشنبیریی دینی ی میدیەکان و هەروەها بوو بەهۆی یەکجاری کوشتنی هەستی یەکیەتی نێوانیان و نێوان سەرپاکی خەڵکی ناوچەکانی ئێران.

بە پێی دروشمی دین دوژمنیان، کە هیلینیەکان هەڵیان گرتبوو، هەو ڵی لە ناوبردنی کتێبی ئاڤێستاو پیری دینی و بەتەواوی برینەوەو بن بڕکردنی دینی زەردەشتیان، دا.

پیرو ماگای زەردەشتی، بە درێژایی فەرمانڕەوایی (هیلینەکان)، کە نزیکەی سێ سەدەیەکی خایاند، لەژێر ئەشکەنجەی ئازاردان و ڕاونان و شار بەدەرکردن و کوشتن و برین دا، لەناو دەچوون.

ئەوەی کە سوودی بۆخۆیان هەبوو دەیان بردو ئەوەش کە زیانی بەدینەکەی خۆیان دەگەیان، لەناویان دەبرد، بەم بۆنەیەوە مەسعودی وای لەقەڵەم دەدا، کە بە هەزاران نوسخەی ئاڤێستا، کە لەسەر پێستە نووسرابوون، لەلایەن هێلینیەکانەوە، سووتێنراون.

ئەوەی، کە لەو رووە مابێتەوە، زۆر کەم بووە، مەگەر بە تاك وتەراك لە کون و قوژبن دا، لەملاولەولاوە نوسخە شاررابێتەوە، یان لەسنگە دا، پارێزگاری کرابێ!

ئەوەی، کە دەبێ بوترێ، ئەوەیە، چی دین و ئاینی پڕوپووچی یۆنانی ئەو سەردەمە هەبوو، سەرپاکی بە زۆر بەسەر خەڵکەکەی میدیا (کوردستان)و ئێران دا سەپێنرا: (خوای شەڕ، خوای خەیر، خوای جوانی، خوای باران، خوای بەفر، خوای ئاو، یر، خوای ئاگر)، ... (ئافرۆدایت یاخود، میترا)... و (ئەناهیتا)و.... هتد.

بۆ، وێنە، لەم رووەوە، دەبێ ئەوەی (ئەی. ج. ئاربەری) بهێنینەوە یاد، کە بەناوی (هیرۆدۆتس)ەوە دەیگێرێتەوە ووای لەقەڵەم دەدا، کە یۆنانیەکان (هەتیوبازیان) فێری خەڵکەکەی ناوچەکانی ئێرانی کردووە. (ل ـ ٣٩. ئەی. جی. ئاربەری. شێوەی عارەبی).

هەڵگرتنی دروشمی (دین دوژمنی) لە لایەن هیلینیەکانەوە، بوو بە هۆی لەناوچوونی دینی زەردەشتی و بەرپا بوونی دین و ئاین وجۆر بەجۆری بت پەرستی رەنگە وپتریش لەوە بوویەهۆی بڵاوبوونەوەی دینی مەسیحیەت بە شێوەیەکی شێوە رەسمی و جیابوونەوەی، یاخود پێکهاتنی ستراپنشینێکی میدیەکان، لە ناوچەی (دووزێ)داو، کە (هەولێری) ئێستا مەرکەزی دەگرتەوە، ئاینی مەسیحی یەت لە ناوی‌دا، باوەڕوێکی رەسمی وەرگرتووە. (تەماشای، طه باقر ـ من تراثنا اللغوي القديم، ل ـ ١٥٧، بکە).

(و) ـ دینی زەردەشتی لە دەمی ئەشکانیەکان دا.

دەرکردنی هیلینیەکان بۆدەرەوەی ئێران و گەڕانەوەی ناوچەکانی ئێران بۆژێر دەسەڵاتی ئێرانیەکان خۆیان، خۆی لەخۆیدا زیندوو بوونەوەو ژیاندنەوەیەکی دینی زەردەشتی یە، ئەگەرچی لەرووی برەوپێدانیان بەدینەکە، لە هەخامەنشیەکان بەتین تر نەبوون.

ئەوەی، کە دەبێ بخرێتەوە یاد، ئەوەیە، کە لەو دەمانەی ئەوان دا، لەسەر دەمی فەرمانڕەوایی بلاشی یەکەم (ئەشکی بیست ودووەم) داو لە نێوان سالآنی (٥٢ ـ ٧٧ ـ ی. ز)دا، فەرمان بە کۆکردنەوەی ئاڤێستا درا. هەروەها، واش بەرگوێ دەکەوێ، کە یەکێ لە شاهە ناوچەییەکان (هی ناوچەی کرمان) کە (ڤەلخەش = Valgash) دەبێ، فەرمان بەکۆکردنەوەی ئاڤێستا دەداتەوە.

(ز) ـ دینی زەردەشتی لەدەمی ساسانیەکان دا.

دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانی (ئەردەشیر) یەکیەتی ئێران و بەهێزکردنەوەی لەدینی زەردەشتیدا، بەدی کردبوو، بۆیە یەکسەرە فەرمانی بە (تەنسەر)دا، (٥) بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی راست ورەوان ئاڤێستا کۆبکاتەوە.

ئەگەرچی، ناوەڕۆکی ئاڤێستا بوو بەپەیرەوێکی دینی و رەسمی دەوڵەتی ساسانی لەسەروکلاوی (ئەردەشیر)دا، بەڵام لەسەروکلاوی شاهەکانی دوای ئەو ئەو رەسمیەتە پشت گوێ خرا.

لەملاو لەولاوە دینی نوێ سەریان دەرهێنا، یەکێ لەوانە دینی مانی (٢١٦ ـ ٣١٥) بوو، کە دینێکی تێکەڵاو بە زەردەشتی یەت و بە مەسیحیەتی دروست کرد. شاپووری یەکەم بە شێوەیەکی رەسمی بوو بە لایەنگیری یەکەمی.

دینێکی دیکە، بە ناوی (مزدەکی = مەزدەکی)یەوە (مەزدەك) هێنایە ناوەوەو ئەو دینەش، رووالەتێکی سۆشیالیستی ساکاری هەبوو.

پاش کوژرانی (مانی) بەنزیکەی سی وپێنج ساڵی، شاە سابوور چووە سەر حوکم و تەماشای کرد کە بیروڕای جۆراو جۆر دەربارەی (ئاڤێستا)وە لە ناو خەڵك دا بلاو بووەتەوەو لەبەر ئەوە سەرلەنوێ بڕیاری رەسمیەتی دایەوەو واش باوە، کە ئەویش فەرمانی بۆکۆکردنەوەو لێکدانەوەی ئاڤێستای داوەتەوە.

بەکوژرانی (ئەنەوشیروان)و (مەزدەك)، دینی زەردەشتی دەبووژێتەوەو دینی (مانی)و هی (مەزدەکی) بەرەی جۆراو جۆریان لێ دەبێتەوەو رۆژ بە رۆژ بەرەو لاواز بوون و نەمان دەچن!!

ئەوەی کە دەبێ بوترێ ـ (لێرەدا) ـ ئەوەیە، کە لەدەمی ساسانیەکان دا (پازەند)و ئاڤێستای بچووك و لێکدانەوەو پەراوێز، بۆ ئاڤێستا کران. هەندێ وای لەقەڵەم دەدەن، کە لەدەمی ساسانی دا، (زەند) بۆ ئاڤێستا کراوەو ئەوجا (پازەند)یشی بۆ کراوە هەروەك لەمەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەوەیەکە (زەند) بە واتای لێکدانەوە هاتووە، (ئەگەرچی لەبنەڕەت دا ناوی زمانە)، (پازەند)یش بە واتای لێکدانەوەی (زەند) هاتووە، ئەمەش زۆر دوورە لەڕاستی یەوە چونکە ئەگەر (زەند) لەسەرەتای سەردەمی ساسانیدا زاگراوبێ، چۆن دەبێ بەماوەیەکی کورت ئەو زمانەی زەند نەزانراو بێ!

ئەوەی، کە بەلای ڕاستیدا، دەچێ، ئەوەیە، کە (زەند) ئەوەیە، کە زەردەشت خۆی بە زمانی (زەندیی) واتە، باختریایی ئەو سەردەمە، لێك دانەوەی ئاڤێستای، بۆ ناوچەی باختریا کردووەو (پازەند)یش، لە لایەن ساسانیەکانەوە بۆ لێك دانەوەی (زەند) کراوە.

## (٧) سەرئەنجام ـ ی ئەم ئاڵ و گۆرە.

ئەم ئاڵ وگۆڕو هەڵس وکەوت وپەیوەندی یە جۆر بە جۆرانەی، کەلە دێرینەوە تائەمڕۆ بەسەر کوردستان و خەڵکەکەیدا هاتوون، بوون بەهۆی هاتنە ناوەوەی هەمە جۆر کەدەستەی زمانیی رەنگاو رەنگ و دەوڵەمەند کردنی زوربەی زۆری وەچ و لقەکانی رۆشنبیریی خەڵکی ناوچەکانی کوردستان و بەهۆی بە سەرچوونی تەمەنێکی دوورودرێژ بەسەرهاتنە ناوەویان داو وەچە بەوەچەو پشتاوپشت کاریان تێ کراوەو هەندێ لەوانەش، ئەگەرچی بەرگێکی نوێیان پۆشیبێ، بەلام بە واتا بنەڕەتیەکە ـ یانەوە ماونەتەوەو هەندێکی تریشیان لەهەموو رووەکەوە بەرگی نوێیان بە بەردا کراوە.

جۆری ئەم کارتێ کردن و قەرزکردن و ئاڵ وگۆڕە، تا لێرەدا، بەکورتی بە هۆی چەند خاڵێکەوە، رۆشن دەکەینەوەو ئەوانیش:

(یەك) ـ دیارە میدیەکان لەسەر کەلەپووری کۆنی خەڵکی ئەوسای ناوچەکانی کوردستان نیشتەجێ بوون ـ (بۆوێنە، بابلێین، هوریەکان، میتانیەکان، گوتیەکان. . هـ)، بەلام، هیچ جۆرەشتێ لەو رووەوە جگە، لە ناو (شاهـ)و ناوی (ناوچە)و ناوی (گوند)و (دێهات)و (رووبار) چ بەڵگەنامەیەکی دیکە بەدەستەوە نی یە.

ئەو ناوانەی، کەلەسەرچاوەی نوێی کوردییدا، کە لەملاو لەولاوە، لەو رووەوە، بەرچاو دەکەون، سەرنج رادەکێشن!! بە تایبەتی لەو لایەنانەوە، کە (ناوێك) بە چەند رووالەت و قەوارەیەك پیشان دراوە، بەو پێیەی گوایا هەریەکە لەو رووالەتانەی ئەو ناوە، ناوێکی سەر بەخۆبێ! بێگومان ئەوە جێگای لۆمە نی یە، چونکە، لەوانەیە، ئەو پشکێنەرە، ئاگای لەوە نەبێ، کە (ناو) لە زوربەی زۆری زمانە دێرینەکانی ئەوسای ئێرانیدا هەشت دۆخی هەبووەو هەریەکێ لەو دۆخانەش، جۆرە رووالەتێکی تایبەتی هەبووە، کە لەگەڵ رووالەتی هەمان ناوو لە دۆخێکی دیکەدا جیاواز بووە.

بۆوێنە، (نەك بۆ کەم کردنەوە لەکەس)، ناوچەکانی (ئارازیاش)و ولاتی (ئارازیشو)، کە لە نووسینەکانی (شالمەنناسری) سێیەمی ئاشۆریەکان دا هاتووە، هەر یەك ناوە، بەلام هەریەکێ لەوانە لەدۆخێکایە.

بەهەر حاڵ، ناوەکان، بەچەند جۆرێ لەرووی داهاتنەوە لێك دەدرێنەوە. هەندێ لەوانە، بەناوی سەرۆك هۆزەوەن و هەندێ لەوانەش،

بەناوی پاڵەوانەوەن و هەندێکیشیان بەناوی رووداوی دینی یەوەن. لەگەڵ ئەوەش دا، هەندێ لەو ناوانە، لەگەڵ گۆڕانی جۆری فەرمانڕەوایی دا، ناوبەناو ناویان گۆڕدراوەو وێنەیەکیش لەوانە؛ (سەرگۆنی) ئاشوری کە وڵاتی (خارخار). (واتە، خورخورە)ی ئێستا، کە کەوتووەتە ناوچەی (سەردەشت)ەوەو سەر لقێ لە لقەکانی رۆخانەی سیروان، ناوی دەگۆڕێ و دەیکا بە (کارشاروکین)، بەڵام ئەو ناوەی (سەرگۆن = شارۆکین) هەر لەلای خۆیان بری دەبێ و لای خەڵکەکەی (خارخار) هەروەك خۆی دەمێنێتەوە، کە حاڵی حازر، هەروەك وتمان، ئاوازو شێوەی (خورخورە)ی وەرگرتووە.

ئێمە، ناوەکانی وڵاتانی میدیا، بە تایبەتی ناوی ناوچەکانی، بە دەگمەن ناوی بێگانەیان تیادا دەبینین!! ئەگەر هاتوو لەرووی مۆرفۆلۆژ ییەوە، بەراوردمان لەگەڵ (رەگە)و (قەد) و (ریشە) ناوی (شاهـ) میدیەکان و ئەو ناوانەی کە بە ئاشکرایی و رۆشنی، دەستی پشکێنەریان بە ناوی میدی بۆ راکێشراوە، کردن.

وێنەیەکی زۆر زەقیش لەوڕووەوە، ئەوەیە، هەر ناوی جێگایێ، یان ناوچەیێ، یان رووبارێ، یان شارێ، ئەگەر ریشەی (ل=L)ی تیادا بێ، ئەوە، ئەو ناوە، لەبنەڕەت دا میدی نی یە، یاخود ئاڤێستی نی یە!!

ئەو ناوانەی، کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئاشوریەکان دا، بەرچاو دەکەون و ریشە (ل = L) یان تێ دایە، بێگومان میدی نین وزۆرتریش بەلای ئاشوری و بابلی دا دەڕۆن.

بۆ، وێنە، لەکاتێك دا، کە (هەولێر)ی ئێستا، لەدەمی مادەکان و هەخامەنشیەکان دا بە (ئەربێرا = ئاربیرا = Arbira) ناوبراوە، هەر لە هەمان کات دا، ئاشوریەکان بە (أربا ئیلو = Arba - ilu) ی ناودەبەن و بابلیەکانیش هەر بە هەمان ناوەوە، ناوی دەبەن (طه باقر، ل ـ ١٥٨ ـ من تراثنا اللغوي القديم). [٧]

ئێمە، وای بۆدەچین، کە جگە لەم جۆرە ناوانە، کەباسمان لێوە کردن و ئەو جۆرە ناوانەی، کە وەك (لاسایی کردنەوە) ناوی بێگانە (لەبەر هەر هۆیەك بووبێ)ی بۆ هێنرابێ، ئەوانی تریان بەئاسانی پێناسەی ناوچەکانیان و ناوی شاهەکانیان و دینەکەیانیان پێوەیەو لەبەر رۆشنایی شیکردنەوەیان دا، بەشێکی زۆری سەرگوزەشتەو بەسەرهاتی دێرینی ناوچەکانمان بۆ دەردەکەوێ!

بۆ، وێنە، (ئەنگمەتان)، کە ئێستا (هەمەدان)ی پێ دەوترێ، یەکێکە لەو ناوانەی، کە میدیەکان، بەپایتەختەکەیانەوە ناویانە واتە، شاری فەرمانڕەوایی یەکەیان بەوناوەوە ناوە.

ئێستە، بابزانین، وشەی ناساکاری (ئەنگمەتان یان ئەنگماتان) واتای چی دەبەخشێ! وشەی (ئەنگەن) یان (ئەنگەنە) بە واتای (هۆز- لەشێوەی ـ کۆ ـ دا) یاخود (هۆزان) هاتووە. لە ئاڤێستاش دا، بەواتای (هۆز، هەنگ، پوورە) هاتووە.

وشەی (مەتان) یش لەبریی (مەدان)ە یاخود خۆیەتی و بە هەردوکیانەو پێکەوە وشەی ناساکاری (ئەنگمەتان)یان پێك هێناوە کە بەواتای (کۆمەڵگای ماد = مەتان) + (ئەنگەن = هۆز) ـ کۆمەڵگای هۆزانی ماد، هاتووە.

لەپارسی هەخامەنشی (پارسی کۆن)دا، شێوەی (هەگمەدان)ی وەرگرتووەو ئەوجا، بەرەو (هەکباتان = ئەکباتان = ئەکبادان) چووەو تا حاڵی حازر بووە بە (هەمەدان).

لەنووسراوەکانی (ئامونائید)دا، بە شێوەی (ئەگامتانو) دەرکەوتووە!
د. جەمال رشید، لێ کۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژ ووی وەڵاتی کوردەواری، ل ـ ٣٠٢ [٨]

بۆ سوودی بەراورد کردن، (ناو)ی میدی، لەمەلاو لەولاوە بەرچاو دەکەون، (ئەگەرچی هەندێ واڵە قەڵەمیان داوە، کەچەند ناوێکی میدی زۆرکەم بەرچاو دەکەون!)، بۆ، وێنە، وەك ناوی شاهەکانی میدیا، ناوی ئەستێرەناسەکانی میدیا، کە بۆپیرۆزبایی لەدایکبوونی (مەسیح) بۆقدس چوون، ناوی هەندێ ناوچەو شارو رووبارو کێوو قەڵاو پاڵەوان و سوارچاك و فەرماندار، کە وەك پاشماوەیەك رووالەتی میدیەتیان ئاشکراو روونەو جێگەی گومانیان رامالیوە. [٩]

بەهۆی بەراوردکردنی ئەو ناوە جۆر بەجۆرانەوەو کۆمەڵێ ریشەو قەدی زمانەوانی کە لە ناوزمانی پارسی هەخامەنشی و هی پەرتی دا بەرچاو دەکەون، لەگەڵ ناوی جۆر بەجۆری ناوچەکانی کوردستان و خەڵکەکەداو زمانەکەیان دا، دەگەینە ئەنجامێکی راست ورەوان و بڕوایێ کراو.

بەم پێیە، بۆمان هەیە، کە قەدی (ئەنگ) یان (هەنگ)و هی (تان)، یاخود (مەتان) = (مەدان)، یاخود (مان)، لەهەر وشەیەك دا بەدیی کرا بەشێوەیەکی تایبەتی لەکوردستان دا، ئەو وشەیە بەوشەی (میدی) بزانرێ! دیارە، نابێ، ئەوەشمان لە بیربچێ، کە ناوی جێگاو ناوچە، هی پێش میدیەکان بۆمیدیەکان، بەجێ ماوە، ئەمە جگە لەوەی، کەمیدیەکان، لەکاتی بنیاتنان و دروست کردن دا، لەوانەیە لاسایی بێگانەیان کردبێتەوەو ناوی قەرزگۆنەیان بەکار هێنابێ،

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە، دەبێ ئەوە بزانین، هەروەك چۆن هەخامەنشیەکان کەرەستەی زمانیی میدیەکانیان، لە نووسینەکانیان دا، لە کاروباری رۆژانەیان دا، بەکاریان هێنا، هەروەها، بەلای کەمی یەوە ناوی ناوچەو جێگاو شاریشیان دەگۆڕی.

گۆڕینی ناوی جێگاو ناوچەو دێهات و شار، لەلایەن ئاشووریەکانەوە، بە تایبەتی لە ناوچەکانی میدیادا، بەزۆری دەگۆڕدران و ناوی ئاشووریان لێ دەنراو خەڵکەکانیشیان دەگوێزرایەوە بۆ جێگایەکی تر.

کارویێشەی ناوگۆڕین، تەنانەت، بووبە نەخۆشی گریکەکان و

ئەوانیش گەلێ ناوی جێگاو شوێن و ناوچەیان گۆڕی.
بەپێی ئەم کێشــانـــە زمــاننــاسی یـەی سەرەوە، دەتـوانین بڵێین، کە دێونـاوچەی (بێساران) و (بایگان)و (هەورامان)و (مەریوان)... ناوی میـدی بن هەروەهـا، وشـەی (ئـەنجـومەن)، کە وشەیەکی ئاڤێستایی یەو حاڵی حازریش، بەهــەمــان واتــاو بە رووالــەتێکی دیکــەی دینیش - (جـەمجـەم) - بەکاردێ، ریشەی (ئەنگە)ی تیادایە، کە بووە بە (ئەنج)، بەڵام پارێزگاری واتای ریشە بنەرەتی یەکەی، هەر، کردووە.
وشـەی (سـەرهـەنـگ)ی پارسی نوێ، بەهـەمـوو رووالـەت وواتـاو ئاوازیەوە، وشەیەکی ناساکاری، میدی یە.

هەروەك، لەیـەکـێ لە تەتـە(لـەوحـە) هەڵـکـەنــدراوەکــانـی ئاشـــووریــەکـان دا، کە دەگـەرێتـەوە بۆدەمی ساڵانی (٧١٦ - پ. ز)و سەروکــڵاوی سارگــۆنی دووەم، هەنـدێ ناوی ناوچـەکـانی مادەکـان و سەرۆکــەکــانیــان هاتـووە، بۆوێنـە، وەك ناوی ناوچـەی (خـارخـار)و فەرمـانـرەوای ئەو ناوچەیە (کەیبایا)و ناوچە (ئەڵیپی) فەرمانرەوای (داڵتا)، هەروەها بەشێوەیەکی دووراندوور جێگاکانیشیان دیاری کراون.
لەم رووەوە بەراوردکـردن، دەورێکی باڵای هەیـەو بەهـۆیەوە دەتوانین دڵنیابین لەرەگ و ریشەی هەر ناوێ لەم ناوانە.
لە نەخشـەکـەدا، واخراوەتە بەرچاو، کە ناوچەی (خارخار) کەوتووەتە سەر لقێ لەلقەکانی سیروان.
بەو پێیــە، ئێمــە، ئەمــرۆ، دەگــەرێین بە دووای ناوی ئەو ناوچــەو جێگـایـانـەدا، کە کەوتوونەتە سەر لقەکانی (سیروان)ەوەو لەم ئاسۆیەدا، ئەم ناوانەمان بەرچاو دەکەون:
- ناوچـەی خورخـورە، کە کەوتـووەتە سەر لقێ لە لقە سەرووییەکانی سیروان و نزیك بە ناوچەی مەریوان - ی ئەمرۆیەو جوگەیەکی گەورەش، هەر بەو ناوەوەیە، کە ئەو ناچانەی ئاوەدان کردووەتەوە!
- لەنــاوچـەی شـارەزوورو بنـاری هەوارمـان دا، (خـورمـاڵ) هەیـەو شوێنــەواری زۆر دێــرینی تێدایــە. هەروەهــا، دێی (خـارگـیـلان)و (خەرپانی) هەن.
دێهاتێ، یان جێگایێ، یان ناوچەیەك کەرەگی، یاخود ریشەی (خ)ی تیـادا، بەدەیـان لەناوچەکانی کوردستان دا هەن. تەنانەت لە ژووروی رۆژهەڵاتی سلێمانی ئەمرۆوە، دەوڵەتی بەناوی (خەممان)یەوە هەبووە.
بەهەر حاڵ، ناوچەی خورماڵ وخارگێلان وخەرپانی، کەوتوونەتە ئەو ناوچـەیـە، کە بەهـۆی لقێ لە لقـەکـانی (سیروان)ەوە ئاوەدان، بوون کە ئەویش ناوی (زەڵم)و (دەڵێن)و لقەکانی تریەتی!
لەوە، دەکـات، کە وشـەی (خـار خار) بەواتـای (خـۆرەتـاو) هاتبێ، چونکە (خڤار) بە واتای (خۆر) هاتووە!
بەم پێیـە، ئەم وشـە ناسـاکـارە، یەکیـەتی نێـوان زمـانی ئاڤێستاوهی میدیەکان پیشان دەدات.
دەربارەی وشەی (ئەڵیپی = ئێڵیپی)وەو فەرمانرەواکەیەوە (داڵتا)، هیچ کامێکیـان، نەنـاوی (میـدی - ن)و نە (ئێرانی). من وەهای بۆدەچم، کە هەردووکیان ناوی ئاشووری بن، یان دەستکردیان بن لەگەڵ ئەوەش دا، حاڵی حازر دێی ئێلانێ، لەناوچەی خورماڵ دایە
ناوی فەرمـانرەواکەی (خارخار) کە (کەیبانا)یە، گومانی تیا نی یە، کە ناوێکی میدیەوییك هاتووە، لە دووبرگەو ئەوانیش، (کەی)و (بان = وان = ڤان)ن.
- (کەی) بەواتای (گەورە)، (خودا)، (سەرۆك)، (فەرمانرەوا)... هاتووە
- (بـان = وان = ڤان)، بەواتـای، (ئاگاداریکەر)، (پاسەوان)، (لەلە)، (بەخێوکەر)..... هاتووە.
بەهـەرحـاڵ، ئەم (قـەد)و (پاشبەندە)ی سەرەوە، لە ناوی شاهەکانی میدیادا لە ئاشکرایی، بە دیی دەکرێن!
(دوو) - لەرووی ئەندازیاریی و چەکی جەنگەوە.

تەتـە نووسراوەکانی سەردەمی شاهە ئاشووریەکان وبەدرێژی تەمەنی فەرمـــانـــرەوایی یـــان، وای بەدەستـــەوە، دەدەن، کە ئاشـــووریـــەکـان مەترسی یان، زۆر لە میدیەکان بووەو بۆیە هەمیشە هێرشیان بردووەتە سەر ناوچـە جۆر بەجـۆرەکـانی میـدیـاوئەنجـامی ئەو هێـرشـانـەش بە زۆری سەرکـەوتنی ئاشـووریـەکـان بووە، بەسەر میدیەکان داوگرتن و کوشتنی هەزاران جەنـگـاوەرو دیـلی میـدیـی وتاڵان کردن وبردنـی سەروەت و سامـانیـان ودانانی سەرانەی مانگانەوساڵانەو ەرزانە بۆهەر ناوچەیێ لەو ناوچـانـەی میـدیـا، کە داگیـریان کردبوو وزوربەی کاتیش ئەنجامی ئەو هێـرشـانە، گوێزانەوەی خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکە بۆجێگایەکی دیکەی دوورو گورینی ناوی ناوچـەکـەو دانانی سەرکاری خۆیان بۆفەرمانرەوایی هەریەکێ لەو ناوچانەبووە.
ئەم شەرو شۆرەی نێــوانیـــان، هەروەك وتمـان، تەنهـا جارێ نەبـوو بیرێتەوەو بەڵکو بۆماوەیەکی درێژ خایەن، خایاندوویەتی.
بەهـۆی ئەوپەیـوەنـدی یـەوە بێگـومـان لەیـەکتری یەوە فێری شتی زۆر بوون. بۆوێنە - (هەروەك لەسەرچاوە ئاشووریەکان، کە زوربەیان وێنەی نەقش کراویــان لەگـەڵ دایە) - قەڵاوسەنگەرەکانی ئاشووریەکان وهینی میـدیـەکـان چ جیـاوازی یـەکی ئەوتـۆ، لە رووی رووالەتی دەرەوەی، بە دەستەوە نادەن.
جەنگـاوەری میـدیـەکـان، بەتایبەتی سوارەکانیان، جگە لەوەی، کە لەســەرەتـای منـداڵی یـەوە خۆیـان بەسـواریی ئەسپ رادەهێنا، هەروەها شان بەشانی ئەوراهێنانەش خۆیان فێری تیرهاوێشتن (بەسواری ئەسپ) دەکــردو بەجــۆرێ، کە هەرگیــز تیـرێکیـان بەبـەلاش نەدەهـاویشت.

پیادەکانیان، خاوەنی تیروکەوان وخەنجەرو سپێری چوار گۆشە (قەڵغان) بوون.

بەهەرحاڵ ئەو جیاوازی‌یە، کە لە نێوان جەنگاوەرانیان بەدی بکرێ، جۆری جل وبەرگە، ئەگینا هەردوولا خاوەنی هەمان جۆری چەکن، کە ئەمەش ئەوە دەچەسپێنێ، کە هەریەکەیان، لەوی‌ترەوە فێری دروست کردنی هەمان چەك و بەکارهێنانی بووە.

ئەسپ، کە چوارپێیەکی بەرزەی میدیەکان بووەو بە ناویانەوە ناوبانگی دەرکردووە، گەیشتووەتە لای ئاشوورییەکان و ئەمانیش وەك میدیەکان، بۆ کاروباری جەنگ بەکاریان هێناوە.

وشەی (ئەسپ) یەکێکە لەو وشە (ماد)یانەی، کە کۆی (زمانی) (ماد)و هی (ئاڤێستا) دەکاتەوەو هەر بەهەمان ناوەوە لە لایەن (ئاشوورییەکان)و خەڵکەکانی تری نێوان هەردوو رووبار (بین النهرین)ەوە، بەکار هێنراوە.

لەرووی ئەندازیاری دیواری دەوران دەوری قەڵاکانیانەوە، وەها بەرچاو دەکەوێ، کە چ جیاوازیەك، کە شایەنی باس بێ، دەرناکەوێ! هەروەك قەڵاکان وشارەکانی ئاشوورییەکان. چەند دیوارێك، بە چوار دەوریان دا دروست کراوە، هەروەها پاشماوەی شاری (هەممەدان)یش وای دەردەخات، کە چەند دیوارێکی ئەستوورو بەرزو هونەریانە، بەچوار دەوری‌دا کراوەو واش لەقەڵەم دەدرێ، کە حەوت دیوارو هەر دیوارەش لەرەنگێ، بەچوار دەوری شاری (هەممەدان)دا کراوەو هەریەکێ لە سەرۆکی ئەو حەوت هۆزە یەکگرتووەی میدیەکان، لەنێوان دیوارێك و یەکێکی دیکەدا کۆشکی فەرمانرەوایی بۆ کراوە و بەپێی رێرەوی (کاریز) ئاویان بۆ هێنراوەتەوە!

(سێ) ـ لە رووی کاروباری کۆمەڵایەتی و کارگێڕی‌یەوە.

بەپێی ئەو هەواڵانەی، کە لەسەرچاوەی ئاشوورییەکانەوە دەستمان دەکەوێ، میدیەکان، خاوەنی سەرووەت وسامانێکی ئاژەڵی فراوان بوون و بەرووبوومی کشت وکاڵیشیان لە ئەندازە بەدەر بووەو ئاژەڵی هەرە گرینگ وگرانبەهاشیان ئەسپ ومانگاو ئاژەڵی وردەی وەك مەرو بزن بووەو ئەمەش بە رۆشنی لە سەرانەی ساڵانەدا، کە ئاشوورییەکان، لە میدیەکان سەندوویانە، بە وێنەو بە نووسینەوە دەرکەوتووە.

کۆمەڵی میدیەکان، بریتی بووە، لەوانەی‌کە لە دێهاتی گەورەو (نیمچە شار)و (گوند)دا ژیاون. سەرۆك هۆزە گەورەکان خاوەنی دەوڵەتی ناوچەیی بوون و ئەمانە، جگە لە خانەنەدان (خاوەن زەوی‌وزار)، باخەوان و کێڵگەوان شوان یان هەبووە. لە کاتی تێگیرانەدا سەرپاکیان ئەرکی شەریان کەوتووەتە ئەستۆو هەریەکێ لەوانە خاوەنی چەکی خۆی بووە.

کارگێڕی (ستەرابنشینی) یەکێکە لەو کارە وردانەی، کە پارسی هەخامەنشی و گریکەکان و پەرتەکان و ساسانیەکان و ئیسلامەکانیش لەسەری رۆیشتن و وشەی (ستراپ)ی میدی لە ناو فەرهەنگەکانی رۆژئاوایی‌کاندا دەنگی داوەتەوە.

تاوەکو سەرەتای بەرپابوونی دینی ئیسلام وشەی (ئەسپ)ی میدی لە سەرپاکی دەوڵەتە دێرینەکانی نێوان هەردوو زێ (میسۆپۆتامیا) هەر بەکار دەهێنرا!

وشەی (دێهات)و (دێ)و (کوێخا) لەسەرچاوە عارەبی‌یە کۆنەکان دا، بە هەمان واتا، بەکاردێت و لەسەردەمی سەرانسەری فەرمانرەوایی دەوڵەتی ئەمەوی‌یەکان و عەبباسیەکان دا، یاسای کارگێڕی میدیەکان، کە لە پارسەکانە (ئەوانیش لە میدیەکانەوە بۆیان بەجێ ماوە)وە وەریان گرتبوو، هەر بەکار دەهێنرا!

پێش ئەوەی، ئەم خاڵە بەجێ بهێڵین، دەبێ ئەوە بهێنینەوە یاد، کە هەمان دابەش کردنی کۆمەڵ، لە گاتەکان دا هاتووە بەلای نزیکیەوە، بەم جۆرە، دەگرێتەوە:

١ ـ دەمانە = Demana

٢ ـ ڤیس = Vis

٣ ـ سۆترە = Soitra

٤ ـ دەهیو = Dahyu

واتە، خاوەن زەوی زارەکان، یان دەرەبەگەکان، شاری‌یەکان، یان ماڵە گەورەکان و خانەدانەکان، بەندەکان و کرێکارو کێڵگەوانەکان، دێهاتیەکان و لە سەرووی هەموویشیانەوە (شاهەنشاە)، یان (خشاثرا).

ئەوجا، بۆ ئەم جۆرە بەرێوەبردنەو دابەشکردنی کۆمەڵایەتیە، مادەکان، بە سەرۆکایەتی شاهەنشاهـ ـ (ئەنجومەنێکی گشتیی، کە نوێنەری هەموو لایەنەکانی تێدا بووەو باشترین و لێهاتووترین و زاناترین پیاوانی میدیەکان بوون) ـ ئەنجومەنی پیاو ماقوولانیان هەمیشە لەکارا بووە (هەروەك، دیاکۆنۆڤ، بەدەم هیرۆدۆتەوە دەگێڕێتەوە، میدیا، ل ـ ٢٧٥)، بەم بۆنەشەوە، دەبێ وشەی (هەم جەمەن)ی ئاڤێستایی، کەبە هەمان واتا هاتووە، بخەینەوە یاد.

(چوار) ـ لەرووی رۆشنبیری دینی‌یەوە.

هەروەك لەمەوپێش تر، باسی ئەوە کرا، کە لە دێرین کاتەوە، بە لای نزیکی‌یەوە پێش یەکگرتنی هۆزەکانی میدیاو دەوڵەت پێکهێنانیان، لە ناوچەکانی میدیادا، دینێکی ئەوتۆ هەبووکە (یەزدانپەرستی) رێرەوی بووەو دینی زەردەشتیش، بە شێوەیەکی گەوهەریی نوێ‌کردنەوەی ئەو دینە بووەو پیلانی پەرەسەندنیشی لە چوارچێوەی کاروکردەوەی سوودبەخش دا بوو.

دروشمی دینێك، ئەوەبێ، کە داوای، بەرگری‌کردن لە نیشتمان، ئاوەدان کردنەوە، تەندروستی، رەنجدان، زۆرکردنی ئیماندان، بکات،

دەبێ چۆن بگەڕێتەوە، سەر پەرستنی (خواڵە)و بیری پڕپووچ و بت پەرستن!

ئا، لەم دەرفەتەدا، ئەوەی (هیرۆدۆت)، کە (ئەی.ج. ئاربەری) بە وێنە هێناویەتیەوە، بۆ پاڵپشتی ئەم وتەیەی سەرەوە، سوودی زۆرە، کە تیایدا هاتووەو دەڵێ: (هیرۆدوت، باسی دینی ئێرانیەکان دەکاو دەڵێ، کە ئەوان، وەك یۆنانیەکان. نە خاوەن بت بوون، نە بتیان پەرستووە، کەچی یۆنانیەکان بتیان، لە وێنەی مرۆڤ و ئاژەڵ دا دروست دەکردو لە ناو پەرستگادا، دایان دەناو دەیانپەرست ـ بەسەدەیەك پاش لەناوچوونی دارای هەخامەنشی).

کەوابوو هاتنە ناوەوەی دەیان بیروباوەڕی پووچەڵی دینی و خواڵەی وەك (ئەناهیتا)و (ئافرۆدایت = مێترا)و قوربانی دان لەرێی هەندێشتی پڕوپووچ دا، لە رێی ئاشوورییەکان و ئەوجا یونانیەکان و لەپاش بابلیەکانەوە بۆیان هاتووە.

حاڵی حازر، لە ناو کوردەواریی دا، وشەی (ئافرەت) بە خانمی ماڵ، دەوترێ و بەردەوام بەکار دەهێنرێ و ئەمەش بێگومان لە (ئافرۆدایت)ی یۆنانیەوە، کە خوای جوانی وبەر بووە، بۆمان هاتووەو بەجێ ماوە.

وشەی (ماگا)ی مادیش، چووەتە ناو گریکی و ئەرمەنی و ئاشوری و عارەبی ئێستاشەوە لەگەڵ نەختێ خاڵخاڵ کردن دا، کە وەك (ماگۆس)و (ماگی)و (مۆنج) بێ، بەکار دەهێنرێت.

(پێنج) ـ لەرووی رۆشنبیریی گشتی یەوە.

بەهۆی ئەنجامی ئەوجۆرە پەیوەندایەتی یەوەو ئەوجۆرە هەڵس و کەوتانەی دراوسێیانی میدیەکان و نەوەکانیەوە، تا ئەمڕۆ، زۆر بە ئاسانی هەندێ کەرەستەی زمانی جۆراوجۆرمان دەست دەکەوێ، کەیەك لەوی ترەوە وەری گرتووەو تائێستەش هەر بە هەمان واتاو ئاوازەوە بەکار دەهێنرێت.

ئەو کەرەستە زمانیانە، لایەنی جۆراو جۆرو چۆنیەتی ژیانی سەردەمەکانیانمان بۆ وێنە دەگرن، بۆ وێنە:

ـ (شکارتە)، وشەیەکی کشت وکاڵی وئابووری یە. زۆرتر پەیوەندیی بەو کەسانەوە هەیە، کە تەنیا بۆ (خودپێویستی) خەریکی دەبن. بە شێوەیەکی تر، (شکارتە = ئاشکارتە = ئەشکارتە) بریتی یە، لەچاندنی بنەتۆوی گەنم، یان دانەوێڵەو تەنها بۆ خواردنی ماڵ ومنداڵ، نەك بۆ فرۆشتن.

وشەی (ئەشکارتە = شکارتە) هەروەك من وەها بۆی دەچم تایبەتی یە، بەجێگا شاخاویەکان و کوێستاکانەوە، چونکە، کارکردن لە پێناوی خۆتە سلەلەکردن دا، لە هەمۆو روویەکەوە دروشمی دینی بووە. ئەوجا، بەکار هێنانی هەمان وشەو بە هەمان واتاو هەمان ئاوازەوەو، لەلایەن سۆمەریەکان و ئاکاریەکانەوە، جۆرە وەرگرتنێکی ئەوکاتە دەردەخا.

هەرلەم رووەوە، بۆمان هەیە، وشەی (بەڕوو)یش بە وێنەیەکی دیکەی قەرز کردنی ئەکادیەکان سەر ژمێر بکەین، چونکە داری بەڕوو هەرگیز لەگەرمیان دا ناڕوێ بوونیشی لەزمانی بابلی دا، بە شێوەی (بیلوت = belut) و لەعارەبی ئەمڕۆدا، بەشێوەی (بلوط) پاڵپشتی ئەو قەرز کردنەیە.

هەروەها، هاوبەشی بوونی بەدەیان وشەی دیکەی، وەك (توون)و (دووکان)و (چەوەندەر)و (بەرە)، لەنێوان زمانی کوردیی ئەمڕۆداو نێوان (ئەکاوی)و (سۆمەری)و (ئاشوری) وێنەیەکی تری ئەو پەیوەندایەتی یەیە.

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم.

(١) ـ مێژوونووسان، بە تایبەتی ئەوانەیان، کە خەریکی پشکنین و لێکدانەوەی مێژووی میدیەکان و سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەکەیانن، وەك دەوڵەتێکی یەکگرتووی دەوڵەتە بچکۆلەکان و ستراپنشینەکانی میدیا، بیروڕای جۆربەجۆریان بڵاوکردووەتەوە، کە بەدەگمەن دوانیان لەسەر بیروڕایەك لەو رووەوە یەکانگیربوون، بە تایبەتی لەرووی مێژووی سەرەتای دروستبوون و پێکهاتنیەوە!

ئەوەی، کە لەلامان روون بێ، ئەوەیە، کە لە نووسراوەکانی ئاشوورییەکان دا وا دەرکەوتووە، کە ئاشوریەکان مەترسی یەکی زۆریان لە دوژمنێکیان هەبووەو زوربەی کاتیش دەستیان بۆ ئەو دوژمنەیان راکێشاوە، ئەویش میدیەکان بوون، کە دراوسێی رۆژهەلاتیانن!!

ئەو دەست راکێشانەش دەگەڕێتەوە، بۆسالانی (٨٣٦. پ. ز)و ئەمەش بێگومان، ئەوە دەگەیەنێ، کە میدیەکان هەر لە زوویەکەوە خاوەن دەوڵەت بوون، یان بۆمان هەیە بڵێین، پێش ئەو دیاریکردنەی ئاشوورییەکان، میدیەکان دەبێ خاوەن دەوڵەت و خاوەن هێزو خاوەن دەسەلات بووبن!!

لەم رووەوە، وتەکەی مەردۆخ، زۆرتر بەلای راستی دا، دەچێ، چونکە ساڵی (٨٥٣. پ، ز)ی بەدەمی یەکگرتنی دەوڵەتە بچووکە ناوچەیی یەکانی (ماد)و چوونە سەرتەختی (کەیکوباد= ئارباکس)ی داناوە.

مەردۆخ، (زاڵ)، کە یەکێك لەپاڵەوانە بە ناوبانگەکانی ئێران بووە، بە یاریدەدەرو پاڵپشتی (کەیکوباد = کەیقوباد)ی دادەنێ و بەم بۆنەیەشەوە، هەندێ زانیاریی دەربارەی (زاڵ)و وەچەکانیەوە سوود خۆی دەبەخشێ لە شاهنامەی فردەوسی دا، باسی وەچەو نەوەی (سام)و (زاڵ)و (رۆستەم)و (زۆراب) وەك پاڵەوانان و یاریدە دەرانی کەیانیەکان هاتووەو لەو شاهنامەیەدا، پایەیەکی رێزو لێهاتنیان دراوەتێ. لەرووی دینیشەوە، بە (یەزدان پەرست) لەقەڵەم دراون.

لە ناو کوردەواریی ناوچەکانی هەورامان و کوردستانی ئێران دا،

بەدەیان رازو سەرگوزەشتەی ئەو پاڵەوانانە هەن.

سەرهەنگ ئەڵماس خان (میرزا ئەلماس خان)، کە یەکێك بووە، لە ئەفسەرە لێهاتووە کوردەکانی سەردەمی نادرشاهـ وخاوەنی بیروڕایەکی دینی ی کوردیی بووە، لە داستانە شیعری (کە نیزەك ویانزەرەزم)دا، باسی وەچەزای زاڵ دەکات و بە پاڵەوانی لێهاتوو بەرگەگریان لەقەڵەم دەدات. لەو رازەدا، دەمیان دەباتەوە، بۆ سەردەمی توورانیەکان. ئەو دەمەش، بەپێی بیروڕای مێژوونووسە ئێرانیەکان دەگەڕێتەوە بۆچەرخی (یانزەهەم - دەیەم)ی پێش زایین.

میرزا ئەڵماس خان، هەروەها (فردەوسی)یش، وای دەردەخا، کە زاڵ و وەچەزاکانی (ڕۆستەم وزۆراب) ئێزدان پەرست دەبن ولەکاتی نارەحەتی وتیگیرانەدا، روو دەکەنە خواو نوێژ ی بۆدەکەن ولێی دەپاڕنەوە، کە لەو تەنگ و چەڵەمەو نارەحەتیە دەربازیان بکات.

لەو جەنگی، یاخود بابڵێین، داستانە شیعری (کە نیزەك ویانزە رەزم)ەدا، (ڕۆستەم)ی کوڕی (زاڵ) بە پاڵەوانی شاهـ (کەی‌خوسرەو = کەی ئەخسان)ی دادەنێ و لەگەڵ توورانیەکان و (ئەفراسیاو)ی شایان دا دەجەنگن.

بەهەرحاڵ، میرزا ئەڵماس خان، بەم جۆرە، رازە هۆنراوەیی‌یەکەی دەست پێ دەکات و دەڵێت:

**«یاحەی، پێم بدەی واتەنێ تەمام**  
**واچووم شەرحی حاڵ، ئەولادانی سام**  
**وە لەفزی گۆران، بوا چوون یەکسەر**  
**داستانی شێران، ئێران سەرانسەر.**  
**چەپەران، یاوان، واتن: نەبەردەن**  
**شا، خەیاڵ، رەزم، ئێرانش کەردەن**  
**ئەوجا، بە غارەت خەسرەو پەرستان**  
**باوەران وەدەس، (ڕۆسەم)ی دەستان.**

(دەستنووسی لای خۆم. هەورامانی)

ئەم وەرگرتەیەش، دیمەنی نوێژکردن وپاڕانەوەیان لە ئێزدان، پیشان دەدا، میرزا دەڵێ:

**«زەوارە واتش: دادرەس وەدادم**  
**وە یەکتایی وێت، بدەر مرادم**  
**ئێرانی سوپا، تەمام بێ‌کەسەن**  
**ئینتیزار وەلوتف شای فەریارەسەن.»**

**(هەمان، سەرچاوە).**

شاعیری ئینگلیزی، (ماثیو ئارنۆڵد = Matthew Arnold)، دەربارەی جەنگ و زۆرانبازیی وپاڵەوانیەتی نێوان (ڕۆستەم)و(زۆراب)ی کوڕی‌دا، لە توووران، بە زمانی ئینگلیزیی، چیرۆکە هۆنراوەیەکی دوورو درێژ ی بۆ هۆنیوینەتەوە بەم جۆرە دەستی پێ‌کردووەو دەڵێ:

Sohrab and Rustum

«And the first grey of morning filled the eats,  
And the fog rose out of the Oxus stream  
But all the Tartar camp along the stream  
Was hushed ,and still the men were plunged in sleep.  
Sohrab alone he slept not. all night long  
He had lain wakeful, tossing on his bed,»

.(English Verse, V.V,P. 297 - 324)

(٢) - ئەوانەی، کە بە تەنگ پشکنین ولێکدانەوەی ژیان وبەسەرهاتی خاوەنی دینی (ئاڤێستا) وەن، وای بۆچوون، کە (زەردەشت) لە دەوروبەری سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین، یان لەنێوان سەدەی هەشتەم و دەیەمی‌دا، لە ناوجەرگەی نیشتمانی (ئێریەن ڤاچ)دا، لە دێیەك لەو دێیانەی ناوچەی ئۆرمیە لەدایك بووەو بۆ ماوەی (٧٧) ساڵێ ژیاوە.

لە تەمەنی پانزە ساڵی‌دا، زەردەشت، بە شێوەی بەرگی دینی وباب و باپیری رووالەتی جل وبەرگی خۆی گۆڕیوەو یەکێ لەو رووالەتە دینیانەشیان بەستنی پشتوێنی ئەستووری دینی بووەو ئەم ناونیشانەش بە تەواوی لەگەڵ پشتوێنی کوردەواریی ناوچەکانی شارەزوورو هەورامان و شارباژێرو دزایەتی و خۆشناوەتی وناوچەکانی بادینان دا یەك دەگرێتەوە.

ژمارەی پێچاوپێچەکانی ئەو پشتوێنەو ژمارەی گرێیەکانی پێشەوەی لە دەمی زەردەشتی‌یەکان دا، سێ پێچاو پێچ بوون و سێ گرێ بوون.

لە تەمەنی بیست ساڵانی‌دا، زەردەشت، بیروڕای دەربارەی دینی باب و باپیریەوە دەگۆڕێ و ئەو گۆڕانەش، بە جۆرێ دەبێ، کە شەوو رۆژ سەری دەخاتە گێژاوی بیرو لێك دانەوەی بیروباوەڕی دینی‌یەوە.

بۆ ماوەی، نزیکەی دەساڵی، بیری لە دەربارەی ئەو جۆرە بیرە دینیایەدا، کە بە پەردەی مێشکی‌دا دێن ودەچن، مەلە دەکات و تا وەهای لێ‌دێ، کە هەموو شتێکی لەو رووەوە، لا ئاشکرا بێ!

لە تەمەنی سی ساڵانی‌دا، وای لێ‌دێ، کە ئیتر نەتوانێ، ئەو بیرو هۆش وئاوەزە روونەکەی ناوناخیەوە، بشارێتەوە! بۆیە لەو پێناوەدا، هەوڵ و تەقالایەکی بێ‌پایانی زۆری دەدا، بۆ ئەوەی دینەکەی ئاشکرا بکات.

لەتەمەنی چل و دووساڵی‌دا، لە پێناوی بلاوکردنەوەی دینەکەی‌دا،
لەتەمەنی چل و دووساڵی‌دا، لە پێناوی بلاوکردنەوەی دینەکەی‌دا،
بریاری ئەوەی دا، کە خۆی بگەیەنێتە جێگایەکی پەناواوکپ تا لە ئەنجامی چەند کۆچەڵکۆچێك دا، لەشاری (بەلخ) گیرسایەوە.

لەوێ، لە ناوچەی (خاوەرزەمین)دا، لای یەکێ لە شاهە حوچەییەکان، کە (کەیوێشتاسپ) بوو، مایەوەو بەیاریدەی ئەو، توانی دینەکەی، بە ئاسانی لەو ناوچانەدا، بڵاو بکاتەوە.

بە زمانی (زەند)، کە بەزمانی ئەوسای ناوچەی (باختریا = خاوەرزەمین) دەوترا، ناوەڕۆکی ئاڤێستای بۆ لێك دانەوە تاوەکو بە ئاسانی ێی تێ بگەن (لەم رووەوە، بە زۆرتر زانین، تەماشای بەرهەمی: زرادشت الحكيم - حياته وفلسفته - حامد عبدالقادر - القاهرة - بکە).

(٣) - دەربارەی بنەماڵەی کەیانییەوە، بیروڕای جۆراوجۆر دەربراوە، هەندێ، وەها بۆ چوون، کە شاهانی باپیرەگەورەی میدیەکان بن وپێش هاتنە کایەی دەوڵەتی یەکگرتووی میدیاوە، بە هەزار ساڵێ یان کەمتر خاوەنی دەوڵەتی ناوچەیی بوون و میدیایەکانیش، بە سەر کەلەپووری ئەوانەوە فەرمانڕەوایی یان گرتووەتە دەست (تەماشای، مەردۆخ بکە، ل - ١٦١، تأريخ مردوخ).

هەندێکی دیکە، بوونی دەوڵەتێ، بە ناوی کەیانیەکانەوە، بە ئەفسانەی لەقەڵەم ئەدەن. (لەم رووەوە زوربەی سەرچاوە عارەبی یەکان لەگەڵی دان).

هەندێ سەرچاوەی دیکە، وەها بۆی چوون، کە لە باختریادا، بە تایبەتی لە (بەڵخ)دا، بە ناوی دەوڵەتی کەیانییەوە، دەوڵەتێ هەبووە.

هەندێکی دیکەش، لایان وایە، کە دەوڵەتی (کەیانی) یەکسەرەو پاش پێشدادیەکان دامەزراون. (تەماشای، نشريه أنجمن فرهنگ ايران باستان، ابراهيم بورداود، بکە).

بەبیروڕای ئێمە، ئەوەی مردۆخ وتوویەتی (لەبارەی کەیانییەوە) زۆرتر بەرەو راستییە، چونکە ئەو داستانە شیعرانەی، کە بە شێوەی هەورامانی هەن وباون - (داستانی کەیخوسرەو ئافراسیاب وداستانی رۆستەم و زۆراب وداستانی حەوت خوانی رۆستەم وداستانی کەنیزەك و یانزەرەزم و..... هتد).

زۆرتر باسی شاهانی کەیانی (ئەوشاهانەی، کە بە نازناوی کەی ناوەکانیان، دەستیان پێ کردووە) دەکەن، کە شەڕیان لەگەڵ شاهانی تووراننی دا کردووە. مێژووی ئەو رووداوەش دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی یەکەمی پێش زایین، یان تەختێ کەمتر لەوە.

بەم بۆنەشەوە، دەبێ وشەی (کەڤی = kavi) ئاڤێستایی، کە بە واتای (گەورە) یان (خودا)، دێو رووالەتی وشەی (کەی)یە، بهێنینەوە یاد.

(٤) - لەسەرەتاوە، زمانی ئاڤێستا، بە شێوەزمانی دایکزادی خاوەنی ئاڤێستا زەردەشت بووە، کە ناوچەقی ناوچەکانی ئێریەن ڤاچ بووە، لەبەر ئەوە، ناوەڕۆکەکەی، لە لایەن دانیشتوانی خەڵکی خاوەرزەمین و بە تایبەتی وڵاتی (کەیویشتاسپ)ەوە، کە باختریا بووە، کەمتر زانراو بووە، یان تا رادەیەك نەزانراو بووە، بۆیە زەردەشت، وای بەباش زانیوە، کە ناوەڕۆکەی بە زمانی باختریا، کە ئەوکاتە زمانی (زەند)یان پێ وتووە، لێك بداتەوە، بۆ ئەوەی، بە ئاسانی دانیشتوانی ئەو ناوچانە لێی تێ بگەن.

شایانی باسە، کە هەندێ سەرچاوە، وای لەقەڵەم دەدەن، کە زمانی (زەند) نزیك هەزار ساڵ پێش زایین زمانی سەرپاکی ئێران بووبێ (تەماشای: ل - ٢٤ - اطلاعات عمومي جديد - م - رياحى پور)

لێکدانەوەی ئاڤێستای کۆکراوە، لە لایەن ساسانیەکانەوە بە شێوەی زمانی پارسیك هەر هەمان ناوی (زەند)ی وەرگرتووە. وادیارە، وشەی (زەند - = زند) جگە لەوەی کە ناوی کۆنی ناوچەیەو ناوی کۆنی زمانی ئەو ناوچە کۆنەیەشە، هەروەها بە واتای (لێکدانەوە)ش هاتووە!

(٥) - نامەی تەنسەر، لەلایەن گەورەترین پیری دینی سەردەمی ئەردەشێر (٢١٢ - ٢٤١)ەوە، (بە فەرمانی ئەردەشیر)، نووسراوە.

گوایا، ئەم پیاوە دینی یەش، بۆیە (تەنسەر) یان پێ وتووە، چونکە مووی تەنی، لە هی سەری پتر بووە.

تەنسەر یەکێك لەو گەورە پیاوە دینیانە بووە، کە زوربەی زۆری ئاڤێستای لەبەر بووەو بە فەرمانی (ئەردەشیر)، سەر لەنوێ ئاڤێستای کۆ کردووەتەوە.

بەهەرحاڵ، نامێلکەیەك، بە ناوی (كتاب تنسر)ە، لە لایەن (يحيى الخشاب) عەمیدی کۆلێجی ئەدەبیات، لە قاهرە، ساڵی (١٩٥٤)، بەزمانی عارەبی، لە چاپ دراوە.

لەو نامێلکەیەدا، گەلێ شتی ئەو سەردەمەی ئەردەشیر و فەرمانی دینی دەربارەی جۆری هەڵس وکەوتی نارەواوە، تیایە. (تەماشای، كتاب تنسر، أقدم نص عن النظم الفارسية قبل الاسلام - يحيى الخشاب - القاهرە، بکە).

(٦) - مانی، لەبنەڕەتەوە ئێرانییەو هەندێ هەواڵیش وەها دەگەیەنێ، کە دایکی (مانی) لەبنەماڵەی شاهانی ئەشکانییەو لە کات و دەمێکیش دا، خاوەن تەخت و تاراج بوون.

ناوی باوکی (مانی)، کە (فاتك) بووە، خەڵکی شاری (هەمەدان) بووەو بۆ وڵاتی (بابل) کۆچی کردووەو لە دێیەك دا، کە کەوتووەتە ناو جەرگەی ناوچەی (میسین)ەوە، نیشتەجێ بووە.

باوکی (مانی)، (فاتك) لەوێ لە کۆبوونەوەی کۆمەڵەی (المغتسلە)دا ئامادە دەبێ و بەم جۆرە مانی (کە ساڵی ٢١٥ - ٢١٦)ی زاینی، لەکۆشی ئاینی (المختسلە)دا، لەدایك دەبێ و بەو دینە گۆش دەکرێ!

مانی، لەو دینانەی، کەلەسەردەمی دا باو بوون، بە قووڵی و بە وردیی لێیان دەکۆڵێتەوەو دەیان پشکنێ!

پاش ماوەیەکی پشکنین لەو رووەوە، لە تافی تەمەن پێ گەیشتنی دا، (مانی) وەها بڵاوی کردووەتەوە، کە ئەمیش (پەیامبەر)ێکەو دەیەوێ، کاری دینی خۆی لە (بابل)دا، تەواو بکات. هەروەك چۆن (بەد) لە

هینـدستـان داو (عیسـا) له ڕۆژ ئاواداو زەردەشت له وڵاتی ئێـران دا دینی خۆیان بڵاو کردەوە، ئەمیش، خۆی دەیەوێ زیاتریش لەوان هەنگاو بنێ و (خاتم الأنبياء) بێ!!

به هەرحاڵ، مانی، ساڵی (٢٧٦)ی زایینی له سێداره درا.

مانی جگه لەوەی له هونەرمەندێکی بێ هاوتا بووچ لەنەقش کردن وچ له وێنه کێشان دا، هەروەها خۆش نووسێکی بێ وێنه بوو.

یەکێك، له کتێبـه دینی یـەکـانی (شابورقان) بوو، که له کاتی چوونه سەرتـەختی شاپووردا، مانی پێشکەشی به (شاپوور) کردو به ئاشکرایی و به وێنەیەکی ڕەسمی دینەکەی، له لایەن (شاپوور)ەوە، پەیرەوی کرا!

جگـه لەوە، مانی خۆی دەستکـاری ئەلف وبێ ی نووسینی پالـەوی کردووە، که بگونجێ و بەو پێیەش، خۆی یەکێکه له نووسەرەکانی.

بەهـەرحـاڵ، باسکـردنی نامـه دینیـەکـانی مانی، که به (پـارسی ساسـانی) و به (پـەرثی) و به (ئـارامی) بڵاوی کردوونـەتـەوە، لەڕووی بەراوردکـردنی زمـانـەوانی یـەوە، دەورێکی یەکجـار گرنگیـان هەیـە، بۆ دیـاری کـردنی هەنگـاونانی ئەوشێوە زمانانه، بەرەو پێشکەوتن وله کات و دەمێکی تایبـەتی دا. (تـەمـاشـای، تراث فارس ئه. جی. ئاربـەری، بەعـارەبی، ل ـ ٢٣٦ ـ ٢٤٤ بکـەو ئەگـەر ویستیشت دەربـارەی مانی ـ یەوە، زۆرتـر بزانی تەمـاشـای، بەشی چوارەم، بلاد فارس في عهـد الساسانين، کریستنسن، بەعارەبی، بکه).

(٧) له بەرهەمی «من تراثنا اللغوي القديم ـ طه باقر» و (جولات تأريخية بين مواطن الآثـار في شمـالي العراق» گەلێ کەرەستەی زمانی کۆنی جۆر به جۆری کوردستـانی عیـراق ـ مان بۆ ئامادەکراوەو که ئەمەش بێگومان به هۆی لێکـۆڵینەوەی بەراوردەوە، دەمانگەیەنه ئەنجامێکی سوودبەخشی بێ هاوتـاوە بەتـایبـەتی لەڕووی دیـاری کـردن وناسینی کەرەسته زمانیەکان و دەستنیشان کردنی ڕەگەزیی زمانی یان.

(٨) ـ ئەگـەر ویستت لەم ڕووەوە، زانیـاریی زۆرتـرت دەست بکـەوێ، بەبیـرورای ئیمـه بگەڕێیتەوە، بۆ بەرهەمەکەی (د. جەمال ڕەشید)، که به ناونیشـانی؛ (لێ کۆڵینـەوەیـەکی زمـانـەوانی دەربـارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری ل ـ ٣٠٢) هەویه.

(٩) ـ حەوت دیـواره کۆنـەکـەی شاری هەمـەدان، یەکێکـه، یان کارێکه لەو کـاره هونـەری یـه ئەنـدازیـاریـانەیی جیهان، که سەرسوڕهێنەری به تەماشاکەریان دەهێنن.

مەردۆخ، وەها بۆی چووە، که شاری (هەمەدان) پێش ئەوەی بکرێته پایتەختی میدیەکان، هەبوووەو لەلایەن شایێ لەشایەکانی بابلەوە دروست کراوە. ئەوجـا، نوێ کردنـەوەی و پان و پۆرکردنی و دروست کردنی حەوت دیـواری بەرز و ئەستـوورو قوڵلەدارو هەریـەك لەڕەنگێ، به فەرمـانی (کەیقوباد) شاهەنشاهی میدیا بووە.

هەروەهـا، مەردۆخ، وەهـا تێمـان دەگەیەنێ، که له نێوان دیوارێك و ئەوی تردا، مەیـدان وپانتـایی یـەك هەبووە، کەکۆشکی سەرەك هۆزێکی تێـادا بووه. بەو جۆره، نێـوان هەر دیـوارێـك ویەکێکی دیکـه کۆشکو سەرەك هۆزێ بووه تاوەکو دیواری ناوەڕاست، یاخود حەوتەمین دیوار، که کۆشکی شاهی میدیەکانی تیادا بووه.

ڕەنگی دیـوارەکـان، هەروەك مەردۆخ، باسیـان دەکـات، یەکـەم سپی بـووەو دووەم ڕەش و سێـیـەم سوورو چوارەم شین و پێنجـەم پرتەقاڵی (نارنجی) و شەشەم زیوی و حەوتەم زێڕیی بووه،

بەو پێیه، حەوت سەرەك هۆز لەو شارەدا، لەنێوان دیوارێك و یەکێکی دیکـەدا، که به دەوران دەوری شاری هەمـەدان دا کرابـوون، کۆشکی سەرەك هۆزێ دروسـت کراوەو بێگـومـان، ئەم حەوت سەرەك هۆزەو شاهەنشاهـ، پێکەوه ئەنجومەنی سەرکردایەتی یان دروست کردووه.

مەردۆخ، بۆ ئەم وتـەیـەی سەرەوەی، پەنـای بردووەتـه بەر سەرچاوەی (پیرنیا، ل ـ ٥١) و (ملل قديمة مشرق، لـ ٣٧٨) و (تأريخ قديم اورمان، ل ـ ١١٨). (تەماشای، تأريخ مردوخ، ل ـ ١٧٠ ـ بکه).

ئەگـەرچی مەردۆخ، ناوونیشـانی حەوت دیـواره دەورانـدەوریـەکانی شاری هەمـەدانی چاك دەرخستبـوو، بەڵام، بەداخـەوە، ناوی حەوت هۆزەکـەی نەهێنـابـوو، بۆیـه پەنـامـان برده بەر سەرچـاوەری وەك (میدیا ـ دیـاکـۆنوف ـ کوردیی) و ئەوەمان دەست کەوت، که ئەو هۆزانەی یەکیەتی مادیان دروست کردوه، ئەمانه بوون!

(١) ـ بۆوسه = بەوسه، بۆوشه = Bousai

(٢) ـ ستـرەوکنەت = سترەوکنات = Strouknates

(٣) ـ پـەرەتاکن Paretakenoi

(٤) ـ ئاریزانتی Arizantoi

(٥) ـ بـــەودی Boudioi

(٦) ـ مـــــاگی Magoi

دیـاکـۆنـۆف، ئەم ناوانـەی، له سەرچـاوه ئاشـووریـەکـانـەوه یان یۆنـانیەکانەوه وەرگرتووەو ناوی یەکێکیشیان نی یەو ئەمەش، لەوە دەکات، کەنـەختێ ئاڵ و به دەنگـەبـز وێنـەکانیانەوه بەهۆی زمانی ئاشووریەوە یان هی یۆنانیەوە ڕووی دابێ.

ئێمـه، وەهـا بۆی دەچین، که ناوی هۆزی حەوتـەم، (مـادا) بێ و لەهـەمـوویشیـان دەم دارتـرو بەهێـزتـر بوو بێ و یەکـەم شاهی مادی یەکگرتووش بێگومان لەهۆزی (مادا) بووه.

دەمـەتەقێ کردنی ئەم ناوانه، لەلایەکی دیکەوه، به فراوانی دەکەین و بەراوردیان، لەگەڵ قەدوریشەی ئاڤێستایی و کوردیی ئەمڕۆدا، دەکەین.

# تاريخ مسيرة اللغة الكوردية

محمد أمين هوراماني

ان المصادر من الوثائق المدونة والمنقوشة والتي بامكانها ان تزودنا مباشرة، بالمعلومات الضرورية الكافية عن وصول اجداد الكرد القدماء والميديين وثقافتهم ولغتهم قليلة جداً، أو تكاد تكون معدومة لحد الان.

ورغم ذلك، بامكاننا ان نحصل على معلومات قيمة ومفيدة جداً عن الميديين والكرد ولغتهم وثقافتهم وتأريخهم وعلاقاتهم المختلفة والمتنوعة مع الشعوب المجاورة لكنها بصورة متفرقة وفي بعض الأحيان متضاربة وذلك في خفاياو بطون بعض الكتب والمصادر الأجنبية المختلفة التي كتبت ونشرت عن الشعوب الايرانية وحولها فيما إذا اعتمدنا على الطريقة العملية الكفيلة بتمحيص تلك المعلومات وإنتقائها.

فقد أعتمد هنا، في أول الأمر وكلياً على جمع المعلومات من المصادر الأجنبية الكثيرة المختلفة والمتنوعة، ودرس، جميع جوانب تلك المعلومات والمصادر، ومن ثم وضع تلك المعلومات في ميزان الدراسة المقارنة، أخدة بنظر الاعتبار الجوانب التأريخية واللغوية والدينية والسياسية والجغرافية والاقتصادية لبلاد كوردستان وفي المراحل المختلفة إبان الحكم الميدي والهخامنشي والهيليني والاشكاني والساماني والعربي الاسلامي، وعن طريقها، وحسب رأينا، أنتقينا معلومات كافية، وعلى ضوئها توصلنا الى:

أن اللغة الكوردية الحالية المتمثلة بلهجاتها (باستثناء المفردات الدخيلة والغريبة فيها) بموادها الأولية النقية، هي حفيدة اللغة الميدية وعليه والظروف التي مرت فيها، منذ مرت (اللغة الكوردية) بمراحل متعددة ومختلفة وبفترات زمنية متفاوته، يمكن حصرها بصورة تقريبية في المراحل التالية:

١ ـ مرحلة اللغة الكوردية القديمة.
٢ ـ مرحلة اللغة الكوردية الوسطى.
٣ ـ مرحلة اللغة الكوردية وظهور اللهجات.
٤ ـ مرحلة ظهور اللغة الكوردية الأدبية (الكوردية الحديثة)

فللدراسة اللغة الكوردية القديمة، التجأنا الى ثلاث نقاط رئيسة، ألا وهي:ـ

أ ـ دراسة بلاد كوردستان لفترة اكثر من سبعة قرون قبل الميلاد وبصورة خاصة من الناحية الجغرافية والدينية والأقتصادية والتأريخية والثقافية والقصد منها تشخيص اللغة المتداولة بين شعوب بلاد كوردستان لتلك الفترة.

ب ـ عدم أهمال المعلومات التي تشرت عن بلاد كوردستان و شعوبها ولغتها وتأريخها، سوى أكانت تلك المعلومات منشورة في المصادر الأجنبية أم في المصادر الكوردية والعربية، والاستفادة منها.

جـ ـ فقد فُقد أثر بعض المفردات اللغوية، للغة الميدية المتمثلة ببعض الاسماء وبعض المفردات والكلمات، التي التقطت قسم منها ضمن تدوينات اللغة الفارسية القديمة وبعض المصادر الأخرى التي نشرت معلومات قيمة عن الشعوب القديمة لبلاد ايران القديم، فهذه المفردات تشمل بعض الجذور والسيقان اللغوية للكلمات والمفردات الميدية من اسماء لشخصيات ميديه، وأمكنة استراتيجية مهمة أخرى.

فاستناداً، الى تلك المواد الأولية اللغوية الميدية، استطعنا ان نشخص كلمات ومفردات ميديه اصيلة في اللغة الكوردية الحالية، وعليه سلكنا طريقة الدراسات المقارنة بين تلك المواد الأولية اللغوية وبين مثيلاتها في اللغة الفارسية القديمة وبينها وبين اللغة الأفستيه (الگاتات)، وبينها وبين اللغة الكوردية الحالية، تبلورت لدينا نتائج مهمة، وكالآتي.

١ ـ هناك تشابه كثير بين اللغة الميدية واللغة الفارسية القديمة
٢ ـ هناك تشابه كثير جداً بين اللغة الميدية واللغة الأفستية
٣ ـ هناك تيشابه كثير جداً بين اللغة الميدية واللغة الكوردية

الا ان أوجه التشابه الموجود بين اللغة الميدية واللغة الأفستية اكثر بكثير مما هو موجود بينها وبين اللغة الفارسية القديمة، وبالاحرى أن اللغة الأفستية تعتبر لهجة من لهجاتها الدينية، وعلى هذا الاساس، استند المقال هنا، على دراسة المنعطف الشعري من (الگاتات) لغرض تحليلها لغوياً، كنموذج للغة الكردية القديمة، لغرض مقارنتها باللغة الكردية الحالية من حيث الأصوات وتكوين وتركيب ونحت الكلمات وتكوين الجمل.

# وشەی لێکدراوی بەستراو لە کوردی دا

● محمد معروف فتاح ●

پرفیسوری یاریدەر لە زانکۆی صلاح الدین

کۆلیژی ئاداب ـ بەشی کوردی / هەولێر

**سەرەتا:**

وشـەی لێکـدراو لە کوردیـدا لە چەنـد شێـوەیـەکی جیـاوازدا دەبینری. [1] بابەتی لێکولێنەوەکەمان ئەوجۆرەیان دەگرێتە خۆ کە لە دوو مۆرفیمی سەربـەخـۆیان زیـاتر (دوو وشەیان زیاتر) پێك هاتبن بەمـەرجێ بە ئامـرازی بەستن (و) لێکـدرا بن و بە ئاسـانی بێ تێکـدانی واتـای ڕۆنانەکە جێگە نەگۆڕنەوە ئاسایی ئاسایی ڕۆنانەکە هەمووی وکەرتە پێك هێنەرەکانیشی سەر بە هەمان بەشی ئاخاوتن دەبن.. [2] ئەگـەر نیشـانـەی س وع بۆکەرتـەکـان ونیشـانـە (أ) بۆ ئامرازەکە و د بۆ هەموو ڕۆنانەکە دابنێین، ئەوا لێکدراوی بەستراو [3] لەکـوردیـدا شێـوە هاوکێشەیەکی وەك د = [س + أ + ع] وەر دەگرێ وەك لەم نمـوونـانـە دەبـیـنـیـن: دەم وچـاو، نەرم ونـۆل، تەنگ وچەڵەمە، ژن ومال.... هتد.

مەبەست لەنووسینی لێکولێنەوەکە لەدوو خاڵدا کۆ دەبێتەوە: (١) باس لێکـردنێکی تێـر و تەسلی دیـاردەکـەو جیـاکـردنەوەی لەدیاردە زمـانییـەکـانی نزیکی و دیـاری کردنی سنـوورو تایبـەتیـەکانی و ئەو

پەیوەندییە واتاییانەی دووشەکەی بە یەکەوە گرێ دەدەن و ئەو هۆکارە کۆمەڵی و زمانییانەی وشەیەکیان بەسەر ئەوی تردا دەسەپێنی و چونیەتی بەکار هێنانی و دەوری ئەم لێکدراوانە لە زمانەکەدا بەگشتی

(۲) سەلماندنی راستیەك لەدوو توی لێکولێنەوەکەدا کەتا ئیستاش زۆر زمانەوان لێی بەگومانن: کردەکانی وشەسازی ورستە سازی لە هەلکەوت و سروشتدا هەر یەکن و بەسێ هەنگاودا دەرۆن: هەلبژاردنی کەرەسەی بەجێ و لێکدانی کەرەسە هەلبژیراوەکان و تێبینی کردنی ئەو گۆرانانەی لە ئەنجامی ئەم لێکدان و یەکگرتنەدا دێنە کایەوە. بێ گومان ئەو یاساو هەمەکی یانەی کە لە کردەکاندا دەیان گەیێنێ دیسان لە جۆردا جیاواز نین، با لە بلاوی و بەردەوامیش دا وەك یەك نەبن و بەدی هێنانیان لە کۆمەلە کەرەسەیەکی داخراواتر وبچووکتردا بێت. کەواتە، مەبەستی دووەمی لێکولێنەوەکە کە دەیخەینە دوو نوێ باسلێکردنێکی چروورد تێری بابەتەکەوە دۆزینەوەی ئەو یاساو هەمەکییانەیە کە لەم بوارەدا کار دەکەن.

بۆ گەیشتن بەو دوو مەبەستە، لێکولێنەوەکەمان دەکەین بە شەش بەشەوە (جگە لە سەرەتاو ئەنجام). لە بەشی دووەمدا سنوور وتایبەتیەکانی بابەتەکە دیاری دەکەین و ئەم لێکدراوانە لە فرێزی ئاسایی و لێکدراوی تر وئیدیەم جیا دەکەینەوە لە بەشی سێیەمدا لە پەیوەندی نێوان کەرتەکانی دەدەوێین لە رووی فۆرم وواتاوە. بەشی چوارەم دەربارەی چۆنیەتی رێز بوونی کەرتە پێکهێنەرەکانە ولێرەدا ئەو هوکارانە شی دەکرێنەوە کە کار دەکەنە سەر هەلبژاردنی کەرەسەی پێشەوە. لە بەشی پێنجەم دا لە هەندی تایبەتی ئامرازی بەستنی (و) لەم لێکدراوانەدا دەستیان لێ هەلْ دەگرێ. بەشی شەشەم لەبارەی شوێنی ئەم لێکدراوانەیە لەرستەداو بەشی حەوتەمیش دەوری لێکدراوەکان لەزمانەکەدا روون دەکاتەوەو هەندی بەکار هێنانی دیاری دەکات. دووا بەش باس لەو ئەنجامانە دەکات کە لێکولێنەوەکە دەستیان دێنی.

(۲) سنوور تایبەتیەکانی لێکدراوی بەستراو: ئەو وشانەی لەزمانی کوردیدا بەئامرازی بەستنی (و) لێك دەدرێن لەوانەیە فرێزی ئاسایی بن یان وشەیەکی لێکدراوی بەستراو یان ئیدیومن پێشەکی دەبێ ئەمانە لەیەکتری جیا بکرێنەوە تا تێکەلکردن روو نەدات.

۲ ـ ۱ لێکدراوی بەستراو فرێز: فرێزی ئاسایی لەکوردیدا لەچەند قالبێکدا دەبینرێ[٤] ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەو جۆرەیە کە کەرتەکانی بەهۆی (و)ەوە لێك دەدرێن: وەك کالەك و شووتی شین ومەنگ و قوڵ لەم رستانەی خوارەوەدا:

هەندێ کالەك و شووتیی هێنایەوە.

گۆمەکە شین و مەنگ و قووڵ بوو.

فرێزی ئاسایی بەم تایبەتییانەی خوارەوە لە لێکدراوی بەستراو جیا دەکرێتەوە

(۱) کەرتەکانی ئەم لێکدراوانە ئاسایی گەر ناو بن، ئەوا ناوی گشتین بەواتای ئەوەی تاکە ئامرازیء ناسیاوی و نەناسیاوی و کۆیان پێوە نالکێ، بەپێچەوانەی کەرتەکانی فرێزی ئاساییەوە کە هەر یەکەیان دەتوانێ ئەم ئامرازانە وەرگرێ

کالەکێك و شووتیەکی کری.

کالەکەکەو شووتیەکەی هێنا

* کارەکەو بارەکەی راپەراند.

* تەنگێك و چەلەمەیەکی دروست کرد.

تەنیا رێگە بۆ ناساندن، نەناساندن وکۆ کردنەوەی ئەم لێکدراوانە ئەوەیە کە ئامرازەکان بە کۆتایی دوا کەرتەوە بلکێنرێن:

کارو بارەکە راناپەرێنێ

کارو بارێك ئەو راپەرێنی، دەبێ چۆن بێ!

تەنگ و چەلەمەیەك هاتە رێگا

ژن و ماڵەکەی ناردەوە.

هات بۆ راپەراندنی ئەو کارو بارانە

(۲) لە فرێزی ئاسایی دا سنوور دانانرێ بۆ ژمارەی کەرتەکان (لەرووی رێزمانەوە) واتە دەتوانین بێ وەستان کەرت لە یەك بدەین و ئەوەی دەمان گێرێتەوە لەمە توانای دیاری کراوی مرۆڤ خۆیەتی (ماندوو بوون وهەناسەنەمان و تێ نەگەیشتنی قسەکەر و گوێگر) لە لێکدراو داژمارەی کەرتەکان (وشەکان) لە دوو تێناپەرن.

ناردم بە دوایی ئازادو رزگارو نەبەزو نەبەردو...

ناردوومە بۆ کتێب و قەلەم ومۆم و چراو

ناردیان بەدوای کەس و کارەکەیدا.

درێژ کردنەوەی لێکدراو بە زیاد کردنی کەرتێکی تر، جۆری لێکدانەکە دەگۆرێ بۆ فرێزی ئاسایی، واتە مەرجەکانی لێکدراوی تێدا ناهێلْی.

ناردوومانە بەدوای خزم و کەس و کارو دراو سێکانیاندا.

(۳) کەرتەکانی فرێزی ئاسایی بەئاسانی پاش وپێش دەخرێن بێ ئەوەی واتای فرێزەکە بگۆرن، لەم لێکدراوانەدا هەر کەرتە جێگەی خۆی هەیەو جێ گورکێ دەبێتە هۆی شێواندن و تێکدانی واتای رۆنانەکە:

منالێکی گورج و گۆڵە. (لێکدراو)

* منالیکی گۆڵ و گورجە
دەست و پلی دەشوات ( ⟪لێکدراو⟫ )
* پل و دەستی دەشوات
ژن و ماڵ ومناڵەکەی ناردۆتەوە
ناردم بۆ چرایەك و کتێبنیك و قەلەمێك
ناردم بۆ کتێبیك و قەلەمێك و چرایەك

(٤) کەرتەکانی فریزی ئاسایی لەیەکتر دەترازێن و ڕێگە دەدەن کەرەسەی تر بچێتە نێوانیانەوە، بە پێچەوانەی کەرتەکانی وشەی لێکدراوەکە نایانەوێ لە یەکتری دوور کەونەوە.

پارەی قەلەمێك و (وابزانم) دەفتەرێکت لامە
قەلەمێك و (درۆم نەکردبێ) دەفتەرێکت بۆ ناردم
* کەس و (وابزانم) کارەکەی خۆشیان ناوێ
* کیژ یکی گورج و (تابلێی) گۆڵە
* کیژ یکی نەرم و زۆر نۆڵە.

(٥) کەرتەکانی فریزی ئاسایی بەهۆی دیار خەرەوە دەتوانرێ فراوان بکرێن، بەپێچەوانەی لێکدراوە وە کەتەنیا وەك دانەیەکی لەیەك نەپچراو فراوان دەکرێن، واتە دیار خەر دەبێ بەدوایی کەرتەکاندا بێت و بۆ هەردوو کەرتەکە بگەرێتەوە:

قەلەمیکی جوان و جانتایەکی دەستی بەدیاری بۆ ناردم.
قەلەمە جوانەکەو جانتا گەورەکەم لێ بەجێ ما.
* دەستێکی نەرم و پلێکی جوانی پێوە بوو.
دەست و پلێکی جوانی پێوە بوو
دەست و پلێکی زۆر زۆر جوانی پێوە بوو.
* کچێکی نەرمی کەلەگەتی نۆل بوو.
کچێکی کەلەگەتی نەرم و نۆل بوو.

(٦) ئەو پەیوەندییە واتاییەی لە نێوان کەرتەکانی ئەم لێکدراوانەدا هەیە، پەیوەندییەکی سنوور دارە، واتە لەچەند جۆرێ تێناپەری وەك پەیوەندی هاوواتایی و دژ واتایی و گرتنەوە، (بڕوانە بەشی سێیەم). بە پێچەوانەوە، لە فریزی ئاساییدا هیچ جۆرە یاسایەك پەیوەندی واتایی نێوان کەرتەکان بە تەواوی دیاری ناکات. بەواتاکەی تر، نازانین کە دوو ناو یان ئاوەڵناو لەفریزدا بەیەکەوە نایەن. ئەگەر تەگەرەیەك هەبێت، دەبێ لەدەرەوەی زمانەوە بێت و پەیوەندی بە دەورو بەرمانەوە هەبێ:-

خزم و خویش، پەرت و بلاو (هاو واتا)
دەرو ژوور، سەرەو خوار (دژ واتا)
پارەو پوول (گرتنەوە)

لە ژوورەکەدا چرایەك، کورسی یەك، چەند کتێبیك، دوو سێ دەفتەر، قەلەمێك، گولێك، جانتایەك، هەندێ کەل و پەل. . . . هەبوو (تەینا دیمەنی ژوورەکە کە دەورو بەرە دەتوانی کەرتەکانی فرێزەکە دیاری بکات).

بەکورتی لێرەدا دەمانەوێ بڵێین کە دەتوانین پێش بینی ئەوە بکەین کام دوو وشە لێکدراوێکی بەستراو دروست دەکەن و کامانە لەوانە نییە دروستی بکەن بەهۆی شیکردنەوەی ئەو پەیوەندییە واتاییەی کەلە نێوان وشەکاندا هەیە، بەلام هەرگیز لەتوانادا نییە پێش بینی ئەو کەرەسانە بکەین کەلە فریزی ئاساییدا پێکەوە دێن یان نایەن بۆ نموونە، لەبەر ئەو واتا نزیکەی لەنێوان «ئاو» و «کانی»دا، یا لەنێوان «درەخت» و «دار» داهەیە، چاوەڕوانی ئەوە دەکرێ کە لێکدراوێکی وەك «کانی وئاو» و «داروددرەخت» لە زمانەکەدا هەبێ. دیسان لەبەرئەوەی هیچ پەیوەندییەکی واتایی وەك نزیکی واتاو دژ واتایی و گرتنەوە لەنێوان وشەیەکی وەك «بەرد»و «گەلا»دا نییە، پێش بینی ئەوە دەکرێ کە لێکدراوێکی وەك(*) بەردو گەلا یان (*) گەلاو بەرد لەزمانەکەدا نەبێ، بەلام هەمان دوو وشە لەوانەیە لەبارێکیدا وەك دوو کەرتی فرێزێ پێکەوە بێن:

- بەردو گەلای ئەو ناوەی کرد بە سەرماندا.
- گەلاو بەردەکانی نزێك کانیەکە لە دوورەوە زەرد دەچوونەوە.
- گەلاو بەردی ئەو ناوە هەموو خەراکن.

(٧) هەندێ جار ئەم لێکدراوانە بە شێوە لە فریزی ئاسایی جیا دەکرێنەوە، بە تایبەتی لەو کاتانەدا کە کەرتی دووەمی لێکدراوەکە لەسەر ئەوەی یەکەم دارێژ را بێت (بڕوانە بەشی سێیەم - أ) وەك:

حازرو بزر، سووك و سوڵ

(٨) جیاوازییەکی تری نێوان لێکدراوی بەستراو (یان لێکدراو گشتی) فریزی ئاسایی لە هێزدایە. لە فریزی ئاساییدا هەر دوو بەستراوەکە هێزیان دەکەوێتە سەر، لە وشەی لێکدراودا هێزی سەرەکی دەکەوێتە سەر دوا برگەی بەهێزی لێکدراوەکە واتە، لە وشەی دووەمدا دەبێ وەك بەم نموونانەدا دەر دەکەوێ:

کەس و کار، تەنگێ و چەڵمە، نەرم و نۆڵ.
قەلەمێك و پاندانێکی کرێ.

**لێکدراوی بەستراو لێکدراوەکانی تر:-**

لێکدراوی بەستراو وەك هەموو لێکدراوێکی تر خاوەنی چەند تایبەتی و خاسیەتێکەی کە لە وشەی سادەو دارێژ راو جیای دەکاتەوە. هەموو لێکدراوێك لە هەموو جۆرێك بێت لە دوو وشەی سادە یان زیاتر پێك هاتوون، وشەکانی جێ گورکێ ناکەن و

لەیەکتری دوورناکەونەوەو فراوان ناکرێن و بە هەمووشەکان تاکە هێزێکی سەرەکی وەردەگرن کە لە کوردیدا لەسەر دوا برگەی بەهێزە لە ڕۆنانەکەدا.

لێکدراوی بەستراو بەوە لە لێکدراوی ناسەربەخۆ (تابع) جیا دەبێتەوە کە هەر کەرتە بەهای لە کەرتەکەی تر کەمتر نییەو واتای لێکدراوەکە ئاسایی بریتییە لە لێکدانی واتای کەرتەکان. لە لێکدراوی نا سەر بەخۆدا یەکێك لە وشەکان هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ وشەکەی تر، واتە دیارخەرە، ئەوی تریش دیارخراو ڕۆنانەکە هەمووی کاکڵەییە بە واتای ئەوەی دیار خراوەکە دەتوانێ جێگەی هەموو ڕۆنانەکە بگرێتەوە وەك لەم نموونە شیکراوانەدا دەبینن

دار خورما = دار     دار (دیارخراو + خورما (دیارخەر)

تیر برژانگ =     برژانگ     تیر (دیارخەر) + برژانگ (دیارخراو)




جیاوازی نێوان لێکدراوی بەستراوو لێکدراوی «کورتە»ش لەوە دایە کە ئەویان کورتکراوەی گوزارەی کارێکی تیپەرە لە کوردیدا، واتە لەکاریکی تیپەرە لە کوردیدا، واتەلەکاریکی تیپەرو بەرکارێك یان تەواو کەرێکەوە دێ:

چێشت لێنان     چێشت (بەرکار + لێنان (کار)

بــەرگ دروون     بەرگ (بەرکار) + دروون (کار)

خــۆ فروشتن     خۆ (تەواوکەر) + فروشتن (کار)

جۆریکی تر لەم کورتە لێکدراوانە ئەوانەن کە لە ناوێك و (بەرکار) ڕەگی کار پێك هاتوون. ئەمانە بەوە جیا دەکرێنەوە کە جگە لەواتای کارو ناوەکە واتایەکی زیادەشیان لەئەنجامی لێکدانەکە پەیدا کردووە، ئەویش (ئەو کەسەی/ ئەوشتەی‌کە....

وێنە گر وێنە (بەکار) + گر (ڕەگی‌ڕابردوو)

ئەو کەسەی کە وێنە دەگرێ

هــێــزە ڕۆن =     هێزە     هێزە (دیارخراو) + ڕۆن (دیارخەر)

لە شێوەدا لێکدراوی بەستراو بە هۆی ئامرازی بەستنەوە کە بەتایبەتی (و)ە جیا دەکرێتەوە. [٧] شایانی تێ بینیە کە دانانی ئامرازی لێکدان (ئیزافە) لەنێوان دوو کەرتەکەی لێکدراوی ناسەربەخۆ واتاکەی ڕوون دەکاتەوەو دەیکات

بەفریز دار سێو     داری سێو

هــێــزە ڕۆن     هێزەی ڕۆن

پێش ئەم هەنگاوەش دەبێ دیار خەر هێنرا بێتە پێشەوە:

تەرە پیاز     پیازی تەڕ

گێلە پیاو     پیاوی گێل

ئەم هێلکاریە جیاوازیی پێك هێنانی هەر دوو جۆرەکە ڕوونتر دەکاتەوە:




نموونەی تر: کا فرۆش، دار فروش، سەرتاش، خوێن ڕێژ

هەندی کورتەش، بەتایبەتی ئەوانەی کە کارەکەیان تێنەپەرە، کورتکردنەوەی ڕستەیەکی تەواون، واتا لەڕستەیەکەوە (بکەر + کار) وەر گیراون و کەرتی یەکەم بکەری ڕستەکەیە ودووەم کارەکەی:

ڕۆژهەڵات     ڕۆژ (بکەر) هەڵهات (کار)

لە هەندی کورتەدا هەموو کەرتەکانی ڕستە بەتەواوی دەپارێزرێ وەك:

ئەو پیاوە لە گوێ مەدەیە دەژی

جۆریکی تر لە لێکدراو (لێکدراوی خاوەندی) ئەوانەن کە پەیوەندی نێوان دوو کەرتە کە بە زوری ئیزافەیە لەکوردیدا) هیچ شتێکمان دەربارەی واتای وشە لێکدراوەکە بۆ ڕوون ناکاتەوە. واتا، واتای لێکدراوەکە لێڵە چونکە لە ئەنجامی لێکداندا واتایەکی نوێ هاتوتە ئاراوەو تا ئەو واتایە دا ئەنێنەوە ناگەینە واتای لێکدراوەکە بۆ

نموونە وشەیەکی لێکدراوی وەك «بنەمۆم» بەواتای «بنی مۆم» نایەت بەڵکو بەواتای کەسێك دێ لە بنی موم بچیت لە کوردیدا یان کەسێکی زۆر کورت، ئەوەی شایان سەرنجە ئەوەیە کە ئەم جۆرە لێکدراوە بەزۆری لەزمانی کوردیدا حەمام، (کەسێکی بێ‌بار)، درکی مەم وزین (کارلێکدەر)، سەگی برسی، مانگای مالوان، گورگی پێ سووتاو، گێپەی جۆ (زۆر قەڵەو)، مەری گیژ (بێ‌دەسەڵات)، مووی لووت (ئەو کەسەی لە خەڵك نابێتەوە)، هەوری‌بەهار (لە پڕ هەڵدەچێ)، دەم پیس، دڵرەق، دڵ تەڕ، دڵ پیس، مشتەی ناو هەمانە، کەندوی بەتاڵ (لێ نەهاتوو)، گیسکی سەلەم (ریوەڵە) کەشکی ئاوەسوو، دەم بەهاوار، دەم پڕ، دەم زل، . . هتد ئەم جۆرە لێکدراوانە بەوە لەلێکدراوی بەستراو جیادەبنەوە کە واتاکانیان وەك نموونەکانی سەرەوە بەتەواوی دەری دەخەن زیاترە لەکۆی واتای دووکەرتە کە دیسان لەشێوەشدا بەوە لەیەکتری جیا دەکرێنەوە کە لێکدراوی خاوەندی ئامرازی بەستنی (و)ی تیدا نیە لێکدراوی بەستراو و ئیدیەم :

ئەمانە دوودانەن لەدووئاستی جیاوازدا، یەکەمیان دانەیەکی وشە سازییەو دووەمیان دانەیەکی واتا سازییە . لێکدراوی بەستراو وەك وانە ڕێزمانییەکانی تر هەر لە وشەورستەوە بۆی هەیە بگاتە پلەی ئیدیەم ـ بەڵام بیگومان هەموو لێکدراوێکی بەستراو ئیدیەم نییە . وەك لەم هێڵکارییەدا دەبیزی ئیدیەم دەتوانی لەچەند شێوەیەکدا خۆی بنوینی یەکێك لەم شێوانە وشەی لێکدراوەکە وشەی لێکدراوی بەستراویش دەگرێتەوە :




هەر چەندە ئیدیەم واتایەکی تایبەتی بێ‌هاوتا دەبەخشێ، هەموو ئیدیەمێك لەم ڕووەوە وەك یەکترنین . ئاسایی زمانەوانەکان بەپێی تاریکی و ڕوونی ئیدیەم چەند پلەیەك جیا دەکەنەوە لەزۆر لێڵەوە بۆ ڕوون وەك : ئیدیەمی تێکچڕژاو و ئیدیەمی لێکدراو [٨] ئیدیەمی تواونەتەوەو پێش بینی لەواتا کەرتەکانەوە ناکرێ . ئیدیەمی لێکدراو، بەپێچەوانەی جۆرەکەی ترەوە، تەنیا یەکێك لەکەرتەکانی گۆرانی و واتایی بەسەردا ودێ و لەرۆناندا شل و شێواوترەو ڕێگەیە بە هەندی یاسای ڕێزمانی بەر بلاو دەدەن بەسەریاندا جێ‌بەجێ بکرێ، ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەوەیە کەلێکدراوی بەستراو دەبنە ئیدیەم، ناگەنە ئیدمی پلەیەك (تێکچڕژاو)، بەڵکو لە پلەی دووەم دا دەمێنەوە، واتە گۆرانی واتایی تەنیا بەسەر یەکێك لەدوو کەرتەکەدا دێ و کەرتەکەی تر واتا فەرهەنگیەکەی خۆی دەپارێزێ . بۆ نموونە وشەیەکی لێکدراوی بەستراوی وەك «دەم وچاو» کەبەواتای «ڕوو» دێ گەیشتۆتە پلەی ئیدیەم بەوەدا واتاکەی لەواتای کەرتەکانەوە پێش بینی ناکرێ، بەڵام ئیدیەمی پلەیەك یان تێکچڕژاو نییە، واتە واتاکەی تەواو تاریك نیە، چونکە کەرتەکان هەر دووکیان هەر بەواتا فەرهەنگیەکەی خۆیان بەکار هاتوون .

ئەوەی شایانی زانینە ئەوەیە کە ئەم جۆرە لێکدراوە کەمتر لەهەموو جۆرەکانی تر دەبێتە ئیدیەم چونکە یەکێك لەتایبەتیەکانی لێکدراوی بەستراو ئەوەیە کەهەموو واتا لێکدراوەکە لە یەکێك لە کەرتەکاندا هەڵگیراوەو کەرتەکەی تر بۆ خەست کردنەوەو چڕکردنەوەی واتای کەرتەکەی ترە ئەم هەڵکەوتەی لێکدراوی بەستراو لەگەڵ سروشتی ئیدیمەدا ڕێ ناکەوێ چونکە ئاسایی واتا ئیدیەم لەکۆی واتای کەرتەکانی زیاترەو لەمانەدە پێش بینی ناکرێ . لەبەر ئەمە، ئاسایی لێکدراوی بەستراو زۆر کەم دەبنە ئیدیەم، ئەگەر بگەنە ئەم پلەیەش هەر لەپلەی دووەم دا (لێکدراو) دەمێننەوە .

**پەیوەندی نێوان کەرتەکانی وشەی بەستراو**

پەیوەندی نێوان کەرتەکانی وشەی لێکدراو بەستراوەکان لەدوو لایەنەوە لێك دەورێنەوە لایەنی فۆرم (شێوە)و لایەنی واتا

٣ ـ ١ لە رووی فۆرمەوە:

ئەوەی لێـرەدا تێبینی دەکـرێ ئەوەیـە کە لە هەندێ وشـەی بەسـتراودا دووکەرتـەکـە کەم وزۆر لەشێوەدا لەیـەك دەچن. ئەم لێکچوونـە کە هۆکارێکی زۆر گرنگە لە چەسپاندنی لێکدراوەکەدا دەگەرێتەوە بۆ دووپات بوونەوەی فونمێك یان برگەیەك لە سەرەتایان کۆتـایی کەرتی دووەمی وشـەی بەستراوەکەدا. لێکچوون ودووپات بوونەوە لەم جۆرە لێکدراوانەدا لە چەند شێوەیەکدا دەبێ:

(١) دووباره بوونـەوەی فۆنیمی یەکـەمی کەرتی یەکـەم لەسەرەتای کەرتی دووەمــدا: لەش ولار، خواروخیــچ، بەژن وبالاّ، کوررو کالّ، خزم وخویش، ئاخ وئوف، دۆســت ودوژمــن، شوخ و شەنـــگ، دەرودراوسێ، ماڵ ومنـــاڵ (منـــداڵ)، نەرم ونیـــان، گیروگرفت، کەس وکار، راست ورەوان، دارودرەخت.

(٢) دووپات بوونـــەوەی دووفۆنیمی سەرەتـــای وشـــەی یەکـەم لە سەرەتـــای وشـەی دووەمـدا: دەم ودەست، لەم ولەو، ئەم وئەو، قاپ وقاجاغ، زەبروزەنگ.

(٣) هاتنی فۆنمێکی نزیکی فۆنیمی سەرەتـای یەکـەم لە سەرەتـای وشەی دووەمدا: پەرش وبڵاو، گۆروکفن، کەروگا، .

(٤) دووباره بوونـــەوەی دوا فونیــمی وشـــەی یەکـــەم لە کوتـــایی دووەمـدا: ماڵ ومنداڵ، ماڵ وحاڵ، ئیسك وپروسك، چاوراو، رێك وپێك، شروپر، شەروشۆر، هەراوهوریا، .

(٥) دووپات بوونـــەوەی دووفۆنیمی کوتـایی یەکـەم لە دووەمــدا: بەزم ورەزم، حازروبرز، شل وملِ، خان ومان، ئیـــــسك و پروسك، چاوراو، شروپر، رێك وپێك . . .

(٦) دووباره بوونـەوەی فۆنیمیکی نزیکی کۆتـایی یەکـەم لە کۆتـای دووەمدا: کەروڵاڵ، ترس ولەرز، .

(٧) لێکچـــوونی سەرەتـاو کۆتـای یەکـەم لەگـەڵ سەرەتـاو کۆتـای دووەمدا: ماڵ ومناڵ، داروبوار، شەروشۆر، هەراوهۆریا، .

شایانی سەرنجە کە جۆری (١، ٢، ٧) تەواو بڵاون لە کوردیداو جۆرەکـانی تر کەمتـر بەرچاودەکـەون. ئەوەی زۆر کەم روودەدات ئەوانەن کە لەنێوان وشەکانی زمانێکدا دەبینرین وەك هاوواتایی یان نزیـك واتـای، دژ واتـایی (بـە هەمـووجۆرەکـانیـەوە)، جیاوازیو گرتنەوەی. ئەم پەیوەندییە واتاییانە ستیمایەکی ئەم جۆرە لێکدراوەیە کە لە هەموولێکدراوەکانی تری جیا دەکاتەوە. پەیوەندییە واتاییەکان بریتین لە:

(١) پەیـوەنـدی هاوواتـای یان نزیـك واتایی: لە هەندی بەستراودا وشەی دووەم هەمان واتای وشەی یەکەمی هەیە یان واتایەکی نزیك بەوی هەیـە: خزم وخویش، شوخ وشەنـگ، تەنـگ وچەڵەمە، وردوخاش، رق وکینـە، پەرش وبلاو، سووك وریـوان، کەم و کورتی، لەرولاواز، کۆت وزەنجیر، نەرم ونیان.

واتـا دووکەرتی ئەم جۆرە بەسـتراوە ئەوەنـدە نزیکن لەیـەکتـری کەزۆر جار کەرتی یەکـەم لە جێگـەی هەموولێکدراوەکە بەکاردێ: گەلاّ کەم وردوخاش ورد کرد، کچێکی شۆخ وشەنگـە شەنگــە شۆخە. کەم کورتی کورتی کارەکەی دەرخست!

پیـاوێکی سووك ورسـوا رسـوا سووك بوو. واتـای ئەم جۆرە لێکـدراوە لە واتـای هەردووکەرتـەکـەوە نایـەت، بەڵکـو لەکـەرتی یەکــمـدا جێگیـر بوو، وکـەرتی دووەم تەنیـا بۆخەست کردنـەو گەیاندنی واتای رۆنانەکەیە:

(٢) پەیوەندی دژ واتایی [9]

هەنـدێ لێکـدراوی بەسـتراو بریتین لە لێکـدانی دووشـەی دژ واتا. دژ واتایی لەم لێکدراوانەدا لەدوو شێوەدا دەبینرێ:ـ

أ ـ پێچـەوانـە! وشـەی دووەم پێچـەوانـەی وشـەی یەکـەم. پێچەوانەیی یەوە لە دژ واتایی تر جیا دەبێتەوە کە کەرەسەکانی بەراورد دەکـرێن (واتـە ـ تر، ترین) وەردەگـرن)وناکردنی یەکێکیان، تاکید کردنی ئەویتریانەوتاکی لە کەرەسەکان لە هەندێ رستەدا لەم بابەتە زۆرە وەك: باش وخراپ، سەروخوار، (قـــەی) بەرزونزم، گەرماوسەرما، ساردوگەرم، دۆست ودوژمن، هات وچۆ.

(ب) تەواو کردن: ئەم پەیـوەنـدییە بەزۆر لەولێکدراوانە دەبینرێ کە کەرەسە پێك هێنەرەکانی ناون، هەرچەند ئاوەلناویش دەبێ وەك: (نێـرومێ) لەم جۆرە لێکـدراوەدا کەرەســەی دووەم یەکـەم تەواو دەکـات: ژن وماڵ، ناوونیـشـــان، باوك وکور، ئاخ وئوف، خەت وخاڵ، بووك وزاوا، جێ ورێ، هات وچۆ، رەنگ وبۆ

(٣) جیـاوازی [10] ئەم جۆرە پەیـوەنـدییە بە زۆری لەولێکدراوانەدا دەبینرێ کە کەرەسەکانی رەنگن وەك: زەردوسوور، سەوزوسوور، رەش وسپی.

(٤) گرتنەوە: لەم جۆرە لێکدراوانەدا کەرتی دووەم ئاسایی جۆربکە، یان بەشێکـە لە کەرتی یەکـەم، واتـە واتـای کەرتی یەکـەم دووەمیش دا دەپـۆشی یان دەیگـرێتـەوە، وەك: پارەوپول، ماڵ و حاڵ، ماڵ ومناڵ،

دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە لێکدراوی لەوانەیە سەر بە پۆلی یان زیـاتـر لەوپۆلانـەی سەرەوە بێـت، بۆنمـوونـە، هات وچۆ،

پێچەوانەش و تەواو کردنیشی پیشان دەدات ئەمەش لە زۆر پۆلێنی واتاییدا روو دەدات

**ریز بوونی کەرتەکانی لێکدراوی بەستراو**

۱ ـ گرنگی شوێنی یەکەم

وەك لە سەرەتادا روونمان کردەوە لێکدراوی بەستراو بە زۆری لەدوو خانە یان شوێن پێك هاتووە کە بەهۆی ئامرازی بەستن (و) لێکدراون. ئەوەی شایانی سەرنجە ئەوەیە کە ئەم دوو شوێنە لە گرنگی وبایەخدا یەکسان نین، هەر چەندە ئامرازەکە ئەو بیرەمان دەداتێ (ئامرازی بەستن دوو شتی چوون یەك، وەك ناو، ئاوەلناو، کار، فریز، پارستە، رستە بە یەکەوەگرێ دەدات کەیەك دەوریان هەبێت لە (رستەسازیدا). شوێنی یەکەم ووشەیەی پری دەکاتەوە لە واتادا پر تروگرنگتر لە شوێنی یەکەم، شوێنی دووەم لەرووی واتای لێکدراوەکەوە گرنگی کەمترە، واتە بەشداری بوونی لە دروست کردنی واتای رۆنانەکەدا سست و بێ هێزە بە جۆرێك کە هەندێ جار لابردنی یان نەمانیشی کار ناکاتە سەر واتای لێکدراوەکە، بە واتایەکی تر لە واتای لێکدراوەکە کەم ناکاتەوە گرنگی شوێنی یەکەم لەرووی واتاوە لەم خالانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

(۱) لەو لێکدراوانەدا کە پەیوەندی هاوواتای کەرتەکان لەیەك دەدات، کەرتی یەکەمی لێکدراوەکە واتای هەموو رۆنانەکە پر بەپری هەڵ دەگرێ و دەوری کەرتی دووەم تەنیا خەست کردنی واتای یەکەم چەسپاندنی رونانەکە هەموویەتی، لەبەر ئەوە لابردنی واتای لێکدراوەکە ناشێوێنێ: رق و کینە = رق، لەرو لاواز = لەر، کۆن و زنجیر = کۆت، نەرم و نیان = نەرم، خزم و خویش = خزم. دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە کەرتی دووەمی ئەم لێکدراوانە وە نەبێ واتایان نەبێت، بەڵکو واتاکانیان لەناو رۆنانەکەدا بۆ ماوەیەك دەدۆڕێنن هەر لەبەر ئەوەی کە شوێنی دووەم لەرۆنانەکەدا وەردەگرێ.

(۲) لەو لێکدراوانەدا کە پەیوەندی دژ واتایی کەرتەکان گرێ دەدات، دیسان کەرتی یەکەم واتا سەرەکی رۆنانەکە هەمووی هەڵ دەگرێ، کەرتی دووەم تەنیا تاکیدی روودانی کارەکە تا رادەیەکی گەورە لەباری ئەرێدا، یان روونەدانی کارەکە بەهیچ جۆری لەباری نەرێدا، وەك بەم لێکدانەوەی ئەم رستانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

ئەو کورە راست و چەپی خۆی نازانی. (هەر هیچ نازانێ)

ئەو کورە بەراست و چەپدا هەڵ دەسورێ. (زۆر هەل دەسوورێ)

گەرماو سەرما بەدەست خۆی نییە (هەموو شتێ....

خۆ گەرماو سەرما بە دەست خۆی نییە (هیچ شتێ...

گەورەو بچووك رێزی دەگرن. (هەموو....

دۆست و دوژمن باشەی ناڵێن (کەس، هیچ کەس...

(۳) لە هەندێ لێکدراودا واتای کەرتی دووەم ئەوەندە لاواز و ناگرنگە کە بەتەواوی لە بیرچۆتەوە لە فەرهەنگی زمانان نەماوە، ئەو واتایەی هەیەتی لەکەرتی یەکەمەوە دێ. واتە، کەرتی دووەم زۆر جار بوونێکی سەربەخۆی نییە یان بەتەنیا لە فەرهەنگی زمانەکەدا باسی لێ ناکرێ وەك کەرتی دووەمی ئەم لێکدراوانەی خوارەوە: تەنگ و چەڵەمە، کشتو کاڵ، سووك و سوڵ، نەرم و نۆڵ، ئیسك و پروسك، درۆو دەلەسە، رێگاو بان، چاووراو رێك وپێك، خوارو خێچ، قوڕو قەپ، یان و پور[۱۱]....

بێگومان ئەگەر شوێنی دووەم بایەخی لەرووی واتاوە ببوایە، نەدەتوانرا بەم وشە کەم واتا بە تاڵانە پر بکرێتەوە.[۱۲] دیارە رێکەو تیش نییەکە بەزۆری ئەم وشە کەم واتایانە دەچنە کۆتایی وشە لێکدراوەکە، چونکە تەنیا لێرەدا بێ واتایی یان کەم واتاییان دەرناکەوێ وکار ناکاتە سەر واتای لێکدراوەکە هەمووی.

٤ ـ ۱ چونیەتی پر کردنەوەی شوێنەکان:

لەبەر ئەوەی کەرتی یەکەم بەزۆری هەڵگری واتا سەرەکێکەی هەموو لێکدراوەکەیە وا چاوەروان دەکرێ ئەم شوێنە تەنیا بەو وشانە بدرێ کە پر واتان یان بوونی سەر بەخۆیان هەیە. هەر لەبەر ئەمەشە کە هەندێ بەشی ئاخاوتن کە بوونێکی سەربەخۆیان نییەو بەگوێرەی شێوە لە بەشەکانی تر جیا ناکرێنەوە[۱۳] وەك بەرناو، ئامراز وپرتکەکان، کەم وزۆر لەم شوێنەدا نابینرێن. جگە لەمەش، تەنانەت ناو وئاوەلناویش کە هەموویان بەشێوەیەکی گشتی (تێگرا) رێگەیان دەدرێ ئەم شوێنەپر بکەنەوە، بەکردەیەکی هەلبژاردندا دەرون پیش ئەوەی شوێنی پێشەوەیان پی بسێنرێ، ئەمەش دیسان لەبەر گەورەیی و گرنگی بەشدارییەکەیانە لەواتای لێکدراوەکەدا. ئەو هۆکارانەی دەور لەکردەی هەلبژاردنەکەدا دەبینن بریتین لەمانەی خوارەوە (کەبەپێی گرنگی لیيان دەدوێن).

(۱) کورت ودرێژیی کەرتەکان:

---

لەو دوو کەرتەی دەپالیورێن بۆ پێك هێنانی وشەیەکی لێکدراوی بەستراو، دەبێ کورتەکەیان شوێنی پێشەوەی بدرێتی کورتی و درێژی لێرەدا بە ژمارەی فۆنیم وجۆری فۆنیم ناپیورێ بەڵکو بە ژمارەی برگە، ئەو کەرتەی لێکدراوەکە کە ژمارەی برگەکانی

زیاترن، بیٚ گویٚ دانە هیچ کاریٚکی تر دەچیٚتە دواوەو شویٚنی پیٚشەوە بۆ کەرتە کۆرتەکە بەجیٚ دیلیٚ. شایانی سەرنجەکە ئەم دەستوورە هەر لەپیٚکهیٚنانی وشە لیٚکدراوی بەستراودا کار ناکات، بەڵکو یاسایەکی بەر بڵاوی زمانی کوردییە لەریز بوونی زەنجیرە ئاوەڵناو ئاسانتر بەکار دیٚ[14] هەرکاتیٚك دوو کەرتە

(٢٠) جۆریکی تایبەتی لەم لیٚکدراوە کە بە دووبارەی کردنەوەی کەرتی یەکەم دروست دەبیٚت دوای گۆرینی فۆنیمی سەرەتا بە/م/: قاپ وماپ، چراومرا، راست وماست.... بە تایبەتی لە شیٚوازی دواندنی هەندیٚ ناوچە بەکار دیٚ، بەڵام تەنانەت، ئەمەش چۆتە ناو شیٚوازی ئەدەبیەوە وەك لەدیٚریٚ شیعری ناڵیدا دەبینن

دامیٚنی بە ئەنواعی گوڵ و مڵ خەملا بیٚ
گەنجیکی تیدا بیٚ کە طیلەسمی نەشکا بیٚ. (دیوانی ناڵی ل٦١٤

لیٚرەدا بە ئارەزووی ئەم جۆرە لیٚکدراوەمان خستە لاوە لەبەر ئەوەی کردەیەکی زیندوو بەردەوامەو بیٚ سنوورە بەوەدا کە هەموو وشەیەکی زمانەکە (جگە لەوانەی کە خۆیان بەدەنگی /م/ دەست پیٚدەکەن) ئەم لیٚکدارە یان لیٚ پیٚك دیٚت وبەمەش لە دیاردەی مۆرفولوجی دوور دەکەویٚتەوە.

(٢١) دەیان نموونە لەم بابەتە لەدیوانی دیلان و بەرهەمی چەند شاعیریکی لاودا دەبیٚنری وەك: بەزم لەجیاتی بەزم ورەزم ل١٤٢ کش لەجیاتی کش ومات ل١٥٣ شەنگ لەجیاتی (شوخ وشەنگ ل١٨٩) تەفر (لەجیاتی تەفروتونا ل٢٦٤)، خاش (لەجیاتی وردو خاش، ل٢٦٧)، نوتەك (لەجیاتی تاریك نوتەك، ل٢٦٨ پەرت (لە جیاتی پەرت و بڵاو ل٢٧٤ - دیوانی دیلان).

پالیوراوەکە لەدریژ یدا وەك یەك بوون، واتە لەژمارەی فۆنیم وبرگەومۆرفیم دا یەکسان بوون، ئەوا دابەشکردنیان بەسەر دوو شویٚنەکەدا بەپیٚ ی دەستووری تر دەبیٚت. ئەم لیٚکدراوانەی خوارەوە بەپیٚ ی ئەم دەستوورە کەرتەکانیان دابەش بووە:

تەنگ وچەڵمە، دۆست ودوژمن، کەم وکورتی (کوری)، دایك و فرزەند، میرو گەزیر، (بووەبە) داسك ودەرزی، (لە) خۆشی وناخۆشیدا، خەم وپەژارە شەڕوئاشتی، فەقیرو دەولەمەند، راست ورەوان، ناوونیشان، بیروباوەر، بنج وبناوان، دڵ ودەروون، پیچ وپەنا، گەشت وگوزار، کۆشك وباڵەخانە، چۆل و بیابان، توندوتیژی، خەم وخەفەت

(٢) لەو لیٚکدراوە بەستراوانەدا کە پەیوەندی پیٚچەوانە دووکەرتەکە بەیەکترەوە دەلکیٚنیٚ شویٚنی پیٚشەوەی لیٚکدراوەکە بەو کەرەسەیە پر دەکریٚتەوە کە گەرمە (موجب) وکەرەسە ساردەکە دەچیٚتە دواوە. ئاوەڵناوە گەرمەکە خاوەنی چەند تایبەتیەکە وەك خۆ بەتاڵ کردنەوە لەواتا لەهەندی رستەدا، هاتن لەورۆنانەدا کە چەندیٚتی پیٚشان دەدات، توانای بەراورد بوون و.... هتد[15]

(قسە)ی بەرزونزم، گەرماوسەرما، باش وخراپ، راست و چەپ، گەورەو بچووك، دوورونزیٚك، راست وچەوت، دۆست و دوژمن، خۆشی وناخۆشی، دەبیٚ تی بینی ئەوە بکەین کەدەستووری یەکەم بەسەر دووەمدا زاڵە، واتە، لەم کۆمەڵەشدا کەرەسەی دریٚژ بیٚ گویٚدانیٚ گەرمی و سارد هەر دەچیٚتە دواوە:

تاڵ و شیرین، فەقیرو دەولەمەند،

(٣) ریٚز بوونی کەرەسەکان لە هەندیٚ لیٚکدراویٚ بەستراو راستەوخۆ لە ژیرکاری لیٚکدراوی تری ناو زمانەکەدایە، واتە هەندی لیٚکدراو لەبەر هەندی قاڵبی پیٚشتردا دەریٚژ ین وبریتین لە لاسایی ئەمانە، بۆ نموونە هەموو ئەو لیٚکدراوە بەستراوانەی کە «دەم» یەکیٚك لە کەرەسەکانیتی، (وەك دەم وچاو، دەم ولووت، دەم وفلق، دەم و دەست، دەم دان.... هتد) شویٚنی یەکەم بەوشەی (دەم) دراوە ئەمەش بەڵگەیەکە هەموو لیٚکدراوەکان بەدوای دروستبوون وهاتنە کایەی یەکەم دانەیانەوە قاڵبی ئەویان وەرگرتووەو ئەم قاڵبەش بەردەوام لە کوردیدا بەکار دیٚ بۆ داتاشینی لیٚکدراوی بەستراوی نویٚ نموونەی تریش لەم بابەتە زۆرن:

سەر: سەرو کەللە، سەروگوێلاك، سەروریش، سەروپیٚ سەرو سەکوت، سەرو چاو.

دار: دارو دەخت، دارو بەرد، دارو پەردوو، دارو دیوار

ئەوەی تیٚبینی دەکریٚ لیٚرەدا ئەوەیە کە لیٚکدراوی بەستراو نییە لەزمانەکەدا «سەر» و «دار» کەرتی دووەم بیٚت لەناویاندا. لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە نموونەکان جاریٚکی تر ئەوە دەسەلمیٚننەوە کە دەستووری یەکەم (بروانە دواوەی کەرەسەی دریژ) بەردەوام لە کوردیدا پەیرەوی دەکریٚ (بروانە سەروگویلاك، سەرو سەکوت، سەرو کەللە، دارو پەردوو).

(٤) هەڵبژاردنی کەرەسە بۆپرکردنەوەی شویٚنی یەکەم هەندی جار پەیوەندی بەباری کۆمەلایەتی ئەو خەڵکەوە هەیە کە زمانەکە بەکار دیٚنن. پەیوەندی نیٚوان زمان و کۆمەڵ راستیەکە مشت و مری تیدانەماوە،[16] لەبەر ئەوە شتیٚکی سەیر نییە کەهەندیٚ یاساو دەستووری زمانەکە رەنگدانەوەیەکی راستەوخۆی ئەوخۆو بەهایانە بیٚت کە کۆمەڵ باوەری پیەتی و بڵاوە لە ناویاندا. لەناو کۆمەڵی کوردیدا کە تا ئەم دواییەش کۆمەلیٚکی کشتوکالی بووەوژ ن وپیاو

لەبەر ئەوەی بەیەکەوە رەنجیان داوەو کاریان کردووە تارادەیەك وەك یەك سەیر کراون، ئەمەش لەهەندی لێکدراوی بەستراودا رەنگی داوەتەوە، چونکە لە هەردوو لە هەندێکیاندا جینسی نێرو لەهەندیکی تریاندامێ پێش دەکەوێ:

ژن و مێرد، ژن و پیاو، بووك و زاوا،

نێرو مێ، باوك و کور،

لەرێز بوونی کەرتی هەندی لێکدراودا پلەو پایەو بەرزی و نزمی لە روانگەی کۆمەڵەوە دەور دەبینێ: پاشاو گەدا، وەستاو شاگرد، میرو کزیر، گەنج و پیر، گەورەو بچووك.

(٥) لە هەندی لێکدراوی بەستراودا، رێز بوونی مۆرفیمەکان بەپێی کاتە، واتە پاش و پێش هەنگاوەکانی کردەکە. شوێنی پێشەوە بۆ هەنگاوی یەکەم یان قۆناغی یەکەم دادەنرێ، شوێنی دوەمیش بۆ ئەوەی تر:

ترس و لەرز، قات و قر، تیرو کەوان، ئیستەو ئەوسا، سیوو جگەر. ئەم جۆرە بەتایبەتی لەو لێکدراوانەدا دەبێ کە کەرتەکانی لەبنەرەتدا کارن و (یان رەگی کارن):

هات و چۆ، بگرەو بەردە، بگرو بکوژ.

(٦) لەو لێکدراوانەشدا کە هەردوو کەرتەکە باس لەناوچەیەك دەکەن یان دیمەنێ دروست دەکەن، رێز بوون لە گەورەوە بۆ بچووکە، بە واتای ئەوەی ئەو کەرتە پێش دەکەوێ کەواتایەکی فراوانتری هەیە، یان ناوچەیەکی گەورەتر دادەپۆشی یان لە دوور ترەوە دەبینری یان ئاشکراترەو زووتر بەرچاو دەکەوێ، ئەو کەرتەش کە واتاکەی تەسکترەو ناوچەیەکی کەمتر دادەپۆشی وپاش زەمینەی دیمەنەکە دەنەخشێنی، ئاسایی دەچێتە شوێنی دووەم

کانی و ئاو، باخ و بێستان

سەرو چاو، سەروپێ، سەرو گوێلاك

قاچ و قول، خاك و بێڵ و پاچ

دەست و پەنجە، لارو لەنجە

دەم و چاو، دەم و لووت،[١٧]

(٧) هەندی لێکدراوی بەستراو هەیە کە لەزمانی ترەوە وەرگیراون ورێزە دێرینە کەشیان هێناوەتە کوردیەوە، واتە شوێنی کەرتەکانیان نەگوراوە وەك:

ئادەم و حەوا، لەیلاو مەجنوون، حەول و قووەت، مەدح و سەنا، لوتف و کەرەم، دیسان ئەمانەش لەسنووری یاسای یەکەم دەر نەچوون.

لێرەدا دوو خاڵی زۆر گرنگ سەر هەڵدەدەن: (١) دەستووری یەکەم، رێز بوون بەپێی درێژی یا قورسی برگە لەهەموو هۆکارەکانی تر بەهێز ترە وچاری هەموو نموونە دژەکانیش دەکات: بۆ نموونە لە لێکدراویکی وەك (فرو فیشاڵ)دا هاتە پێشەوەی کەرتی یەکەم بەپێچەوانەی هەموو بۆچوونەکانی سەرەوەیە، چونکە واتای پری هەیەو نەوەرگیراوە لەزمانی ترەوەو نەگەرمەو نە لەسەر قاڵب دارێژراوە تاکە هۆکار ئەوەیە کە (فیشاڵ) درێژترە ودەبێ دواوە بگرێ. بەمە شوێنی سەرەکی بۆ مۆرفیمیکی بەند واتا دوراو بەجێ هێشتووە(٢) چونکە پێشەوەی هەندێ کەرت زیاتر لەهۆکارێکی هەیە وەك لە لێکدراویکی وەك «سەروگوێلاك» دادەبینن، (سەر) دەبێ بەپێی دەستووری (١) و (٣) و (٤) و (٦) بکەوێتە پێشەوە

**٥ ـ پەیوەندی نێوان ئامرازەکەو کەرتەکانی لێکدراوەکە:**

ئەوەی شایانی تێبینیە لەم جۆرە لێکدراوانەدا ئەوەیە کە رەفتاری ئامرازی بەستن (و) رەفتاریکی ئاسایی ئامرازی بەستن (حروف العطف) نییە، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆئەو راستیە کە کەرەسەی وشەی لێکدراو وئیدیەم زۆر جار واز لە هەندێ تایبەتی خۆیان دێنن ودەگۆرێن لەپێناوی بەدەست هێنانی دانەیەکی رێزمانی نوێ واتە دروستکردنی دانەیەکی نوێ زۆر جار وا لە کەرەسەکان دەکات کە دەست لە هەندێ تایبەتی خۆیان هەڵگرن تا بتوانن لە گەڵ یەکتریدا بگونجێن[١٨] بۆ هێنانەدێ ئەم گونجاندنە دووگۆرانی گەورە بەسەر ئامرازی بەستانی (و)ی ئەم لێکدراوانەدا هاتووە.

١) ئامرازی بەستن ئەم وشە لێکدراوانە (و)، بەپێچەوانەی ئەو ئامرازەی کە دووشت یان زیاتر لە (دووشە، دووریز، دووپارستە، دوو رستە) یەکەوە دەبەستی (و) گوێ ناداتە سروشت و هەلکەوتی دوو کەرتەکە وئەو مەرجە ناسەپێنی کە هەر دووکیان سەر بەیەك بەشی ئاخاوتن بن. بە واتایەکی تر، (و) دەتوانێ دوو کەرەسە بەیەکەوە گرێدا کە هەر یەکەیان بەشێکی جیاوازی ئاخاوتن بێ.

کورەکە دەست و برد ئیشەکەی بۆ راپەراندم

دەست وَ برد > دەست (ناو) + برد (رەگی کار)

بیگومان (و١) ئەم توانایەی نیە وەك رێزمانی رستەی ١و٢ وناریزمانی ٣و٤ دەری دەخەن:

پاکەت و شقارتەو وردەواڵە دەفرۆشێ

کورەکەی وریا و زرنگ و دڵسوزە

*کوەکەی وریا و زرنگ دڵسۆزیە

*کورەکە نیشانەی وریا و زرنگی و دڵسۆزیە

٢) و٢ ، بەپێچــەوانــەی‌وتوانـای گۆڕینی بەشی ئاخـاوتنی کەرتـە لێکـدراوەکـانی تێدایە، واتە دەتوانی لە لێکدانی دووکار، ناوێك بە دەست بێنیٛ یان لە لێـك دانی دوونـاو، ئاوەڵنـاو دروست بکات لەم خاسیەتەدا وەلە هەندێ بەرناو (بەناز، بێ‌ناز) دەچن کەدەبنە پێشگر لەناوەوە ئاوەڵناو دادەرێژ ن : بۆ نمونە

(١)دەم (ناو) + دەست (ناو) > دەم و دەست (ئاوەڵکار)
(٢) دەست (ناو) + ئەژنۆ (ناو) > دەستەو ئەژنۆ (ئاوەڵکار)
(٣) هات (کار) + نەهات (کار) > هات و نەهات لە رێگای
هات و نەهات (ئاوەڵناو ئاسا)
(٤) هات (کار) + چۆ (کار) > هات و چۆ (ناو)

ئەم رەفتــارە نامـۆیـەی و٢ ونـزیـك بووئەوەی لە بەرنـاو وای لە هەنــدێ زمــانــەوان کردووە کە ئەو لێکــدراوانـــەی بە بەر ناویش بەستراون بەلێکدراوی بەستراوی دابنێن وەك : دەست بەجێ ، جێ بەجێ ، سەر بەرەو خوار ماهە پروون بەهە پروون [١٩]

٦ ـ شوێنی لێکدراوی بەستراو لە رستەدا :

شوێنی لێکدراوی بەستراو لەرستەدا بەپێ‌ی ئەو بەشە ئاخاوتنەی کە لێکدراوەی کە پێکی دێنی دەگۆرێ شایانی سەرنجە کە زۆربەی کات ئەو بەشــە ئاخـاوتنـەی لێکـدراوەکـە پێکی دێنیٛ هەر ئەو بەشە ئاخـاوتنـەیـە کە کەرتـەکـان تاکـە تاکـە لەسـەرین . بەواتایەکی‌تر، بەستنی دوو ناو بەیەکترەوە هەر ناومان دەداتێ هەروەها بەستەنی دوو ئاوەڵنـاو دیســان ئاوڵنـاو دەدات بەدستەوە لە هەندێ باردا پێچەوانەی ئەم دەستــورە دێتــە بەر چاو: بۆ نمــونــە ، بەستـەنی دوو کار لەم لێکـدراوانەدا ، لەجیاتی ئەوەی کارێکی لێکدراو بدات بە دەستەوە، ناوێکی لێکدراو پێك دێنیٛ (بروانە : هات (رەگی کار) + چۆ (رەگی کار) هات و چۆ (نـاو)، هەروەهـا : دەم و دەست، بگرەو بەردە بەم پییە ، لە دوو توێ دوو دەستوری فراواندا دەتوانین شوێنی لێکدراوی بەستراو لە رستەدا دیاری بکەین :ـ

(١) ئەگـەر وشـە لێکـدراوەکـە ناو بێت یان ئاوڵنـاو ئەوا لەهەموو ئەو شوێنـانـەدا بەکـار دێ کەبە ناویان ئاوڵناو پر دەکرێنەوە . لەزمانەکەدا وەك! بکەر، بەرکار، تەواوکەری‌کار، دیارخەر. . . . هتد.

وەك بەم نموونەدا دەردەکەوێ :

ماڵ و مناڵەکەی گەیشتن (بکەر)
ماڵ و مناڵەی ناردەوە (بەرکار)
بەماڵ و مناڵەوە هاتوون (تەواو)
پارەی ماڵ و مناڵەکە شی‌خوار دووە (دیارخەر)
ئاوڵناو: شۆخ و شەنگەکانی بەخۆیان دەنازن (بکەر)
شۆخ و شەنگەکان هەڵ دەبژێرن (بەکار)
یەکێکی لەو شۆخ و شەنگانە هەڵبژارد (تەواوکەر)
ئەو کچە شۆخ و شەنگانە خەڵکی کوێن؟ (دیار خەر)

(٢) ئەگـەر وشـە لێکـدراوەکـە ئاوەڵکـار بێت، ئەوا هەموو شێوینانە دەگـرێ کە ئاوڵنـاوی تێـدا دەبینـرێ وەك : پێش کار، پێش بکـەر، دوای بەرکـار شایـانی تێ بینیـەکـە کەم لەم لێکـدراوە ئاوڵکـارانە لە بنچینـەدا . لە ئاوەلکـارەوە دروست دەبن، بەتـایبـەتی لەبـەر ئەوەی جگـە لە ژمـارەیـەکی زۆر کەم لە ئاوەلکاری شوێن دەکات ورادەی ئاوەڵکار لە کوردیدا نییە، بەڵکو بەشەکانی تری ئاخاوتنە کە ئاوەڵکار ئاسا (وەك ئاوەڵکار) بەکار دێن

ژنەکە ئیستاو ئەوسا نەهاتە دەرێ. (پێش کار)
ژنەکە دەم و دەست دۆی بۆ هێنان (پێش بەرکار)
دەم و دەســت ژنـەکـە دۆی هێـنـا (پێش بکەر)
مناڵەکە دەم و دەســت هـاتـە قسـە (پێش کار)

شوێنی لێکدراوی بەستراو لە زمانەکەدا

لێکـدراوی بەستـراو بە شێـوەیەکی گشتی لە هەموو شێوازەکانی زمانەکەدا بەکار دێت، شێوازی دواندن بێت یان نوسین، شێوازی ئافرەت بێت یان پیاو، میری بێت یان ئەدەبی . [٢١] دابەش بوونیشی لەم شێـوازانـە تارادەیەك وەك یەکە هەر چەندە لەو شێوازانەدا بلاوترە کە زمـان بەمـەبـەستی هەست دەربرێن وورووژاندنی بەکار دێ بۆ نمـوونـە لە ووتـارو نووسینی ئایینی‌دا ئەو جۆرە لێکـدراوانـە زۆر باو وبلاون کە یەکێك لە کەرتەکان لێك دانەوە یان هاوواتای وشەیەکی عەرەبیـە وەك : (بـە) هێـزو قووەتی (خـ‌ێ) ، فەقیرو هەژار، دەردو بەلا ، داوو دەرمان

لێکـدراوی بەستـراو وەك چەنـد دیـاردەیـەکی تری زمان (لەوانە هاوواتــایی) لە چالاکی‌وتوانــای زمــان کەم دەکـاتـەوەو بوونی بە ژمـارەیـەکی یەکجار زۆر لە بەرژەوەندی زمان نییە، چونکە هەمیشە یەکێـك لە کەرتـەکـان وئامرازی بەستنەکە لەپەیوەندی کردن لەگەل دەوروبەردا کەم وزۆر کەڵکیـان لێ وەرنـاگیـرێ، لەبـەر ئەوەی ئەو مەبـەستـەی دەمـانـەوی بەخـەڵکی تری بگـەیـەنین لەیـەکێـك لە کەرتەکاندایە بەتایبەتی کەرتی یەکەم کەرتەکەی دەوری چر کردنەوە

دەبینێ. ئەم خەستکردنەوەو مەیاندانە لەزماندا شتێکی ناپێویست وزیادە (فائض). شتی زیادە ناپێویست لەزماندا لەلایەکەوە ڕێگە دەگرێ و زمانە قورستر دەکات. بەڵام لەلایەکی ترەوە زیادەکە لەدواندنا ئەرکی خۆی دەبینێ. هەروەك چۆن نیشانەیەکی ڕێزمان چەند جارێك لەرستەیەکدا دووپات دکرێنەوە بۆ ئەوەی ئەگەر لەیەکیکش لەجارەکاندا بەتەواوی نەگەیشتە گوێ لەبەر هەر هۆیەك بێت، گوێگر هێشتا پات بوونەوەیەوە لەپاشماوەی رستەکەدا بتوانی لەمەبەستەکە بگات (بۆ نموونە، بڕوانە ئەم ڕستەیەو تێ بینی ئەوە بکە ئەو نیشانەی بۆ بکەر دەگەڕێتەوە چەند لەرستەیەکی وا کورتدا گوتراوەتەوە: ئەو هەر خۆی بەخۆیەوە ئەنازێ بەهەمان ڕێگا کەڵك لەلێکدراوی بەستراو لە دواندنا دەبینرێ کەواتە هەرچەند لێکدراوی بەستراو ڕاستەوخۆ لەکردەی پەیوەندی کردندا سوودیکی کەم دەبەخشێ، لەدواندنا بۆ سافکردنی قەناتی گفتوگۆ و نەهێشتنی تەم و مژی واتایی کەڵکێکی چاکی لێ وەردەگیرێ.

لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی لێکدراوی بەستراو وزە بەفیڕودانی تێدایەو بەهۆی زۆرەوە کەم دەردەبڕین، (زۆر دەڵێین وکەم دەر دەبڕین) لەکوردی ئەمڕۆ بەتایبەتی لەنووسینی ئەدەبی هەندێکدا هەوڵێك بەدی دەکرێ بەرەو هەڵ وەشاندن وتێکدانەوەی وشەی بەستراوی لێکدراو وبەکارهێنانی کەرتێکی وشەکە لەجیاتی هەمووی لەهەر شوێنێکیدا کە تەم ومژ وشێوانی. لەوانە نەبێ سەر هەڵدا. بەمە نەك هەر تارادەیەك هەمان بیر دەردەبڕین بەڵکو دەتوانین کەڵك لەکەرتە زیادەکەیش وەرگرین بۆ دەربڕینی نوێ تر. سەرەتای ئەم کۆششە بەتەواوی لەشیعری نوێدا هەستی پێدەکرێ.[21] ئەم یاریکردنە بە زمان لەوانەیە لە نووسین دا سەیر بکەوێ، بەڵام دەبێ بزانین کە دابڕینی وشەی لێکدراوی بەستراو لەزمانەکەو فڕێدانی بۆ دەرەوەی ئەگەر سەرکەوتوو بێت (کە جێگەی گومانێکی زۆرە)، زمانەکە لەبۆن و بەرامەیەکی ڕەسەنی خۆشی مێژوویی بێبەری دەکات.

## ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە

**هەرچەندە زاراوەی لێکدراوی بەستراو لەچەند بەرهەمێکی ڕێزمانییدا ناوی هاتووەو چەند نموونەیەکی لەسەر دراوە، سەرچاوەکان بەشێوەیەکی گشتی لە تایبەتی و سیمای دیاردەکە نەدواون،وتەنانەت لەو ڕۆنانەشیان جیا نەکردوتەوە کە لە شێوەدا لەم دەچن. ئەوەندی سەرچاوەکانم ڕێگە بدەن، دەتوانم بڵێم ئەمە یەکەم لێکۆڵینەوەیە کە سەربەخۆ بۆ ئەم جۆرە لێکدراوە تەرخان کرا بێت وبەم وردی و چڕ یە بابەتەکە بداتە بەرتیشکی توێژینەوەو هەموو لایەنێکی بگرێتە خۆ. لێکۆڵینەوەکە دەمان گەیەنێتە چەند ئەنجامێك کە گرنگەکانی ئەمانەی خوارەوەن :-**

**(١) یەکێك لە جۆرە بلاوەکانی وشەی لێکدراو وشەی لێکدراوی بەستراوە کەتێدا دوو کەرتی هاوشان بەهۆی ئامرازی بەستنی (و)ەوە لەیەك دەدرێن ئەم لێکدراوانە بە چەند ڕێگەیەك لەو فریزانە جیا دەکرێنەوە کە ئامرازی بەستنی (و) پێکیان دێنی. هەرچەندە هەندی لەم لێکدراوانە دەگەنە پلەی لێکدراو بەهەموویان ئەو پلەیە وەر ناگرن**

**(٢) پەیوەندی نێوان دوو کەرتەی ئەم جۆرە لێکدراوە هەر ئەو پەیوەندییەکە کەرەسە وشەییەکانی زمانێك بەیەکترەوە گرێ دەدا وەك: هاوواتای، دژواتایی، تەواو کردن و گرتنەوە.**

**(٣) وەك هەموو یەکگرتن و لێکدانێکی تری زمان، هەموو کەرەسەکان، دوو کەرتەکەو ئامرازەکەش لە هەندێ سی و تایبەتی خۆیان دەبوورن لەپێناوی دروستکردنی دانە نوێیەکەدا.**

**(٤) هەرچەندە کەرتەکان هاوشانن، لەرووی واتاوە ئاسایی کەرتی یەکەم پرترە، لەبەر ئەوە ئەم شوێنە نادرێ بە کەرەسەی کەم واتا لەو کاتانەدا نەبێ کە کەرەسە پڕ واتاکە درێژ ترن.**

**(٥) شوێنی لێکدراوی بەستراو لەرستەدا بەپێی ئەو بەشە ئاخاوتنە دەبێ کە لەئەنجامی لێکدانەکە دروست دەبێت.**

**(٦ هەرچەند بوونی ژمارەیەکی زۆر لەلێکدراوی بەستراو لەچالاکی وتوانستی زمان کەم دەکاتەوە چونکە درێژن وکەم دەردەبرن، لە شێوازی دواندندا دەوری خۆیان هەیەو دابڕینیان لە زمان لە پێز و بۆن و بەرامەی مێژووی زمان کەم دەکاتەوە.**

**پەراوێز:**

(١) Lehman, 1972 - 143 - 6

(٢) بڕوانە بەشی پێنجەمی لێکۆڵینەوەکە بۆ هەندی نموونەی دژ بەم ڕایە.

(٣) هەندی زمانەوان زاراوەی جوتە وشە بۆ هەمان دیاردە بەکار دێنن، بڕوانە د. نەسرین فەخری، ١٩٨٥، ل١٨٠

(٤) بۆ نموونە د. مەککارمس دوو جۆر فریز جیا دەکاتەوە: فریز ناوی وفریزی کار. لەفریزی ناوییدا، کەرتی سەرەکی (دیارخراو) ناو یان ئاوەلناو یان ڕاناوە، یان پرتکە (ئامرازی نیشانە، پرسیار، یان ژمارە) جۆریکی تایبەتی لە فریزی ناوی بەبەر ناو دەست پیدەکات (منالی بچووك، پیاوی باش، ناوی تۆ، لەگەڵ

تۆ، چەند رۆژ، گەلێ کەس) فریزی کار دیار خراوەکەی دەبێ بەکار بێت: دەر کرد، بانگە کرد ئامادەکرد) (بروانە: McCarus, 1959, 92).

(٥) Fattah , 1980, 186

(٦) Swaminathan 1973, 44

(٧) بۆ ئەم نموونانە بروانە جەلال مەحمود عەلی

(٨) بروانەمحمد معروف فتاح ١٩٨٦ ل١٠٠

(٩) Ibid, 453

(١٠) John Lyons, 1969, 460 - 69

(١١) هەندێ لەمانە لەبەر کەرتی یەکەم بە گۆرانی بزوینەکەو دانانی د/ڵ، ڕ، چ/م دروست بوون! نەرم نۆل، معوك سۆڵ، پان پۆڕ، خوارو خێچ لە هەندیکی تر دا کەرتی دووەم بە واتای جیاواز لەفەرهەنگدا دێ: ڕاو، قەپ بان، پێك، پۆڕ . . . . . هتد

(١٢) ئاگەداری ئەوە هەم کە گوترا «وشە» نابێت بێواتا بن، بەڵام ئاشکراشەکە هەموو وشەیەکش بەهەمان رادەو واتایان نییە، لەبەر ئەوە شتێکی نامۆ نییە وشەی پر واتاو کەم واتاو بەتاڵ هەبێ، ئەمانە ئاسایی ئەرکیان هەیە لەزماندا

(١٣) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ١٩٧٩، ل١٠

(١٤) محمد معروف فتاح لێکوڵینەوەیەکی بلاو نەکراوە.

(١٥) Lehrer, 1985, 31

(١٦) محمد معروف فتاح، ١٩٨٦ أ، ١١٦

(١٧) ئەو نموونانەی دژ بەم دەستوورەن لەژێر باری دەستووری یەکەمدا لێك دەدرێنەوە دڵ و دەروون، باخ و باخات، جەرگە و هەناو

(١٨) محمد معروف فتاح، ١٩٨٦، ل٩٨

(١٩) ئەم رەفتارە نائاساییەی ئامرازی بەستنی (و) زیاتر لەبەر ناو نزیکی دەکاتەوە لە سروشتدا چونکە تەنیا ئەوەیان تیدایە بنە پاشگری دارێژراو وبەشی ئاخاوتن بگۆرن جێ (ناو) بەجێ (ئاوەڵناو)، ناز (ناو)، بێناز، بەناز (ئاوەڵناو) هەروەها بار لەبار

(٢٠) جۆریکی تایبەتی لەم لێکدراوە کە بە دووبارەی کردنەوەی کەرتی یەکەم دروست دەبێت دوایی گۆرینی فۆنیمی سەرەتا بە /م/: قاپ ماپ، چراو مرا، راست و ماست. . . . بە تایبەتی لە شێوازی دواندنی هەندی ناوچەو بەکار دێ، بەڵام تەنانەت ئەمەش چوتە ناو شێواز ئەدەبیەوە وەك لە دێری شیعری نالیدا دەبینین:

دامێنی بە ئەنواعی گوڵ وملٚ خەملابێ

گەنجیکی تێدا بێ کە طیلەسمی نەشکا بێ «دیوانی نالی ل٦١٤»

لێرەدا بە ئارەزوو ئەم جۆرە لێکدراوەمان خستە لاو لەبەر ئەوەی کردەیەکی زیندوو بەردەوامەو بێسنوورە بەوەدا کە هەموو وشەیەکی زمانە کە «جگە لەوانەی کە خۆیان بەدەنگی /م/ دەست پێدەکەن) ئەم لێکدراوە یان لێ پێك دێت و بەمەش لە دیاردەی مۆرفولوجی دوور دەکەوێتەوە.

(٢١) دەیان نموونە لەم بابەتە لەدیوانی دیلان وبەرهەمی چەند شاعیریکی لاودا دەبینرێ وەك: بەزم لە جیاتی بەزم وەرەزم ل١٤٢، کش لە جیاتی کش و مات ل١٥٣)، شەنگ لەجیاتی (شۆخ و شەنگ ل١٨٩)، تەفر (لەجیاتی تەفرو تونا ل٢٦٤) خاش (لەجیاتی وردو خاش، ل٢٦٧)، نوتەك (لەجیاتی تاریك و نووتەك، ل٢٦٨ پەرت (لەجیاتی پەرت و بلاو ل٢٧٤ دیوانی دیلان).

## سەرچاوەکان:

### أ. بە کوردی


(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی (ناو)، چابخانەی کۆڕ/ بەغدا ١٩٨٠

(٢) جەلال مەحمود عەلی ئیدیۆم لەزمانی کوردیدا بەغدا ١٩٨٢

(٣) محمد معروف فتاح، زمانەوانی، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٧

(٤) محمد معروف فتاح، سنوورو بنەماو ئەرکەکانی کۆزمانەوانی، روشنبیری نوێ ژمارە ١١٢، ١٩٨٦ أ

(٥) محمد معروف فتاح، دیسان ئیدیەم، گوڤاری کوری زانیاری، بەرگی ١١، ١٩٨٦

(٦) د. وریا عمر امین، لێکدانی وشەکان رۆشنبیری نوێ ژمارە ١١٨، ١٩٨٨

(٧) د. نەسرین فەخری، لیکسیوگرافیا، رۆشنبیری نوێ ژمارە ١٠٧، ١٩٨٥


### ب ـ بەزمانی ئینگلیزی


(1) Fattah, M. M. )1980) ''On the stress system in Kurdish''. Zaneo v.b, Iqy - 200

(2) Lehman, P.L. led (1972) Desciptive Lingustics New York :Random House.

(3) Lehrer A (1985) Markedness and Antonomy ''Jovvnal of linguistics, Vol No .2, 393 - 429

(4) Lyons, J. (1969) Introduction to the· oretal Linguistics Combridge university press: London.

(5) Mackenizie D.N. (1961) Kurdish Dialect studies (I) London:Oxford university press

(6) Mccarus, E (1959) A kurdish Grammar washington:washing ton plandogroph company

(7) Swamin athan R., (1943) «The word» ZRAL V.XI

■ ملخص البحث ■

# الكلمة المركبة العطفية في اللغة الكردية

محمد معروف فتاح

استاذ مساعد /جامعة صلاح الدين

كلية الأداب ـ قسم اللغة الكردية أربيل

تهدف الدراسة الى وصف دقيق ومسهب للمركبات العطفية وهي كلمات تتكون من جزئين او اكثر ترتبطان بواو العطف، محاولاً التأكيد على ان العمليات الصرفية التي تنحصر في الاختيار والتجاور والتكييف هي نفس العمليات التي تحدث للعناصر في النحو وإن الاختلاف بينهما ماهو الا اختلاف في النوعية والكم.

يقع البحث اضافة الى المقدمة والختام في سته أجزاء، تتناول المقدمة تعريفاً موجزاً بالظاهرة اللغوية المراد دراستها وتحدد الهدف من الدراسة والمواضيع التي تتضمنها. ويحاول الباحث في الجزء الثاني تمييز المركبات العطفية من العبارات والكنايات والمركبات الاخرى كالمركبات التابعة والتملكية والتمازجية. ويتطرق الجزء الثالث الى العلاقات الشكلية والمعنوية التي تربط جزئي المركب وتلاحظ ان هذه العلاقات هي نفسها التي تربط مفردات لغة ما وتنحصر في الترادف والتباين والتضاد والتخالف والتضمين. ويؤكد الجزء الرابع من البحث على أهمية الموقع الأول في هذه المركبات من الناحية الدلالية مشيراً الى أن العناصر التي لا تشبع بالمعنىٰ لايمكن أن تشغل هذا الموقع. أما الموقع الثاني فيشغله عادة عناصر لا أهمية لها من ناحية المعنىٰ ولكنها تعمل على تكثيف وتأكيد السمات الدلالية للعناصر الاولىٰ ثم يستعرض هذا الجزء القواعد التي تتحكم في توزيع العناصر على الموقعين فيؤكد أهمية طول الكلمة والعوامل الاجتماعية والقياس والسلب والايجاب في هذا التوزيع. تناول الجزء الخامس التغيرات التي تطرأ على واو العطف نتيجة تواجدها في هذه المركبات فيؤكد على ان هذا الحرف يفقد شيئاً من خصائصها الوظيفية الأصلية ويقترب من طبيعة حروف الجر وفي الجزء السادس يسعى البحث الى تحديد موقع هذه المركبات في الجملة الكردية فيميز بين المركبات التي تعمل كأسم والمركبات التي تعمل عمل الصفة والظرف ويتناول الجزء السابع توزيع وأهمية هذه المركبات في الأساليب المتنوعة للغة الكردية فيؤكد على تواجدها في جميع الاساليب الرسمية وغير الرسمية، وفي الكتابة والكلام وبين أن هذه المركبات تعمل كعناصر فائضة في اللغة ومن هنا يتطرق البحث الى محاولة المحدثين من الشعراء تجزئة المركب واستثمار اجزائها لغايات متباينة ثم يوجز الباحث الاستنتاجات التي يتوصل إليها

# ڕستەی شوێن کەوتووی هۆیی

● د. کوردستانی موکریانی ●

کولێجی ئاداب ـ زانکۆی سەلاحەددین

## سەرەتا

هەتا ئەمرۆ لەنێو ئەو بەرهەمە ڕێزمانی یانەی بەرچاوم کەوتوون، بابەتی ڕستەی شوێن کەوتووی هۆیی لەنێو ڕستەی تێکەڵ دا سەربارى ئەوەی بە شێوەیەکی سەربەخۆو زانستانە لێی نەکۆڵدراوەتەوە، هەر تەنیا لە نێو چەند سەرچاوەیەك دا ناوی هاتووەو باسێکی کورتی لەسەر نووسراوە وەیا هەر تاکە ڕستەیەکی بە وێنە بۆ هێندراوەتەوە، ئەگەرچی ئەم جۆرە ڕستەیە بە شێوەیەکی فراوان لە زمانی کوردیدا بە کاردێت، هۆی ئەمەش بۆ کەمی لێکۆڵینەوە لە بواری زانستی سینتاکس دا دەگەڕێتەوە.

مامۆستا نوری علي أمین لە بەرهەمی ڕێزمانی (ڕێزمانی کوردی)دا[1] بەشێکی بۆ ڕستە تەرخان کردووەو ڕستەی شوێن کەوتووی سەر بە ڕستەی تێکەڵی دابەش کردۆتە سەر سێ پارچە :ـ

١ ـ پارچەی ناوی.

٢ ـ پارچەی ئاوەڵناوی.

٣ ـ پارچەی ئاوەڵکاری.

پارچەی ئاوەڵکاریشی دابەش کردۆتە سەر نۆ بەش لە بەشی سێیەمی دا بەم جۆرە لە ڕستەی شوێن کەوتووی، هۆیی دەدوێت :ـ

[ ٣ ـ بۆ سەبەب بەکارئەهێنرێ، وەك :ـ ئەم نەمامە هەڵ ئەکێشم، چونکە ووشك بووە. . ]

پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ لە (زمانی کوردی)دا[2] باسێکی کورتی لەلاپەرە (٧١ و ٧٢)ی ئەم بەرهەمەیدا بۆ ڕستەی تێکەڵ تەرخان کردووەو تێیدا باسی ناوی ئامرازی (چمکی) بردووەو ڕستەیەکیشی بە وێنە بۆ هێناوەتەوە.

مامۆستایان کەریمی ئەیوبی و ی. آ. سمیرنۆڤا لە بەرهەمی (دیالێکتی کوردی موکری)دا[3] سێ دێری لاپەڕە (١٤١)یان بۆ ئەم جۆرە ڕستە شوێن کەوتووە تەرخان کردووەو لەو ئامرازە گەیەنەرانەی هاوبەشی دارشتنی دەکەن نێوی (چونکە، چونکو، لەبەر ئەوەی، کە) یان بردووەو ئەم دوو ڕستەیەی خوارەوەشیان بە وێنە هێناوەتەوە :ـ

ئەمن گۆشتم نەکڕی، چونکە دووکان داخرابوو. لەبەر ئەوەی، کە برسی بووم، نەمتوانی زۆرتر ڕێگا بڕۆم.

مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لە بەرهەمی د. زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراووردا[4] لە خاڵی حەوتەمی جۆرەکانی. ڕستەی لێکدراودا ناوی ئامرازی (چونکە)ی بردووەو ڕستەیەکیشی بە وێنە بۆ هێناوەتەوە.

زەری آ. یوسوپۆڤا لەنێو بەرهەمی ڕێزمانی (شێوەی سلێمانی ـ زمانی کوردی).[5] لە لاپەرە (١٢٦)دا باسێکی کورتی، ڕستەی

شوێـــن کەوتـــووی هۆیـــی کردووە، بە تایبـــەتـــی لە رووی ئەو ئامـرازانـەی، کە بۆبنیـات نانی ئەم جۆرە رستـە تێکەڵە هاوبەشیی دەکـەن وناوی ئامـرازی گەیـەنەری هۆیی (چونکە، چونکو، لەبەر ئەوەی کە) بردووە و لە باری شوێـنـی رستـــەی شوێـن کەوتـــووی هۆیی‌یـەوە لەنێـو رستـەی تێکـەڵ دا دەڵێت: (کـە رستـەی شوێن کەوتـووی هۆیی بە ئامـرازی گەیـەنەری ـ چونکە، چونکو ـ دەست پێ‌دەکـات، ئەوە شوێنی لەنێـو رستـەی تێکـەڵ دا دەکەوێتە دوای رستەی سەرەکی‌یەوە، بەڵام کە بە ئامرازی گەیەنەری ـ لەبەر ئەوەی کە ـ دەست پێ‌دەکات رستە شوێن کەوتووەکە بە پێش رستەی سەرەکی دەکەوێت و رستە سەرەکی‌یەکەش بە وشەی ـ بۆیە ـ وەیا ـ بەو هۆیـەوە ـ دەست پێ‌دەکـات، بۆ ئەم جۆرە رستە شوێن کەوتووە چوار رستەی تێکەڵی بە وێنە هێناوەتەوە.

توێژەری ئەم لێکـۆڵینـەوەیـە لە لاپـەڕە (٨٣ و ٨٤)ی (سینتاکسی رستـەی سادە)[٦] دا دوای ئەوەی پێنـاســەی ئەم جۆرە رستـەیـەی کردووە، لەو ئامـرازە گەیـەنـەرانـەی، کە رستـەی شوێن کەوتووی هۆیی بە رستـەی سەرەکیـوە دەگـەیـەنێت ناوی ئامرازی گەیەنەری (چونکە، چونکی، چمکی) بردووەو چەند رستەیەکیشی بە وێنە بۆ هێنـاوەتـەوەو سەبارەت بە شوێنی ئەم جۆرە رستەیەش لە نێو رستەی تێکـەڵ دا دەڵێت: (رستـەی شوێن کەوتووی هۆ هەمیشە دەکەوێتە دوای رستەی سەرەکی‌یەوە.)

## رستەی شوێن کەوتووی هۆیی

رستـەی شوێن کەوتـــووی هۆیی لە رستـــەی تێکـــەڵ دا هۆی روودانی رووداوی نێـو رستـەی سەرەکی روون دەکـاتـەوەو وەڵامی پرسیاری بۆ، بۆیە، لەبەرچی دەداتەوە.

لە زمـانی کوردی‌دا رستـەی شوێن کەوتووی هۆیی لە نووسین و لە قسـەکردن دا زۆر بەکاردێت لەو ئامرازە گەیەنەرانەی، کە رستەی شوێن کەوتـــووی هۆیی بە رستـــەی سەرەکی‌یـەوە دەبـەستێتـەوە؛ ئامرازی گەیەنەری (چونکە چونکو، لەبەر ئەوە، لەبەر ئەوەی کە) بەکاردێت.

رستـەی شوێن کەوتـووی هۆیی وەکـو هەمـوو جۆرەکـانی دی رستـەی شوێن کەوتـوو لە رووی دارشتنی سینتاکسی‌یەوە هەرگیز بە تەنیا بەکارنایەت و لەرووی واتاوەش بەبێ رستەی سەرەکی ناتەواو دەبێت، چونکـە مانـاکـەی تەواوکـەری مانـای رستـەی سەرەکییە، کەواتـا رستـەی شوێن کەوتـووی هۆیی لە دوو لایـەنـەوە، لایـەنی دارشتنی سینتاکسی‌و، لایەنی واتاوە بەندیواری بە رستەی سەرەکی نێو رستەی تێکەڵ دا هەیە.

بۆ وێنـە ئەم رستـە تێکـەڵانـەی خوارەوە ئەم جۆرە پێـوەندی‌یەی نێوان رستەی شوێن کەوتووی هۆیی و رستەی سەرەکی لە نێو رستەی تێکەڵ دا روون دەکەنەوە:

پێم مەڵێ میمکەوبڵێ پووری، چونکە هێشتا نەبووم بە میمك. (شار ـ ٤٨)

(پێـم مەڵێ میمکـەوبڵێ پووری) رستـەی سەرەکی نێـو رستـە تێکـەڵـەکـەیـەو (لە ئاستی خۆی‌دا رستەیەکی لێکدراوی پێوەستە بە هۆی ئامرازی لێکدەری (و))، کە بە هۆی رستەی شوێن کەوتووی (چونکە هێشتا نەبووم بە میمك) هۆی دەربراوی رستەی سەرەکیکە روون دەبێتـەوە. ئەگـەر بێـو بە تەنیـا هەر رستـە شوێن کەوتـووەکە بەکاربێت (چونکە هێشتا نەبووم بە میمك) نازاندرێت هۆیەکە بۆچ جۆرە بیرێکی پێشتر دەگەرێتەوە.

هەروا لە رستەی ژێروو دا دیسانەوە ئەم پێوەندییە روون دەبێتەوە: ـ

(ژیـان لەبـەر ئەوە خۆشـە، چونکـە ئێمە هەموومان ئیش دەکەین، جەژنانە، ١٩

(ژیان لەبەر ئەوە خۆشە) رستەی سەرەکی نێو رستە تێکەڵەکەیە، بە هۆی رستـەی شوێن کەوتـووی (چـونکـە ئێمـە هەمـوومـان کار دەکـەین) هۆی دەربـراوی نێـو رستـە سەرەکی‌یەکە روون و ئاشکرا دەبێت. لەو بارە دا، کە رستـەی شوێن کەوتـووی هۆیی لابـبردرێت نازاندرێت هۆی خۆش بوونی ژیان چی‌یە، کە لە رستەی سەرەکی دا دەربراوە.

ئەم رستـە تێکـەڵـەی خوارەوەش هەمـان پێـوەندی نێوان رستەی سەرەکی‌و رستەی شوێن کەوتووی هۆیی روون دەکاتەوە: ـ

ئەویش وەك براکەی وون بووە، بەڵام بە چەشنێکی تر، چونکە هەرگیـز بریـاری نەداوە روو بکـاتـە رووخـان و بەرەنگـاری بێتـەوە (مردنی دیوەرەیەك، ٢١)

## رستـــەی شوێن کەوتـــووی هۆیی بە یارمـەتی ئامـرازی گەیەنەری (چونکە چونکی چونکو)

ئامـرازی گەیـەنـەری (چـونکـە چونکـو چونکی لە نووسین و نە

ساتانه بوون، که دەروێش تەقەلای دەدا زەفەری پێ بەرێ، شار، ١٠٢

| | |
|---|---|
| ھەلاّتنەکانیشی وەخت و سەعاتیان | ڕستەی سەرەکی |
| بۆنەبوو | ڕستەی شوێن کەوتو هۆیی‌یە |

چونکە بەندی ئەو ساتانە / بوون.

کە دەروێش تەقەلای دەدا زەفەری پێ بەرێ ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری‌یە

لەم ڕستە تێکەڵەی ژ ووروودا ڕستە شوێن کەوتووە هۆی‌یەکە بە پێش ڕستە شوێن کەوتووە دیارخەری‌یەکە کەوتووەو ئەوەی دووەمیان بەندە بە ڕستە شوێن کەوتووەکەی یەکەمیانەوە، چونکە بە لابردنی ڕستە شوێن کەوتووە دیارخەریکە ڕستە تێکەڵەکە واتای تەواو نابەخشێت و ڕستە شوێن کەوتووە هۆیەکە لێرە دا ناتوانێت بە تەنیا هۆی ڕوودانی ڕووداوی ڕستەی سەرەکی ڕوون بکاتەوە، بەڵکو پێویستی بە ڕستەیەکی شوێن کەوتووی دی هەیە بۆئەوەی زیاتر هۆیەکە بەدیار بخات.

وا لە خوارەوە چەند نموونەیەك لەم جۆرە ڕستە تێکەلاّنەی، کە سەرباری هەبوونی ڕستەی شوێن کەوتووی هۆیی لە ڕستە دا، ڕستەیەکی شوێن کەوتووی دیش بە دوا دا دێت، وەیا بە پێشی دەکەوێت:ـ

سەعاتچی چاکت دەکاتەوەو سەر لەنوێ کات پێشان دەدەیت، بەلاّم وریابە لەمەو دوا خۆت هەڵمەکێشە، چونکە کەس باوەڕت پێ ناکات، کە نەریتی جیهان لەسەر تۆ وەستابێت، جەژنانە، ٧٣.

وای بۆ دەهات، کە دەبێ ڕووخساری سپی هەڵگەرابێت، چونکە یەگجاری سەرمای بوو، وێنەی هونەرمەند، ٢١

تا بلێی ئاهەنگەکەم بەلاوە خۆش بوو، چونکە ئەوە یەکەم جارم بوو، کە لەناوخێزان و منداڵان دا هەڵسم و دانیشم، فریشتەکانی سەر زەمین، ٤٧

هەر ئەوەتە کە ناوی (صوفی) بۆیە بوەتە هی ڕێبوارانی ئەم ڕێگایە، چونکە (صوف) پۆشاکێك بووە هەر لە مێژ ینەوە براوە بە بالاّی ئەو کەسانە دا، کە بوونەتە خاوەنی ئەم خدەیە، تەصەووف چی‌یە، ١٩٢

ڕستەی شوێن کەوتووی هۆیی
به یارمەتی ئامرازی گەیەنەری
لەبەر ئەوە (ی، کە)

ئامرازی گەیەنەری [ لەبەر ئەوە (ی، کە] ش هەروەکو ئامرازی گەیەنەری (چونکە) هەمان دەوری سینتاکسی دەگێڕێت، بۆ دارشتنی ڕستەی شوێن کەوتووی هۆیی و هەروەکو ئەویش دەکەوێتە سەرەتای ڕستەی شوێن کەوتووەکە، بەلاّم لەڕووی بەکارهاتنێوە چ لە زمانی قسەکردن و چ لە زمانی نووسین دا لەچاو ئامرازی گەیەنەری (چونکە)دا کەمتر بەکاردێت، بۆ وێنە:ـ

لەبەر ئەوەی بێ کار بوو، بۆیە هەمیشە پەست و دڵگیر بوو، بیست چیرۆك.

(لەبەر ئەوەی بێ کار بوو) ڕستەیەکی شوێن کەوتووی هۆیی‌یەو بە یارمەتی ئامرازی گەیەنەری (لەبەر ئەوە) دەستی پێکردووەو دارێژ راوەو هۆی پەستی و دڵگیری بکەر، کە لە ڕستەی سەرەکی (بۆیە هەمیشە پەست و دڵگیر بوو) ڕوون دەکاتەوەو کەوتۆتە پێش ڕستەی سەرە کێوە.

لەبەر ئەوەی زانرا کێ وای کردووە، ڕایان کرد، وێنەی هونەرمەند

(لەبەر ئەوەی زانرا کێ وای کردووە) ڕستەیەکی شوێن کەوتووی هۆیی‌یە کەوتۆتە پێش ڕستەی سەرەکی، کە بریتیە لە (ڕایان کرد).

شوێنی ڕستەی شوێن کەوتووی هۆیی، کە بە یارمەتی ئامرازی گەیەنەری لەبەر ئەوەی (ی، کە) دارێژ راوە.

ڕستەی شوێن کەوتووی هۆیی، کە بە یارمەتی ئامرازی

گەیـەنـەری لەبـەر ئەوە (ی، کە) داریـژ راوە بە شیـوەیـەکی گشتی دەکـەوێتە پێش رستەی سەرەکیو، وکاتی روودانی رووداوەکەش بە پێش کاتی روودانی رووداوی رستەی سەرەکی دەکەوێت [هەر وەکو ئەو رستـە شوێن کەوتـووانـەی، کە بەهـۆی (چـونکە داریژ راون]و هێـنـدێـك جار نەبێت (ئـەویش بە دەگمـەن) رووداوی هەردوو رستـەکـە، شوێن کەوتووی هۆیی و سەرەکی لە یەك کات دا دەبن.
بۆ وێنە :ـ
لەبەر ئەوەی، کە تاریکی داهات، چرای ژوورەکانی داگیرساند.

| | |
|---|---|
| لەبەر ئەوەی کە تاریکی داهات | رستەی شوێن کەوتووی هۆیی یە |
| چرای ژوورەکانی داگیرساند | رستەی سەرەکی یە |

لەبەر ئەوەی میوانی تۆین، دەبێت ڕێزو حورمەتمان لێ بنێیت.

| | |
|---|---|
| لەبەر ئەوەی میوانی تۆین | رستەی شوێن کەوتوو هۆیی یە |
| دەبێت ڕێزو حورمەتمان لێ بنێیت. | رستەی سەرەکی یە |

لەم دوو رستانەی پێشوو دا کاتی روودانی رستەی شوێن کەوتوو بە پێش کاتی رووداوی رستـەی سەرەکی کەوتـووە، بەڵام لەم رستـانـەی خوارەوە دا کاتی روودانـەکـە لەنێـو هەر دوو رستە دا (شوێن کەوتوو و سەرەکی) بۆ یەك کات دەگەڕێنەوە :ـ
لەبەر ئەوەی مامۆستامان بوو، زۆر ڕێزمان لێ دەنا.
لەبەر ئەوەی کە نەخۆش بوو، توانای قسەکردنیشی نەبوو.

لەگـەڵ ئەوەی کاتی روودانی رووداوی نێـو هەر دوو رستـەی سەرەکی و شوێن کەوتـووی هۆیی لەم دوو رستـانـەی ژوورەوەدا بۆ یەك کات دەگەڕێنەوە، بەڵام ئەگەر بە ووردی سەرنج لە کاتەکانیان بدرێت، ئەوا دەبیندرێت ئەو کەسەی، کە ڕێزی لێندراوە لە رستەی یەکـەم دا دەبێت پێشتـر بووبێتـە مامۆستا، نەك تەنیا لەو کاتەی، کە ڕیـزی لێـندراوە، هەروا ئەو کەسـەی، کە قسـەی بۆ نەکـراوە، هەر دەبێت پێشتـر نەخـۆش کەوتبێت، نەك هەر تەنیـا لەو کاتـەی، کە قسـەی بۆ نەکـراوە، بەواتـا جیـاوازی یـەك لە کاتـی روودانـی رووداوەکان دا هەر هەیە.

رستـەی شوێن کەوتـووی هۆیی، کە بە یارمـەتی ئامـرازی گەیـەنـەری لەبـەر ئەوە (ی، کە) داریـژ راوە ئەویش لەنێـو هێندێك رستـەی تێکـەڵ دا ناتـوانێت هۆی روودانی رووداوی نێـو رستـەی سەرەکی بە تەنیـا روون بکـاتـەوە، بەڵکـو رستەی شوێن کەوتووی جۆری دی یارمەتی دەدەن، بۆ وێنە :ـ

کاربـەدەستـانی خەستـەخـانـەکـە وایـان بە پێـویست زانی، کە بە زووتـرین کات کورەکـەی بۆ ئامـادە بکـەن، لەبەر ئەوە ئۆتۆمبیلێکی تایبەتیان نارد بە شوێن کورەکەی دا، فریشتەکانی . ، ه

| | |
|---|---|
| کاربەدەستای خەستەخانەکەی وایان بە پێویست زانی | رستەی سەرەکی |
| کە بە زووترین کات کورەکەی بۆ ئامادە بکەن | رستەی شوێن کەوتووی بەرکاری |
| لەبەر ئەوە ئۆتۆمبیلێکی تایبەتیان نارد بە شوێن کورەکەی دا | رستەی شوێن کەوتووی هۆیی |

## ئەنجام

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە دا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کەوا رستەی شوێن کەوتووی هۆیی جۆرێکە لە جۆرەکانی رستەی شوێن کەوتوو لەنێو رستەی تێکەڵ دا.

رستـەی شوێن کەوتـووی هۆیی وەکـو رستە شوێن کەوتووەکانی دی ئامـرازی گەیـەنـەر هاوبـەشی پێـك هێنانی دەکات و دەکەوێتە سەرەتـای رستـەکـەوە بەڵام ئەوەی ئەم ئامـرازە گەیـەنەرانە لە جۆرە ئامـرازە گەیـەنـەرەکـانی دی جیـای دەکـاتـەوە سەربـەخۆیی بەکار هێنـانێتی تەنیـا لەم جۆرە رستـە شوێن کەوتووە دا، بەواتا هاوبەشی پێـك هێنـانی جۆری دی رستەی شوێن کەوتوو ناکەن و هەر تایبەتن بە رستەی شوێن کە وتووی هۆیی یەوەو ئامرازە گەیەنەرەکانین برێتین لە (چونکە چونکو چونکی)و (لەبەر ئەوەی ( ـ کە) ).
شوێنی رستـەی شوێن کەوتـووی هۆیی لەنێـو رستەی تێکەڵ دا بەپێی جۆری ئەو ئامـرازە گەیـەنـەرەیـە، کە هاوبەشی پێك هێنانی

قسـەکـردن دا بە شێـوەیـەکی فراوانتـر بە کاردێت لە چاو ئەو ئامرازە گەیەنەرانەی دی، کە رستەی شوێن کەوتووی هۆیی پێك دەهێنن و هەمیشەش دەکەوێتە سەرەتای رستەی شوێن کەوتووەکە.

شوێنی ئەو رستـە شوێن کەوتـووەی، کە بە یارمـەتی ئامـرازی گەیـەنـەری (چـونکـە) دەست پێ دەکـات بە شێـوەیـەکی گشتی دەکەوێتە دوای رستەی سەرەکی لە نێو رستەی تێکەڵ دا.

لەم رستەی تێکەڵانەی خوارەوەدا رستەی شوێن کەوتووی هۆیی کەوتۆتە دوای رستەی سەرەکییەوە:ـ

دەرگاکە ئەوەندە سەوز و جوان بوو، نەی وێرا بە دەست لێی دا، چونکە دەستی رەش و دووکەڵاوی بوو (پێکەنینی گەدا، ٢٠)

ماوەیـەك بوو، دارشکێنیـك بێ کارو فرمان رای دەبوارد، چونکە دەسکی تەشوێکەی شکابوو، بیست چیرۆك،

**لە رستەی یەکەم دا:ـ**

| | |
|---|---|
| دەرگاکە ئەوەندە سەوز و جوان | رستەی لێکدراوی |
| بوو، نەی وێرا بە دەست | پێوەستەو لێرەدا |
| لێی دا | رستەی سەرەکییە |
| چونکە دەستی رەش و | رستەی شوێن کەوتووی |
| دووکەڵاوی بوو | هۆیی. |

**لە رستەی دووەم دا:ـ**

| | |
|---|---|
| ماوەیەك بوو، دارشکێنێك بێ | رستەی لێکدراوی |
| کارو فرمان رای دەبوارد | پێوەستەو لێرەدا |
| | رستەی سەرەکییە |
| چونکە دەسکی تەشوێکەی | رستەی شوێن کەوتووی |
| شکابوو. | هۆییە |

هەروا لەم رستـانـەی خوارەوەش دا رستـەی شوێن کەوتـووی هۆیی کەوتۆتە دوای رستەی سەرەکییەوە:ـ

ئەویش ماوەیـەك بە دوایـان کەوت ویـاشـان وەستا، چونکە راکردن دادی نەدا، وێنەی هونەرمەند، ١٨.

دڵم لەو قسـەیـە داخورپا، چونکە وام زانی لەناوچوو، فریشتەکانی سەر زەمین، ٢٥

ئەم ئەو ساتـە لە دڵی خۆی دا بەم قسـەیـەی باوکی نەدەوت ئامین، چونکە بە دەستییەوە مارانگاز بوو، شار، ٦٧

لە دیـالێکتی کرمـانجی ژووروش دا ئامـرازی گەیـەنـەری (چـونکی) هەروەکـو (چـونکـە)ی دیـالێکتی کرمـانجی خواروو بەکـاردێت و هەمـان مەبەستی سینتاکسی دەگێڕێت و هەمان واتاش دەبـەخشێت و دەکـەوێتـە سەرەتای رستەی شوێن کەوتووەکەو رستە شوێن کەوتووەکەش بە شێوەیەکی گشتی دەکەوێتە دوای رستەی سەرەکییەوە:

من نەڤێـت دلێ وان ژمـە بمینت، چونکی خۆش مرۆڤن، خان و مان، ١٥

لەوا دبینن حەیـرانـۆك گەلـەك جارا ڤێ رێکێ دگـرت و بەرددت، چونکـە دبینن بەهـرا پتـر چوارن دبنـە سێ و دوو پتـرتـر مینـا ڤان نمونا... حەیرانۆك، ٩

**لە رستەی یەکەم دا:**

| | |
|---|---|
| **من نەڤێت دلێ وان ژمە بمینت** | **رستەی سەرەکی** |
| **چونکی خۆش مرۆڤن** | **رستەی شوێن کەوتووی هۆیی** |

**لە رستەی دووەم دا:**

| | |
|---|---|
| لەوا دبینن حەیرانۆك گەلەك | رستەی لێکدراوی |
| جارا ڤێ رێکێ دگرت و بەرددت | پێوەستە، لێرەدا |
| | رستەی سەرەکییە |
| چونکە دبینن بەهرا پتر چوارن | رستەی شوێن |
| دبنە سێ و دوو پترتر مینا | کەوتووی |
| ڤان نمووا.... | هۆییە |

وەنـەبێت رستـەی شوێن کەوتـووی هۆیی، کە بە ئامـرازی

گەیەنەری (چونکە) دەستی پێکردووە، هەمیشە بکەوێتە دوای رستەی سەرەکیەوە، بەڵکو هێندێك جار دەکەوێتە نێوان رستە سەرەکیکەوەو هەبوونیشی لەم شوێنە دا زیاتر بۆ بایەخ دانە بەو هۆیەی، کە روداوی روودانی رستە سەرەکیکە روون دەکاتەوە :-

تۆش، چونکە وەکو ئەو بێ ویژدان و بێ بەزەییت، بەقسەت کرد، شار، ٨١

لەم رستەیەی ژووروودا (تۆش بە قسەت کرد) رستە سەرەکیکەیەو (چونکە وەکو ئەو بێ ویژدان و بێ بەزەییت) رستەی شوێن کەوتووی هۆیە.

هەروا لەم رستانەی خوارەوەش دا رستەی شوێن کەوتووی هۆیی کەوتۆتە پێش گوزارەی رستەی سەرەکیەوە، بەواتا کەوتۆتە نێوان نیهادو گوزارەوە :-

نەوزاد، چونکە برا گەورەیانە، شوێنی باوکی گرتۆتەوە.

بەهار، چونکە ماران گازبوو، لە خشەی مار دەترسا.

ئازاد، چونکە باوەڕ بەخۆ بوو، لە خوێندن دا سەرکەوتوو بوو.

## چەند رستەیەکی شوێن کەوتوو لەنێو رستەیەکی تێکەڵ دا

هێندێك جار رستەی شوێن کەوتووی هۆیی بە تەنیا لە رستەی تێکەڵ دا نایەت، بەڵکو رستەی شوێن کەوتووی جۆرەکانی دی لەگەڵ دا دێت و ئەوەی لەم جۆرە رستە تێکەڵانە دا سەرنج راکێشە ئەوەیە، کە رستە شوێن کەوتووەکان هەر خۆیان بە تەنیا بەواتا تاکە تاکە لەگەڵ رستەی سەرەکی دا واتای رستە سەرەکیکە تەواو ناکەن، بەڵکو تێکرای رستە شوێن کەوتووەکان واتای تەواوی پێ دەبەخش و زیاتر روونی دەکەنەوە، هەروەك لەم رستانەی ژێرووەدا بۆمان روون دەبێتەوە :-

من زۆر مەمنوونی ئەو کەسەم، کە تێی گەیاندم ئێوە دایك و باوکی راستەقینەی من نین، چونکە تا ئێستا هەر چیەکتان بۆ من کردبێت هیچ منەتم لێ نەزانیبوون، چونکە دایك و باوك هەرچیەکی بۆ منداڵی خۆی بکات پێویستی سەر شانێتی و منەتی نی یە، فریشتەکانی سەر زەمین، ٦٠

| | |
|---|---|
| من زۆر مەمنونی ئەو کەسەم | رستەی سەرەکی یە |
| کە تێی گەیاندم ئێوە دایك و باوکی راستەقینەی من نین . | رستەی شوێن کەوتووی گوزارەی یە |
| چونکە تا ئێستا هەرچیەکتان بۆمن کردبێت هیچ منەتم لێ نەزانیبوون | رستەی شوێن کەوتووی هۆی یە (ژمارە - ١) |
| چونکە دایك و باوك هەرچی بۆ منداڵی خۆی بکات پێویستی سەرشانێتی و منەتی نی یە | رستەی شوێن کەوتووی هۆی یە (ژمارە - ٢) |

ئەگەر لەم رستەیەی ژووروو دا رستە شوێن کەوتووە گوزارەییەکە لا ببردرێت، ئەوا رستە تێکەڵە کە لە رووی واتاوە ناتەواو دەبێت و هەست بە هەبوونی نهێنێك دەکرێت، کە لەم ناوە دا پەردەی بەسەر دا دادراوە، وەیا لا براوە، چونکە رستەکە بەم جۆرەی لێ دێت :

(من زۆر مەمنوونی ئەو کەسەم، چونکە تا ئێستا هەر چیەکتان بۆ من کردبێت هیچ منەتم لێ نەزانیبوون . .)

بۆیە هەبوونی رستە شوێن کەوتووە گوزارەییەکە زۆر پێویستەو رستە شوێن کەوتووە هۆیەکە بەوەوەش بەندە.

ئەوەی لەم رستەیەی پێشوو دا دیسانەوە سەرنج راکێشە بەکارهێنانی ئامرازی گەیەنەری (چونکە)یە بۆ دوو جاران، کە نووسەر دەیتوانی بۆجاری دووەمی بەکاری نەهێنێت چونکە لە روون کردنەوەی هۆیەکەی دا هەر بەردەوامەو هیچ بارێکی سینتاکسی تازەی نەخستۆتە سەر، بۆیە لە بریتی ئامرازی گەیەنەری (چونکە) دەبا ئامرازی لێکدەری پێوەست (و)ی وەیا هەر فاریزەی بەکارهێنایا راستتر بوو و هەمان واتاشی دەبەخشی.

وێنەیەکی دی بۆ ئەو رستە تێکەڵەی، کە لە رستەیەکی شوێن کەوتووی زیاتری تێدا بەدی دەکرێت و یەکێکیش لەم رستە شوێن کەوتووانە هۆیین :-

هەڵاتنەکانیشی وەخت و سەعاتیان بۆ نەبوو، چونکە بەندی ئەو

دەکـات، ئەورستـە شوێن کەوتـووەی، کە بە یارمـەتی ئامـرازی گەیەنەری (چونکە) پێك هاتووە بە شێوەیەکی گشتی دەکەوێتە دوای رستـەی سەرەکی لەنێـورستـەی تێکـەڵ دا، بەڵام ئەورستـە شوێن کەوتـووەی، کە بە هاوکـاری ئامرازی گەیەنەری لەبەر ئەوەی (کە) بنیات نراوە بە گشتی دەکەوێتە پێش رستەی سەرەکی .

کاتی رووداوی رستەی شوێن کەوتووی هۆیی بە پێش کاتی رووداوی رستەی سەرەکی دەکەوێت و هێندێك جار نەبێت رووداوی هەردوو رستـەکـە ـ شوێن کەوتـووی هۆیی رستەی سەرەکی لە یەك کات دا دەبێت .

## پەراوێز

١ ـ نوری علي أمين، رێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ٥٥

٢ ـ ك . ك . کوردیێ، زمانی کوردی، مۆسکۆ، ١٩٦١، ٧١

٣ ـ کەریمی ئەیوبی‌وی . آ . سمیـرنۆڤا، دیالێکتی کوردی موکری، لینینگراد، ١٩٦٨، ١٤١

٤ ـ محـەمـەد ئەمین هەورامـانی، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا، بەغدا، ١٩٨١، ٣١٢

٥ ـ زەری آ . یوسوپۆڤا، شێوەی سلێمانی زمانی کوردی، مۆسکۆ، ١٩٨٥، ١٢٦ .

٦ ـ د . کوردستانی موکریانی، سینتاکسی رستەی سادە : بەغدا، ١٩٨٦، ٨٣ و ٨٤

## سەرچاوە


١ ـ آ . ن . گڤـۆزدیـڤ، زمـانی رووسی هاوچـەرخ بەرگی دووەم، مۆسکـۆ، ١٩٦٨، ٢٦٩ ـ ٢٧٣

٢ ـ ن . س . ڤالگینـا، سینتـاکسی زمانی رووسی هاوچەرخ، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ٣٢٤ ـ ٣٢٦

٣ ـ ی . م . ستیپانۆڤا، زمانی رووسی بۆ هەمووان، مۆسکۆ، ١٩٧٨، ١١١

ئەو سەرچاوانەی رستەیان لێ دەهێندراوە :ـ

١ ـ احمد عبدالله زەرۆ، حەیرانۆك، بەغدا، ١٩٨٧

٢ ـ ئازاد حەمە شەریف، مردنی دێوەرەیەك، (وەرگێرانە)، بەغدا، ١٩٨٤

٣ ـ ئازاد حەمە شەریف، وێنەی هونەرمەند لە تافی لاویدا (وەرگێرانە)، بەغدا، ١٩٨٧

٤ ـ ئەمین شیخ عەلائەددین نەقشبەندی، تەصەووف چی‌یە؟، بەغدا، ١٩٨٥

٥ ـ ئەها ئەحمەد صالح، فریشتەکانی سەر زەمین، بەغدا، ١٩٧٥

٦ ـ حسین عارف، شار، بەغدا، ١٩٨٧

٧ ـ صادق بهاءالدین ئامێدی، خان و مان، بەغدا، ١٩٨١

٨ ـ دوکتور عیزەدین مستـەفا رەسـوول، جەژنانە (وەرگێرانە)، بەغدا، ١٩٨٢

٩ ـ د . کوردستـانی موکریانی، بیست چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی، هەولێر، ١٩٨٤


# الجملة التابعة السببية


● د . كردستان موكرياني ●

كلية الآداب ـ جامعة صلاح الدين


تصـاغ الجملة المعقـدة مع الجملة التـابعـة السببيـة بواسطة اداة الـوصـل [ (چـونكـە ـ چونكو ـ چونكي)، (لەبەر ئەوەی (ـ کە) ]، وتقـع هذه الادات النحـوية عادة في بداية الجملة التابعة السببية، والملاحظ ان اداة (چونكە چونكو چونكي) هي اوسعهم استعمالاً في لغة التكلم والكتابة ايضاً .

توضـح الجملة التـابعة السببية سبب وقوع الحدث في الجملة الـرئيسيـة ضمن الجملة المعقـدة يُلاحـظ ان موقع الجملة التابعة السببية في الجملة المعقدة له تماس مباشر بالاداة النحوية، حيث ان الجملة التـابعـة السببيـة المنظمة اداة الوصل (چونكە) تقع في المـرتبـة الثـانيـة ضمن الجملة المعقـدة، اي ان الجملة الرئيسية تسبقها من حيث الترتيب، اما الجملة التابعة السببية المبتدئة باداة الـوصـل (لـەبـەر ئەوەی (ـ کە) فأنهـا تسبق الجملة الـرئيسيـة في الجملة المعقدة .

ان زمن حدوث الحـدث في الجملة التـابعة السببية يسبق زمن وقوع الحدث في الجملة الرئيسية وأحياناً يتطابق زمن الحدثين أو الظاهرتين في الجملتين الرئيسية والتابعة لها .

# گیروگرفتی وەرگێران لە ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی لای قوتابیی کورد

وریا عزالدین علي و
ئازاد حمه شریف
کۆلێژی ئەدەبیات/ بەشی زمانی
ئینگلیزی زانکۆی صلاح الدین
هەولێر

## ١ - پێشەکی :

لەم نووسینەدا مەبەست لە وەرگێران ئەوەیە کە دەقێك لە زمانێکی بێگانەوە بگۆڕێتە سەر زمانێکی تر. ئەم کردەیە لێرە تەنها تایبەتە بە وەرگێران لە ئینگلیزییەوە (زمانی سەرچاوە) بۆ سەر زمانی عەرەبی (زمانی وەرگێڕراو) لەلایەن قوتابییە کوردەکانەوە؛ ئەمەش هەڵبەتە سوودو قازانجێکی زۆری دەبێت بۆ فێرخوازانی دیکەی وەرگێران لە ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی.

ئەوەی راستی بێت، وەرگێران راهێنانێکی هەرە بەسوودە لە زانستی زمانەوانی بەراوردکاریدا، چونکە لە کاتی وەرگێران دا قوتابی بە بەردەوامی رووبەرووی ئەو لێکچوون و جیاوازییانە دەبێتەوە کە لە نێوان زمانی ئینگلیزیو زمانی دایکزایان دا هەیە.

ئەو کۆمەڵە فێرخوازانەی کە ئێمە لێکۆڵینەوەیان لەسەردەکەین قوتابیانی بەشی ئینگلیزی (کۆلێژی ئادابی - زانکۆی سەلاحەدین)ن. ئەوانە بەلای کەمەوە هەشتساڵێك ئینگلیزییان خوێندووە. ئەو بابەتەی بۆ وەرگێرانیش بۆیان دەست نیشان کراوە هەڵبەتە هیچ پێشینەیەکیان (خلفیة) لێ ی نی یە.

قوتابی کورد لەکاتی وەرگێرانی دەق بۆعەرەبی تووشی گەلێك گیروگرفتی گەورە دێت، خۆجاری واش هەیە تووشی شپرزەیی دێت هەر کە داوایان لێ دەکرێت هەڵسنە سەر تەختەو لەبەرچاوی قوتابیانی پۆل وەرگێرانەکەیان بنووسنەوە ئەو دەمە ترسی ئەوەیان لێ دەنیشێت کە رەنگە تووشی هەڵەی زمانەوانی و رێزمانی و رێنوس ببن لە زمانی عەرەبیدا. هەندێ جاریش کە دەقەکەیان دەخوێننەوە تووشی هەڵەی گۆکردن (pronunciation) دەبن چونکە نە ئەو پیتانە (ط، ظ، ص، ض، ذ، ث) و نە دەنگەکانیش لە زمانی دایکزایاندا هەیە.

مادام لێرەدا قسەمان دەربارەی ئەو قوتابییە کوردانەیە کە تووشی هەڵەی وەرگێران دەبن دەتوانین ئەوانە بەسەر دوو کۆمەڵە دابەش بکەین:

یەکەم: ئەوانەی کە خوێندنیان لەو خوێندنگایانە تەواو کردووە کە بە کوردی خوێندوویانە لەو ناوچانەی کە خوێندنیان بە کوردی بووە زمانی عەرەبیشیان شان بەشانی زمانی کوردی خوێندووە، بەڵام بەگشتی زۆربەی کتێبەکانیان بەزمانی کوردی بووە.

دووەم: ئەوانەی خوێندنیان لە خوێندنگای عەرەبیدا تەواو کردووە

لەو ناوچانەی کە دەبوایە خوێندن بە کوردی ببوایە. هەرچەندەش لەوێ زمانی عەرەبی وەك تاقە مادەیەك دەخوێندرێ،

هەڵبەتە ئەوە روون و ئاشکرایە کە کۆمەڵەی دووەم زۆر لەوەی یەکەم باشترە بەتایبەتی لە قسەکردن و نووسین بەزمانی عەرەبی و لە ئەنجام دا لە وەرگێڕانیش دا. دەبێ لێرەدا رۆڵی تێکەڵ بوون لە بیر نەکەین کە هۆکارێکی بنچینەیی و پێویستە لە پتەوکردنی زمانی عەرەبی دا.

هەندێ قوتابی کوردو کەمایەتیەکانی تریش عەرەبی بە باشی دەزانن چ بە خوێندنەوەو چ بە نووسین لە ئەنجامی تێکەڵاویان لەگەڵ عەرەب زمانەکان یان نیشتەجێ بوونیان لەو ناوچانەی کە زۆربەی بەعەرەبی دەدوێن و خوێندن و خوێندنەوەشیان بە عەرەبی بووە شان بە شانی زمانی دایکزایان. سەرباری ئەم هەمووەش ئەوانەی کە عەرەب نین پێویستیان بە فێربوون و کۆك کردنی زمانی عەرەبی هەیە بە شێوەیەکی ورد دەنا تووشی زۆر گیروگرفت دەبێت لە دوارۆژدا هەرکە داوای لێ دەکرێت دەقێك وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی لە کۆنگرەو کۆبوونەوە دەوڵەتی یەکان دا.

بەڵام ئەمە هەرگیز وا ناگەیەنێت کە شتی ڕێزپەر لەم مەسەلەیەدا نی یە ، زۆرجار وا هەڵ دەکەوێت کە قوتابییەك لە مەیدانی وەرگێڕاندا دەردەکەوێت هەرچەندە زمانی رەسەنیشی (زمانی دایکزای) عەرەبی نی یە. ساڵی پار شتێکی وا رووی دا، ئەوەبوو کچێکی قۆناخی چوارەم یەکەم دەرچوو لە بەشی وەرگێڕانی کۆلێژی ئادابی زانکۆی موستەنسریەدا. کچەکە کورد بوو هەروا نموونەی تری لەوبابەتەشمان هەیە کە قوتابی یەك دەبێتە سەرتۆپی قوتابی یانی تر لە مەیدانی وەرگێڕان دا و زمانی دایکزاشی عەرەبی نی یە، بەڵام ژمارەی ئەوانە زۆر کەمە.

ئەمە هەرگیز وا ناگەیەنێت کە ئەو قوتابیەی زمانی دایکزای عەرەبی نی یە بەهەمان رادە تووشی گیروگرفت و هەڵەدێت لە کاتی وەرگێران لە عەرەبی یەوە بۆ ئینگلیزی (یان بۆزمانی دایکزای) هەتا ئەگەر ئەو دەقەی وەریشی دەگێڕێت بە زمانی عەرەبی بێت؛ چونکە ئەو بەهەمان تای تەرازوو لەگەڵ هاورێ عەرەبەکەی خەریك دەبێ بە وەرگێرانی دەقێك یان پارچەیەکی داواکراو بۆ وەرگێران لە زمانی عەرەبی یەوە بۆ زمانێکی تر؛ جا دانانەوە لەبەر ئەوەی لێکچوونی زمانەوانی لە نێوان زمانی دایکزاو زمانی ئینگلیزیدا هەیە بە تایبەتی لەلایەنی رستەهەڵنانەوە، ئەمە وای لێ دەکات ببێتە وەرگێڕێکی بە توانای زمانی ئینگلیزی ولەکارەکەیدا بە دەسەڵات دەبێت ئەگەر زمانی ئینگلیزی بە چاکی بزانێ و شارەزای بنج و بناوانی ڕێزمان و رستەسازی ئەو زمانە بێت.

## ٢ ـ لێکۆڵینەوەی لەمەوپێش :

هیچ لێکۆڵینەوەیەك تائێستا لەمەڕ ئەم بابەتەوە نەکراوە، بۆیە لێکۆڵەرەوان خۆیان بە خاوەن ماف دەزانن کە تەنها کاغەزی تاقی کردنەوەی قوتابیە کوردەکان لە بابەتی وەرگێڕان لە ئینگلیزی یەوە بۆ عەرەبی بکەنە سەرچاوەی سەرەکیان

## ٣ ـ چەمکی وەرگێڕان و بنەماکانی وەرگێڕانی راست وەڕەوان :

وەرگێڕان لە ئینگلیزی یەوە بۆ عەرەبی پێویستی بە پێشینەیەکی زانیاری هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی هەیە. گیروگرفتەکەش لە پێکەوە بەستنی رستەکان و گۆڕینیان بەوانەی کە لەگەڵ دەستوورو ڕێزمانی عەرەبی دەگونجێن دێتەکایەوە. وەرگێڕ دەبێ خاوەنی توانا و شێوازێکی باشی دەربرین بێت تا بە باشی بەو ئەرکە هەڵسێت. خۆ زۆر جاریش لە ئەنجامی ئەوەوە بە چەندین گۆڕین و دەستکاری و خستنە سەرو لێ لابردنەوە خەریك دەبێت بۆ ئەوەی مانایەکی دیارو ئاشکرا بخاتە بەر زەینی خوێنەر.

ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستە کە وەرگێڕان بریتی یە لە کردەی گوازتنەوەی دەقێك لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر. کەواتە زمان بڕبڕەی پشتی وەرگێڕانە. ج.س. کاتفۆرد[1] لە کتێبەکەی «تیۆری یەکی زمانەوانی وەرگێڕان»دا دەڵێت: «وەرگێڕان کردەیەکە بە هۆی زمانەوە بە ئەنجام دەگەیەنرێت؛ واتە کردەی گۆڕینی دەقێکە لە زمانێکی تایبەتی یەوە بە دەقێکی تر لە زمانێکی دیکەدا». ئەوەش ئاشکرایە کە دەبێ هەر تیۆری یەکی وەرگێڕان پشت بە تیۆری زمان ـ تیۆری یەکی گشتی زمان ببەستێت.»[1]

وەرگێڕان خۆ لە نێوان هەردوو جەمسەری توونـدگری و دەسکاریدا دەبینێتەوە بە پێی سروشتی مادە وەرگێڕاوەکەو بە پێی خۆبەستنەوە بە بیروباوەڕی دەستپاکی وەرگێڕان، کەواتە بە گشتی توندگری لە وەرگێڕانی بابەتە زانستی یەکاندا پێویستە؛ هەرچەندە دەستپاکی لە وەرگێڕانی شیعردا بە «ناپاکی» دراوەتە قەڵەم. سەرباری ئەوەش وەرگێڕان بە سروشتی ئەو زمانەی دەقەکەی نی

وەرگێراوە بەستراوەتەوە .

وەرگێـران لە سەربنچینـەو ڕێسایەکی تایبەتی دەوەستێت چونکە وەرگێڕان زۆر پێویستی بە وردەکاریو شارەزایییەوە هەیە ؛ وەرگێڕی سەرکەوتووش ئەو کەسەیە کە بیرۆکەکەی بە ئاسانیو ڕێك ورەوانی دەگەیێنێتە گوێگری بە شێوەیەکی نزیك لە فیکرەی دەقە ڕەسەنەکە ـ پێویست نییە وەرگێڕ هەموو وشەیەك بگەیەنێتە گوێگر، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە تام و بۆو شێوازو ڕۆحی مادە ڕەسەنەکەی پێ بگەیەنێت .

خراپترین جۆری وەرگێڕانی دەقێك ئەو جۆرەیە کە بەردەوام ئەوە بە بیـر خوێنـەر دێنێتـەوە ئەو دەقـە دەقێکی وەرگێـراوە نەك ڕەســەن ، وەرگێڕی چاك ئەوە زۆر باش دەزانێت کە خراپترین ڕێگای وەرگێڕان ئەوەیە کە دەقێك لە زمانێکەوە وشە بە وشە وەربگێڕێتە سەر زمانێکی تر .

## ٤ ـ گیروگرفتی وەرگێڕان بە گشتی :

گەلێ گیـروگـرفتی گشتی هەن کە تووشی وەرگێـر دێن لە کاتی وەرگێـران لە ئینگلیـزییەوە بۆعەرەبی : نەخوازە ئەگەر وەرگێرەکەش زمـانی دایکـزای عەرەبی نەبێو تازە فێـرخـوازی وەرگێڕانیش بێت ـ سەرەنجام هەڵەی بەربادیان لە دەست دەقەومێت . ئەوەی سەرنجی ئێمـە بۆئـەو گیـروگرفتە ڕاکێشا ئەوڕاستییە بوو کە ژمارەی قوتابییە کوردە تاقیکراوەکان (١٥) کەس بوون (لە پۆلی چوارەمی ـ بەشی ئینگلیـزی ـ زانکـۆی سەلاحـەدین) ؛ ئەو قوتـابیـانە داوایان لێکرا دەقێك لە دوو دەق (یەکێکیان ئەدەبیو ئەوی تر (زانستی) بە کەیفی خۆیـان بکـەنـە عەرەبی تا بزانین چەنـد کەسیـان بە سەرکەوتوویی دەقەکان وەردەگێڕن و چەندیان تووشی هەڵە دەبن .

وەڵامـەکـانیـان دووپـاتی ئەوڕاستییە دەکەنەوە کە گیروگرفت و هەڵەکانیان گەلێ ترسناکن و مەسەلەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی ورد هەیــە چونکــە هەر (١٥) قوتــابی بەرێــژەی ٤٥٪ تا ٧٥٪ی وەرگێڕانەکانیان هەڵە بوو . ئەمانەی خوارەوەش هەندێ لەو هۆیانەن کە وەرگێڕ تووشی هەڵەی هەمە جۆر دەکەن :

**یەکـەم :** لەبـەر ئەوەی زۆربـەی فێرخوازەکان خاوەنی زانیارییەکی هەمـەلایی و تەواوی ڕێســاو یاســا بنچینـەییـەکانی ڕێزمان ورستە سازی (هەردوو زمانەکە)نین بە زۆری وەرگێڕانەکانیان کرچ و کاڵ دەردەچێت .

**دووەم :** بە شێـکـی هەرەزۆری فێـرخــوازەکــان تووشـی گەلـێ گیروگرفت دێن هەر کە داوایان لێ دەکرێت دەقێك لە ئینگلیزییەوە وەربگێـرنـە سەر زمـانی عەرەبی . هەنـدێـك لەو گیـرو گرفتـانـە لە ئەنجـامی (قـورسی) دەقـەکـەوە خۆی دێتـە کایەوە یان لە ئەنجامی لەوەرگێــران نە هاتنی مادەکـە، زاراوەکـانی ، یان کەمی زانیـاریو پێشینـە (خلفیـەت) لە بارەی ئەو مادەیـەی کە وەری دەگێڕێت . جار وایـە لە ئەنجـامی خاڵبـەنـدییـەوە مانـاکان لەلای وەرگێر تێکەڵ و پێکەڵ دەکرێت .

**سێیـەم :** زمـانی ئینگلیـزیوزمـانی عەرەبی لە چەنـدین ڕووەوە لە بەکارهێنانی ئامرازی نەناساندن (ال)ەوە لێك جیاوازن ، هەرچەندە لە هەنـدێـك لایەنیشەوە لێکچوون (واتا هاوتای وەرگێڕان) لە نێوان ئامـرازی ناســانـدنی عەرەبیو ئینگلیـزییەوە هەیە بەتایبەتی لەسەر ئاستی وشەو کۆمەڵەو شەدا (گەرچی لەوەی کۆمەڵە وشەدا کەمترە)، بەڵام قوتــابیــان هەر زۆر تووشی هەڵـەی لەم بابـەتـە دەبن . دەبێ سەرنجی قوتابیان بۆ ئەو ڕاستییە ڕابکیشرێت کە ئەو بەگشتی کردنە لەســەر ئاستی بەرز جێگــای خۆی ناکـاتـەوە چونکـە لە زۆر باردا هاوتــای وەرگێــرانی ئەو ئامــرازەی ناســانــدنـە لەگـەڵ هاوتـای ئینگـلیـزییـەکـەی ڕێـك ناکەوێت (یان جار وایە هاوتای نییە) کە ئەمەش زۆربەیان تووشی گیروگرفتی بەکارهێنانی ئامرازی ناساندن دەکاتەوە .

**چوارەم :** لەبــەر ئەوەی زمــانـی ئینـگـلیــزیوزمــانی کوردی لە سەرچاوەیەکی هاو بەشەوە یەك دەگرنەوە کە ئەویش بنەماڵەی زمانی هینـدوئەوروپییـە وچونکە زمانی عەرەبیش سەر بە بنەماڵەی زمانی سامییە دەبینین گەلێ جیاوازی لە نێوان زمانەکان دا هەیە . ئەمەش دەبێتـە هۆی خولقـاندنی گەلێ گیروگرفت لە کاتی وەرگێڕان دا و لە ئەنجـام دا ئەمە دەبێتە هۆی پێك نەچوون و پێك نەشیان و ناتەبایی لە نێوان ڕستەو دەستە واژەکانی هەردوو زمانی عەرەبیو ئینگلیزی .

**پێنجـەم :** هەروەك ئاشکـرایـە لە زمـانی ئینگلیـزیدا گەلێ ڕستەی ناوئـاخن هەیـە کە ئەمـەش بۆوەرگێـران زۆر ناخـۆشـە و بە ئاسانی لەگەڵ ڕستەکانی زمانی عەرەبی ڕێك ناکەوێت .

**شەشـەم :** لەکـاتی وەرگێـران دا بۆسەر زمانی عەرەبی دەبێ هەندێ وشـەورستـە بخـرێتـە سەر دەقـە وەرگێـراوەکـە بۆتەواوکردنی مانای هەنـدێ ڕستـەی ناتـەواوا لە زمانی ئینگلیزیدا ، بەڵام پێویـستە ئەمە زۆر بە وردی وزیـرەکی بکـرێت چونکـە ئامـرازی پێك بەستنەوە لە نێوان ڕستە ناتەواوەکاندا نییە بۆیە دەبێ لە خۆوە وشەی وادا بنرێت کەجێی خۆیان بکەنەوە .

**حەوتـەم :** جیـاوازییـەکی زۆر لە نێوان ڕیزبوونی وشە لە ڕستەدا لە زمانی عەرەبیو ئینگلیزیدا هەیە ، قوتابی کورد هەرکە ئەو ڕستانە لە

1- THE CREATIVE PROCESS 

The most remarkable discovery made by scientists is science itself. The discovery must be compared in importance with the invention of cave-painting and of writing. Like these earlier human creations, science is an attempt to control our surroundings by entering into them and understanding them from inside. And like them, science has surely made a critical step in human development which cannot be reversed. We cannot conceive a future society without science.

I have used three words to describe these far-reaching changes: discovery, invention, and creation. There are contents in which one of these words is more appropriate than the others. Christopher Columbus discovered the West Indies, and Alexander Graham Bell invented the telephone. We do not call their achievements creations because they are not personal enough. The West Indies were there all the time; and as far the telephone, we feel that Bell's ingenious thought was somehow not fundamental. The groundwork was there, and if not Bell then someone else would have stumbled on the telephone as casually as on the West Indies.

2- A major headache for conference organisers , both in the Middle East and in international forums, is to find good Arabic-speaking translators and interpreters.

Fifteen years ago Arabic was scarely heard in international conferences, but since 1973 it has been an official language in all United Nations bodies , with their vast networks of committees and conferences.

Arabic is also an official language in the Organisation of Arican Unity (OAU) and the Islamic Conference Organisation, and is extensively used in the non- aligend movement.

But the training of interpreters and translators has fallen far behined the demand. And international or regional bodies are not the only cosumersof these skills . Throughout the Middle East , goverments are trying to 'Arabise ' their education systems, which means that a wide variety of text books for schools and universities need to be translated into Arabic.

ئینگلیزی‌یەوە دەکاتە عەرەبی بە کوردی بیر دەکاتەوە و وشەکان بە کوردی لە مێشکی خۆی لێك دەداتەوەو بە پێی ڕێزمانی کوردی لە مێشکی خۆی ڕیزیان دەکات. ئەمەش کار لە وەرگێڕانەکە دەکات و بە زمانێکی عەرەبی (بەکوردی دارێژ راو) نووسینەکە دێتەبەرچاو (وەك پاشتر نموونەی لەم جۆرە دەبینین)

**هەشتەم:** دانانی سەروبۆروژێروزەنە پێویستی بە شارەزایی هەیە لە زمانی عەرەبی‌دا. ئەوەش بەدەگمەن لە قوتابی کورددا بەرچاو دەکەوێت.

**نۆیەم:** گرنگیی گۆڕانە زمانەوانی‌یەکانی زمان لەکاتی وەرگێڕاندا دەوەستێتە سەر ڕادەی شارەزایی و پسپۆری وەرگێر لە پێکهاتووە زمانەوانی‌یەکان و گۆڕانیان لە هەردوو زمانە وەرگێڕاوو بۆ وەرگێڕاوەکەدا.

**دەیەم:** جیاوازی دەنگ لەنێوان زمانی ئینگلیزی‌و عەرەبی‌و کوردی‌دا.

**یانزەهەم:** گیروگرفتی تاك و کۆ لەنێوان زمانی ئینگلیزی‌و عەرەبی‌دا دەبێتەهۆی ڕوودانی گەلێ هەڵەی جۆربەجۆر لەکاتی وەرگێڕان دا. (بڕوانەی برگەی ٦)

**دوانزەهەم:** گیروگرفتی نێرومێ (٢)و لێك جیاکردنەوەیان لە زمانی عەرەبی‌دا، ئەوەی ئەو گیروگرفتە پتردەکات نەبوونی نێرومێ‌یە لە زمانی ئەدەبی کوردی‌دا (مەبەستم لە شێوازی شێوەزاری کرمانجی خواروو)ە. هەر ئەمەشە وا لە قوتابی کورد دەکات بەهەمان چاو تەماشای هەموو وشەکان بکات؛ لەپاڵ ئەوەش دا لە عەرەبی‌دا وشەی وا هەیە کە لە ئینگلیزی‌دا نێرە یان مێ‌یەو لە عەرەبی‌دا بە پێچەوانەوەیە. (وەك وشەی مانگ (القمر) کە لە عەرەبی‌دا نێرەو لە ئینگلیزی‌دا بەپێچەوانەیە؛ جا لەبەرئەوەی ئەوانە ئامرازی نێر و مێیان پێوە دیار نی‌یە یان تەنانەت ئامرازی (جمع تكسير)یشیان پێوەنی‌یە قوتابی سەری لێ دەشێوێت و هەڵەی ناقۆڵا دەکات.

**سیانزەهەم:** گیروگرفتێکی دی ئەوەیە کە لە زمانی عەرەبی‌دا دوخی (المثنى) هەیەو لە زمانی کوردی‌دا ئەوە نی‌یە، خۆ ئەوە لە زمانی ئینگلیزیش دا زۆر دەگمەنە.

**چواردەهەم:** گیروگرفتی هەبوونی دوخی (نصب ورفع وجزم) لە زمانی عەرەبی‌دا نەبوونیان لە زمانی ئینگلیزی‌و کوردی‌دا وەك (أثنتان ـ أثنين)و ناخۆشی لێك جیاکردنەوەیان.

### ٥ ـ ئەو دەقانەی درابووە قوتابی‌یە کوردەکان بۆ وەرگێڕان لە ئینگلیزی‌یەوەبۆ عەرەبی.

تێبینی: زۆربەی قوتابیەکان پارچەی ژمارە (١) یان هەڵبژاردووە بۆ وەرگێڕان چونکە پارچەی یەکەم زانستی‌یەو لە زمانی زانستیش دا وشەو دەستەواژە مانای دیارو ئاشکرا بەخۆوە دەگرێت، بەڵام لە دەقی ئەدەبی یان دەقی ڕۆژنامەیی (وەك دەقی پارچەی دووەم)دا وشەو دەستەواژەکان پتر لە مانایەکیان دەبێت و بەم جۆرە وەرگێر تووشی سەرلێ‌شێوان دەبێت. وەك پێشتریش گوترا ئەوانە تازەفێرخوازن و لە مەیدانی وەرگێڕان دا شارەزا نین بۆیە باشیان کردووە کە پارچەی یەکەمیان هەڵبژاردووە. کەچی تەنیا یەك (١) قوتابی پارچەی دووەمی هەڵبژاردووە. چونکە دەقەکە بە زمانێکی تایبەت بە ڕۆژنامە نووسراوە کە ئەمەش تەنها وەرگێری شارەزا دەوێرێت خۆی لێ بدات چونکە زمانی ڕۆژنامە زمانێکی کورتبڕی پڕ وردەکاری‌و ڕەوانبێژی‌یە ـ وشەو دەستەواژەکان لەبەر زەینی قوتابیان نامۆیەو ڕەنگە وشەو دەستەواژەکانی ناوپارچەی دووەم بە ڕێکەوتیش نەبێ نەهاتبێتەرێی ئەوان.

### ٦ ـ نموونەی هەڵەی وەرگێڕانی قوتابی‌یە کوردەکان.

هەڵەی قوتابیان گەلێك زۆرە، زۆربەشیان چەند بارە بوونەتەوە. هەر بۆیەشە ئێمە بڕیارمان دا بەسەر چەند کۆمەڵەیەك دابەشیان بکەین کە هەر کۆمەڵەی تایبەتە بە یەك جۆرە هەڵە.

**یەکەم:** هەڵەی نێرومێ: ئەم گیروگرفتە بە شێوەیەکی زۆر بەربڵاو تووشی قوتابی کورد دێت لەکاتی وەرگێڕان لە ئینگلیزی‌یەوە بۆسەر زمانی عەرەبی (بەتایبەتیش ئەو قوتابیانەی کە خوێندنیان بەکوردی بووە، چونکە لەزاری کرمانجی ژووروودا کە زاری نوسین وزمانی ئەدەبە بەهیچ جۆرێك نێرومێ بەرچاوناکەوێت کە ئەمەش وا لە قوتابی کورد دەکات بەرامبەر ئەو دیاردە نوێ‌یە دابمێنێت و سەری لێ‌دەرنەکات. هەڵەکانیش بەم جۆرەی خوارەوەن (بۆدەرخستنیان لەناو کەوانەم داناون:

هەڵە

———

١ ـ ان العلم (هي) من اكثر اكتشافات أهمية (رقم١)

٢ ـ يوجد محتويات (الذي يكون فيه) هذه الكلمات. (=)

٣ ـ ان العلم (لهـا) دورمهم في تطـويـر الأنسـان التي لايمكن الأستغناء (عنها)

٤ ـ لقد استعملت (ثلاثة) كلمات

٥ ـ مشروع العمل (كانت موجودة)

٦ ـ لانسمي هذه المنجـرات بالخلق، (لأنـه) لم تكن كافيـة على الصعيد الشخصي)
٧ ـ ان من اهم الأكتشافات (الذي) صنع من قبل العلماء . . .
٨ ـ وتضمن كل واحد من هذه الكلمات مغزى ذو أهمية حيث ان (واحد) من هذه الكلمات أوضح من (اخر)
٩ ـ في الشرق الأوسط الحكومة (يحاول تعريب (نظامهم) الثقافي (رقم٢)

**راستی**

---

١ ـ ان العلم هو من اكثر الأكتشافات العلمية أهمية .
٢ ـ هنالك محتويات تكون فيها احدى هذه الكلمات .
٣ ـ ان للعلم دور مهم في تطوير الأنسان ولا يمكن الأستغناء عنه .
٤ ـ لقد استخدمت ثلاث كلمات
٥ ـ وكان مشروع العمل موجوداً .
٦ ـ نحن لانسمى هذه المنجزات خلقاً (أو ابداعاً) لانها لم تكن كافية على الصعيد الشخصي
٧ ـ ان اهم اكتشاف قام به العلماء .
٨ ـ . . . احدى هذه الكلمات اكثر ملائمة من الأخرى .
٩ ـ تحاول الحكومات في دول الشرق الأوسط تعريب مناهجها التعليمية .

**دووەم**: هەڵـە لە ئامـرازی ناساندن (ال) دا . قوتابی کورد بە زۆری تووشی ئەم هەڵـەیـەش دەبێت چونکـە لە زمـانی دایکـزای‌دا ئەمـە دەگمەنە . ئەمانەی خوارەوەش چەند نموونەیەکن :

**هەڵە**

---

١ ـ ان اشهر (اكتشافات) العلمية (رقم ١)
٢ ـ ان العلم من اكثر (اكتشافات) أهمية (=)
٣ ـ يحاول العلم ان يسيطر على الأشياء التي حولنا (بدخول) اليها
٤ ـ (الرسومات) الكهف . . .
٥ ـ لأنه لم تكن كافية على (صعيد الشخصي)
٦ ـ ان اهم (الأكتشاف) التي استكشف من قبل العلماء هو العلم نفسه
٧ ـ لقد استخدمت ثلاث كلمات لوصف هذه (اختلافات) الصعبة . .

**راستی**

---

١ ـ ان اشهر الأكتشافات العلمية . . .
٢ ـ ان العلم نفسه هو من اكثر الأكتشافات العلمية أهمية .

٣ ـ يحاول العلم أن يسيطر على الأشياء التي تدور حولنا وفهم جوهرها .

٤ ـ رسومات الكهوف . . .
٥ ـ لأنها لم تكن كافية على الصعيد الشخصي .
٦ ـ ان أهم اكتشاف من قبل العلماء هو العلم نفسه
٧ ـ لقد استخدمت ثلاث كلمات لوصف هذه الأختلافات الشاسعة .

**سێیەم**: تاك و کۆ:

قوتـابی کورد زۆر جار تووشی هەڵـەی (تـاك وکۆ)ش دەبێت هەروەك لەو نموونەیەی خوارەوە دەردەکەوێت :

**هەڵە**

---

١ ـ أنا يستعمل (ثلاث) حرف

**راستی**

---

١ ـ استخدمت ثلاثة أحرف

تێبینی : ئەگەر هاتوو ناوەکە نێر بێت وژمارەکە لە (٣ ـ ١٠) بێت ئەو (ة)ی مێ دەکەوێتە سەر ژمارەکە خۆی، بەڵام ئەگەر ناوەکەی دوای ژمـارەکـە مێ بێت ئەو (ة)ە لەسـەر ژمـارەکـە لادەبەین وەك (عندي ثلاثة رجال) و (عندی ثلاث نسوة)

چوارەم : هەڵەی کارتێکردنی زمانی دایکزا :

هەندێ هەڵەی دیکەی جۆربەجۆر هەن کە تووشی قوتابی کورد دەبێ لە ئەنجـامی ئەوەی بە زمـانی دایکـزای بیـردەکاتەوە، چونکە هەمـوو مرۆڤێـك پێش ئەوەی مادەیەك وەربگێڕێتە سەر زمانێکی دی بە زمانی دایکزای بیردەکاتەوە، وەرگێڕی شارەزا دەتوانێ زوو بە زوو

خۆی لەم گیروگرفتە دەرباز بکات، وەك هەمووشمان دەزانین زمان لەلایەن دەروون ناسەکانەوە بە جۆرە عادەتێك دادەنرێت بۆیە لەکاتی وەرگێڕاندا دەبینین ئەو عادەتە بەبێ ئاگاداری بەسەر قوتابی‌یەکەدا زاڵ دەبێت. ئەوەش تووشی ئەو هەڵانەی خوارەوەی دەکات:

أ) هەڵەی جێگای کردار لە رستەدا: هەروەك ئاشکرایە کە کردار لە زمانی کوردی‌دا بەزۆری دەکەوێتە دواوەی رستە، بەڵام لە عەرەبی‌دا بە پێچەوانەیەوە دەکەوێتە سەرەتای رستەو لە ئینگلیزی‌دا دەکەوێتە پاش بکەر (subject)، بۆیە قوتابیی کورد بە زۆری تووش ئەم هەڵە باوەدەبێت وەك لەم رستانەی خوارەوە دەردەکەوێت (ئەوەی جێگای سەرنج دانە هەموو قوتابیەکان ئەم هەڵانەیان کردووە):

**هەڵە**

١ ـ في الشرق الأوسط الحكومة (يحاول) تعريب نظامها الثقافي (قطعة رقم ٢)
٢ ـ كريستوفر كولومبس (اكتشفت). . .
٣ ـ والكسندر گراهام بيل (ابتكرت) التلفون
٤ ـ والمترجمين (يقع) بعيداً عن المقصود

**راستی**

١ ـ تحاول الحكومات في دول الشرق الأوسط تعريب مناهجها التربوية
٢ ـ اكتشف كريستوفر كولومبس. . .
٣ ـ واخترع الكسندر گراهام بيل جهاز الهاتف
٤ ـ الا ان تدريب المترجمين والمترجمين الفوريين لم يلب الحاجة.

ب) هەڵەی مامەڵەکردن لەگەڵ جێ ناوە عەرەبی‌یەکان: زۆربەی قوتابی‌یە کوردەکان کە مامەڵە لەگەڵ جێ‌ناوی عەرەبی دەکەن تووشی هەڵە دەبن و نازانن دۆخی کردار چۆنی لێ دێت ئەمەش گەلێ جار دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆیەی کە ئەوان نازانن نێرو مێ لێك جیابکەنەوە، ئەوانەی خوارەوەش هەندێ لەو هەڵانەن:

**هەڵە**

١ ـ نحن لا (يستطيع) تؤمن المستقبل المجتمع بدون العلم (قطعة ١)
٢ ـ أنا (يستعمل) ثلاثة حرف

**راستی**

١ ـ نحن لانستطيع تأمين مستقبل المجتمع بدون العلم.
٢ ـ استخدمت ثلاث احرف.

د) هەڵەی ناوی وڵات و جێگاو شوێن: هەندێ ناوی وڵات هەن تایبەت بە زمانی کوردی‌و لە زمانانی تری دونیا بە شێوەیەکی دی دەردەبرێن. بۆ نموونە کورد بە وڵاتی هیند دەڵێ (هیندستان) و بە وڵاتی کورد دەڵێ (کوردستان) و بە وڵاتی ئینگلیز دەڵێ (ئینگلستان) و بە وڵاتی جۆرجیا دەڵێ (گورجستان) و هتد کە هەر ئەوەشە وای لێ کردووە بەم ناوانە رابێ و چۆنی پێ راهاتووە لەکاتی وەرگێڕان دا بۆ عەرەبی وا دەنووسێ، کە ئەمانەش چەند نموونەیەکن:

**هەڵە**

١ ـ كريستوفر كولومبس اكتشف غرب (هندستان)

**راستی**

١ ـ اكتشف كولومبس جزر الهند الغربية

لە ئەنجام دا دەگەیتە ئەو راستی‌یەی کە:
١ ـ ژمارەی قوتابیە کوردەکان کە بە وەرگێڕان هەڵسان (١٥) کەس بوو.
٢ ـ ژمارەی ئەو قوتابیە کوردانەی خوێندنیان لەناوچەی کوردی نەبووە (١) کەسە هەڵەکانیشیان بەم جۆرەبوو:
١ ـ ژمارەی هەڵەی ئامرازی ناساندن (ال) لەسەرجەمی قوتابیان دا (٢٤) هەڵەبوو.
٢ ـ ژمارەی هەڵەی نێرومێ لەسەرجەمی قوتابیان دا (٢٧) هەڵەبوو
٣ ـ ژمارەی‌هەڵەی تاك وكۆ لەسەرجەمی قوتابیان دا (٩) هەڵەبوو.
٤ ـ ژمارەی ئەو هەڵانەی لەژێرکارتێکردنی زمانی کوردی‌یەوە لەسەرجەمی قوتابیان دا (٢٨) هەڵەبوو

سەرجەمی هەموو ئەو هەڵانەی هەر (١٥) قوتابی کردوویانە (٨٨) هەڵەبوو کەواتە نزیکەی هەر قوتابیەی شەش هەڵەی بەلای کەمەوە کردووە کە ئەمەش وادەگەیەنێت کە هیچ یەکێکیان نی یە رستەیەکی بێ هەڵەی نووسی بێت.___

## ٧ ـ چارەسەری و پێشنیاز:

**یەکەم:** مامۆستای مادەی وەرگێران بەتایبەتیش لەبەشەکانی وەرگێرانی کولیژ ی ئاداب دا کەلێرەدا تەوەرەی ئەم لێکۆڵینەوەیە پێویستە تاقی کردنەوەیەکی بەرایی بەنووسین پارچەیەکی هەڵبژاردەیان بۆ وەرگێران پێ بدات تا شارەزایی جیاوازی ئاستی زانستی قوتابیان بێت بەتایبەتی لەمەیدانی وەرگێران داو بزانێت تاچ رادەیەك بەسەر زمانی عەرەبی و ئینگلیزیدا زاڵن ئینجا ئەو بابەت و رەگەزانە دەست نیشان بکات کە لە زمانی دایکزایان دا نی یەو پێ لەسەر ئەو رەگەزانە دابگرێت بەدرێژایی ساڵی خوێندن، هەروا راپۆرتی ناوبەناو لەبارەی ئاستی زانستیان پێشکەش بە سەرۆکی بەش بکات تاوەکو باش و خراپەکان لێك هاوێر بکرێن. لەپاڵ ئەمەش دا دەبێ هەوڵی چارەکردنی هەڵەوچەوتی بدرێت لە قۆناغە سەرەتاییەکانەوە بەرلەوەی رەگ لەمێشکی قوتابیان دابکوتن یان زیانی پێ بگەیەنن، چونکە ئەگەر لەسەر ئەم شێوازە بەردەوام بوون رۆژێك هەر دادێت واز لەمەیدانی وەرگێران بێنن دوای ئەوەی دەکەونە بەر نەشتەری رەخنەو گومان لێ پەیداکرن لەمەیدانی وەرگێران دا. چونکە وەرگێران لێزانی و شارەزایی زمانە بەشێوەیەکی ورد. جا ئەو قوتابیەی کە زمانی دایکزای عەرەبی نی یە رەنگە زۆر بەتوانا بێت لە مەیدانی وانە گوتنەوەی زمان یان بەئینگلیزی دوان دا، بەڵام زۆر جار نابێتە وەرگێرێکی سەرکەوتوو لەبەر نەزانین و دەست نەشکان بەسەر زمانی بۆ وەرگێرراو (Target Language) وەك دەشگوترێت زمانی عەرەبی دەریای زانستەو زمانێکی زۆر کۆنەو تەنانەت ئەوانەی زمانی دایکزاشیان عەرەبی یە تووشی هەڵەی جۆر بەجۆر دەبن لە مەیدانی زمان دا، ئەی دەبێ حاڵی ئەوانەچۆن بێت کە عەرەبی زمانی خۆیان نی یە.

زۆر جار ژمارەیەك قوتابی کورد زمان لەبەشەکانی وەرگێران لە ئینگلیزیەوە بۆ عەرەبی وەردەگیرێن ـ ئەوەش لەبەر ئەوەیە نمرەکانی بەکالۆریایان بەرزە، بەڵام زۆربەیان تووشی گەلێ گیروگرفت دێن لەو بەشانەدا، بەتایبەتیش، ئەوانەی کە لەقسەکردن و نووسینی عەرەبی دا باش شارەزانین چونکە ئەوانە بەکوردی خوێندوویانە یان لەو ناوچانە دانیشتوون کە بە کوردی دەدوێن. چەندین بابەتی وا لەبەشی وەرگێرانی کۆلیژ ی ئەدەبیاتی زانکۆی موستەنسریەدا لەساڵانی (١٩٨٧ ـ ١٩٨٨)دا رووی دا ـ گەلێ قوتابی کورد نەیان توانی لە تاقی کردنەوەی کۆتایی ساڵ دەربچن، ئەمەش وای لە هەندێکیان کرد لەو بەشە دەربکرێن و ناچار کران بچنە بەشی نزمتر وەك بەشەکانی دەروون ناسی و پەرتووکخانەو کارگێری و ئابووری و هی دی هەرکە لەنیوەی پتری مادەکانیان دەکەوتن، سەرباری ئەوەش ئەوساڵەیان بە (کەوتن) بۆ دانراو ناچاربوون ساڵی دووەم لەقۆناغی یەکەمەوە لەبەشێکی دیدەست پێ بکەنەوە.

کەچی ئەوانەی تر کە لەنیوەی کەمتری مادەکانیان کەوتبوون مافی ئەوەیان پێ درا کە لەخوێندن بۆ ساڵێکی تر لەهەمان بەش دابمێننەوە، رەنگە سەرەنجامی ئەوانیش هەر وەکو دەستەکەی پێشوو بێت و بکەونەوەو لەزانکۆ بە دەربنرێن و ئاواتی ساڵەهایان مایەپووچ بێ.

هەربۆیەشە ئەوە پێشنیازمانە کەشان بەشانی بەشی وەرگێران لە ئینگلیزیەوە بۆ عەرەبی و بەپێچەوانەوە، بەشێکیش بۆ وەرگێران لە ئینگلیزیەوە بۆ کوردی و بە پێچەوانەوە لەیەکێك لەزانکۆکانی وڵات بکرێتەوە، واش بەباش دەزانین ئەو بەشە سەر بەکولیژ ی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین بێت چونکە رەنگە ئەو قوتابیەی کە لە وەرگێرانی ئینگلیزی بۆ عەرەبی سەرنەکەوتووە لەپاشە رۆژدا ببێتە وەرگێرێکی لێهاتووی ئینگلیزی ـ کوردی.

**دووەم:** تاقی کردنەوەی سەلامەتی زمان و گۆکردن بەعەرەبی پێش ئەوەی قوتابیان لەبەشی وەرگێران وەربگیرێن شتێکی یەگجار پێویستە؛ هەروەها ژمارەی ئەوانەی کە زمانی دایکزایان عەرەبی نی یە دەبێ یەگجار کەم بکرێتەوە چونکە وەك بینیمان لەکاتی وەرگێران دا گەلێ گیروگرفت دێتە پێشەوە کە تەنها عەرەب زمانەکان برێکیان پێ چارەسەر دەکرێت.

**سێیەم:** ئەگەر هاتوو هەر ناچار بووین کە ئەوانەش وەربگیرێن کە زمانی دایکزایان عەرەبی نی یە پێویستە لەوانە وەربگیرێن کە نمرەی بەرزیان بەدەست هێناوە و دەبێ بۆ ماوەیەکیش بخرێنە دەورەی فێربوونی زمانی عەرەبی بەتایبەتی ئەو قوتابیانەی کە بەکوردی

خوێنـدوویـانـەو عەرەبی کەم دەزانن و بەهیچ جۆرێك بەشێوەیەکی راستـەوخـۆ تێکـەڵاویـان لەگەڵ عەرەبی دا نەبووە بەڵام نمرەکانیان خۆو بەخت ئەوانی فرێداوەتە بەشی وەرگێران.

چوارەم: هەروەك لەسـەرەوە باسمـان کرد بەرلـەوەی تاقی کردنەوەی بەنـووسین و بەزارەکی بە وقـوتـابیـانـە بکـرێت و ئەوەش بەهێنـد هەڵبگیـرێت کە نمـرەکـانیان لەهەردووزمانی عەرەبی و ئینگلیزی لە (٨٠) کەمتـر نەبێت وخـاوەنی زەخیرەیەکی گەورەی زمانەوانی بن و دەرچووی بەشی ئەدەبی یش بن و ئارەزوویەکی زۆریشیان لەبەشی وەرگێـران دا هەبێت. ئینجـا ئەگەر ئەو قوتابیە ئەو هەموو مەرجانەی سەرەوەی تێــدا هەبــوو مافی ئەوەی هەیـە لەبـەشی وەرگێـران وەر بگیـرێت دەنـا بە هیچ جۆرێك ناتوانێت بەسەر گیروگرفتی وەرگێران زاڵ بێت.

## پەراوێز

١) بەپێویستی دەزانین کە هەندێك لەو وشانەی لەعەرەبیدا بەنێریان مێ یان بە هەردووبار دێن روون بکـەینـەوە چونکـە زۆر بـەی قوتابیان لەوانەدا بەهەڵەدا دەچن و نێرە بەمێ ومێ بەنێر دادەنێن.

أ) ئەو بەشانەی لەشی مرۆڤ کە لەعەرەبیدا هەر بەمێ دادەنرێن:

١ - العين ٢ - الأذن ٣ - الأصبع ٤ - الرجل (القدم) ٥ - السن

ب) ئەو بە شانەی لەشی مرۆڤ کە بەنێرومێ دادەنرێن:

١ - (أ) اللسان (نێر)

ب) اللسان (مێیە کە لە هۆنراوەدا بەکاردێت)

ج) ئەو شتانەی کە بەگشتی بەنێرومێ بەکاردێن:

١ - السکین (بەزۆری نێرە بەڵام جارجارەش بەمێ بەکاردێت)

٢ - الطريق

٣ - السوق

٤ - السماء

٥ - الذهب

د) ئەو شتانەی بەگشتی بەمێ بەکاردێت:

١ - النار ٢ - الدار ٣ - الشمس ٤ - اسماء الريح

هـ) نێرومێ بەگشتی:

١ - الحية ٢ - الجراد

و) ناوی وڵاتان کە بەنێریان مێ بەکاردێت:

١ - العراق (نێر)

٢ - مصر (مێ)

٣ - بغداد (نێرومێ)

## سەرچاوەکان

1 - J.C. Cateford, ALinguistic Theory of Translation, (Oxford; Oxford University Press, 1978)

٢ - ابی بکـر محمـد بن القـاسم الأنبـاري، المـذکر والمؤنث، تحقيق الدکتور طارق عبد عون الجنابي جـ١، جـ٢ (بيروت: دار الرائد العربي، ١٩٨٦)

3 - C.K. Ogden and I.A.Richards, The Meaning of Meaning, (Londn: Kegan Paul, 1944)

4 - Geoffrey Leech, Semantics, (Middlesex: Penguin Books, 1978)

5 - A. Eugene Nida, Towards a science of Translating, (Leiden: E.J. Brill, 1964)

6 - T.H. Savory, The Art of Transl ation, (Oxford: Alden Press, 1959)

7 - P. Newmark, Approaches toTranslation, (Oxford: Pergamon Press, 1982)

# خلاصة البحث

## مشاكل الترجمة من الأنگليزية الى العربية
## بالنسبة للطلبة الأكراد

وريا عزالدين علي
ازاد حمه شريف
كلية الأداب / جامعة صلاح الدين - أربيل

يهدف هذا البحث الى دراسة مشاكل الترجمة من الانكليزية الى العربية التي تواجه الطلبة الأكراد عندما يقومون أويكلفون بمهمة ترجمة نص أو موضوع معين من اللغة الاصلية (الانكليزية) الى اللغة العربية وكذلك البحث عن السبل الكفيلة بمعالجة ذلك وايجاد الحلول المناسبة لها، وقد تم تقسيم البحث الى المحاور الرئيسية التالية:

١ - المقدمة

٢ - الدراسات السابقة

٣ - متطلبات الترجمة الصحيحة ومؤهلات المترجم.

٤ - مشاكل وصعوبات الترجمة بصورة عامة بالنسبة للطلبة الأكراد.

٥ - دراسة وتحليل لنماذج من النصوص المختارة والتي قامت بترجمتها مجموعة من طلبة قسم اللغة الانگليزية في كلية الاداب جامعة صلاح الدين في المرحلة الرابعة. وفي هذا المحور ظهر بأن معظم أخطائهم تكمن في حالات التذكير والتأنيث لعدم وجودها في لغة الأم (الكردية الفصحى) وكذلك حالة التثنية واستخدام (ال) التعريف ثم تأثير اللغة الكردية على النص المترجم الى اللغة العربية حيث يقع الطالب تحت تأثير لغته عند الترجمة. وكانت نسبة الأخطاء كثيرة تقدر بـ٤٥٪ - ٧٥٪ بصورة عامة الامر الذي يتطلب معالجة سريعة وخاصة في المناطق المشمولة بالدراسة الكردية.

٦ - وفي حقل المعالجات والحلول والمقترحات تم تقديم الحلول والمعالجات المناسبة لتجاوز هذا الخلل مستقبلاً مما يؤهل الطلبة الأكراد بالقيام بمهمة الترجمة دون أية صعوبة تذكر في هذا المجال.

ومن المقترحات فتح قسم للترجمة من الانگليزية الى الكردية جنباً لجنب مع الترجمة من الانگليزية الى العربية وبالعكس في الجامعات، ومن المفضل فتح القسم المذكور في كلية الآداب بجامعة صلاح الدين. وبذلك فأن الطالب الذي يفشل في الترجمة من العربية الى الانگليزية أوبالعكس يمكنه ان يصبح مترجماً قديراً في الترجمة من الانگليزية الى الكردية.

ومنها: اجراء إمتحان سلامة اللغة العربية والتكلم بها لطلاب قسم الترجمة. وقبول الطلاب من ذوي الكفاءة في العربية ومن الحائزين على درجات عالية. وفتح دورات تقوية اللغة العربية للطلبة الاكراد المقبولين في قسم الترجمة.

٧ - المصادر

# چۆنیەتیی وتنەوەی
# دەقە
# ئەدەبی یە کوردی یەکان

● مولود حمد نبی خلیفانی ●
یاریدەدەری مامۆستا
بەشی زمانی کوردی ـ کۆلێجی
پەروەردەی یەکەم ـ زانکۆی
بەغدا

## دەقە ئەدەبی یەکان

______________ :

دەقی ئەدەبی، ئەوپارچە ئەدەبی یەیە لە کەلەپووری ئەدەبی یەوە، کۆن یان نوێ، هەڵدەبژێررێت و، تام و چێژێکی هونەریی و تایبەتی تێدایە، بیرێکی تەواو و سەرلەبەر، یان چەند بیرێکی تێکبەستراوە، دەگرێتە خۆیەوەو، بۆ قوتابیانیش سەرچاوەی چێژ ی ئەدەبی و هەڵێنجانی ئەحکامی ئەدەبی یە.

وانەکانی دەقە ئەدەبی یەکانیش، جۆرەها ئامانج ومەبەست وەدی دەهێنن، بە تایبەتی لە پاککردنەوەو بێگەردکردنی دەروون و دروستکردنی کەسایەتی و ئاراستەکردنی رەوشت و رەفتاری مرۆڤایەتی، بە شێوەیەکی گشتی.

دەقە ئەدەبی یەکانیش، چونکە پڕ لە نرخ و بەهای بەرزو تاقیکردنەوەی پاك و بێگەردو سوود بەخش و دەوڵەمەندی مرۆڤایەتی، ئەوتۆی خێروپاکانە لە دەروون وویژدانی قوتابیاندا دەڕوێنن و هەستی راستگۆیی و دڵسۆزانەی نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەریتی لە دڵ و مێشکیاندا بەهێز دەکەن و بەردەوام پەرەیان پێ دەدەن.

ئەدەبی باشیش کاری قووڵ دەکاتە سەر دەروونی خوێنەرو دەروونناسانیش، ئەم رەنگەی بەرهەمی مرۆڤایەتییان بە گەورەترین و بەهێزترین سوڵتانی سەر دڵ و دەروون وویژدان و مێشکدا داناوە. (النويهي : ل۲۳).

لە لای ئێمەدا، تاکو ئێستا ئامانجەکانی فێرکردن و وتنەوەی بابەتی ئەدەبی کوردی، بەهەموو لقەکانیەوە، دانەنراون. . .

لەمانیش) ئامانجەکانی وتنەوەی دەقە ئەدەبییەکان . بەڵام ، بە شێوەیەکی گشتی ، دەتوانین ئەم مەبەست وئامانجانەی خوارەوە بخەینە رووکە رەنگە بشێن بکرێن بە مەبەست وئامانجەکانی وتنەوەی دەقە ئەدەبی یە کوردی یەکان وبەگوێرەی (پلەی خوێندن) ـ یش هەڵبژێرێن وبژاربکرێن و، هی تریش بخرێتە سەریان :

١ ـ قوتابی لە دەربڕینی ئەدەبی بگات وتێکەڵاوی بێت و، فیکرو هەستەکانی ناو دەربڕینەکە، تێیدا رەنگ بدەنەوە .

٢ ـ پەرە بە توانای راست ورەوان دەربڕینی قوتابی بدات و، سامانی زمانەوانی وتوانای ئەدەبیشی دەوڵەمەندو فراوانتر بکات .

٣ ـ وا لە قوتابی بکات چێژ لە وێنە هونەرییەکان ومانا بەنرخ و بەهاکان ودەربڕین وشێوازە بەرزەکانی ناو دەقە ئەدەبییەکە وەربگرێت . (وەزارەتی پەروەردە : ل٥١) .

٤ ـ مێشکی قوتابی بە لەبەرکردن وبیرهاتنەوەو بۆچوون وئەندێشەی فراوان وهەڵێنجان وهەڵسەنگاندن رابهێنێت .

٥ ـ دەروون وویژدانی قوتابی بە مانا بەرزەکان ورەوشت وبەها جوانەکانی ناو دەقە ئەدەبی یەکان تێرو تەسەل بکات . (العزاوي : ل٧) .

٦ ـ پەرە بە توانای قوتابی بدات لە رووی شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی دەقە ئەدەبییەکانەوە . (ابراهیم : ل٢٣٥)

٧ ـ وا لە قوتابی بکات ، ئەدەبی لاخۆش بێت و، بەردەوام بە پەرۆشی پتر خوێندنەوەو زیاتر لەبەرکردنی بێت . (الرحیم : ل٦٥) .

## هەڵبژاردنی دەقە ئەدەبی یەکان
:

بۆ ئەوەی وانەی دەقە ئەدەبی یەکان ، ئامانجەکانی باسکران وەدی بهێنێت دەبێت دەقی باش هەڵببژێررێت و، لە هەڵبژاردنیشیدا ، ئەم بنچینە بنەڕەتانەی خوارەوە رەچاو بکرێن :

١ . دەقی هەڵبژێرراو، دەبێت لە ئاستی مستەوای قوتابی بێت . هەر دەقێکیش ، قوتابی بەزۆر تێی بگات ونەشێ ناوەرۆکەکەی باش شیبکاتەوەو، بۆی نەکرێ ئەنجامە گشتییەکان راست هەڵبهێنجێت ، ئەوە سوود بەخش نابێت . (زریق : ل١٦٥) .

٢ . دەبێت دەقەکە بە بۆنەیەکی نیشتمانی یان نەتەوایەتی یان کۆمەڵایەتی ، بەسترابێتەوە . ئەم تێکبەستنەوەش سوودی زۆرە، لەمانە :

أ . بە قوتابی رادەگەیەنێت کە ئەدەب پەیوەندیی پتەوو بەهێزی بە ژیانەوە هەیەو ئاوێنەی رووداوەکانیەتی و وێنەی دەورو بەری دەکێشێت .

ب . وتنەوەو باسکردنی دەقەکە لە کاتی داهاتنی بۆنەی دانانی ، وا لە قوتابی دەکات بەپەرۆشی زانینی رووداوەکانی بێت وخۆی لەناو رووداوەکانی دەقەکەدا دەبینێتەوەو تێکەڵاویان دەبێت . ئەمانەیش ، پتر قوتابی هان دەدەن وزیاتر پاڵی پێوە دەنێن ، خێرا فێری ببێت وباش تێی بگات وچاك ناوەرۆکەکەی وبیرە سەرەکیە بنەڕەتەکانی شیبکاتەوەو هەڵیان بسەنگێنێت ولە ژیانی رۆژانەشی دا سوودیان لێ وەربگرێت .

٣ . تا دەکرێت دەقی وا هەڵبژێررێت ، شێوازو دەربڕینەکەی ئاسان بن و، ماناکەی روون بێت و، جوان وێنەی رووداوەکانی گرتبێت

٤ . با دەقەکە نە ئەوەندە درێژ بێت قوتابی لێی وەڕز بێت ، نە ئەوەندەش کورت بێت بیرە سەرەکییەکان بەدەستەوە نەدات وقوتابی چێژ و سوودی لێ وەرنەگرێت . (شریف : ل١٤) .

٥ . چەند دەکرێت ، با دەقە هەڵبژێرراوەکە هەمەجۆروزۆر مەبەست بێت .

٦ . با دەقەکان تەنانەت بە هونەرەکانی شیعرەوە بەند نەبن ، با هونەرەکانی پەخشانیشیان تێدابن .

٧ . دەقی هەڵبژێرراو لەوجۆرانە بێت پەرە بە ئەقڵ بدات ، رادەی شارەزایی قوتابی زیاد بکات و، دڵ وویژدانی قوتابی پڕ بکات لە سۆزو هەستی بەنرخ ومرۆڤانە ، گیانی ئازایەتی وهێزو بەجەرگی و پاڵەوانێتیی گەل ونەتەوەکەی وتێکرای مرۆڤایەتی ، بپژێنێتە ناو دەروون ومێشکی قوتابی .

٨ . ئەگەر جار بەجاریش ، بەپێی پێویست ، ئەوە هاتە گۆڕێ کە دوو پارچە لە هەمان بابەت هەڵببژێررێن ، بۆ ئەوەی دەرفەتی بەراوردکردن بۆ قوتابی باو بکرێت وپەرە بە توانای قوتابی بدرێت لە رووی هەڵسەنگاندنی بابەتەکەوە ، ئەوەهەر قەیدی ناکات .

## رووکاری نوێ لە خوێندنی دەقەکاندا
:

پێشان ، گرینگیی پێویست بە خوێندنی دەقی ئەدەبی نەدەدرا . . . ئێستاش لەلایەن ئەو مامۆستایانەی توانای راست و باش وتنەوەی دەقە ئەدەبی یەکانیان نی یەو، هەست بە سوودەکانی ناکەن ، هەروایە .

دەقی ئەدەبی زۆر وشك دەخرایە روو، سووك وساکاروخێراش ماناکەی شی دەکرایەوەو گرینگی بە تێکرا رووداوو هەڵوێستە وردو درشتەکانی ناو دەقەکە نەدەدرا . . . . وەك پەراوێزیش ، سەیری

هەڵسەنگاندنی و هەڵهێنجانی ئەحکام و ئەنجامە گشتییەکانی دەکراو، هیچ جۆرە پەیوەندییەکیش نەبوو لە نێوان دەقەکەو بۆنەی دانانی و، ئەو رووداوانەی پاڵیان بە ئەدیب ناوە بیهۆنێتەوە یان بینووسێت.

قوتابیش، تەنیا ئەوەی لەسەر بوو، دەقەکە لەبەر بکات و لەپێش مامۆستا دووبارەی بکاتەوە. (الجبوری: ل١٤).

لەوانەکانی مێژ ووی ئەدەبیشدا، دەق پاشکۆی دەخراو تەنیا گرینگی بە رووداوو راستییە مێژ ووییەکان دەدرا کە بەند بوون بە سروشتی سەردەم و، ژیانی ئەدیب و رواڵەتە هونەرییەکانی. پرسیارەکانی تاقیکردنەوەش لەمان بەدەر نەبوون. هەڵبەتیشە، ئەمانە هەموویان، وایان لە قوتابی نەدەکرد، چێژ وەربگرێت وباش لە دەقەکە بگات و توانای شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی هەبێت. (الطعمة: ل٥٧ ـ ٥٩).

بەڵام رووکاری نوێی خوێندن وتنەوەی دەقە ئەدەبییەکان، وا دەروانێتە دەقی ئەدەبی کە بازنەی خوێندنی ئەدەب و، بنچینەی لێکۆڵینەوەکانی ئەدەبییە. ئەمەیش وا دەگەیەنێت کە مێژ ووی ئەدەب سەر بە ئەدەب بێت ولەو هەڵێنجراو بێت..... واتە، دەبێت لە دەقەکان خۆیان، بکۆڵرێتەوەو لە ئەنجامدا ئەحکامە ئەدەبییەکان هەڵبهێنجرێن. بەمەیش دەق لە خزمەتی مێژ ووی ئەدەبدا دەبێت، نەك بە پێچەوانە.

ئەم رووکارەش پەرە بە توانای قوتابیان دەدات لە رووی تێگەیشتن و شیکردنەوەو

هەڵسەنگاندن و هەڵێنجانی ئەحکام و ئەنجامە گشتییەکان، لەتەك وەرگرتنی چێژە هونەرییەکانەوە. (قورة: ل٢٢٩ ـ ٢٣٠).

## هەنگاوەکانی وتنەوەی دەقە ئەدەبییە کوردییەکان.

زۆر رێگاو هەنگاو هەن بەگوێرەیانەوە دەقە ئەدەبییەکان دەوترێنەوە.... ئێمە بەکارهێنانی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بە پەسەند دەزانین:

١. پێناسینی خاوەن دەقەکە: لە دایکبوونی وچۆنیەتی پێگەیشتنی، ژینگەکەی، رۆشنبیرییەکەی، دیارترین مەبەستەکانی شیعری و بەرهەمە ئەدەبییەکانی، بەو رادەیەی دەقە روون دەکەنەوە.

٢. کورتە پێشەکییەك بۆ چوونە ناو دەقەکە، بە باسکردنی بۆنەی دانان و، روون کردنەوەی ئەو هۆو باروودۆخانەی باڵیان داوە دەقەکە بنووسێت و وێنەی باسەکەیان بۆ بگرێت و، ئەو بارو رووداوانەی پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەیە، بۆیان بگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی رێگا لەبەردەم قوتابیان خۆش بکات و، وا حەزیان تێدا پەیدا بکات، بۆ زانینی رووداوەکان و بارو سەرنجی خاوەنەکە بە پەرۆش بن.

٣. خوێنەنەوەی دەقەکە خوێندنەوەیەکی نموونەیی و بە دەنگێکی بەرزو روون لەلایەن مامۆستاوە.

٤. خوێندنەوەی دەقەکە، بە بێدەنگی، لەلایەن قوتابیانەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی لە ماناکەی بگەن و مەبەستە گشتییەکانی ئەدیبەکەیان لەلادا روون بێتەوە.

٥. ئاراستەکردنی هەندێ پرسیاری روون و ئاشکرا بەند بن بە مانا گشتییەکەیەوە بۆ هەڵسەنگاندنی رادەی تێگەیشتنی قوتابیان و پەردەلادان لەسەر هەندێ رووی گشتیی دەقەکە، بۆ ئەوەی قوتابیان، بۆ زانینی تەواوی ناوەرۆکەکە بورووژێنن.

٦. خوێندنەوەی دەقەکە لەلایەن قوتابیان. بە دەنگێکی بەرزو لەسەرخۆو روونەوە... لەسەر مامۆستاشە، ئاگای لە چۆنیەتی خوێندنەوەو رەچاوکردنی وەستان لە ئاست خاڵ و فاریزەو تەواوبوونی واتای رستەو.... هەتاد بێت و یەکسەر هەڵەکانی قوتابیان راست بکاتەوە، بۆ ئەوەی لە مێشکیاندا نەچەسپێن و دووبارە نەبنەوە.

٧. دابەشکردنی تەختە بۆ دوو بەش... یەکەمیان بۆ راڤەکردن و روون کردنەوەی مانای وشەکان و دووەمیشیان بۆ پەنجە راکێشان و نووسینی بیرە سەرەکییەکانی دەقەکە.

٨. راسپاردنی یەکێك لە قوتابیان بە خوێندنەوەی کۆپلەی / پارچەی یەکەمی دەقەکە.

٩. مانادانەوەو روون کردنەوەی واتای وشەی گران و زاراوە زمانییەکان و نووسینیان لەسەر تەختە (یان لەناوپەرتووکی قوتابیان بە گوێرەی پلەی خوێندن). لەسەر مامۆستاشە، ئاگای لەو وشانە بێت کە بۆ هاوواتای وشە گرانەکان دێنێتەوە، لەوەی دەبێت پڕ بە پێستی واتاکەیان و مەبەستی ئەدیبەکەین و، تەنیا واتای ئەووشانەش بداتەوە کە کلیلی روون کردنەوەی واتای پارچەکەن.

بۆ روون کردنەوەی وشەی گرانیش، زۆر شێواز هەن، لەمانە:

أ. پێشاندان، واتە تێگەیاندنی ماناکە بە پیشاندانی شتەکە خۆی، یان وێنەکەی، یان وێنەیەکی نزیك لە ئەو.

ب. هێنانەوەی هاو واتا.

جـ. هێنانەوەی دژ واتا.

د. پێناسە، دیارکردنی مانای شتەکە بەهۆی ئەدگارەکانیەوە.

هـ ـ لێکچوون

و. روون کردنەوەی لێکدان و دارشتن. (الهاشمي : ل٥٤)

١٠. ئاراستەکردنی لقە پرسیار دەربارەی پارچەکە، بەو مەرجەی تێکرای پرسیارەکان مانای تەواوی پارچەکە بە دەستەوە بدەن.

١١. دارشتنی مانای گشتی کۆپلە پارچەکە لە لایەن قوتابیان و بە یارمەتیدانی مامۆستا، دارشتنێکی رێك وپێك و پوخت و تێکبەستراو.

١٢. گفتوگۆکردنی لایە جوانکاریەکانی ناو پارچەکە... وەستان لە ئاست ئەو وشەو رستە جوانانەی شێوازی بوێژ دەردەبرن، بۆ ئەوەی قوتابیان چێژێکی بە تامی ئەدەبی لێیانەوە وەربگرن.... هەروەها پەنجە راکێشان بۆ وشەو رستەی بەهێزی بەکارهێنراو کە تامێکی تایبەتیان بە پارچەکە داوەو، چۆن بەگوێرەی هەڵوێستەکانی ناو پارچەکەدا رازانراونەتەوە.... پێشخستن و دواخستن و رادەی کارکردنیان لە ئاڵۆزی و روونی واتا، بەرچاوخستنی وێنە نرخ شناسییەکان (بەگوێرەی پلەی خوێندن)و.... تاد.

١٣. دەستکردن بە پارچەیەکی تری دەقەکەو روون کردنەوەی هەروەك باسکرا، لەگەڵ گرینگیدان بە باش تێکبەستنەوە یان، پاشان، قوتابیان مانای گشتی پارچەکان، کورت دادەرێژنەوەو مامۆستاش پوختیان دەکاتەوە.

١٤. دیارکردنی بیرە سەرەکییەکانی دەقەکە، بە کورتی، لە لایەن قوتابیان و بە یارمەتدانی مامۆستا.

١٥. هەڵێنجاندنی هەندێ ئەحکام و ئەنجام بە رێگای ئەو پرسیارانەی مامۆستا ئاراستەی قوتابیان دەکات. لەسەر مامۆستاشە، بە تەنگە گەیشتنە ئەو ئەنجامانەی خوارەوە بێت (گشتیان یان بەشێکیان):

أ. تا چ رادەیەك دیاردە ژینگە سروشتییەکان، یان کۆمەڵایەتییەکان، یان وێنەکانی ژیانی رامیاریی سەردەم.. تاد، لە دەقەکەدا رەنگ دەدەنەوە.

ب. هەندێ ئەحکام دەربارەی ئەدیبەکە: سیماتەکانی، رادەی دوورکەوتنەوەو نزیك بوونەوەی لە ئەدیبانی سەردەمی دا... ئایا سۆزو بیرە سەرەکییەکانی بەسەر گشت بەشەکانی دەقەکەدا دابەش کراون، یان تەنانەت، لە هەندێکیاندا بەرچاو دەکەون؟... رادەی کارلێکردنی نێوان سۆزو ماناو ئەندێشەو..... تاد.

جـ. هەندێ ئەدگاری هونەریی دەقەکەو رادەی رەنگدانەوەیان لە کەسایەتیی نووسەرو ناخ وگیانی سەردەم دا.

د. هەندێ ئەحکام دەربارەی سەردەمەکەو رووکارە ئەدەبییەکانی، لە ئەنجامی تێك بەستنەوەو هەڵسەنگاندن وسەرەنجامەکانی ئەم دەقەو دەقە خوێنراوەکانی پێشوو... بۆ ئەوەی قوتابیان، بەردەوام، لە وێنەی گشتیی ئەدەبی سەردەمەکە نزیك ببنەوە.

هـ. هەڵسەنگاندنی دەقەکەو شوێن و نرخەکەی لە نێوان دەقەکانی ئەدیب و نێوان دەقە هاوچەشنەکانی تری هاو سەردەم داو، پایەکەی لە کەلەپووری بنەرەتی ئەدەبی کوردیدا، بە گشتی.

**نەخشەیەکی نموونەیی وتنەوەی دەقە ئەدەبییە کوردییەکان**

***

رۆژ:...... بابەت: پۆل و لق:......

مێژوو:.... وانەی:......

١. ئامانجەکان:

أ. گشتییەکان: (هەموویان دەنووسرێن ـ تەنیا لە نەخشەی یەکەمی سەرەتای ساڵی خوێندندا لە دەفتەری نەخشەدا دەنووسرێن ـ).

ب. تایبەتییەکان: (ئەو ئامانجانەن کە مامۆستا لە ئامانجە گشتییەکان و، لە بابەتە خۆی، هەڵیان دەهێنجێت)و خاڵ خاڵ لە نەخشەی رۆژانەدا تۆمار دەکرێن.

٢. هۆیەکانی فێرکردن: ئەو هۆیە فێرکردنە (بیستراو ـ بینراو)انە تۆمار دەکرێن، کە مامۆستا دەتوانێت دەربارەی ئەدیب و دەقەکە ئامادەیان بکات.

٣. هەنگاوەکانی وانە وتنەوە:

ئەو هەنگاوانەی باسمان کردن، زۆر بە کورتی و بە گوێرەی پلەی خوێندن، تۆمار دەکرێن.

٤. سەرنجەکانی مامۆستا:

(پاش تەواوکردنی بابەتەکە، مامۆستا چ سەرنجێکی هەبێت دەربارەی بابەتەکەو، ئەو پرسیارەیان ئەو پرسیارانەی لێی کراون و گومانی هەیە لە وەڵامدانەوەیان، تا کوێ بابەتەکەی روون کردووەتەوەو چی ماوە... ناوی ئەو قوتابیانەی ئامادەیان کردووەو ئەوانەی ئامادەیان نەکردووە.... هەر سەرنجێکی تری هەبێت ـ تۆماریان دەکات).

٥. دیارکردنی ئەرکی ماڵەوە بۆ قوتابیان.

***

ئەم نەخشەیە، نەخشەیەکی نموونەیی وتنەوەی وانەی دەقە ئەدەبییەکانە... بەڵام تا چ رادەیەك مامۆستای زمانی کوردی، پەیرەوی دەکات و لەسەری دەڕوات، ئەوە بۆ مامۆستاکە خۆی

دەگەڕێتەوە،

* * *


سەرچاوەكان :

١ . ابـراهيم، عبـدالعليم ـ الموجـه الفني لمـدرسي اللغـة العـربيـة، الطبعة السابقة، دار المعارف بمصر، القاهرة، ١٩٧٣

٢ . الجبـوري، عمـران جاسم حمـد . دراسـة مقـارنـة بين طريقتي المنـاقشة والمحـاضـرة في تدريس مادة الادب والنصوص في الصف الخامس الثانوي، جامعة بغداد، كلية التربية، ١٩٨٦ (رسالة ماجستير غير منشورة).

٣ . الجمهـوريـة العـراقية، وزارة التربية، لجنة وضع اهداف المواد الدراسية للغة العربية لسنة ١٩٨٥، (ملزمة مطبوعة بالالة الكاتبة).

٤ . الـرحيم، احمـد حسن . اصـول تدريس اللغـة العـربيـة والتربية الدينية، الطبعة الثانية، مطبعة الاداب، النجف الاشرف، ١٩٧١ .

٥ . زريق، معروف . كيف تلقي درساً، الطبقة الرابعة، دار الفكر، القاهرة، ١٩٧٨ .

٦ . شريف، ازهـر جواد . اصـول تدريس المحفوظات، وزارة التربية، معهد تطوير تدريب اللغة العربية، بغداد، ١٩٨٣ .

٧ . الطعمـة، صالح جواد ـ مشكـلات تدريس اللغـة العـربيـة في المـرحلة الثـانـويـة، مؤسسـة دار الكتب، وزارة التعليم العـالي والبحث العلمي، الموصـول (بـدون تأريخ)

٨ . العـزاوي، نعمـة رحيم . اصـول تدريس النصـوص الادبية، معهد تطوير تدريب اللغة العربية، وزارة التربية بغداد، ١٩٨٤ .

٩ . قورة، حسين سليمـان . تعليم اللغـة العـربيـة ـ دراسات تحليلية ومواقف تطبيقية ـ، الطبعة الثانية، دار المعارف بمصر، القاهرة، ١٩٧٣ .

١٠ . النويهي، محمد . ثقافة الناقد الادبي، الطبعة الثانية، مكتبة الخانجي، بيروت، ١٩٧٩

١١ . الهاشمي، عابد توفيق . اللغة العربيةـ الطرق العملية لتدريسـها، الجزء الاول، الطبعة الاولىٰ، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٦٧ .


# أصول تدريس النصوص الأدبيّة الكورديّة


مولود حمد نبي خليفاني

مدرس مساعد/ قسم اللغة الكردية

كلية التربية الاولىٰ / جامعة بغداد



يحقق درس الادب غايـات عدة، ذلـك لمـا له من اثر قوي في تهـذيب النفس، وتكـوين الشخصيـة، وتـوجيـه السلوك الانساني بوجه عام .

وبـالنظـر لعـدم تدوين الاهـداف المتـوخاة من تدريس الادب الكـردي، بفـروعه كافة، من قبل الجهة المعنية بوضع الاهداف، فقد قام الباحث بوضع اهم اهداف تدريس النصوص، الادبية الكردية .

ثم يتطـرق البـاحـث الى اهم الاسس التي يجب ان تراعى في اختيـار النصـوص الادبيـة، كمـلاءمتها لمستوى الطالب واتصالها بمناسبة وطنية او قومية او اجتماعية، وكون النص الادبي سهلاً في اسلوبه وواضحاً في معناه وجميلاً في تصويره، ومناسباً في طوله . وان تكون النصوص المختارة متنوعة متعددة الاغراض والغايات، وتتناول فنون النثر كتناولها فنون الشعر، وان تنمي العقل وتزيد من خبـرة الطـالب وتهذب نفسه وتملاء قلبه بالعواطف الطيبة والشعور النبيل، والى غير ذلك .

ويستعـرض البـاحث الاتجاهات القديمة والحديثة في تدريس النصـوص الادبيـة، ويـركـز على الاتجـاه الحـديث، الذي جعل النص محـوراً للدراسـة الادبية، واساساً تقوم عليه عمليات كثيرة، فتستنبط منه أسرار بلاغية، وتضاء فيه مواطن الجمال، وتبنى عليه احكام ادبية تدخل في موضوع تأريخ الادب .

ثم يعـرض البـاحث الخطـوات الاسـاسيـة التي ينبغي اتباعها والسيـر عليهـا في تدريس النصـوص الادبيـة الكـرديـة، ويـرد في الختام خطة نموذجية لتدريسـها .


* * *

# دەمارەلێدان
# النبضة العصبية

- ئا مادەکردنی
عبدالرحمن حمه چاوەش
سەرپەرشتی تایبەتی - بایۆلۆجی
بەڕێوبەرایەتی پەروەردەی سلێمانی
ئەیلولی ١٩٨٩

## پێشەکی:

هەر لە کۆنەوە مرۆڤ هەوڵی داوە هەموو شتێك لەبارەی خۆیەوە بزانێت، بەتایبەتی کە لە خۆی وردبۆتەوەو بیری لەوە کردۆتەوە کە ئەو هەموو ئەندامانەی لەشی چۆن وا بە ڕێك وپێکی کاردەکەن!! بێ ئەوەی کاری خۆیان لێ تێك بچێت، وەیان کار بکەنە سەر ئەوانی تر، تەنانەت هەندێ لەو ئەندامانە کارکردنیان لەژێر دەسەڵاتی مرۆڤەکەدا نی یە، . . پاش چەندین هەوڵ و تەقەلا کۆئەندامی دەمار دەست نیشان کرا بە ڕابەری ئەم کارە، بەڵام ئایا چۆن وبەچی شێوەیەك؟! کە تا ئێستا لێکۆڵینەوە بەردەوامە بۆ وەدەست هێنانی وەڵامی تەواو، چونکە بەڕاستی فرمانی خانەکانی دەمار ئاڵۆزە، بەڕادەیەك هەتا لێی بکۆڵرێتەوە. پرسیاری تازەتر دێتەکایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا زانایان و لێکۆڵەرەوە کۆڵ نەدەرەکان توانیویانە قۆناغێکی زۆر ببڕن لەم بوارەداو بەردەوامیشیان لەهەوڵ دان دا دواڕۆژێکی ڕوونی لەپێشە بۆ پەردە هەڵماڵین لەسەر هەموو ئەو شاردراوانە کە شوێنی گومان و پرسیارکردنن. .

### دەمارە لێدان (Nerve Impulse)

هەرچەندە ئەم کارە بە گرنگ و بێ هاوتا ناسراو بەڵام لەم بنەڕەت دا بەرەنجامی ئەو گۆڕانانەیە کە بەسەر ڕەوشتە بنچینەییەکانی خانەدا هاتوە. چوکڵەداری و فرە تایبەتمەندێتی ئەم چوکڵانەو ژ وارەیان کە بەپێی پێویستە، باشترین خۆراهێنانی دەمارەخانە (Neurone) دەردەخات لەم بوارەدا. تەوەرە (Axon) کە تاکە چوکڵەی دەمارەخانەیە، دەمارەلێدان لە لەشەخانەوە (Soma) دەبات بۆ دوور لە لەشەخانە، درێژی لە مایکرونێکەوە بۆ مەترێك دەبێت، لە لەشی مرۆڤ داو بە زۆری بەرگدارو داپۆشراوە، بۆیە ناودەبرێت بە «ڕیشاڵە» دەمار (NerveFiber) بەڵام پەل (Dentrite) کە چوکڵەی گواستنەوەیە بەرەو لەشەخانە کورت و بێ بەرگ و ئەستوورە، زۆربەی دەمارەخانە لە پەلێك زۆرتری هەیە (وێنە ١) کۆتایی ئەم چوکڵانە (process) بەگشتی (تەوەرە، پەل) لق دارە بۆ وەدەست هێنانی زۆرترین پەیوەندی لەگەڵ بەشە جۆراو جۆرەکانی لەش داو بەستنەوەیان بە ناوەندە کۆئەندامی دەمارەوە (Centeral Nervous System) بۆ دەست بەسەرداگرتن و ڕێکخستنی زیندەگۆڕانەکان (Metablism) لە لەش دا، دەربڕینی ئەم فرمانەی دەمار لەکارەکەی دایە کە پێی دەڵێن «دەمارەلێدان (Nerve Impulsa)» هۆی ڕوودانی ئەم کارە، گۆڕانی پەردەی دەمارەخانەیە لە ناوچە هاندراوەکەدا، کە لە شێوەی شەپۆلێکی کارەبایی و کیمیایی و فیزیایی دەردەکەوێت وە بەرەو کۆتایی تەوەرە بەپاڵ پەردەی دەمارە ڕیشاڵ دا دەڕوات کەوابو هۆی ڕوودانی ئەم کارە هاندانی دەمارەخانەیە بەڵام دەستەبەر کردن و گواستنەوەی لە ئەستۆی پەردەکەیەتی کە دەستێکی باڵای هەیە لە لەنگەر گرتنی ئەو جیاوازی یە کە لە نێوان ڕێژەی خەستی ی مادەکانی ناو گیراوەی دەرەوەو ناوەوەدا هەیە (واتە لەم دیوو ئەو دیوی پەردەکەدا). بە تایبەتی ئەو ماددانەی کە دەورێکی باڵایان هەیە لە پێکهاتنی ئەم کارەدا وەك ئایۆنی سۆدیۆم (Na) و پۆتاسیۆم (K) و کلۆرو (Cl) و کالسیۆم (Ca) لەگەڵ ئەو مادە ئەندامی یانەی ناو خانە کە قەبارەی گەردەکانیان گەورەن و سالیبن وەك ترشەی ئەمینی یەکان و پرۆتینەکان و و ترشەناوکی یەکان کە لەناو سایتوپلازمی خانەدا بڵاون. دەوری پەردەی خانە لەم بوارەدا دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتی دەڵاندن کە بەپێی پێویست دەیگۆڕێت بۆ دەست بە سەراگرتن و ڕێکخستنی هاتوچۆی ئەم مادانە کە هۆی سەرەکی ڕودانی کارەکەن. دەبینین پەردەکە لە باری سستی دەمارەکەدا واتە پێش هاندان نەهێڵە بۆ ڕۆیشتنی ئایۆنی سۆدیۆم (Na) بە مەرجێك ڕێژەی خەستی ی ئەم ئایۆنە لە گیراوەی دەرەوەی خانەدا نزیکەی دە (١٠) ئەوەندەی ڕێژەی خەستی یەکەیەتی لە ناوەوەی خانەکەدا، وە ڕێژەی خەستی ئایۆنی پۆتاسیۆم (K) لە ناوەوەی خانە نزیکەی بیست (٢٠)

تا (٢٥) ئەوەندەی ڕێژەکەیەتی لە دەرەوەی خانەدا. هەروەها ئایۆنی کلۆر (Cl) کە تا ڕادەیەك لە چاو ئایۆنەکانی تردا سەربەست ترە لە هاتوچۆ کردن دا، ڕێژەکەی لە دەرەوەی خانە هەندێك جار دەگاتە نزیکەی چواردە (١٤) ئەوەندەی ڕێژەکەی لە ناوەوەی خانەدا (وێنە (٢) ) بەڵام مادده ئەندامی یەکانی ناوخانە لەبەر گەورەیی قەبارەیانە هاتوچۆکردنیان ئاسان نی یە. ئەمە لێرەدا وا دەگەیەنێت کە مادەکانی ناو گیراوەی دەرەوەو ناوەوەی خانە لەم بارەدا لە ڕوی خەستی یەوە هاوسەنگ نین بەڵام پەردەکە توانیوێتی هاوسەنگی یەکی نەسرەوت بەدەست بهێنێت بە لەنگەر گرتنی ئەوجیاوازی یە وڕاگرتنی هاتوچۆیان لەو بارەدا ئەم ڕوداوە لێرەدا ناو دەبرێت بە جەمسەرگری (Polarization) و، پەردەکە دادەنرێت بە جەمسەرگرتوو هاتوچۆیان لەو بارەدا ئەم ڕوداوە لێرەدا ناو دەبرێت بە جەمسەرگری (Polarization) و، پەردەکە دادەنرێت بە جەمسەرگرتوو (poLarizedMembrane) لەم کاتەدا دیوی دەرەوەی پەردەی خانەکە موجەب) (positive) وە دیوی ناوەوەی سالیب (Negative) دەبێت (وێنە ٣ ـ ١).

موجەبی دیوی دەرەوەی پەردەکە دەگەرێتەوە بۆ زۆری ئایۆنی سۆدیۆم و پۆتاسیۆم کە بارگە موجەبن لەچاو ئایۆنی کلۆردا (Cl) کە بارگە سالیبە. بەڵام سالیبی دیوی ناوەوەی پەردەکە دەگەرێتەوە بۆ زۆری ئەندامە مادە سالیبەکانی ناو خانە کە پۆتاسیۆم (K) ناتوانێت هەمویان بەندو هاوکێش بکات لەبەر کەمی ژمارەکەی لەچاو ژمارەی گەردی ئەم مادە ئەندامی یانەدا. کەوابو لەباری جەمسەرگری دا دیوی ناوەوەی پەردەکە لە چاو دەرەوەی دا سالیبە واتە: جیاوازی هەیە لە ئەرکی کارەبایی دەرەوەو ناوەوەی خانەدا کە ناو دەبرێت بە ئەرکی پشوو (Resting potential) نرخی ئەم ئەرکە هەمیشە بەسالیب لێك دەدرێتەوە چونکە لە ئەنجامی ئەو ئەرکەوە پەیدا دەبێت کە بارگە سالیبەکانی ناوەوە دەیخەنە سەر پەردەکە، ئەم نرخە لە خانە هەمە جۆرەکاندا لە نێوان (ـ ٢٠ تا ـ ١٠٠) مللی ڤۆلتە.

دەتوانرێت ئەم نرخە بە ئاسانی بدۆزرێتەوە بەهۆی ئەم هاوکێشەیەوە:ـ

ER = 58 log (K) lim

(K) out

ER - ئەرکی پشو

(K) in - خەستی پوتاسیۆم لە ناوەوەی دەمارە ریشاڵەکە.

(K) out - خەستی پۆتاسیۆم لە دەرەوەی دەمارە ڕیشاڵەکە.

58 Log = ثابت

دەتوانین هۆی پەیدابونی ئەم جیاوازی یە لەم خالآنەدا کۆ ـ بکەینەوە:ـ

١ ـ ڕێدانی پەردەی خانەو دەمارە ڕیشاڵ بۆ ئایۆنی پۆتاسیۆم وە کەم ڕێدانی بۆ ئایۆنی سۆدیۆم وکلۆر لە باری سستی دا.

٢ ـ بونی بەشێکی زۆر لە گەردی ئەندامی ی قەبارە گەورەی نەرێ لە ناوەوەی خانە، کە بە ئاسانی ناتوانن بە پەردەکەدا تێپەر ببن.

٣ ـ بوونی ئایۆنی پۆتاسیۆم لە ناوەوەی خانە بەرێژەیەکی یەگجار زۆرتر لەچاو دەرەوەی پەردەکەدا.

یەکبینە بەشێکی کەم لە ئایۆنی پۆتاسیۆم (K) بەپێی یاسای بڵاوبوونەوە دەچێتە دەرەوە ئەمەش دەبێتە هۆی زۆربوونی ئەم ئایۆنە لەسەر ڕووی دەرەوەی پەردەکە لەبەر ئەوە ئەم ڕوەیان بارگە موجەب دەبێت، هەر لەبەر هەمان هۆ ڕوی ناوەوەی پەردەکە بارگە سالیب دەبێت چونکە تا پۆتاسیۆم بڕواتە دەرەوە بارگەی سالیب بەجێ دەمێنێت و لەسەر ڕوی ناوەوەی پەردەکە کەڵەکە دەبێت کەوابو پۆتاسیۆم (K) تا زۆرتر بڕواتە دەرەوە دیوی دەرەوە موجەبی زۆرتر دەبێت وە دیوی ناوەوەش سالیبی زۆرتر دەکات.

لەباری سستی خانەدا پەردەکە جەمسەرگرە، لە لایەکی ترەوە جیاوازی یەك هەیە لە ئەرکی کارەبایی ئەم دیوو ئەودیوی پەردەکەدا بە شێوەیەك کە دیوی ناوەوە سالیب و دیوی دەرەوە موجەبە بەڵام بە هاندانی دەمارەخانە تێکرا ئەم سیفەتانە دەگۆرێت بۆوە دەست هێنانی ئەو کارە کە ناو دەبرێت بە دەمارەلێدان، چونکە ئەم کارە شەپۆلێکە لە گۆرانی پلەی جەمسەرگری پەردەی دەمارەخانە ئەمەش کاتێك دەبێت کە توانای دەڵێنی ئەوپەردەیە بگۆڕرێت. لە ئەنجامی ئەوتاقی کرد ـ نەوانەدا کە کراوە لەم بوارەدا دەرکەوتوە کە ئەو هاندانە ڕاستەوخۆ کار لە پەردەی خانەکە دەکات و دەبێتە هۆی گۆڕینی ڕەوشتی دەلاندنی پەردەکە لە ناوچە هاندراوەکەدا بە شێوەیەك کە دەبێت بە پەردەیەکی باش دەڵێن بۆ سۆدیۆم (Na) وە خراپ دەڵێن بۆ پۆتاسیۆم (K) کەوابوو بە هاندان ئەو هاوسەنگی یە نەسرەوتە کە پەردەکە لەنگەری گرتبو نامێنێت. بۆیە ئایۆنی سۆدیۆم (Na) بە تەوژم دێتە ژ ورەوە.

ئەم ڕووداوە لێرەدا ناودەبرێت بە نەمانی جەمسەرگری واتە (جەمسەر بەردان) هاتنە ژ وورەوەی ئەو ڕێژە زۆرەی سۆدیۆم سالیبی دیوی ناوەوەی پەردەکە ناهێڵێت، بەمە جیاوازی ئەرك دەبێت بە

سفر، واتە دیوی ناوەوەو دەرەوەی پەردەکە وەك یەکی لێ دێت . بەڵام یەکیبنە هاتنە ژ ورەوەی سۆدیۆم ناهێڵێت لەو رادەیەدا بمێنێتەوە بەڵکو دیـاردەکـەی پێش هانـدان هەڵـەوگێـراو دەکـات، دیـوی دەرەوەی پەردەکـە دەبێت بە سالیب وە دیـوی ناوەوەش بە موجەب (وێنە (٣ ـ ٢) بەمـە ئەرکێکی تر دێتـە کایـەوە کە ناو دەبرێت بە ئەرکی کار واتە وەدەست هێنانی دەمارەلێدان لە شوێنی هاندانەکەدا وە بەپێی هاوکێشەی

$$EA = 58 \log \frac{(Na)\ aut}{(Na)\ in}$$

دەتوانرێت ئەرکی کار بە ئاسانی بدۆزرێتەوە

EA = پەستانی کار

Na ) out - خەستی سۆدیۆم لە دەرەوەی خانە

(Na) in خەستی یۆدیۆم لە ناوەوەی خانە .

بەپێی یاسـای بون ـ یان ـ نەبـون مەرج نی یـە هەمو هاندانێك ئەرکێکی کاری بە دوادا بێت چونکـە ناوچـەیـەك هەیـە لە نێـوان گەیشتنو نەگەیشتن بە ئەرکی کار کە ئەویش نزمەرادەیە ئەم ناوچەیە وەك سنـورێـك وایـە کە دەبێت هێـزی هانـدانەکە وابێت ئەو سنورە ببـرێت ئەگینـا کاری هانـدانـەکـە ناتـەواو دەبێت و لە ئاستی خۆی دائەمرکێتەوە بێ ئەوەی هیچ بەدەست بێنێت خۆ هەر ئەوەندە هێزی هاندانەکە توانی ئەو سنورە ببرێت ئیتر ئەو هێزە چەند گەورە بێت یان بچـوك، لە مەسـەلـەکە ناگۆرێت چونکە ئەرکێکی کار پەیدا دەبێت بەهێـزێکی دیـاری کراو لە شێـوەی شەپۆلێك دا دەگوێزرێتەوە بەرەو کۆتـایی دەمـارەریشـاڵ و بە خێـرایی یـەکی دیاری کراو کە پەیوەندی نی یە بە هێزی هاندانەکەوە یان بە جۆرەکەیەوە .

ئەم دیاردەیە لەو هێڵە بارودە (هێڵێکی دیاریکراو) دەچێت کە لە سەرێکـەوە ئاگـری پێـوە دەنـرێت خۆ هەر ئەوەنـدە گەرمی بارودەکە گەیشتـە پلەی کڵپـە کردن ئەوا لەو سەرەوە دەست بە سوتـانـدن دەکـات و بە هێـزێکی دیـاری کراو دەروات بەرەو سەرەکـەی تری بارودەکـە، جا ئەگـەر تینی سەرچـاوە ئاگـرەکە چەند بەهێز بێت یان بێ هێـز وە یان ئەگـەر گرێکی گەورە بێت یان دەنکە شقارتەیەك هیچ لە باسـەکە ناگۆرێت . وەك دەرکەوتوە هێزی هاندانی دەمارە ریشاڵ بۆ گەیـشتن بە ئەرکی کار دەبێت (١ / ٥ تا ١ / ٣)ی، ئەرکی پێشـو کەمتر نەبێت . ماوەی گۆرانی (دەڵێن) لە پەردەی دەمارە ریشاڵ زۆر کورتە لە هەر خاڵێك دا لە چەند مللی چرکەیەك تێ ناپەرێت بۆیە بە خێرایی یەکی یەجگار زۆر ئایۆنی سۆدیۆم (Na) دێتە ژ ورەوە، چونکە پاش ئەم ماوە کورتە کوتوپر پەردەکە دەگەرێتەوە سەر دۆخی جارانی واتە دەبێتەوە بە نادەڵێن بۆ سۆدیۆم و دەڵێن بۆ پۆتاسیۆم (K) بەم ئاوەژ و بونـەوەیـە بەشێکی زۆری ئایـۆنی پۆتـاسیـۆم (K) بەپێی یاسـای بڵاوبـونـەوە بەگـور دەرواتـە دەرەوە . بەمـە دیـوی دەرەوەی پەردەکە دەبێتـەوە بە موجـەب وە دیـوی ناوەوە بە سالیب (-) واتـە دوبـارە گەرانـەوەی جەمسـەرگـری (Repalarization). هەندێك جار بەهۆی چونـە دەرەوەی بەشێکی یەجگـار زۆر لە ئایـۆنی پۆتـاسیـۆم (K) ژمـارەیـەکی زۆرتـر ئەندامە ماددە سالیبەکانی ناوەوە بەرەڵا دەبێت، ئەمـەش دەبێتـە هۆی بەرزبـونـەوەی پلەی سالیبی دوی ناوەوەی پەردەکـە بەرێـژەیـەکی زۆرتر لەچاو پلەی سالیبی پێش هاندانەکەدا بەم رودواوە دەوتـرێت: جەمسـەرگـری بەرز (وێنـەی (٤)) (Hyper polarization) هەر چەنـدە ماوەی مانـەوەی ئەم بارە زۆر کورتـەو بەخێـرایی پەردەکـە خۆی رزگـار دەکـات بۆ ئەوەی بگەرێتەوە باری جەمسـەرگری ئاسـایی بەڵام ئەم رودواوە زۆر گرنگـەو بەتـایبەتی لە رێکخستنی جوڵەی ماسولکەکاندا کە لەداویی دا لێی دەدوێین .

دەمارەلێدان ئەو گۆرانانەیە کە لە ئاستی هاندانەکەدا روو دەدەن بەڵام بەرەنجـامی ئەو گۆرانـانـە لە شێـوەی شەپۆل دا بەپاڵ پەردەی دەمـارە ریشـاڵـەکـە بە خێـرایی یـەکی یەجگار زۆر بۆ کۆتایی دەمارە ریشـاڵ دەگـوێزرێتەوە رون کردنەوەی ئەم رودواوە چەند بیردۆزێکی لەسـەرە بەڵام ئەوەی لە هەمـوویـان پەسەند ترە لای زانایانی فرمان زانی بیـردۆزی گێـژەنی ناوخۆیی یـە) ئەم بیردۆزە وا دەگەیەنێت کە دەمـارە ریشـاڵ تا لەباری سستی دا بێت دیوی ناوەوەی پەردەکەی لە چاو دەرەوەی دا سالـیـبـە، بەڵام بە هانـدان ئەم بارە لە ناوچـە هانـدراوەکـەدا دەگۆرێت واتە دەرەوەی پەردەکە دەبێت بە سالیب وە ناوەوە بە موجەبە بەڵام لە هەموو لایەکەوە ئەم ناوچەیە چ لە دەرەوە چ لە ناوەوە بە بارگـەی جیـاواز گەمـارۆ دراوە (وێنـە ـ (٣ـ ٢) ) کەوابـو جیـاوازی هەیـە لە ئەرکـی کارەبـای ئەم ناوچـەیـەو ناوچـە هان نەدراوەکـانی دەوروبـەری (چونکـە جیـاوازن لە بارگەدا) لەبەر ئەوەی ئەم تەزوە ناوچـەیـە بۆی هەیـە رێ بکات بەرەو ناوچەکانی هاوسێ (لـە ئەرکی کارەبـایی بەرزەوە بەرەو ئەرکی کەم) بەم پێیـە تەزوەکـە ناوچـەیـەکی تر دەگـرێتـەوە و بە خێرایی یەکی یەگجار زۆر ناوچـەی بە دوای ناوچـەدا دەگـوێـزرێتـەوە تا دەگـاتە کۆتایی دەمارە ریشاڵەکە، (وێنە «٣ ـ ٣») هەر ناوچەیەك لەوانەی پێشو کە گۆرانی تێدا روو دابوو بە خرایی دەگەرێتەوەدۆخی جارانی بە هاتنە ناوەوەی پۆتـاسیـوم (K) و کردنـە دەرەوەی سۆدیـوم (Na) ئەویش بەهـۆی کردارێـکـەوە کە ناسـراوە بە گواسـتـنـەوەی چالاك کە پەردەی دەمـارەریشـاڵ (لێرەدا) وەك ترومپایەك کار دەکات کە ناو دەبرێت بە

ترومپای سۆدیۆم پۆتاسیۆم (Na K - pump) (وێنە ـ ٢ ) ئەم کارە بەوزە بەڕێوە دەچێت ئەویش بەگۆڕینی ماددەی ئەدینۆسینی سێ فۆسفێتی (A - T - P) بۆ ئەدینوسینی دووفۆسفێتی (A - D - P) لە مایتۆکۆندریاکانی ناو دەمـارە ریشـاڵ دا بەهـۆی ئەنـزیمێکـەوە کە ناو نراوە بە Na - K). ActivatedATP ase) کەوابــوو دەمــارە ریشـاڵ دەتـوانێت چەنـدین دەمـارەلێـدان بە دوای یەکـدا بەڕێ بکـات بێ ئەوەی ماندو ببێت و بگـاتـە رادەی دەمـارە شەکـەت بون گواستنـەوەی دەمـارەلێـدان لە دەمـارەریشـاڵ دا بەگـەیـانـدن دەبێت کە خێـرایی یەکەی لە ریشاڵە جۆراو جۆرەکـانــدا لە شانتیمـەتـرێکـەوە بۆ ١٠٠ مەتـر دەبێت لە چرکـەیـەك دا، جیاوازی ئەم خێرایی یە دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك لەوانــە ـ بون یا نەبــونی ماددەی چەورەبـەرگ (Myelinted sheath) چونکـە خێـرایی گەیـانـدن لەچـەورە ریشـاڵ دا (Myelinted fibers) زۆرتـرە لەچـاو دەمـارە ریشاڵە بێ چەوری یەکان دا (Non Myelinted fibers) ئەم خێــرایی یــە لە هەنــدێـك چەورە ریشـاڵی لەش دا کە ئەستـوری دەگـاتـە ( ٢٠ ) مایکرون نزیکەی ( ١٢٠ ) مەتر دەبێت لە چرکــەیــەك دا، لە کاتــێــك دا ئەم خێــرایــی یــە لە بێ چەورە ریشاڵەکان دا لە چەند مەترێك تێپەڕ ناکات لە چرکەیەك دا وەك ئەو ریشـاڵانـە کە هەستی ئازار دەگـوێزنەوە. هەروەها ئەستوری تەوەرە دەورێکی گرنگی هەیـە لە خێـرایی گەیـانـدن دا، چونکە تا تەوەرە ئەستور بێت بەرگری کەم دەکات وە بەپێچەوانەوە لەبەر ئەوە خێرایی گەیاندن لە تەوەرە ئەستورەکان دا زۆرترە لەچاو تەوەرە باریکەکان دا کە بەرگـری یـان زۆرترە، هەروەها رێژەی ئۆکسجین و پلەی گەرمی دەستێکی بالایان هەیە لە خێرایی گەیاندن.

گواستنـەوەی دەمـارە لێدان لە خانەیەکەوە بۆ خانەیەکی تر، یەك ئاراستـەی هەیـە ئەویش لە پەلـەوەیـە (Dendrite) بەرەو لەشـەخـانـە (Soma) وە لەویــشــەوە بۆ تەوەرە (Axon) و لە کۆتــایــی تەوەرەوە بۆ سەرەتای پەلی دەمارەخانەیەکی تر تا دەگاتە شوێنی مەبەست، وە بە پێچـەوانەی ئەم رێگایە کارەکە روو نادات هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شێــوەی ئەو پەیــوەنـدی یـە کە هەیـە لە نێـوان کۆتـایی تەوەرەی دەمـارەخـانـەیـەك و سەرەتـای پەلی دەمـارە خانـەیەکی تری دوای خۆی، ئەو پەیوەندی یە لەوێدا ناو دەبرێت بە گەیەنگە (گەیێن) کە جۆرێکیان کیمیایی یە وپێی دەڵێن (کیمیکە گە یەنگە) وئەوی تریان کارەبایی یەو ناو دەبرێت بە (کارەبا گەیەنگ) ئەوەیان کە زۆر ئالۆزە و باوە لە لەش دا، ئەوەی یەکـەمیـانـە، کە پەیـوەنـدی یەکی ئاراستەو خۆیــە لە نێـوان دو دەمـارەخـانـەدا بە هۆی ئەو کەلێنـەوە (Cleft) کە ماوەکــەی نزیکـەی ( ٢٠ ـ ٣٠ ) نانـومیتـر دەبێت و کۆتـایی تەوەرەو سەرەتـای پەل لێـك دادەبـڕێت و ناسـراوە بە (گـەیـەنگـەلە کەلێن) (Synaptic Cleft) ولە هەمان کات دا ئەم جۆرە گواستنەوەیە ناسراوە بە (گـەیـەنگە گواستنەوە) (Synaptic Transmi ssion). بەپێ ی ئاراستەی گواستنـەوەکـە ئەو دوو دەمـارەخـانەیەی ئەم دیوو ئەو دیوی گەیەنگە دیـاری دەکـرێت چونکـە یەکێکیـان دەکەوێتە پێش گەیەنگەوە (pre synaptic) کە دەمـارەلێـدان دەگـەیـەنێتـە گەیـەنگـە، وئەوی تریان دەکــەوێتــە پاش گەیـەنگـەوە (post Synaptic) کە دەمـارەلێـدان لە گەیـەنگـەوە وەردەگـرێت و لەبـەر ئەوەی کە دەمـارەلێدان لە کۆتایی تەوەرەوە دەگــوێـزرێتـەوە بۆ سەرەتـای پەل، کەوابـو کۆتـایی تەوەرە بەشێکــە لە پێش گەیــەنگــە و سەرەتـای پەلیش بەشێکـە لە پاش گەیـەنگـە، وە جیـاوازی پێکهاتنی ئەم دوو بەشـەیە بۆتە هۆی ئەوەی کە دەمـارە لێـدان تەنهـا بە یەك ئاراستە بگوێزرێتەوە ئەویش لەپێش گەیەنگەوە یە بۆ پاش گەیەنگە و بە پێچەوانەوە روو نەدات. ئەگەر لە لقــەکـانی کۆتـایی تەوەرە بکـۆڵینـەوە چەنـد دەرچـویـەکی خر یان هێلکـەیی یان بەسـەرەوەیـە کە ناو دەبرێن بە (کۆتایی یە دوگمەکان) (TerminalBottons) یان (کــۆتــایی یــەپێ یــەکــان) (End feet) کە ژمارەیەکی زۆر مایتۆکۆندریاو (Mitochondria) وردە تورەکەیان تێدایە کە پێ یـان دەڵێن گەیـەنگە چیکڵدانە (Synaptic Vesicle) (وێنە ـ ٥) ئەم چیکڵدانـانـە ئەو ماددە کیمیـایی یـەیـان تێـدایـە کە بە هۆیـەوە دەمـارەلێـدان لە گەیەنگەدا دەگوێزرێتەوە، لەبەر ئەوە ناو دەبرێت بە (دەمـارە گوێزەرەوە (Nerve TransmiHor) وەك ماددەی کۆلێن Acetyle Vholine) و نۆر ئەدرینـــالیـن (Nor Adrena line) وسیــرۆتــۆنین و (Serotonin) دوپــامیـن و (Dopamine) ئەدرینـــالین و (Adrenaline) گلایـسین (Glycine) وە ترشی گلۆتـامیــك (Glutamic Acid). بەلام گرنگتــرین و باوتـرینی ئەم ماددانــە ئەوەی یەکـەم و دووەمـە کە دەردانیـــان لەم ناوچـــانــەدا بە تەواوی سەلمێنـــراوە لەبــەر ئەوە دەمــارەریــشــاڵــەکـــانــی لەش بەپــێ ی دەرد نـی ئەو دو جۆرە ماددەکیمیـایی یـانـە دەکـرین بە دوو بەشەوە، بەشێکیـان کە ئەستیل کۆلین دەردەدەن پێ یـان دەڵێن کۆلینەرجینەکان (Cholinergic fibers) وەك ئەو دەمارە ریشالانە کە پەیوەندی یان هەیە بە ماسولکەکانەوە وە گشت ریشـاڵـەکـانی پێش گری بە بەسـۆز و تەنیشتـە بەسۆزەکانەوە (Pora Sympathetic) وە دەمـارە ریشـاڵـەکانی دوای تەنیشتە بەسوزە گری (post ganglionic) لەگــەڵ کۆتـــایی ئەو دەمـــارە ریشـاڵانـەی دوای بەسـۆزەگـری کە پەیـوەنـدی یـان هەیـە بە ئارەقـە رژێنەکانەوە. . بەلام بەشی دووەمی دەمـارە ریشاڵەکان ئەوانەن کە ماددەی نۆرئەدریتالین دەردەدەن و ناو

دەبــرێن بە ئەدرینــەر ڕیشــاڵ (Adrenargic Fibers) وەك كۆتـایی ئەو دەمارە ریشاڵانەی دوای گرێ بەسۆزەكان .

ئەم ماددە كیمیــاییــانــە بە گشتی دەبنــە هۆی گواستنــەوەی دەمارەلێدان لە گەیەنگەدا و لە لایەكی تریشەوە دەبنە هۆی گۆڕینی پەستــانی كارەبـایی پەردەی دەمـارە خانـەی دوای گەیـەنگـە واتـە سەرەتـای پەل . گواستنـەوەی دەمـارەلێدان لە گەیەنگەدا لەو كاتەوە دەست پێ دەكـات كە ئەركی كار دەگـاتــە كۆتـایی تەوەرەی پێش گەیەنگە (pre synaptic) بە گەیشتنی ئەم ئەركە پەردەی پێش گەیەنگە جەمســەرگـری نامێنێت، لەم كاتـەدا ئایـۆنی كالیسیـۆم (Ca) تەوژم دەباتە سەر ئەم پەردەیەو دەبێتە هۆی بەستنی گەیەنگە چیكڵدانەكان بە پەردەكــەوەو كون كردنــی پەردەكــە لەو ناوچــانــەدا، بەمــە ماددەكیمیــایی ناوچیكڵدانـەكـان بە خێـرایی یـەكی هیجگـار زۆر دەرژێتــە ناو كەلێنی گەیـەنگـەوە، بە گەیشتنی ئەم ماددەیـە پەردەی پلازمـای پاش گەیـەنگـە پێشـوازی دەكـات بە هۆی ئەوپێكهـاتـوە كیمیـاییـانەی سەریەوە كە پێیان دەلێن (وەرگرەكان) (وێنە ـ ٥ ـ) (Receptors) بە یەكگـرتنی دەمـارە گوێـزەر و وەرگر بەستێك (ئاڵۆزە) (Complex) پێــك دێت لە هەردوكیــان كە دەبێتــە هۆی كردنـەوەی كونیلەكانی پەردەی پلازمای پاش گەیەنگە (پەل) بۆ هاتنە ژورەوەی ئایــۆنی سۆدیـوم (Na) و ڕوودانی نەمـانی جەمســەرگـری و بەدەست هێنـانی پەستـانی كار و دەمارە لێدان وە گواستنەوەی لە خانەی پاش گەیـەنگەدا بەهەمان ڕێگەی پێشو، لەبەر ئەوە ئەبینین كۆتایی تەوەرە (پێش گەیـەنگە) بە شێوەیەكە كە هەمیشە نێرەر (Transmitton) دەبێت وەسەرەتای پەلیش (پاش گەیەنگە) هەمیشە وەرگر دەبێت .

ئەو گۆڕانـانەی كە بەسەر پاش گەیەنگەدا هات بە هۆی ڕاپەرینو بزوانـدنی دەمـارە خانەی پاش گەیەنگە بۆ گواستنەوەو گەیاندنی ئەو دەمارە لێدانە بەرەو شوێنی مەبەست ئەگەر هاتو ماسولكە بێت یا لوو (ڕژێـن)وە یان هەر شوێـنێكی تر، لەبــەر ئەوە ئەم جۆرە گۆڕرانــە ڕاستەوانەیە ناو دەبرێت بە وڕوژاندنی ئەركی پاش گەیەنگە (EPZP) (Excitutor post Synaptic potential) بەڵام لە هەمـو دەمـارەكاندا ئەم كارە ڕاستــەوانـە نابێت بەڵكو كاری هەندێك ئاڵۆزاو (Complex) دەبێتە هۆی كردنەوەی ئەو كونیلانەی پەردەی پاش گەیەنگە كە تەنها ڕێگە دەدەن بە پۆتاسیـۆم (K) وكلۆر (U) (كلۆر بۆ ژورەوە پۆتاسیوم بۆ دەرەوە) واتە زۆر بوونی نەرێیی ناوەوەو بەرزبونەوەی پلەی جەمسەر گری كە ناســراوە بە جەمســەرگـریی بەرز (Hyper polarization) بەمە پلەی نزمــەرادە (Therahold) بەرز دەبێتـەوە بە شێـوەیـەك كە هێـزی هانـــدان بە ئاســانـی نایگــاتێ بۆ لابــردنی جەمســـەرگــری و (Depolarization) و ڕوودانـی كاری ئەرك (Action potential). كەوابــو ئەم كارە لێــرەدا بوە هۆی وەستــانـدنی كاری ئەرك و دواخستنی بۆ ماوەیـەك، لەبـەر ئەوە ئەمـە جۆرە گۆڕانـەیـان ناو دەبـرێت بە دابین كردنی ئەركی پاش گەیــەنگــە (Inhibitorypost synaptic poten tial) (IPSP) بەمــەدا دەردەكــەوێت كە كیمیكــە گەیـەنگـە دوو جۆرە، یەكێكیان وروژێنەر (Excitatory) كە دەبێتە هۆی ڕاپەرین و بزواندنی پەردەی پاش گەیــانگــە و ڕوودانـی ئەركـی كار، وە ئەوی تریـــان دابین كەرە (Inhibitory) كە دەبێتــە هۆی وەستاندن و دواخستنی ئەرك لە پەردەی خانەی پاش گەیەنگەدا (وێنە ـ ٦) هۆی ئەم دوو ئەنجامە جیــاوازەی كاری گەیـەنگەكان دەگەڕێتەوە بۆ جۆری وەرگرەكەی ناو ئاڵـۆزاوەكە (Complex) چونكە دەمارە گوێزەرەوەكە هەركامێكیان بێت هیچ لە بەستەكە ناگۆڕێت، ئەم دوو جۆرە كارە جیاوازە، گرنگی لە ڕێكخستنی جوڵـەی ماسـولكـەكـان دا بە تایبەتی پەیكەرە ماسولكە Skeletal Muscle لە باری ئاســایی و ڕوودانی پەرچ دانـەوەدا (پـەرچ كردار) واتـە وەڵام دانـەوەی دركـەپـەتەك پێش گەیشتنی تەزووەكە بە دەمــاخ، وەك لە چەمــێــنــە پەرچ دانــەوەدا (Flexure Reflex) دەردەكـەوێت كە جۆرێكـە لە وەڵام دانـەوەی خێـرای دركـەپـەتـك بەرامبـەر بەو كارە زیـان بەخشـانـەی كە دەكـرێتـە سەر لەش : وەك گەیـانـدنی كارێكی ئازاراوی لە پێستـەوە بۆ دركـەپەتك بەهۆی ئەو دەمارانەوە كە ناسراون بە هەستەدەمارەكان .

لێـرەدا كوتـوپـڕ دركـە پەتك وە بە خێرایی بەهۆی جۆرێكی تر لە دەمــارەوە كە ناســراوە بە بزوێـنــە دەمــار وەڵام دەنێــرێت بۆ ئەو ماسولكانەی پەیوەندییان هەیە بە ناوچە ئازار دراوەكەوە بەمە كوتوپڕ هەنــدێــك ماســولكــە كرژ دەبێت و ناوچــە ئازار دراوەكـەی پێ دووردەخـرێتـەوە لەسەرچاوەی ئازارەكە . ئەم گۆڕانە ڕاستەوانە بووە تە لە جۆری وروژانـدنی پەستـانی پاش گەیـەنگـەیـە (EPSP). بەڵام هەنـدێكی تر لە ماسـولكـەی هەمـان ناوچە، یان [illegible] ناجیەیە لە جیاتی ئەوەی كرژ بێتەوە خاو دەبێتەوە بۆ ئەوە[illegible] نەواوی ڕێگە بدەن بە كرژ بــوونی ماسـولكـەكـانی پێشـو كە (بـوونـە) هۆی چەمینـەوەو دورخســتنەوەی ناوچەی ئازار دراوەكە .

ئەم جۆرە گۆڕانە ناو دەبرێت بە دابینكردنی ئەرك پاش گەیەنگە (IPSP) (وێنــە ـ ٧) هەر چەنـدە كیمیكـە گەیەنگە ئاڵۆز تر و باوترە لە لەش دا بەڵام لە هەمان كات دا دەبێتە هۆی دواخستنی گەیاندنەكە بە ڕادەی (١ . . و. تا ٥ . . و. ) چركـە بەهـۆی ئەو گۆڕانـانـە كە ڕوو دەدات لە پێش گەیـانگـەو پاش گەیـانگـەدا، بە پێچـەوانەی كارەبا گەیـانگـەوە كە پەیـوەنـدی كارەبایی تێدا بەردەوامەو گەیاندنەكەشی

بەرێگــەی پەرینــەوەیــە نەك گواستنــەوە بەهــۆی کیمیکــە ماددەوە لەلایەکی ترەوە ئەو دەمارە گوێزەرەوانە کە ماددەی کیمیاین و لەکاتی گواستنــەوەی دەمــارە لێــدان دا دەرژێنــە گەیــانگەوە، مانەوەیان لەم ناوچــەیـــەدا رێ لە گواستنــەوەی دەمــارەلێــدانێکی تر دەگــرێت بە رادەیــەك هەنــدێــك جار دەبێتە هۆی نەخۆشی دژ وار بۆ خاوەنەکەی لەبــەر ئەوە پاش دەردانیــان بەچــەنــد میللی چرکــەیەك دەبێت لەکار بخرێت. جا بۆ ئەم مەبەستە ئەنزیمی تایبەتی هەیە کە دەبێتە هۆی شی کــردنــەوە، یان وەستــانــدنی چالاکی یــان وەك ئەنــزیمی کۆلین ستریز (Choline Strase) کە ئەسیتال کۆلین

شی ئەکــاتــەوە بۆ کۆلین (Choline) و سرکــات (Acetate) هەروەها ئەنــزیمی مۆنــامین ئوکسیــدز (Monamin Oxidase) کە ماددەی نۆر ئەدرینالین (Nor Adrenaline) شی دەکاتەوە

**جا لەبــەر ئەوە لە کاروبــاری پزیشکــایــەتی دا هەنــدێــك مادەی کیمیــایی وەك کیــوراری (Carare) و ئەتــروپین (Atropine) بەکــار دەهێنــرێت بۆ وەستــانــدن و لە کار خستنی کیمیکە گوێزەرەوەکان لە هەندێك باری نەخۆشی دا. .**

**پەراوێزەکان :-**

---

**١ - دەمارەلێدان (دەمارە راگەیاندن) - الحافز العصبي**
**٢ - تەوەرە - المحور**
**٣ - الليف العصبي ریشالەدەمار**
**٤ - پەل (لق و پۆپ) - الشجيرات نیمچە درەخت**
**٥ - زیندە گۆڕران - التغيرات الحيوية**
**٦ - پەردە - الغشاء او الغلاف Membrane**
٧ - هاندان - التحفيز Stimulus
٨ - مادەی ئەندامی - المادة العضوية
٩ - ترشی ئەمینی - الحامض الاميني Amino Acid
١٠ - ترشە ناوك - الحامض النووي Naclic Acid
١١ - دەلاندن (پیاهێلی) : النفاذ PermabiLity
١٢ - نەسرەوت - قلق
١٣ - جەمســەردا - المستقطب
١٤ - هاوکێش - متعادل
١٥ - (ئەرك) - الجهد Potential
١٦ - (بەردەوام) - باستمرار
سالیب : نەرێ
موجەب : ئەرێ
١٧ - بلاوبوونەوە - الانتشار Diffusion
١٨ - ســست (ناچالاك) - غير فعال
١٩ - ئاوەژ و (سەرەوژێر) - مقلوب
٢٠ - جەمســەر بەردان - زوال الاستقطاب Depolarization
٢١ - ئەرکی کار - جهد الفعل Action PotcmtiaL
٢٢ - بوون - یان - نەبوون - كل الشيء - او - لاشيء ALL or none
٢٣ - نزمەرادە - العتبة ThreshoLd
٢٤ - پلەی گلپەکردن - درجة الاتقاد
٢٥ - مللی چرکە = ١ . .و. چرکە - m sec
٢٦ - گەرانەوەی جەمســەرگری - عودة الاستقطاب
٢٧ - جەمســەر گریبەرز - الاستقطاب العالي
٢٨ - گێژەنی ناوخۆیی - دائرة المحلي
٢٩ - گەمارۆ - محاصر LocaL Circuit
٣٠ - گواستنەوەی کاریگەر - النقل الفعال Active Tyansport
٣١ - ترومپا - المضخة pump
٣٢ - ATP - ادينوسين ثلاثي الفوسفيت

Adenosine Tri Phosphate

سێ جار فوسفاتی ئەدینۆسین

٣٣ - مایتوکوندریا (ووزەماڵ) Mitochondria
٣٤ - شەکەت : - الاعياء Nerv Fatique
٥٣ - گەیاندن - التوصيل Conduction
٣٦ - گەیەنگە دەمار - الوصلة العصبية Synapse
٣٧ - نانومیتر = ١٠ ملم
٣٨ - چیکلدانە - الحوصلة Synaptic Vesicle
٣٩ - پێش گرێ - قبل العقدية Pre gamgiionic
٤٠ - بەسۆز - العطوف Sympathefic
٤١ - تەنیشتە بەسۆز - العطوف المحيطي Pora Sympathetic Receptor
٤٢ - وەرگر = المستقبل پێش وازکر
٤٣ - دەمارە گوێزەرەوە - العصبي nerve Tramsmittor
٤٤ - ئالۆزاو - المعقد Complex
٤٥ - نێرەد گوێزەرەر - الناقل Transmittion
٤٦ - رژێن : لوو - الغدة
٤٧ - وروژاندن - التهيج Excitatory
٤٨ - دابین - کج - وقف Inhibit
٤٩ - پەرچ دانەوە (پەرچەکردار) - المنعکس - الفعل الانعکاسي Reflex
٥٠ - درکە پەتك - الحبل العصبي Spinal Cord
٥١ - چەمین (نوشتاندنەوە) - الانثناي
٥٢ - هەستە دەمار - العصب الحسي Sensory Nerre
٥٣ - بزوێنە دەمار - العصب الحركي Motor Nerre

سەرچاوەکان

١/ سەرچاوە عەرەبییەکان :ـ

١) الدكتور محمد حباوي/ الخلية/ وزارة التعليم العالي والبحث العلمي

1/ GAYTO, «TEXT BOOK OF MEDICAL PHYSIOLOGY». 7 th EDITION. SAUNDERS COMPANY. 1986.

2/ K.M BYhov. TEXT BOOK OF OHYSIOLOGY. MOSCOW.

3/ GROVE AND NEWELL «ANIMAL BIOLOGY», 7 th EDITION. LONDON.

4/ WILSON, J.A. «PRINCIPLES OF ANIMAL PHYSIPLP. GY». NEWYOUK. 1972

5/ DAVID KIRK. «BIOLOGY TO DAY»- NEW YOURK. 1966

## ملخص البحث :

# النبضة العصبية

عبدالرحمن حمه چاوەش

ان لغة الاعصاب هي الحوافز العصبية التي هي عبارة عن موجة من التغييرات الكيميائية والفيزيائية والكهربائية تسير بمحاذاة غشاء الليف العصبي يتكون هذا الحافز نتيجة لتغير في درجة استقطاب غشاء الليف او التغير في فرق الجهد الكهربائي على جانبي الغشاء وان مقدار الجهد يتراوح بين (ـ ٢٠ الى ـ ١٠٠) مللي فولت والذي يسمى بجهد الراحة وان الحافز العصبي في تكونه يتبع قانون كل شيء أولاشيء حيث هناك نقطة في طريق حدوثه يجب اجتيازها والتي تسمى بالعتبة او الحد الادنى (مستهل) فان كانت قوة الحفيز دون الحد هذا فأنه يزول من موقعه دون حدوث اي حافز وان اجتاز الحد فيتكون حافزاً عصبياً ذا قوة معينة متمثلة بموجة من جهد الفعل الذي يسير بسرعة كبيرة على امتداد الليف وفى انتقاله يتبع نظرية التيار المحلي

ومن الضغط العالي الى الضغط الواطىء . وفي سيره عبر الخلايا العصبية تمر بمناطق تسمى بالوصلات العصبية حيث هناك نوعان منها

١) الكهربائية

٢) الكيمائية

حيث يعتبر اعقد واشيع من الاول وان اهمية هذه الوصلات تعود الى عملها في السيطرة على السماح لنقل الحافز العصبي باتجاه واحد فقط .

والامر هذا يعود الى الاختلاف الموجود في تركيب كل من نهاية المحور الذي يعتبر جزء من الخلية قبل الوصيه وبداية القطب للخلية بعد الوصلية .

وان الالياف العصبية نوعان حسب نوع الناقل العصبي الذي يفرزها .

١ ـ الالياف الكولنرجية : والتي تفرز مادة الاستيل كولين

٢ ـ الالياف الادرينرجية : والتي تفرز مادة النور ادرنيالين

اتحاد هذه المواد الكيمائية بالمواد المستقبلية الموجودة على غشاء بعد الوصلية تكون معقد المسؤل عن تحديد نوعية الحافز وتأثيره

اذا كان من نوع التهيجي EPSP الذي يؤدي الى حدوث عمل معين، اوكابحي PSP الذي يؤدي الى تأخير او توقف العمل وذلك حسب حاجة الجسم.

# نوح و كەشتیەكەی و چیای جوودی

● غفور میرزا كریم ●

كوردستـــان لە خانـــەی جوكـــرافیدا بە شێـــوەی گشـــتی بە مەڵبـەنـدێكی كوهستـانی سەرچـاوەی چوار رووباری گەورە ئارازو دیـجـلەو فورات و قزل ئوزەل بە شوێنگـــەیسی گومی گرنـــگ گومی ورمێ و وان و گومی زرێبـار لە مەریـوان دەژمێـرێ. (١) هەروەها ئەم مەڵبـەنـدە لە نێـو وولاتان دا ناوبانگی بە ناوچەیەكی دابەش بوو بە گەرمیـان و كوێستـان، بە ئاوو هەوای سازگـار ـ سەر بە ئاوو هەوای دەریـای ناوەراسـت ـ بەكێـــو كەژی سەخت و دەشت و دەری بە پیت و برشت بە دارستـــانـی چروزەبـــەنـدو دۆڵـی كپ ونزارو پێدەشـت و زێو چەمـی زورو كانی وكـارێــزی لە ژمـــارە بەدەر دەركردووو ناسراوە.

لە مێـژەوە مرۆڤی كورد بە هیـوای ژیان بە پێی ویستی رۆژگارو خواستی مێـژ وولە هەل و دەرفـە تی رەخســاودا چ لە دەوروبەری كانی یان گوێ رووبـارو چەم و كەنـاری كارێز بێ چ لە بن دەوەنگە یان تاشە بەردو پاڵە گردو بەردم ئەشكەوت و سێبەری دار بەروو ودار گوێـز بێ بەردی بنـاغـەی بنكـەی دیوەخانی ژیان وپایەی ئاوەدانی دامـەزرانـدووە بەرزكردوەتەوە كە دواتر بە دەوریدا رەشماڵ و خانوو بەرەو هەوارگـــەی لێ هەڵـــداوەو خستـــوەو بە چرای شارستـانیـەت رووناكی كردۆتەوە.

زیـــاد ووتن نیـیـــە ئەگـــەر ئەو راستیـــە دووپات بكـەینـەوە كە نەونەمامی ژیان و چاوگەی رووناكی و شارستانیەت لە كوردستان دا لە دەوروبـەری رووبـارو كانی و چەم و كارێـز چەكـەرەی دەركردووەو خونچـەی پشكـوتووە، واتە لە كوێ ئاوو هەبوو بێ ئاوەدانیش لەوێ سەری هەڵداوە كورد واتەنی «ئاو بە ئاوەدانیدا دەچێت».

ئیدی ئەگەر سۆمەرو ئەكەدیو بابلیەكان واتە دەشت نشینیەكانی خواروو ناوەراستی عێـراق ژیـانیـان بە گیـروگـرفتی دژواری لافـاو توفـانی دیجلەو فوراتـەوە گینگلی دەخـواردو لە ئاستی زەبرو زەنگی كوشـنـدەیدا زۆر جار دووچـاری دەردی دەربـــەری و ماڵوێرانی و سەرگــەردانی بوو بوون، بە پێچـەوانـەوە چیا نشینـەكـان زامـوا، لولـــویی، گوتی، میتـانی و خوری «حوری» و كاسـای «كـاشی» و میـدیـەكـان... هتد لە جیاتی دیاردەی لافاو لە گێژاوی پەڵەنەدان وكـــەم بارانی و كێشـەی ساڵی نەهـات و گەردەلـوولی قات وقری و گرانی و هەوار گواستنـــەوەو كۆچ كردنی هۆزو خێـڵ دا دەژیـان و دەتـــلانـەوە، لە ئەنجـامی ئەم تایبـەتمـەنـدیـەی هەردوو ناوچـەدا چیانشینەكان پەنایان بۆ خوای باران دەبرد دوعا گوێ خواستی باران بارین بوون تەنـانـەت لە بوارێكی مێژ وویی تایبەتیدا قوربانیان بە مرۆڤیش دەدا تا ئاسمـان خیـرو بێـری برژێنێتـە سەر زەوی و دەغڵ و دان و مەرو ماڵاتیـان و دار دەوەنگیـان تێـر ئاو بێت و بگـەشێتـەوە بە بەردا. دەشت نشینـەكـانی دووزێی دیجلەو فوراتیش رووبـان لە ئاسمـان دەكـردو لە خوای باران و توفـان دەپـارانـەوە وقوربانیتان بە مرۆڤـیش دەدا تا لە رق و قینـی ئەستـووری سزای قورسی خوای سروشت لە لافاو توفاتی ماڵ وێرانكەر رزگاریان بێ...

بێ گـومـان لە دێـرینەوە باو بووە چیا نشینەكان چ لە ناهوشیاری و كەم دەستەلاتی بێ بەسەر سروشت دا «بە هوی قات و قریەوە بێ» چ لە بەردەم تاوو شالاوی دەست درێـژ ی كەران وزۆردارانی

بێگانەوە بوو بێ بۆ ڕزگاربوون لە برسێتی و هەژاری یان لە کوشتن و برین و تاڵان برۆ بەرەو کێو و کەژە سەختەکان ملیان ناوە و تا ماوەیەك ـ تا ترسیان دەڕەویەوە ـ لە ناو ئەشکەوت و لووتکەی چیاکان دا مۆڵیان دەخوارد و گوزەرانیان دەکرد بۆیە کوردیش لەسەر خورەوشت و پەیڕەوی‌کردنی باو باپیری لەحەن کارەساتی سروشتی ناهەموار و ڕووداوی کۆمەڵایەتی دژوار و لە تاو هێرشی زۆرداران بە ناچاری پێیان لە کەوش دەکرد و ڕەشماڵیان دەپێچایەوەو هەوارگەیان لوول دەدا . . . دەیان گووت کێوی سەخت خەپلەی گاڵ بزن و کەڵە کێوی ئاشنای کۆن خۆتان بگرن واهاتین پێشینان فەرموویانە «هەزن و بزن و چیای مەزن».

دەشت نشینەکانیش هەرچەندە بۆ هەڵسووڕاندنی کاروبارو ئەنجام دانی جۆراوجۆر کەشتیان بەکار دەهێنا، بەڵام زۆر جار لافاو تۆفان سواری سنگیان دەبوو و ماڵ ویرانی و دەربەدەری بە دیاری بۆ دەهێنان، تا لە ئەنجام دا لە بەردەم تۆفانە گەورەکەی نووح دا بعو ڕزگاری خۆیان و مانەوەی ڕەچەڵەکیان و ڕەچەڵەکی گیانەوەرەکانی تر پەنایان بە دروست کردنی پاپۆرێکی سێ نهۆمی برد وەبو ئاواتی ڕزگارکردنی ژیان و ماڵ و ماڵاتیان بە کاریان هێنا . .

کاروانی مرۆڤایەتی لە زۆر گۆشەی ئەم سەرزەمینەدا بە گشتی لە وڵاتی عێراقی کۆن دا بە تایبەتی زۆر دەردی لافاو و تۆفانی بەخۆوە دیوە هەندێ جار بەچاو تروکاندنێك دیوەخانی ژیانیانی لێ پێچاونەتەوەو چارەنووسی دوا ڕۆژ یانی لێ تاریك دەکردن کە دواترە بە گران خۆیان لەم گۆتاوە ڕووە ڕزگار دەکرد بەزەحمەت هەوارگەی ژیانیان سەرلەنوێ دادەمەزراندەوەو ژ یلەمۆی شارستانیەتیان ئەگەشاندەوەو دەهاتنەوە ناو کۆڕی کاروانی نەپساوی پێشکەوتن و سەرکەوتن.

مرۆڤ لە بەرە بەیانی مێژ ووەوە لەبەر ناهۆشیاری و کەم دەستەڵاتی بەسەر سروشت زەبرو زەنگەکانی دا بە ناچاری کڕنووشی بۆ دیاردە جوراوجورەکانی دەبرد هەورە تریشقەو دارو بەردو ئاوو باران و ئاگرو ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەیان . . . هتد بە «خوا» یان دەزانی و دەیانپەرست . لەبەر دەرگای پەرستگاکاندا بە مل کەچی‌یەوە ڕادەوەستان و لێیان دەپاڕانەوە تا مرازیان بێتە دی، هەروەها بۆ دڵ نەوایی کردنیان و دوورکەوتنەوەیان و خۆپاراستن لە پریشکی ئاگریان قوربانیان پێشکەش دەکردن ـ کە لە پێشدا ئەو قوربانیانە بریتی بوون لە مرۆڤ کە دواتر لە پلەیەکی مێژ وویی تردا بە ئاژەڵی جۆراو جۆر گۆڕا . (۲)

میسریەکانیش بۆ خاوکردنەوەی زەبروزەنگی ڕووباری نیل و دڵ نەوایی کردنی و کەڵك وەرگرتن لە خێروبێری هەموو ساڵێ کردبوویان بە باوو کچێکی شۆخ و شەنگی بووکی ڕازاوەیان بە وێنەی قوربانی لە کۆڕێکی شایی و ئاهەنگی ئایینی دا وەکوو خەڵات دەدا بە دەم شەپۆلی هەڵچووی ڕووباردا . (۳)

وڵاتی سومەر ئەکە بەهۆی هەر دووڕووبارو توانەوەی بەفرو باران بارینی بی وچان زۆر لە سەرچاوەکانی‌یەوە لە بەهاردا بۆ چان دووچاری تۆفانی گەورە گەورە هاتووە کە بێ گومان دژ وارترین و سامناك ترینیانی ئەو تۆفانە گەورەیە مێژ وویی‌یە بوو کە لە پێش سێ هەزار ساڵ پێش زایینی دا پەیدابوو ڕوی دا کە ڕووداوەکەی لە دوو توێی مێژ ووی سومەریەکاندا تۆمار کراوە . سەرگوزشتەی ئەم تۆفانە کە بە تۆفانی نووح ناو ئەبرێ هەرلاو بەرەیەك لە ڕوانگەی تێڕوانین و بۆچوون و تایبەتمەندی خۆیەوە هۆی پەیدابوونی لێك دەداتەوەو نیشان دەداو بە شێوەی جۆراو جۆر ڕایەڵەی باسەکە دەهۆنێتەوەو قەرماوەکە باس دەکاو دەیخاتە پێش چاو دواتریش شوێنگەی لەنگەرگرتنی کەشتی یەکەش لە چغزی سێ شاخی جیاوازدا بۆ دیاری دەکات .

سومەری و بابیەکان بۆچوونیان دەربارەی تۆفانەکە لە بنەڕەت دا نیکوێنەوەیان لەگەڵ تەورات و قورئانی پیرۆزدا یەك دەگریتەوەو گشتیان لە کلاو ڕۆژنەی ئایینی‌یەوە ئەم قەومەوە لێك دەدەنەوەو باسی دەکەن و لەو بڕوایەدان کە ئەم تۆفانە لە ئەنجامی زۆرداری و خراپەکاری بێ ئایینی و سەرپێچی ئەو خەڵکە بەرامبەر بەخوا ، ئیدی چ خوای سروشتی سومەریەکان و بابلیەکان (ئەنلیل ، ئەنکی ، عوشتەر) بێ یان یەزدانی گەورەی ئەم گەردوونە بێ پەیدابووە و ڕووی‌داوە . واتە خوای گەورە بەهەڵستانی تۆفان سزای گەورەی گوناهبارانی داوە ڕق و قینی بەرامبەریان ڕشتووە . تا هۆش بێنەوە سەریان و ڕێگای ڕاست بگرنەوەبەر .

هەروەها زانایان و شوێنەوارناسانی هەوچەرخیش دەربارەی تۆفان بە شێوەیەکی زانیاریانە لێکی دەدەنەوەو دەیبەنەوە سەر باری ناهەمواری سروشت و زەبروزەنگەکانی .

بێ گومان هەموو سەرچاوە مێژ وویی‌یەکان لەو باوەڕە و بۆچوونەیان دا هاوجۆرن کە تۆفانی نووح لە ناوچەرگەی وڵاتی سومەری‌دا پەیدابووەو ڕووی‌داوە ، ئەوەدەچێ کە لەبەرەبەیانی مێژ ووەوە سێ لە ساڵان بەدبەختی و سەرگەردانی ڕوو دەکاتە وڵات و بەتووندی و دژ واری یەخەی دانیشتوانی دەگرێت .

ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ناکاو کۆمەڵە پەڵە هەورێکی چڕی ڕەشی ترسناك ئاسمانی شینی وڵاتی سومەری داپۆشی . حەوت شەو

حەوت ڕۆژ وەکوو لە «داستانی گەلگامێش»ی سۆمەریدا دیاری کراوە، یان چل شەو چل ڕۆژ وەکوو لە «تەورات»دا دێت بێ وچان باران بە گرمەی هەورە تریشقەو چەخماخەوە زەوی داماو دائەگری، هەروەکوو هەزارەها کونگە ئاو سەرەو خوارکرێتەوە بەو ڕەنگە ئاسمان تاوو هێرشی ناهەمواری بردە سەر زەوی کە لە ئەنجام دا ئەو خەڵکەی بە مەرەیەك برد کە برا بەفریای برای نەکەوێ باوك هەرگیز نەیدەپەرژایە سەرکوڕی. . زەوی خۆی پێ نەگیرا ئاو لە هەموو کون و قوژ بنێکیەوە لێزمەو بەلێشاو هەڵدەقوولی و شەپۆلی هەڵچووی ڕووباری دیجلەو فوراتیش سەری لە ئاسمان تونگ دەکرد لەوە دەچوو کە ئاسمان بێ بەزەیی یانە بە کۆنەقینەوە داخی تووڕەیی پەستێزاوی دڵی بە زەوی بێ تاوان و ئەو خەڵکە تاوانبارە دەڕشت. . . تا تۆڵەی بێ ئاینی و گومرایی و سەرپێچیان لێ بکاتەوە بۆیە لەبەردەمی شەپۆلی لافاوی کاولکەریدا شاروودێ . . مەڕو ماڵاتیان دەکەوتە ژێرئاو یان سەر ئاو کەوت.

ئەوسا خەڵکەکە بە ئاگا دەهاتن بە ناچاری پەناو هاواریان بۆ حەزرەتی نووح برد دەپاڕانەوەو دەیانگوت:ـ

«ئێمە کردمان تۆ نەیکەیت.» بەڵام پەشیمانی و دادو بێ دادی و تۆبە کردن گشتی بێ سوود بوو، کورد واتەنی: «لەپاش باران کەپەنك». هەست کردنی حەزرەتی نووح لە سەرەتادا بە مەترسی لافاو راچڵەکین و هوشیار کردنەوەی دانیشتوانی ناوچە بۆ ئامادەبوون و پارێزگاری کردن لەسەرو ماڵ و بەرامبەر ئەم بەڵای ناگەهانەو هاوارکردن لێیان بۆ کۆمەك و یارمەتی دانی بۆ دروست کردنی پاپۆڕەکەی تا ژیانی خۆیان و ماڵ و ماڵاتیان لە مەترسی مردن و لەناوچوون ڕزگار کات، ئەم خاڵ و هەڵوێستانەی بە گشتی پایەوپلەی «حەزرەتی نووح»ی گەیاندە لووتکەی ناوداری و ناوبانگی بە هەستیارێکی مەزن بەرامبەر ژیان و ڕزگارکەری چارەنووسی دوارۆژی ژیان مرۆڤایەتی دەرکردو دواتر ناوی پاپۆڕەکەشی لە مێژووی کاروانی مرۆڤایەتی دا بە ناوی «کەشتی نووح»ەوە تۆمارکراو ناسرا.

هەرچەندە سۆمەریەکان لە گزنگی بەهاری شارستانیاندا بە هیوای پێشکەوتن و پەرەسەندنی جووڵاندنەوەی بازرگانی و گەرم کردنی بازاری هەڵس وکەوتی هاتووچۆیەی یان بە داهێنان و دروست کردنی کەشتی برد بوو بەڵام بیرکردنەوە بۆ داهێنان و دروست کردنی پاپۆڕێکی سێ نهۆمی «حەوت نهۆمی لە داستانی گەلگامێشی سۆمەریدا»[٦] لە لایەن (حەزرەتی نووح)ەوە بۆ ڕزگارکردنی توخمێ ڕەچەڵەکی گیانەوەرەکان «مرۆڤ، باڵندە، ئاژەڵ» لە مەترسی تۆفان و مردن و نەمان بێ گومان بە دیاردەیەکی گرنگ و مەزن و مێژوویی و شارستانی لە قەڵەم دەدرێ.

لە داستانی دێرین دا دەربارەی زرنگی و کارامەیی و لێوەشاوەیی حەزرەتی نووح فرە باس و خواس هاتووە گەلێ دیاردەی نوێ و داهێنانی گرنگ و مێژوویی بە بەری شیلەی بیری دادەنرێ و بە باڵای تەمەنی درێژیدا دەبڕێ دەڵێن دار مێوو لە لایەن ئەوەوە دۆزراوەتەوە هەروەکوو لە ڕۆژگارێکدا کە مرۆڤ بە دەست و مەچەکی ڕووتی خەلەو خەرمانی دەدەدووریەوە، حەزرەتی نووح بە بیری تیژی پەی بە دۆزینەوەو داهێنانی داس و هەوچارو چەکوش بردوەو بۆ بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە لە بواری کشتووکاڵ و کاری پێویستی تردا کەوتۆتە فێرکردن و ڕاهێنانی ئەو خەڵکە سادەو بێ نەوایە کە دواتر ئەم ئامرازانە لە مێژووی کاروانی مرۆڤایەتی دا بە دیاردەی پێش کەوتن و سەرکەوتن دانرا.[٦] حەزرەتی نووح لە ڕیزی پێغەمبەرەکانی خوای گەورەدا شوێن و پایەی تایبەتی هەیە دەربارەی سەرگوشتەی ژیانی لە ڕێنمانی مرۆڤ دا بۆ ڕێگای خواپەرستن و چاکە دژ یەبت پەرستی و خراپەکاری.

لە دروست کردنی کەشتی یەکەی بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ و تێکرا گیانەوەران لە تۆفان و مردن ناوی لە هەندێ ئایاتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە. . کاتێ شاڵاوی تۆفان و مردن تەنگ بەو خەڵکەو گیانەوەرانە هەڵدەچنێ حەزرەتی نووح دەرگای پاپۆڕەکەی بۆ خزمەتیان دەکاتەوەو بۆ فریاو ڕزگارکردنیان لە مردن دەخاتە کارەوە، ئیدی لەهەر توخمە ئاژەڵ و باڵندەیەك جووتێکی هەڵبژارد وقاتی ژێرەوەی بۆ ئاژەڵ و ناوەڕاستی بۆ باڵندەو سەرەوەش بۆ توخمی خشۆك و لەگەڵ سێ کوڕی «سام، حام، یافث» وژنەکانیان و یاران و هاوەڵەکانی تەرخان کرد. بەم چەشنە پاپۆڕ لە گێژی مریەمیەی تۆفانم دا نزیکەی «١٥٠» ڕۆژ بەسەر ئاوەوە زۆران بازی و مل ملانێی لەگەڵ مردن دا دەکرد. حەزرەتی نووح و کەشتی نشینەکان لە ناوجەرگەی مەترسی گەردەلوولی تۆفان دا دوور بە دوور تەنها چواردە لووتکەی بەرزی چیاییان دەهاتە بەرچاو کە بوو بوو بە مایەی ترووسکەی ڕزگاری و هیوای ژیان و سەرکەوتنیان و ئومێدی سەرفرازی و چارەنووسی ژیانی دوارۆژییان پێ دەبەخشین.

دیارە کەشتی نشینەکان لەم «تەنگەبەرەدا خۆزگەو ئاواتیان هەر ئەوەبوو کە خۆیان بگەیێننە یەکێ لەم لووتکانە تا چنگیان لە ڕەگی ژیان گیر بکەن و ڕزگار بن، جا دوور نی یە کە یەکێ لەو لووتکە چیایانە چیای «بێ خێر» لای ناوچەی زاخۆ نەبووبێ ئەم چیایە کە

نەیتوانی لە ئاستی هێزو داروباری گرانی کەشتی‌یدا خۆی ڕابگرێ بۆیە بە چۆکاهات و شکستی خواردو بوو بە ژێر ئاو کەشتی‌یەوە کە دواتر خەڵکی ناوی چیای بێ‌خێرییان) بە سەردا بڕی.[8]

ئیتر هەروەکوو تا ئێستا تاوانی ئەو بەرگری نەکردنە بکێشێ بۆیە تا ئەمڕۆش بێ بەرو ڕووت و بێ خێرە.

لە ناوجەرگەی گێژاوی تۆفان و نا ئومێدی‌دا بە هیوای ژیان و دەست لە ملی ڕزگاری‌و شادی حەزرەتی نووح پەیتا پەیتا قەلەڕەشکەو کۆتری بە ئاسماندا هەڵئەدا[9] بە هیوای ئەوەی مژدەی سەرفرازی‌و تارمایی ئاوەدانیان پێ ڕابگەیێنێ قەلەڕەش کە نەیتوانی ئەرکی سەرشانی خۆی بەڕێوە بەرێت لە جیاتی ئەوەی بگەڕێتەوە سەر شار (ناو کەشتی)و مزگێنی سەرکەوتنیان پێ بدات کەچی بەسەر گەندە خواردنێکەوە نیشتەوە وە لەبەر چڵێسی گەڕانەوەی لەبیرچووەوە بۆیە هەر لەو ساوە بە باڵندەیەکی بەشووم و بە ڕووڕەش و نەفرەت لێ‌کراو بە شمڵی شەڕ لای مرۆڤ ئەناسرێ‌و ناو دەبرێ.

بە پێچەوانەوە کۆتر بە چڵێکی سەوزی دار زەیتون بە دەنووکییەوە بە ڕووسووری بە وێنەی فریشتەی ڕزگاری گەڕایەوەو مژدەی سەرفرازی‌و ئاوەدانی بە حەزرەتی نووح وکەشتی نشینەکانی ڕاگەیاند بەم بۆنەیەوە حەزرەتی نووح لە خوا پاڕایەوە کە کۆتر لەهەموو بەڵاو دەست درێژ یەکی مرۆڤ بیپارێزێ‌و هەرچی بە نیازی کوشتن دەستی بۆ بەرێت بە دەردی ژانە سەر بمرێت و ڕەچەڵەکی ببڕێتەوە، وە داوای کرد کە دار زەیتوونیش ببێت بەدارێکی تەمەن درێژی هەمیشە سەوزو بەرەکەتی بە دەرمان هەموو دەردێك بشێت بەم چەشنە پیرۆزی بە باڵای کۆترو دار زەیتوون دا بڕی بۆیە هەر لەو ساوە کۆتر بە پیرۆزی لە ڕیزی باڵندەکان دا ناسراو ناوبانگی بە نیشانەی ڕزگاری‌و ڕەمزی ئاشتی لای مرۆڤی جیهان دەکرد. بەم چەشنە کەشتی بە هیوای ژیان و ئاوەدانی شەپۆلی لافاوی دەبڕی‌و بەرەو کێوو کەژەکان سەری ئەناو ئەکشا تا لەنگەری لە چیای گودی‌دا گرت ئەم چیایەش مەردانە وەك دایکێکی دڵسۆز سنگی پێشوازی بۆ کردەوەو دەرگای دیوەخانی میوان داری‌و نیشتەجێی هەمیشەیی بۆ کەشتی نشینان ئاوالە کردەوەو خوزگەی ڕزگاری‌و ژیانی نوێ بۆبەدی هێنان کە دواتر کەشتی نشینان ـ کە هەشت کەس بوون ـ بنچینەی کۆڵەکەی گوندێکی نوێیان بە ناوی «گوندی هەشتیان»ەوە دامەزراند، کە ئەمڕۆ بە گوندێکی پیرۆزی مێژوویی و ڕزگاریکەر ناوی لە مێژووی مرۆڤایەتی دا دەبرێ.

هەرچەندە شوێنەوار ناسان و مێژوو ناسان دەربارەی شوێنگەی لەنگەرگرتنی کەشتی نووح بیروڕاو بۆچوونی جۆراوجۆر دەردەبڕن و پیشان دەدەن بەڵام لەگەڵ ئەمەش دا هەموو لەو بیروباوەڕەدان کە لە دامێنی چیا بەرزەکان ئیدی چ چیای ئارارات نزیك گۆمی «وان» بێ چ لە پیرە مەگرون سەر بە شاری ئێستای سلێمانی بێ چ لە چیای گوتی ناوچەی شاری زاخۆ بێ لەنگەری گرتووە کە بێ‌گومان ئەم چیایانە گشتیان لە بازنەی مەڵبەندی کوردستانی ئەمڕۆدا ستاری گرتووە. بەم چەشنە چیا لەم بوارە مێژوویی‌یەدا ئامێزی بۆ پەنابەران و بێ دەرەتانان کردەوە و بوو بە فریاد ڕەس و ڕزگارکەری دەشت نشینەکان کە لە ئەنجام دا جارێکی تر مرۆڤایەتی لەم مەڵبەندەوە خونچەی گوڵی هیواو نەونەمامی زیندەگانی پشکوتو چەکەرەی کردو سەر لەنوێ بنچینەی دیوەخانی ژیان و ئاوەدانی و شارستانیەتی دامەزراندو دەستی لە ملی هیوای ڕزگاری‌و سەرکەوتن کرد.[10]

بەڵام لەگەڵ ئەمەش دا بەڵگەی زۆری لەبەرچاو نیشانەی بە هێزو گرنگ تای تەرازووی شوێنگەی لەنگەرگرتنی کەشتی نووح بەلای چیای گودی‌دا لاسەنگ دەکا بە دڵنیایی‌یەوە سەرنجی کۆمەڵانی خەڵکی زیاتر بۆ ئەم مەڵبەندە ڕادەکێشی ئیدی جگە لە سەرچاوەی سریانی‌و بەڵگەو خانی لەبەرچاوی تر کە لەدوایی‌دا باسی دەکەین بە هێزترین و گرنگترین سەرچاوە بریتی‌یە لە قورئانی پیرۆز کە چیای جودی بە شوێنگەی لەنگەرگرتنی کەشتی‌یەکە دیاری دەکاو دەڵێت:

«یاارض ابلعي ماءك ویاسماء اقلعي وغیض الماء وقضي الامر واستوت علی الجودی وقیل بعدا للقوم الظالمین» سورة هود لایة ٤٤

بێ‌گومان ڕشتەی کارەساتی تۆفان و سەرگوزشتەی کەشتی نووح بە گرنگی‌و قووڵی ڕیشەو جێگای تایبەتمەندی لە دڵ و دەروونی دانیشتوانی ناوچەکە بە تایبەتی‌و گێتی ئەوڕۆژە داکوتاوەو کردوەتەوە هەروەها ڕایەڵەی باس وخواستی لە مێژوو داستانی سومەری‌و ئەکەدی‌و بابلی‌و ئاشووری حیثی‌و یونانی‌دا ڕەنگ دەداتەوەو خۆی دەنوێنێ کە دواتریش گەڵالەی لە دووتوێی تەورات و قورئانی پیرۆزدا بە وردی‌و بە تۆمار کراوی دەبینرێ.

ڕایەڵەی باس وخواستی ئەم تۆفانە لە ڕێگەی پەیوەندی بازرگانی و شارستانیەوە بە دەم قسەو گێڕانەوە لە فینیقیەکانەوە گەیشتوتە یونانستان بۆیە هۆمیرۆسی یونانی لە داستانە نوبەنگەکەیدا «داستانی ئەلیادەو ئۆدیسا» لە سەرتان و پۆی بەرگی قارەمانیەتی گەلگامیش «لە داستانی گەلگامیش»دا وێنەی

پاڵەوانیەتی هەرقل، ئەخیل، ئەسکەندەری دووشاخ (ذي القرنين)، ئودیسوسی داڕشتووەو خستونە بەرچاو.[٢٣] حەزرەتی «ئیبراهیم»ی پێغەمبەریش لە دایك بووی شاری ئوری مەڵبەندی سۆمەری بە دەم کۆچ کردنیەوە بۆ فەلەستین و میسر باس و خواستی قەوماوی تۆفانەکەی بەو ناوچانەدا بڵاوکردوەتەوە کە دواتر خەڵکی ئەم ناوچانە سەرگوزشتەی تۆفانەکەیان لە گەنجینەی کەلەپلووری نەتەوەیی یاندا لە قاڵبێکی تایبەتی دا داڕشتووەو خستوویانەتە بازاڕی وتوێژ و خوانی ئاخافتنەوە.

ئیدی هەرچەندە سەرچاوەی ڕووداوەکە گەردی لێ نەنیشتووەو لە چوار چێوەی دیاری کراوی خۆیدا ماوەتەوەو شیرازەی تان وپۆی نەپچڕاوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش دا کەم و زۆر باس وخواستی خراوەتە سەر یان پێوەی لکاوە تەنانەت لە هەندێ شوێن و جێگادا مۆرك و نیشانەی شێواندن و ئاڵۆزاوی پێوە دیارە بە کورتی هەر وڵات و نەتەوەیەك بە پێی بارودۆخی تایبەتی خۆی شیرازەی ئەم قەوماوەی داڕشتوەو لە گەنجینەی کەلەپووریان دا هێشتوویانەتەوە و پاراستوویانە.

قەومانی تۆفانی نووح لە وڵاتی سۆمەری قامیشەڵانی خوارووی عێراق داو لەنگەرگرتنی کەشتی یەکەی نووح لە چیای گودی و، پەیوەندی زیندو بەتین و تێکەڵ بوونی بە هێزی سۆمەریەکان لەگەڵ باو باپیرو نەوەی چیانشینەکانی سەرووی وڵاتی عێراق دواتر پەیدابوونی ئاینی پیرۆزی ئیسلام وڕیزبوونی گەلی کوردیش بە وێنەی گەلانی تری ناوچەکە لەژێر ئاڵای بەرزی داو تۆمارکردنی سەرگوزشتەی ئەم تۆفانەو کەشتی نووح لە دوو توێی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا. ئەم خاڵ و بەڵگانە بە گشتی زەمینەیەکی گونجاوی بۆ ڕەگ داکوتاندنی ئەم قەوماوەی لە دڵ و دەرونی گەلی کورد دا خۆش کردو چەسپاند کە لە ئەنجام دا ڕایەڵەی ئەم باسە بە شێوەی کەلەپوور لە خانەی کەلەپووری ئاینی دا جێگای تایبەتی لە گەنجینەی سامانی کەلەپووری میللیمان دا کردوتەوە.

جێگای خۆیەتی لێرەدا کە بڵێین جار بە جار لە لاپەڕەکانی مێژووی عێراق دا چ کاربەدەستانی دەوڵەت بێ یان کۆمەڵانی خەڵکی بێ بۆ ڕزگاربوون لە مەترسی بەڵای لافاوو ماڵ وێرانی کەڵکیان لە دیاردەی تاقی کردنەوەی بەسەرهاتی کەشتی نووح وەرگرتووە بۆ وێنە هاروونە ڕەشید ـ خەلیفەی عەباسی یەکان ـ کاتی کە هێرشی لافاوی ڕووباری دیجلە هەڕەشەی نەمان و مردنی لە دانیشتوانی بەغدا دەکرد، خەلیفە دەست و برد خزی و خێزانی و دەست و پەیوەندی دەچوونە ناو پاپۆڕەکەوە لەگەڵ کەل و پەلی تایبەتیان دا کورد واتەنی «بە وەزن سووك و بە بەها گران». ئیدی تا لافاو دەنیشتەوە گوزەرانیان لە ناو پاپۆڕەکەدا دەبردە سەر وبەسەبر ئاوەوە دەمانەوە، کۆمەڵانی خەڵکیش هەرکەس بە پێی توانا لەگەڵ شر وشتیاڵیان دا بە سەرگەردانیەوە بە دەشت و بیابان و دێهاتی دەوری شاردا بڵاوەدەبوونەوە. دواتر پاش نیشتنەوەی لافاو دەهاتنەوە جێگای خۆیان.[٢٤] بەڵام باری سروشتی تایبەتمەندی کوردستان هەرگیز دەرفەتی نە دەدا کە لافاوی گەورەی تیادا پەیدابێ و ڕووبدا، بۆیە لافاوی گەورەی بە خۆوە نەدیووە دواتر کەڵکی لە تاقی کردنەوەی کەشتی نووح وەرنەگرتووە.

لە بیرەوەری ئێمەو مانان دا ڕووداوی کەشتی نووح تەنها بە مانای مرۆڤایەتی و ڕزگارکردن دێت، واتە ڕزگاربوونی مرۆڤ لە دەردی کەودەنی و دواکەوتن بۆ وێنە مامۆستا «نجم الدين مەلا» ناوی قوتابخانە خنجیلانەکەی کە کەوتبووە سەر ڕاستە شەقامی سابوونکەران لە سلێمانی ناوی نابوو کەشتی نووح... واتە قوتابخانەکەی بە وێنەی کەشتی نووح ئەرکی ڕزگارکردنی مرۆڤی لە دەردی نەخوێندەواری و دواکەوتنی گرتبووە ئەستۆو لە پێناوی دردان بە شەوەزەنگی تاریکی ڕۆژگارو ڕووناك کردنەوەی شەقامی ژیان هاتونە مەیدانەوە بۆیەکە کەشتی یەکەی نجم الدين مەلا توانی لە ماوەیەکی کەم دا هەزاران نەخوێندەوار بە خوێندەوار بکاو ڕاپێچی کاروانی پێشکەوتن و وریاکردنەوە یان بکات.

جا ئەگەر لەنگەرگرتنی کەشتی نووح لە دامێنی چیای بەرزی جوودیدا بە قەوماوێکی مێژوویی مەزن و ئاینی و پیرۆزو ڕووداوێکی گرنگی ڕزگاری مرۆڤایەتی لە قەڵەم بدرێ، و سەرگوزشتەو ڕایەڵەی باس و خواستی نەخشەی لە دڵ و دەروونی گەلی کورد دا بەستبێ بە وێنەی گەوهەرێك لە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوایەتیمان دا بدرەوشێتەوە، بێ گومان بە هەمان چەشن ناونیشانی حەزرەتی «نووح»یش جێگای خۆی لە زۆر شوێنەواری مێژوویی ناوچەی زاخو کردوەتەوەو مۆرك و نیشانەی ئەوە بەسەر زۆر دێهات و شارو مزگەوتی دەوروبەری چیای جوودی مەڵبەندی جزیرەو بوتان دا ئیدی لە ناوچەی زاخودا بگرە هەر لە چیای بێخێرەو تا چیای جوودی دەوروبەری ئەم گوندو ئاواییانەی خوارەوە ناوی ئارای پیرۆزی نووح ی بە سەرەوە کێشاوە، هەرچەندە لە هەندێ جێگەدا پیتی «ح» بووە بە «خ» یان لە ئەخفتند نووح بووە بە ئەخنوخ.

وەکو گوندی گەزنەخ، گوندی دووزنەح، پەش نەخ، ئینج

شەرنەخ کە لە دوووشە پێك هاتووە واتە شاری ئەخنوخ کە گوایا حەزرەتی نووح لەم شارەدا نێژراوە بۆیە ناوچەکە بە پیرۆزی ناو دەبری.[٦١]

هەروەها شوێنەوارناسی کورد «عبدالرقیب یوسف» دەڵێت کە لە ساڵی ١٩٧٧دا بەناوچەی جزیرەو بۆتان دا گەڕام و لە جزیرەدا مزگەوتێکی گەورەو دێرینم چاوپێ کەوت کە ناوی «مسجد النبي نوح» بوو کە لە ناو مزگەوتەکەدا گومەزێکی تێدابوو کە حەزرەتی «نووح» تیا نێژرابوو. . کە خەڵکیش بەردەوام بۆ زیارەت کردنی دەهاتن. .

هەروەها بەسەرهات و سەرگوزشتەی گرنگ و مەزنی کەشتی نووح دەوری باڵاو دیاری کراوی حەزرەتی نووح لە بواری ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی دا تارای پیرۆزی بە باڵای چیای جوودیدا بڕی و سەرجەم سەرنجی کۆمەڵانی خەڵکی بۆئەم نزرگاو مەبەندە پیرۆزە ڕاکێشاوە بۆیە هەر لەسەرەتاوە بوو بە هەوارگەی زیارەت کەران و چاوگەی ڕازو موراد هاتنەدیان، بۆیە مێژوونووسی جوویوسفوس (٣٧ ـ ١٠٠) زاینی لە سەرزمانی بیروسوسی نووسەری بابلی «٣٠٠» ساڵ پێش زاینی دەگێڕێتەوە دەڵێت «کە کوردەکان پارچە قیریان لە دارو پەردوی کەشتی نووح دەکردەوە بۆ چاوەزار بەکاریان دەهێنا. . . هەروەها تەلاشی داری کەشتی یەکەشیان بە وێنەی دەرمان بۆ هەندێ دەردو نەخۆشییان پێ دەپەڕاند[١١]

هەروەها وەکوو دەڵێن ئیمپراتۆری ڕۆم «هرقل» جارێ لە جەزان لە گوندی هەشتیانەوە چووە بۆ چیای جوودی و چاوی بە دارو پەردوی کەشتی یەکە کەوتووە هەروەکوو دەڵێن لە دامێنی چیاکەش دا کاتی خۆی دێرێکی مەسیحی بەناوبانگ هەبووە.

هەندێ لە شوێنەوارناسانی ئەمەریکایش دەڵێن لە دامێنی چیای جوودیدا گوایا هەندێ دارو پەردوی بە بەردبوویان «المتحجر» دۆزیوەتەوە کە مێژووی بۆ ساڵی «١٥٠٠» پێش زایین دەگەڕێتەوە، جگە لەمەش مێژوونووسی ئەرمەنی «موسی خورنیه» ئەم ناوچە پیرۆزە بە ناوی «ناخیرشیوان» ناودەبا «واتە بێشکەی چاو هەڵهێنانی مرۆڤ.»

سەرچاوەو پەراوێز

١ ـ بۆ شارەزایی زیاتر بڕوانە :ـ قاسملو، د. عبدالرحمن ـ کوردستان و کورد ـ ١٩٧٣ ـ لاپەڕە (١٥، ١٦، ١٧)

٣ ـ ابن کثیر ـ قصص الانبیاء ـ لاپەڕە ١٥٩ تا ١٦٤ ۱
هەروەها گۆڤاری المعرفة المجلد العاشر ـ لاپەڕە ١٩٠٢

لە پلەیەکی تایبەتی مێژوویی دا مرۆڤایەتی قوربانی بە مرۆڤ بۆ خوای سروشت دەدا بۆوێنە عبدالمطلب باپیری پێغەمبەر (د. خ) پەیمانی لەگەڵ خوای (هبل) داکرد بە مەرجی ئەگەر دە کوڕی بوو یەکێکیان لەبەر دەرگای کەعبەدا بکا بە قوربانی بۆ خوی بت (هبل) ئیدی پاش ئەوەی ئەم نیازەی هاتە دی هەر دە کوڕەکەی بۆ کەعبە برد هەر دەیان تیروپشکیان بۆ خوای (هبل) هەویشت لە ئەنجام دا پشك کەوتە سەر عبداللە کوڕی. جا لەبەر ئەوەی عبداللە لە ناو کوڕەکانیدا خۆشەویست بوو بۆیە پیاو ماقوولانی قوڕەیش پێشنیاریان لە عبدالمطلب کرد کە بۆ ئەم قوربانیە پرس و ڕای لێ زانی (العرافة)ی خەیبەر وەرگری. کە دواتر ئەم لێزانە داوای لێ کردن کە لەگەڵ عبداللەدا دە ووشتر بە پشك دا بنێت کە لە ئەنجامی تیروپشك دا تا دەجاریش هەر عبداللە سەرپشك دەرچوو تا لە (١٠) ووشترەوە کردیان بە (١٠٠) ووشتر ئەوس پشك کەوتە سەر ووشترەکان بۆیە تێکڕا هەموو ڕاپێچ کران بۆ سەربڕین و قوربانی بەم ڕەنگە عبداللەی باوکی پێغەمبەر (د. خ) لە کێشەی قوربانی و مردن ڕزگار بوو.

هەروەها سەرگوزشتەی حەزرەتی ئیبراهیم پێشکەش کردنی ئیسماعیلی کوڕی بە قوربانی بۆ خوای گەورەو دوایی بە تاڵ کردنەوەی ئەم کارە فەرمانی یەزدانی گەورەو هێنانی بەرانێك و کردنی بە قوربانی لە جیاتی ئیسماعیل. بەڵگەیەکی ترە.

٣ ـ سوسە، د. احمد ـ فیضانات بغداد في التاريخ ـ القسم الاول ـ ١٩٦٣ بغداد ـ لاپەڕە ١٤٩

٤ ـ هەمان سەرچاوە ـ لاپەڕە ١٦٤

* ـ طه باقر ـ ملحمة کلکامش ـ الطبعة الرابعة لاپەڕە ٣٩ و ٤٠

٥ ـ طه باقر ـ ملحمة کلکامش ـ الطبعة الرابعة ـ لاپەڕە (٣٥١)

هەرچەندە بە شێوەی گشتی و لە بنەڕەتدا پەیدابوونی ڕووداوی توفان لە سەرچاوەی داستانی گەلگامێش و تەورات و قورئانی پیرۆزدا لە یەك دەچێت بەڵام لە ڕایەڵەی باس داولە نێو پەل و لە بابەتی وردەکاری دا ناجۆر دێتە پێش چاو بۆوێنە لافو لە داستانی (گەلگامێش دا) حەوت شەو حەوت ڕۆژە پەلەو نی دروست کەری لە جیاتی حەزرەتی نووح ناوێکی تری هەیە «زیوسودر» بەو پێیەش حەوت بەهەموو تەنانەت شوێنگەی لەنگەرگرتنی کەشتی یەکەش بە چیای نیسیر ـ پیرەمەگروون ـ دیاری دەکات. . . هتد

بەلام ئێمە بۆلێکۆڵینەوەی باسەکەمان جگە لە سەرچاوەی داستانی گگامێش کەلکی زۆرمان لە سەرچاوەی تەورات و قورئانی پیرۆزو زانیاری نوێ وەرگرتووە.

٦ ـ علي الشوك ـ الاساطير بين المعتقدات القديمة والتورات. دار السلام لندن ـ لاپەڕە ٩٥

٧ ـ طه باقر ـ ملحمة گلگامیش ـ الطبعة الرابعة ـ لاپەڕە ١٥٨

٨ ـ لە ناو کۆمەلانی خەلکی ناوچەی زاخۆدا دا باوە کە لەبەر ئەوەی چیای بێخێر کاتی خۆی نەیتوانیوە لە ئاستی کەشتی نووح دا خۆی ڕابگرێ‌و باوەشی ڕزگاریان بۆبکاتەوە بۆیە نازناوی بێخێریان بەسەر ئەم چیایەدا بڕیووە. هەروەها دەربارەی ناوچەی زاخۆ خۆشم تا ڕادەیەك شارەزاییم هەیە لە سەرێکەوە لە ژنەوە خزمایەتیمان لەگەڵ خەلکی زاخۆ لە سی‌یەکانەوە پەیدا کردوە هامۆشەو ڕەفتمان لەگەلیاندا بووە، سەیریش ئەوەیە کاتێ کە دەزگای میری لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم دا بە تایبەتی لە سالی ١٩٦١ دەستی بە داپلۆسینی کوردستان و گرتنی خەلکی کرد.. منیش یەکێك بووم لەو گیراوانە کە بەڕێوەبەرایەتی گرتووخانەی «فضيلية» بە مەبەستی تایبەتی «بۆ ئەوەی قسە نەکەن بەیەك...» کوردی ناوچەی سۆرانی تێکەل بە کوردەکانی کرمانجی ژوورو دەکرد کە لەم دابەش کردنەدا بەختم سوار بوو.. من بە تەنها هاوێژ ڕامە لای گیراوە زاخۆیی‌یەکان کە بێ گومان کەلکم لە برایەتی‌و زانایان وەرگرت.. هەروەها چوونم بۆکوردستانی سووریا سالی ١٩٥٧ مانەوەم تا ماوەیەك لە دێی «خانیك»و ناوچەی (دێریك) [کە لە دوایی‌دا میری ناوی گۆڕی بە (مالیکیەو) قامیشلی .... هتد].

ئەم گەشتەم زیاتر شارەزاییمی لەسەر ناوچەی زاخۆ پەیدا کرد، بۆیە زۆرم حەز دەکرد کە لە سەر ئەم ناوچەیە بە گشتی‌و لە سەر چیای «گودی» بە تایبەتی شت بزانم... زۆر جار لەدێهات و ناوچەی کوردستانی سووریاوە بە تایبەتی لە «دێریکەوە» چیای گودیم دەدی هەروەکوو لە ملەکەوەی پێنجوێنەوە چیای پیرەمەگروون دەبیترێ.

لە سالانی حەفتادا لە سەر شاری زاخۆ لە ڕۆژنامەی هاوکاری‌دا بە پێی ئەو زانیاریەی کە لە بەر دەست دا بوو وردە باسێکم نووسی.

وەبوو ئەم ووتارەی ئێستاش سوودم لە زانینی بەڕێزان صلاح سعدالله وصبري بۆتانی وعبدالجبار یحیی‌و شعبان مزوری ... هتد وەرگرتووە بە تایبەتی هەندێکیان وەکوو بەڕێز عبدالجبار کە خۆی خەلکی زاخۆیەو چیای گودی دیووە یان وەکوو بەڕێز صبري بۆتانی کە کون و قوژ بنی زاخۆو چەزیزەو بۆتانی گەڕاوە.

* ـ طه باقر سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٢٥٠

(٩) نجم الدين مەلا ـ گۆڤاری بلیسە ژ٤ سالی (١)

(١٠) گوندی هەشتیان، د. احمد سوسه لەکتێبی فیضانات بغداد في التاريخ ـ ل ١٦٨ ـ دەربارەی ئەم گوندە دەدوێ، هەروەها ماموستا عبدالرقيب يوسف کەبەو ناوەدا گەڕاوە دەلێ نزیك بە چیای جودی‌یە، ئەم گوندەش تا ئەمڕۆ هەرماوە، لەبەر ئەوە بەگوندێکی شوێنەواری مێژوویی دادەندرێ‌و پیرۆزی بە سەردا براوە.

دەبێ ئەوەش بزانین چیای ئەرارات زۆر دوورە لە گۆمی وانەوە، نزیکەی ١٠٠ کیلومەتر دوورە وە دەکەوێتە سەرووی ڕۆژهەلاتی‌یەوە

١١ ـ ئارارات لە خەتی بسماری پاشای ئاشووری شەلمانصری یەکەم (١٢٧٢ ـ ١٢٤٣) پێش زاینی‌دا بە ئورواتری uruabri یاخود بە ئوارتری (Ulatri) هاتووە کە لە دوایی‌دا بووە بە ئورارتو uaanbu کە بریتی‌یە بووە لە وولاتێکی سەربەخۆ کەوتبووە دەوروبەری گۆمی «وان»ەوە کە عبریەکان لە دەوری دیلیەتیان دا لە بابل پێیان ووتووە وولاتی ئارارات... لەکتێبی علي شوك الاساطير بين المعتقدات القديمة والتورات لاپەڕە ١٠١ هەروەها ئەمین زەکی بەگ مێژوو نووسی کورد لە کتێبەکەی‌دا تەئریخی سلێمانی لاپەڕە ١٢. Nisir پیرەمەگروون کە گەشتی نووح لەنگەری لێ گرتووە بە شاخی (نەجاتی) دائەنێ کە مێژوو نووسانی تر وەکو طه باقر بە شاخی (نصیر)ی دادەنێت لە سەرێکی ترەوە بیرۆسۆس نووسەری بە ناوبانگی بابلی سەدەی سێ‌هەمی پێش زایین دەلێت: ئەو چیایەی کە کەشتی نووح لەنگەری لێ گرتووە بریتی‌یە لە چیای «کوردیین» واتە چیای کوردان. طه باقر ـ لە کتێبی ملحمة گلگامیش ـ لاپەڕە ١٥٨. «ـ گوتیەکان «٢٢٣٠ ـ ٢١٢٠» پ. ز بە یەکێك لە گەلانی چیانشین دادەنرێ کە لە بوارێکی تایبەتی مێژوویی‌دا لە زۆرانبازی مل ملانەیەکی توونتنگ و تیژ وا بوو بەرامبەر گەلانی دەشت نشینەکانی خوارووی عێراق کە دواتر توانی بە سەر دەستەلاتی ئەکادەیەکاندا زال بێ، مەلبەندی نیشتەجێیان کەوتبووە دراوسێی لولوویی‌یەکانی سەر بە ناوچەی شارەزووە ناویان زۆر کەڕەت لە باسی شەڕو شۆڕی‌و هێرش بەرانی ئاشووریەکان دا دێ. سومەریەکان لەبەر شەڕەنگێزی‌و جەربەزەیی‌و سەرسەختیان ناویان نابوون «ئەژدیهای هارو هاجی چیا» لە هەندێ سەرچاوەی مێژوویی‌دا شوێنگەی لەنگەر گرتنی گەشتی نووح بە چیای گودی ناو دەبرێ. بڕوانە کتێبی «طه باقر» ـ مقدمة في التأريخ الحضارات القديمة لاپەڕە ٣٧٥ ـ ٣٨٠ پیتی «گ» لە فەرهەنگی زمانی

کوردیدا جێگـــای تایبـــەتی خۆی گرتـــووە تەنـــانـەت هەنـدێ لە ڕۆشنبیرانی کورد دەڵێن :

دوور نی یـە کە ئاشنـایـەتیـەکی تایبـەتی هەبێ لە نێوان ووشەی هۆزی گویـــانی ئازا لەگـــەڵ چیـــای گودی دا چونکـە ئەم هۆزە لە ناوچەی زاخۆ نزیك بە چیای گودی نیشتە جێ بوون ، شیاوی باسە ئەم هۆزە لە نیسانی ١٩١٩ یەکەمین هۆزی کورد بوو لەم ناوچەیەدا کە چەکدارانە بەرامبەر ئینگلیزی داگیرکەر ڕاپەڕی .

بەڵام لەگـەڵ ئەمـەش دا لەبـەر ئەوەی لە قورئـانی پیرۆزدا ناوی گودی بە جودی هاتـــووە بۆیـــە ناوی جودی چەســـپیـــوە لە زمـــانی کوردیدا وە لەنـــاو فەرهـــەنگی زمـانـەکـانی جیهـانیدا بەم ناوەوە دەناسرێ و دەخوێنرێتەوە . . .

١٢ ـ طه باقر ـ سەرچاوەی پێشوو ـ لاپەڕە (٤٧)

١٣ ـ ماوەیەکی زۆرە یان دەتوانین بڵێین کە سەد ساڵێك دەبێ بەرەی شوێنـەوار ناســان و پشکێنـەران و مێـژ وونـاسان بیروراو بۆچوونی ـ جۆراو جۆر دەردەبـــڕن و بەڵـکـــو لە مشـت ومــڕیـکی بە تین دان دەربـارەی بنـەچەی سۆمەریەکان لە خوارووی عێراق دا لەم ڕووەوە تازەتـرین بیـرورا ئەووتـارە بە نرخـەیـە کە «دکتۆر فوزي رشيد» لە ڕۆژنامەی «الجمهورية»دا بە ناونیشانی «المسألة السومرية» بە سێ ئەلقە لە ڕۆژانی ١٩٨٤/٩/١٣ ولە ١٩٨٤/٩/٢٠ ولە ١٩٨٤/٩/٢٧دا

بلاوی کردۆتـــەوە ، کە زانستیـــانـە پەردە لە سەر ئەو هەڵـەو چەوتیو هەڵـوێستـەیـان لادەدا ، هەروەکوو وەڵامی ئەو سەرچاوە مێژ ووییانە دەداتـــەوە کە لەم بارەیـــەوە بیـــروڕایـــان دەربـــڕیـــوە ، بە ڕوونـی دەیســەلمێنێ و دەری دەخا کە بنەچەی سۆمەریەکان نە خەڵکی دوور وڵاتن نە بە خاك و نیشتمـانی عێـراق بێگـانـەن ، بەڵکوو ڕیشەیان دەچێتـــەوە سەر دانیشتـــوانی سەرەوەی عێـــراق و ڕۆڵـــەی شاخ و داخەکانی ئێستای کوردستانن . لەبەر ئەوەی باری سروشتی لە سەرەوەی وڵات دا بە هەزارەها ساڵ زووترو پێشتر لە باری سروشتی خوارووی عێراق بۆ هەوارگەی ژیان و زیندەگانی ڕەخساوو گونجاوە بۆیە لە کاتێکدا سۆمەریەکانی سەرووی وڵات لە سالان (٨٠٠٠ ـ ٥٠٠٠) پ . ز لە ناوچـــەرگـەی شۆڕشێکی کشتـوکـاڵی دا دەژیـان کەچی هێشتـــا باری سروشتی خوارووی عێـــراق دەستی نەدەدا بۆ ژیانی مرۆڤ و دامەزراندنی بنکەی ئاوەدانی و چاوگەی شارستـانی .

دواتر لەبەر زۆر هۆ دانیشتوانی ئەم ناوچەیە دەستیان بە کۆچ و ڕەو بۆ ناوەڕاستی عێـراقی کرد هەوارگـەی یەکەمین قوناغیان لە تەل صوان نزیـــك بە شاری سامـــەڕای ئێستـــا خست کە دواتـریش دووەمین قۆنـاغی کاروانیـان لە قامیشـەڵانی خوارووی عێراق دا لە ناو هۆرو زەلکـاوەکـان دا گیـرسایەوە کە ناوچەی نێوان شاری (دیوانیەو سوق الشیـوخ)ی ئەمـرۆدا یان کرد بە مەڵبەندی هەمیشەیی نیشتەجێیان و چاوگـــەی ئاوەدانی و شارستـــانی بەیـــەکجـاریـیـان ئیـدی گرنگی و بایـەخـداری ئەم لێکـۆڵینەوەیەی (دکتۆر فوزي) سەرنجی ڕاکێشام کەڵکـەڵــەی گۆڕین و ئامــادەکـردنی خستـە مێشکمـەوە بۆیـە لە ئەنجام دا بە نووسینێکی (٤٢) لاپەڕەیی بە پێنج بەش لە ڕۆژنامەی هاوکاریدا لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٥دا بەکوردی بڵاوم کردەوە .

١٤ ـ ئەحمەد سوسە ـ فيضانات بغداد في التأريخ ـ لاپەڕە «١٦٦»

١٥ ـ علي شوك ـ الاساطيـر بين المعتقـدات القـديمـة التورات ـ لاپەڕە ـ ١٠٣

وشـەی نووح بە زمـانی عبـری مانـای «استـراحـة» واتـە وچان بەرامبـەرەکـەی لە زمـانی ئۆغـاریتی کەنعـانیدا بە نووح دێت و لە زمـانی ئەکـەدی ئەنـاخومانای ڕەنجدەر یان ناڵێن «واتە لە ژێر باری کاردا» دێت . . .

ئینجـا بەم پێ یـە زۆر ئاسـاییە کە لە زمانی کوردیدا پیتی «ح» بوو بێ بە «خ» بە تایبـەتی پیتی «خ» لە وشـەی زمانی کوردیدا بڵاو باو بووە بۆوێنـــە هەر لە ناوچـەی چیـای جوودیدا ناوی ڕووبـاری خاپـوور، شاری زاخـۆ، چیـای بێ خێر، گوندی «خانیك» بەرامبەر فیشخـاپـوور لە سوریـا، خانی کە نازنـاوی شاعیـری مەزنی کورد ئەحمـــەدی خانی . لە دێـــرینـــدا زینـــەفـــون لە پێش زایین دا لە گەڕانـەوەی دە هەزار سەربـازە یونانیەکان بە کوردی وتوە کاردۆخی یان حۆریەکان کە یەکێ لە نەتەوە چیانشینەکانن بە «خۆری» ناویان بردون ، یان ئارابخا کە ڕنووکی ئێستا کە پێشیان ووتووە «کرخا» یان «بيت سلوخ» یان وەکـوو دکتـور جەمـال ڕەشیـد لە وتـارەکـەیدا لە گۆڤـاری کاروانی ژمـارە «٧٧» بە ناونیشانی «ظهور أصل الكرد في التأريخ» دا دەڵێت : بۆتان لە بنەچەدا دەگەڕێتەوە بۆ سەر وشەی بوختان .

١٦ ـ ئەنوەر مائی ـ مێژ ووی کورد ـ گۆڤاری ڕووناهی ـ ژمارەی «٧» ساڵی یەکەم ـ ساڵی ١٩٦٠ . تشرینی یەکەم

١٧ ـ علي شوك ـ سەرچاوەی پێشوو ـ لاپەڕە «١٠١»

١٨ ـ د . ئەحمەد سوسە ـ سەرچاوەی پێشوو ـ لاپەڕە «١٦٩»

١٩ ـ محمود ئەحمەد محمد ـ بەشێك لە بابان ـ بەغدا چاپخانەی زەمان ـ ساڵی ١٩٨٩ ـ لاپەڕە «٩٩ ـ ١٠١» .

تێبیـــنـــی هەروەهـــا بۆ نووسـینـی ئەم باســە کەڵـکی زۆرم لە شوێنەوارناسی کورد عبدالرقيب يوسف و کتێبخانەکەی وەرگرت .

# سفينة نوح وجبل جودي

غفور ميرزا كريم

## ملخص البحث:

في سنة غير مؤرخة قبل ثلاثة آلاف سنة قبل الميلاد، حدث طوفان كبير مروع يسمى بطوفان نوح وذلك في بلاد سومر ذات الأحلاش والقصب بجنوب العراق، هذا الطوفان الذي دمر القرى والمدن وغرق جميع ما انتجه الناس وهدد بالموت والفناء جميع المخلوقات. وقد ورد خبر الطوفان في الآداب السومرية وفي التورات واكده القرآن الكريم. وقد اختلفت المصادر في تعليل سبب الطوفان وفي تثبيت مكان ارساء السفينة عنده، لكن اكثر الحجم وخاصة ما جاء في الآية القرآنية تؤكد ان السفينة رست عند سفح جبل جودي في كوردستان.

لذا فان لهذا الجبل نوع من القدسية لدى ابناء المنطقة اولاً لانه إحتضن السفينة وتسبب في انقاذ البشرية من الفناء وأصبح مهداً آخر للانسان حيث أعادت فيه البشرية حياتها من جديد. ومن جهة ثانية فان ذكر اسمه في القرآن الكريم جعله في أعين الناس شيئاً مباركاً.. وهكذا يذهب الناس لزيارته حاملين معهم الهدايا والنذور، ودخلت قصة رسو سفينة نوح لدى جبل جودي في الفولكلور الكردي والتراث الثقافي، فيذكر المؤرخ سوسفوس (٣٧ - ١٠٠م) على لسان كاتب بابلي عاش قبل ٣٠٠ سنة قبل الميلاد بان الأكراد كانوا يقلعون قطعاً من القار من بقايا السفينة بقصد التبرك والحرز من عين الحاسد، ويستخدمون شظايا خشبها كعلاج بعض الأمراض.

ويذكر السيد عبدالرقيب يوسف بانه شاهد مسجداً في منطقة جزير بوتان باسم مسجد النبي نوح وتحت قبة المسجد ضريح يقال بأن النبي نوح مدفون فيه وكان الناس يذهبون لزيارته.

ومهما يكن الأمر فأن انقاذ البشرية من الفناء بواسطة جبل جودي يستحق الفخر.

# سەرهاتیەکا کوردی،
# ل بن دوستۆری، جوغرافی
# مێژوویڤە

حجي جعفر

پشتی ڤەکۆلین و کۆمکرنا فولکلۆری، ل سەرپێت خۆ راوەستیای، ب تایبەتی ل«فینلەند»و ئەلمانیا، ل سەر دەستێ هەردوو برا - جریم - کو بابێ فولکلۆرێ ئەلمانی نە،[1] هەروەسا ل سەر دەستێ سەیدا، (هـ.ج. بورتان - ١٧٣٩ - ١٨٠٤)، (الیاس لونروط ١٨٠٢ - ١٨٨٢)، کو پێشرەوێت کاروانێ فولکلۆرێ «فینلەند»ینە،[2] پشتی ڤێ واستیکێ، دوستوروو رێباز بۆ ڤەکۆلینێت فولکلۆری هاتنە دانان، ژلایێ فولکلۆرڤانێت جیهانیڤە، داکو ڤەکۆلینێت فولکلۆری رێبازەکا زانستی بگرنە بەرخۆ.... ژڤان دوستورا:

١ - دوستورێ (پێ‌رابونێ - وظیفي).
٢ - دوستورێ (کۆمەلایەتی - اجتماعي).
٣ - دوستورێ (جوغرافی مێژووی - جغرافي تاریخی).
٤ - دوستۆری (دەرونی - نفسی).
٥ - دوستورێ (أنثروبولوجی) رەگەزناسی.
٦ - دوستورێ (دانانێ - بنائي).[3] [4]
٧ - دوستورێ (مورفولوجی).

ئەڤروکە ئەڤ دوستورێت ژ ووری، بۆ ڤەکۆلینێت فولکلۆری، ل جیهانێ تێنە بکارهینان، بەلێ ل دویڤ پێتڤی‌یا چەرخ و گوهورینا ژینێ و پێشکەڤتنا ڤەکۆلینێت فولکلۆری، دوستۆرێت دن ژ ی دێ پەیدابن.

هەرچەندە، هەر دوستورەکی ژڤان کارەکێ تایبەتی هەیەو رێکەکا تایبەتی دایە بەر سینگێ خۆ، بەلێ گەلەك جارا کارێ ڤان دوستورا نێزیکی هەڤ دبن، یان تێکەلی هەڤ دبن، بەلێ ئەڤ نێزیك بون و تێکەلی‌یە، کارێ ڤان دوستورا ئالۆزو شێلی ناکەت، بەلکو پەیوەندی‌و هاریکاریەکا موکم و زانستی دناڤ دا پەیدا دکەت.

سالا ١٩٨٨ مەدوو چیڤانۆکێت کوردی ئێخستبونە بن روناهیا دوستورێ (مورفولوجی)،[5] یاژمن ڤە، یابێ قازانج نەبون، لەو ئەز هاتمە پالڤەدان، کو ڤێ جارێ (سەرهاتیەکا کوردی) - نەکو

چیڤـــانـــۆکێ بێخمـــه بن دوستـــورێ (جـوغـرافی مێـژ ووی)، کو دوستورەکێ رۆژئاڤایی‌یه. ئەڤ دوستوره، ل ڤان خالێت خوارێ دگەرێت:

١ ـ ل چیـــرۆك و سەرهـاتێت وەك هەڤ دگـەرێت و بەراوردیـەکێ دناڤبەینا وان دا دکەن.

٢ ـ ل جهێ و دەمێ پەیـدابـونا، چیرۆك و سەرهاتیا دەگەرێت، کا ل کیڤەو چ دەم پەیدا بوینه.

٣ ـ چ ژڤان چیرۆك و سەرهاتیا ڤەبی‌یەو چ هاتیه سەر، چ گوهورین ب سەردا هاتینه.

ل دویڤ ڤی دوستـــوری، دڤێت سەرهـــاتیـەکـا کوردی بینین و پاشی دگـەل هنـدەکێت مینـا وێ بەراورد بکەین و ڤەکۆلینەکێ ژی ل سەر (سەر ـ هاتیا) کوردی بکەین:

١ ـ سەرهاتیا کوردی

مێرکەك ژکاروانی دهات، کەرێ وی گەلەك وەستیا بو، ئەو ژی ژکـەرێ خۆپتـر بێ سەرویـەر ببـو. گەهشتـه گوندەکی، ژنکەکێ ل پەرێ گونـــدی گلێش دهـــاڤێـت، هوچاڤێت وێ ب کاروانی کەڤت، کو یێ ل دویڤ کەرەکی تێت، گوتێ: (کریڤۆ تۆ ژکۆڤه تێ‌یه)؟

هندی هند، خودانێ کەری وەستیا بو، وی ژی گوتێ، ئەزێ ژ دۆژەهێ (جەهنەمێ) تێم!!

ژنکـــا ساوێلکـــه بو، زوویکـا باوەرکـر، یا ژ وێ‌ڤـه ڕاستـه یێ ژجـــەهـنـــەمێ تێت، ئینـا ئێـــك و ئێـــك گوتـــه کاروانی، پا ته (حەسەنکێ) مه ل وێرێ نه دیت؟ (خودانێ کەری زانی، کو ئەڤ ژنکـه، یا ساوێلکـەیـه) ئینـا گوتێ، بەلێ بەری دوو سێ ڕۆژا منێ دیتی!! ژنکێ گوتێ، تۆبخودێ کریڤۆ، پا دێ وەره بێهنا خۆڤەدەو ئالیکێ بده کەرێ خۆ، دا ئەز ژی پرسیارا (حەسەنکێ) ژته بکەم، کا چ حالێ وی‌یه. (مێرك ما ل چ دگەرێت، ڕابوب دویڤ ژنکێ کەڤـت وچوو مالا وێ، بارێ کەرێ خۆهاڤێـت و ئالیـك دایێ، نانـێ خۆخوارو بێهنـــا خۆڤەکـــر). ژنکێ گوتێ، تۆبخـــودێ، تۆ ژدۆژەهـێ تێ‌یـــه؟ گوتێ، ئەرێ وەلـــلا ڤێ گاڤێ ئەزێ ژدۆژەهێ تێم. گوتێ، ته (حـــەســـەنکێ) مه ژی دیت؟ گوتێ، ئەرێ وەلـلا (حـــەســـەنکێ) هەوە ژی ل وێـرێ بو. ژنکێ گوتێ، پانێ وەختێ (حـەسـەنـك) مری، یێ ڕویس بو، نهـۆ چ حالێ وی‌یـه؟ گوتێ، وەلـلا یێ بەلنگـازو بێ سەرمـل بو، ژنکێ گوتێ، دێ چی یـەڤـه؟ گوت بەلـێ.... ژنکێ گوتێ، پا دێ عەبــاو چووخێت بابێ وی ژێرا ببه، بەلکی ل وێرێ دملێت خۆ وەرکەت. ـ چوو عەباو چووخ ئینـان ـ ژنکێ گوتێ، پانێ وەختێ (حـەسەنك) مری، یێ پێخاس ژی بوا مێـرکی گوتێ، ڤێ گاڤێ ژی یێ پێخـاسه، گەلەك ستری‌و کنجـــرۆك ژی، ل جەهنــــەمێ هەنـــه، دپێـارا دچن. دلێ ژنکێ ب کوڕێ وێ سوت، چوو پێـــلاڤـــا بابێ وی ژی ئینــا، گوتێ تۆ بخودێ بده (حەسەنکێ)، دا ل دۆژەهێ بکەته پێت خۆ.

ژنکێ گوت، پا بازار، دوکان، ل دۆژەهێ هەنه؟ گوتێ، ئەرێ کریڤێ، یاپڕە ژ بازارو دوکانا.... ژنکێ گوتێ، پا (حەسەنك) چ دکـەن، پاره هەنـه بۆخۆ تشتەکی بکڕیت، پانێ هەکو مری، مه چ پاره دگەل نه هنارت بون؟!

مێرکی گوتێ، وەللا یێ بەلنگاز بو تشتەك ڤێ نەبو. (ژنك چوو هنـــدی پارێـت هەیـن ئینـــان وگوت، ئەڤـــه ژی بلا بۆخەرجیـــا (حـەسـەنکێ) بن. مێـرکی هەمی تشتێت خۆ هەلگـرتن و لەزکر، گوت دا بچم بەری مێـرێ وێ بێتـه مال..... ڕابـو ب لەزویـەز کەرێ خۆبارکـــرو کەڤتـــه دوی، هەرجارجار، یێ ل پشت خۆڤـه دزڤریت، کا مێرێ ژنکێ دویڤ ڕا ناهێت. دەمەك پێڤه چوو مێرێ ژنکێ هاته مال، گوتێ، کا فلان کەس، عەباو چووخێت من بینه، دا بکـەمـه بەرخـۆ. ژنکێ گوتێ، وەللا ڤێ گاڤێ، ئێکێ بوسلمان ژدۆژەهێ هاتبـو، گوت (حەسەنك) ژی، ل وێرێ بو، یێ ڕویس بو، یێ بێ سەرمـل بو، من ژی عەبـاو چووخێت ته ژێـرا هنارتن. (مێرێ ژنکێ تێ‌گەهشت، کو حیلەیەك، یا ل ژنا وی هاتیەکرن، ددلێ خۆدا گوت، دا دویڤ ڕا بچم، هێشتـــا خۆبەرزە نەکـــری). گوته ژنا خۆ، کا پێلاڤا من بینه دا بکەمه پێ خۆ. گوتێ مانێ تۆبخۆ دزانی، هەکـــو (حـەسـەنـك) مری یێ پێخـاس بو، گوتی گەلـەك ستـری‌و کنجـرۆك ژی ل دۆژەهێ هەنـه، من ژی پێـلاڤـا ته ژێـرا هنـارت، دا ل وێـرێ بکـەنه پێت خۆ. (مێرکی ددلێ خۆدا گوت، ئەڤـــه دوو). گوتێ، کا پارێت مه بینـه، دا بچم تشتـەکی بکـڕم. گوتێ وەلـــلا پاره ژی من ژحـەسـەنکێ‌ڕا هنـارتن، تۆبخـۆدزانی وەختێ «حـەسەنك» مری، مه چ خەرجی نه دابویێ، دۆژەهـ ژی یاپڕی بازارو دوکانه....

مێـــرێ وێ گوتێ، ئەو زەلام یێ چەوا بو؟ گوتێ، یێ هوهو بو، کەرەکێ ڕەش، یێ بارکـری دگـەل دا بو. گوتێ کیڤه چوو؟ گوت، دڤێ دەرێ‌دا چوو ـ ئیشارەت کره جهێ کاروانی لێ چووی ـ

مێـــرێ ژنکێ کرحنـــك، ل ماهینـا خۆ سوار بو، کەڤتـه شوپـا خودانێ کەری. وەختـەکێ خودانێ کەری، ل پشت خۆ دزڤریت، دبینیت ئەڤـه توزەکا، ل پشت ڕادبیت، گوت ب خودێ ئەڤه مێرێ ژنکێ‌یه، دێ تشتێت خۆ ژ من

ستینت، زووی ب زووی خۆ گەهاندە ڕوبارەکی، وەکو هێ (باسەوا)، کەرێ خۆ هاژوتە دەحلەکی ڕا و هاتە سەر ڕێکێ ڕاوەستیا، هەتا مێرێ ژنکێ هات. گوتێ تە چ کەس نە دیتییە کەرەکێ ڕەش یێ ڤێ، دڤێڕێرا بوری؟

خودانێ کەری گوتێ، بەلێ وەللا بەری بیستەکێ، یێ ب پشت ڤێ ملێ کەڤتی، بەلێ تۆ هوسا ناگەهیێ!!

گوتێ پا چەوا؟ گوت ماهینێ پێلەوب پێا هەرە ڤێ گاڤێ دێ گەهیێ. مێرکی ماهین ئەمانەتی خودانێ کەری داو ب غاردا ڕێکێ، هەرچوو، هەرچوو، کەس نە دیت، یێ هێڤی بو، زڤڕی جهێ ماهینێ، بەرێ خۆ ددەتێ، نە ماهین و نە کەس!!

- پانێ هەروێکاڤێ خودانێ کەری، تشتێت خۆ ل ماهینێ کرن و چەپەک ل خۆداو چوو

مێرێ ژنکێ زانی ئەڤە حیلە بو، ب وان سەر و دلاڤە هاتە مال. ژنا وی گوتێ، کا ماهینا تە جامێرۆ؟ گوتێ، ئەوڕۆژی من ژحەسەنکێ ڕا هنارتە جەحنەمێ، دا لێ سوار بیت و بهێ ی بێتو بچیت. ژنکێ گوتێ، پا تە گازندە ژمن دکرن، پا دێ بلا تە ماهین بۆ حەسەنکێ نە هنارتبا.

مێری وێ گوتێ، هەی.... ما خەلک دچیتە دۆژەهێ و تێت... ڕابو تێر ب ژنا خۆدادا.... بەلێ فایدە نەکر.[6]

## ٢ - سەرهاتیا مسری

ناڤێ ژنکەکێ «ڕزیە» بو، خەلکی ئەڤ ناڤە دانا بو سەر، چونکی یا ساوێلکە بو، «ڕزیە» یابێ گەلەک ب ڤی ناڤی نەخۆش بو، دڤیا خۆ ژێ خلاس کەت، دڤان هزرو بیرادا بو، زەلامەک دبەر پەنجەرکێ ڕا دبوری و یێ گازی دکەت، ناڤ، هەی ناڤ، کی ناڤا دکڕیت؟

«ڕزیە» یابێ گازی کرێ، گوتێ وەرە ناڤەکی بدە من، «ڕزیە» یابێ ناڤێ (فاطمة النبوية) بۆ خۆ هەلبژارد، زەلامی ژی ئەڤ ناڤە فروتێ ب چێلەکێ وەختێ مێرێ وێ هاتیەڤە، گازی کرێ «ڕزیە». گوتێ ناڤێ من «ڕزیە» نینە، ناڤێ من «فاطمة النبوية»، ئەڤ ناڤە من ئەڤرۆیێ بۆ خۆ کری - چیرۆکا خۆ بۆ مێرێ خۆ گوت - کەربێت مێرکی ڤەبون، ژ کەربادا ژمال دەرکەڤت و ل دویڤ سەرێ خۆ چوو. مێرک یێ ل دویڤ سەرێ خۆ دچیت، دەنگێ گریا ژنکەکێ ژ پەنجەرەکێ دەرکەڤت و گازی مێرکی کر، مێرک ل سەر ملێ خۆ زڤڕی، ژنکێ گوتێ، تۆ ژ کیڤە تێی و دێ کیڤە چی؟ مێرکی ژی گوتێ، ئەز ژ دۆژەهێ تێم و دێ چمە دۆژەهێ!! ژنکێ ئێک و ئێک گوتێ، پا تە بابێ من ل وێرێ نە دیت؟ گوتێ بەلێ.... ژنکێ گوتێ، پێتڤی چ تشتی نەبو؟

- مێرکی زانی، کو ئەڤ ژنکە، یا ساوێلکەیە - ئینا گوتێ، پێتڤی پاراو جلکایە. ژنک چوو، پارەو جلک بۆ ئینان..... مێرکی ژی تشتێت خۆ وەرگرتن و چوو - مێرکی زانی دێ مێری وێ ل دویڤ هێت - چ پێڤە نە چوو، دەنگێ پێت هەسپی گەهشتە گوهێت وی، زوویکا خۆ گەهاندە بیستانەکی، دا خۆ ڤەشێریت، بەلێ جوتیارەک دیت، یێ ئاڤدانێ دکەت، زوویکا خۆ گەهاندێ و گوتێ خۆ ڤەشێرە، ئەڤە ئێکێ ل تە دەگەڕێت، دێ تە کوژیت. جووتیار ژترسادا ڕەڤی و چوو خۆ ڤەشارت، حیلەکەری شوینا وی شول کر. دەمێ خودانێ هەسپی گەهشتیە دەڤ حیلەکەری، کو یێ ئاڤدانێ دکەت، گوتێ تە چ کەس نە دیتینە، هندە تشتێت ڤێ؟ گوتێ، بەلێ وێ هەیە، یێ خۆ ڤەشارتی - ئیشارەت کرە جووتیاری مێرکی هەسپێ خۆ هێلا و چوو وێ جهی حیلەکەری ژی خۆ هاڤێتە سەر پشتا هەسپی و هاتە مال، گوتە ژنا خۆ، یا «فاطمة النبوية»، من «ڕزیە»یەکا خرابتر ژ تە دیت. دەمێ خودانێ هەسپی هۆل پشت خۆ زڤڕی، دیت کو هەسپ ل وێرێ نینە، زانی کو حیلە لێ هاتەکرن. پاشی ئەوڕۆژی ب پیا هاتە مالا خۆ، دەمێ ژنکا وی پرسیارا هەسپی ژێ کری، گوتێ، ئەوڕۆژی من دا مێرکی، دا تشتێت بابێ تە لێ بکەت و زوویکا بگەهیتە جەهنەمێ.[7]

## ٣ - سەرهاتیا لاتینی

(ئەڤ سەرهاتیە، ل سالا (١٥٠٩ز)، دگەل کۆمەلەکا چیرۆکێت لاتینی ژلایێ (جان سیفرسون) ڤە هاتیە بەلاڤکرن). کاهنەکی ل پاریس دخواند، ناڤێ وی (فرانکو) بو. دەمێ خواندنا خۆ ب دوماهی ئینای، زڤڕی وەلاتێ خۆ. ب ڕێڤە گەهشتە گوندەکی نێزیکی ڕوباری (راین)، ل وێرێ، دڕێکا خۆدا دژنکەکێ تشقلی، ناڤێ وێ «بارتا» بو، نەبێژە ژنکێ دوو جار شوی کربو، مێرێ وێ یێ ئێکێ مری بو، گەلەک حەژ ی دکر، بەلێ حەژ مێرێ خۆیێ دوماهیێ نەدکر، وەکو یێ بەرێ. (فرانکو)ی

داخوازا ئـارمك ئاڤێ ژژنكێ كر، ژنكێ ژ ی (فرانكو) بره مالا خۆ- مێرێ وێ، ل مال نەبو- پاشی پرسیار ژێ كر، كا ژكیڤە هاتیە، وی ژ ی گوتێ، ئەزێ ژ(پـاریـس) هاتیم. ژنـك خەلەت تێگەهشت، ومـسـا هاتـە بەرگـوهێ وێ، كوێ دبێـژیت، ئەزێ ژ(پـارادیس) هاتیم، لەو ژنكێ گوتێ، ب ڕاستا تۆژ بەهشتێ هاتی؟ پا تە مێرێ منێ ئێكێ ل وێرێ نە دیت؟

- ڕاهبی زانی كو ئەڤ ژنكە، یا ساوێلكەیە - ئینا گوتێ بەلێ. . . ، ژنكێ گوتێ، پێتڤی چ نەبو؟ ڕاهبی گوتێ، پێتڤی یا ب پارا هەی، بێ پارە نەشێت مەیا بەهشتێ ڤەخۆت، هەروەسا پێتڤی یا ب هندەك جل وبـەرگێت جوان هەی، كول دویڤ بابـەتێ خەمـلا بەهشتێ بن. ژنـك زوویكـا چوو هنـدەك پارەو جلك ئینـان. ڕاهبی ژ ێ وەرگـرتن وچوو ڕاهب گەلـەك نە چوو، مێـری وێ هاتـە مال، پێحـەسیا. . . . ڕابو زوویكا ل هەسپێ خۆ سوار بوو چوو. . . . هەكـو ڕاهـبی زانی، كو دەنگێ پێت هەسپێ مێـرێ ژنكێ، بێ تێت، تشتێت خۆ هاڤێتنە ڕەخەكی و هاتە سەر دیوارەكێ نیڤ تەمام، ئاڤاكری.

- ئانكـو ئەو هوستـایـە - هوستایێ ب دروستی ژ ی چووبول وێڤەتر فراڤینێ بخـوت. دەمێ مێـرێ ژنكێ هاتیە نك (فرانكو)ی، كویێ دیواری ئاڤا دكەت، گوتێ، تە چ كەس نە دیتینە، هندە تشتێت ڤێ؟

- فرانكـوی ئیشـارەت دا جهێ هوستـایێ ب ڕاستی، كول وێڤەتر فراڤین دخوار- مێركی هەسپێ خۆ هێلاو چوو نك هوستایێ ڕاست، هوستـایی (مـانـدلا) (إنكـار) كر، كو ئاگـەهـ ژ چ نینە، بو شەڕێ وان. . . دەمێ مێـركـی بەرێ خۆدایـە (فـرانكـو)ی، دیت نە (فرانكو)و نە هەسپ، بەلێ دیت ئێكێ دی بێ دیواری ئاڤا دكەت. خودانێ هەسپی چوو وی گوتێ تە هەسپ بێ دایە وی، بێ بەری تە ل ڤێرە، پاشی چوونە (دادگا)یێ، كرێكارێ بێگوناه نەچار بو، هندەك پارە دانە خودانێ هەسپی.[8]

## ٤ - سەرهاتیا فینلەندی

ئێكێ ژنـەكـا گەلـەك ساوێلكە هەبو. ڕۆژەكێ مێرێ وێ ژ مال دەركـەڤت، بەرێ وی ل عەسمـانی بوو ب ڕێڤە دچوو. وێ گاڤێ چاڤێ ژنكەكێ لێ بو كو مێركێ بەرێ خۆ ددەتە عەسمانی و ب ڕێڤە دچیت. ئینا ژنكێ عەرەبانا خۆ لنك ڕاوەستاند و گوتێ: بۆچی بەرێ تە ل عەسمـانی یـە؟ وی ژ ی گوتێ، ئەز ڤێ گاڤێ بێ ژ بـەهشتێ هاتیم - ئیشـارەت دا كونـەكـا عەوری و گوت، ئەزێ ژ كـونـا هەیـە عەوری دەركەڤتیم. ژنكێ پرسیارا مێرێ خۆیێ مری ژێ كر. وی ژ ی گوتێ، منـێ دیـتـی، بەلـێ پێتڤی پارایـە. ژنكێ پارە دانـە مێركی. . . . وی ژ ی پارێت خۆ وەرگرتن و چوو. زانی كو ژنا وی بتنێ، یا بێ ئاقل نینە.[9]

هەر دڤی قالبیدا، سەرهـاتیـەكـا ئەلمـانی، ئێكا توركی، ئێكا ئیـرلـەنـدی هەیـە، بەلێ ئەڤ چوار سەرهـاتێت مە نڤیسین، تێـرا ڤەكـۆلینـا مە هەنە. پشتی مە سێ سەرهاتێت وەكو سەرهاتیا كوردی نڤیسین، پێنگـاڤـا دووێ دێ دەست پێ كـەت، كو هەڤبـەركـرنـە (مقارنە) - ل دویڤ دوستورێ (جوغرافی تاریخی) -

## هەڤبەر كرن

١ - بابەتێت وەك هەڤ:

أ - ژنكا ساوێلكە، دهەر چوار سەرهاتیادا هاتیە.

ب - بەهشت و دۆژەهـ دهەر چوار سەرهاتیادا هاتیە.

حـ - هەسپ، یان ماهین، دهـەر چوار سەرهـاتیـادا هاتیـە، ژ بلی سەرهاتیا فینلەندی.

د - شیوێ پێكەنین و یاری پێ كرنێ دهەر چوار سەرهاتیادا هاتینە.

هـ - مێـرێت هەر چوار ژنكـا، ژ بلی ژنكـا سەرهـاتیـا فینلەنـدی، ب سواری كەڤتینە دویڤ حیلەكەری.

و - هەر چوار سوارا، ژ بلی سەرهـاتیـا فینلەنـدی، ئێـك پرسیـار ژحیلەكـەری دكـر، (تـە چ كەس نە دیتینە. . . .). دیسان بەرسڤا هەر سێ سەرهاتیا وەك هەڤ بو.

ز - دهـەر چوار سەرهـاتیـادا، ژنكـا ساوێلكـە ناڤ نینـە، ژ بلی سەرهاتیا «لاتینی»، هەروەسا ژ بلی ژنكا ئێكێ دسەرهاتیا مسریدا.

ح - دهەر چوار سەرهاتیادا، مێرێ ژنكا ساوێلكە ناڤ نینە.

ط - دهـەر چوار سەرهـاتیـادا، ژ بلی سەرهاتیا فینلەندی، حیلەكەر دزانـیت، كو دێ مێـرێ ژنكێ دویڤ ڕا هێت، لەو هەر نابـەین، نابەین، بەرێ خۆ دا پشتڤە. . . .

ي - ژ بلی سەرهـاتیـا فینلەندی، مێرێ ژنكا ساوێلكە، دهەر چوار

سەرهاتیادا تێنە هەلْخەلتاندن.

ك ـ ژ بلی سەرهـاتیـا فینلەنـدی، حیلەکەر دەهەر چوار سەرهاتیادا، تشتێت خوّ ددەتە رەخەکی، پاشی تێتە سەر رێکا خودانێ دەواری.

ل ـ دهـەر چوار سەرهـاتیـادا، ژ بلی سەرهـاتیـا فینلەنـدی، مێرێ ژنکێ دبێژتە ژنا خوّ، من هەسپ یان ماهین هنارتە دوژمهێ، یان بەهشتێ. . . (ئەڤە کلیلا راستی‌یە، بوّ هەر سێ سەرهاتیا).

أ ـ دهـەر چوار سەرهـاتیـادا، مێـرکێ حیلەکـەر رزگار دبیت و پارەو تشت بوّ دمینن.

ن ـ دهەر چوار سەرهاتیادا، حیلەکەر ژگیانێ خوّیێ پەرێشان وبو.

س ـ دهەر چوار سەرهاتیادا، (پارە) بوّ مری هنارتن. . .

**٢ ـ بابەتێت جودا، جودا:**

أ ـ دســەرهــاتیــا کوردیدا، حیلەکـەر کاروانی بو، دسـەرهـاتیـا مـسـریدا، حیلەکـەر یێ زیـز بو، دسەرهاتیا «لاتینیدا»، حیلەکەر راهب بو، ژخـوانـدنا خوّدهات، دسەرهاتیا فینلەندیدا، حیلەکەر ل دویڤ سەرێ خوّدچوو ـ هاشم علیٰ وجهە

ب ـ دسەرهاتیا کوردیدا، حیلەکەر ـ کاروانی ـ ژدوژمهێ دهات، دیســان دســەرهـاتیـا مـسـری ژیدا، بەلێ دسـەرهـاتیـا لاتینیو فینلەندیدا، ژ بەهشتێ دهات.

ح ـ دسەرهاتیا کوردیو لاتینیدا، ناڤێت جهێت وەلاتی تێدا هاتینە. . . .

د ـ دسەرهاتیا کوردیدا، گوتنێت مللی هاتینە، دسەرهاتێت دیدا، ئەڤ دیاردە نینە، دوور نینە هەبن ژی، بەلێ ب رێکا وەرگێرانێ ڤە چوو بون. . . .

هـ ـ دسـەرهـاتیـا کوردیو لاتینیدا، حیلەکـەر ـ کاروانی و فرانکو ـ دچنــە مالا ژنـکـێ و بێهنــا خوّ ڤەدکن و دخــوت و ڤەدخــوت، دسەرهاتێت دیدا، ئەڤ کارە نینە.

و ـ دســەرهــاتیـا کوردیدا، کورێ ژنکێ مری‌بـو، دسـەرهـاتیـا مسریدا، بابێ وێ مربو، دسەرهاتیا، لاتینی و فینلەندیدا، مێرێ وێ مری‌بو.

ز ـ دســەرهــاتیـا کوردیدا، دەوار ماهین بو، دسـەرهـاتیـا لاتینیو مـسریدا هەسپ بو، دسەرهاتیا فینلەندی چ نەبوا!!

ح ـ دسـەرهـاتیـا کوردیدا، ناڤێ جل وبـەرگا دیارکرن، کو(عەباو چووخ) بون، دهەر سێ سەرهاتێت دیدا، ناڤێ جل وبەرگا دیار نە کرینە. . .

ت ـ بتنێ دسـەرهـاتیا کوردیدا، پێلاڤ بوّمری هنارتە جەهنەمێ، داکو ستریو کنجروّك دپێ ناچن. . . ئەڤ دیاردەیا سروشتی، وەکو (ستریو کنجروّکا)، دسەرهاتێت دیدا نە هاتیە.

ي ـ دسـەرهـاتیـا کوردیدا، کاروانی حیلێ ل کەسێ دی ناکـەت ژ بلی مێـرێ ژنکێ، بەلێ دسـەرهاتیا لاتینی و مسریدا، حیلەکەر جووتیاریو هوستای ژی دبەر پیـا دبەت. . . .

ك ـ دسـەرهـاتیـا لاتینی و مـسریدا، خودانێ هەسپی، هەسپێ خوّ دهێلتـە لـنـك حیلەکـەری یێ کـو حیلەکـەر بێژتێ، بەلێ دسەرهاتیا کوردیدا، حیلەکەر دبێژتە مێرێ ژنکێ توّهوسا ناگەهیێ، ماهینێ پێلەوب پیـا هەرە، دێ زوویتر گەهیێ.

ل ـ دسەرهاتیا کوردی بتنێدا، ناڤێ خودێ (الله) تێت. . .

م ـ دهەمی سەرهاتێت بوریدا، مێرێ ژنکێ راستیێ بونابێژیت و ڤەدشێـریت، بتنێ سەرهـاتیـا کوردی، ڤێ راستیێ نا ڤەشێـریت، دەمێ دبێژتە ژنکێ، ما مروّڤ دچیتە دوژمهێ و تێت. . . . .

ن ـ بتنێ دسەرهاتیا کوردیدا، مێرك خەبەرا دبێژتە ژنکا خوّ و دقوتیت. . . . .

س ـ ناڤێ یێ مری بتنێ دسـەرهـاتیـا کوردیدا هاتیە، کوناڤێ وی (حەسەنك) بو.

ع ـ بتـنـێ دســەرهــاتیــا کوردیدا، کەری دەورێ خوّدبیتیــە، دسەرهاتێت دیدا ناڤێ کەری نە هاتیە:

ف ـ رووبـار کو هێمـایێ (رەمـزێ) بەردەوام بونـا ژ یـانێ‌یـە، بتنێ دسەرهاتیا کوردیو لاتینیدا هاتیە.

ص ـ بتنێ دسەرهاتیا کوردیا، مێرێ ژنکێ دبێژتێ، مێرکێ چەوا بو؟ کیڤـە چوو؟ ئەوژی بوّراڤـە دکـەت. دسەرهاتێت دیدا، ئەڤ بابەتی گرنگە یا کەڤتی.

ق ـ دسـەرهـاتیـا لاتینیدا (فـرانکـو)ی، خوّکرە هوستایێ خانی، دسـەرهـاتیـا مـسریدا، حیلەکـەری خوّکرە جووتیـار، دسەرهاتیا کوردیدا، کاروانی هاتـە سەر رێکـا خودانێ ماهینێ یێ خوّبکـەتە تشتەك. دسەرهاتیا فینلەندیدا، مێرێ ژنکێ ب دویڤ حیلەکەری ناکـەڤیت، چونکی ئەڤ موتیڤـە، دگـەل هنـدەکێت دی، ژڤێ سەرهاتیێ کەڤتینە.

ر ـ دسەرهاتیا کوردیدا، ژنکێ پارە بوّکورێ خوّهنارتنە دوژمهێ، داکـو یێ بچیتـە بازارو دوکـانـا، دسەرهاتیا لاتینیدا، ژنکێ پارە بوّ مێـرێ خوّهنـــارتنـە بەهشتێ، داکـو مەیـا بەهشتێ پێ ڤەخوّت.

دسەرهاتیا مسری و فینلەندی، ئەڤ بابەتە کەڤتیە.

ش ـ دسەرهاتیا کوردیدا، دوو ئولێت (دین)، دکوردستانێدا هەبین خویا بون، ئەڤ دیاردە دسەرهاتێت دیدا نە هاتیە.

ل دویف دوستوری، (جوغرافی مێژوویی)، دڤێت پێنگاڤەکا دی ژی باڤێژین، ئەوژی ڤەکولین وگەریانە، ل دویف جهـ و مێژ ووا سەرهاتیا کوردییە....

هەکە سەرهاتیا، لاتینی، مسری، فینلەندی، ئەلمانی، تورکی، ئیرلەندی.... ئێکی ژئێکی وەرگرتبیت، ئەڤە بۆ سەرهاتیا کوردی دەست نادەت. ئەم نابێژین خەلکی ئەڤ سەرهاتیە، یا ژمە وەرگرتی، بەلێ ئەم دکارین بێژین، کو ئەڤ سەرهاتیا کوردی، یا ژجەرگێ کوردستانێ هاتیەدەر چونکی:

١ ـ ڤێ سەرهاتیێ، سروشتێ کوردستانێ بەرنەدایە، وەکو رووباری، گوندی، ملێ، دەحلی، ستریا، کنچرۆکا، کەری، ماهینێ....

٢ ـ ڤێ سەرهاتیێ، گوتنێت مللی ـ أقوال شعبية ـ ئێخستینە دناڤ کەڤالێ خودا، وەکو:

(ئەڤە بیستەکە) (حنك وچوو)، (ئەرێ وەللا)، (ب وان سەرو دلاڤە زڤری)، (چەپەك ل خودا)....

٣ ـ پەیڤا، (کریڤۆ)، بتنێ دناڤ کوردان دا هەیە، هەروەسا ئێزدی بتنێ، ل کوردستانێ دژین.

٤ ـ چ ناڤێت غەریب ژسروشتێ کوردستانێ وکوردا تێدا نە هاتینە.

٥ ـ چ رووی‌دانێت غەریب وعەجیب ژدوور، ژ (طبیعتێ) کوردان تێدا نە هاتیە.

٦ ـ کاروان، عەباو چووخ، پێلاڤ ژ رەوشت و تیتالێت کوردان نە دوورن.

٧ ـ هەکە ڤێ سەرهاتیا کوردی، بێخینە بەر تیرۆژکا دوستوری (دەروونی ـ نفسی)، دێ پتر بیروهزرێت مە موکم کەن، کو ئەڤ سەرهاتیە، پشکەکە ژدەروونێ مرۆڤێ کورد...

٨ ـ سەرهاتیا کوردی، گوتنەکا دیریا مللی وەرگرتیە، کو کاکلکا وێیە، هەتا ئەڤرۆکە ژی، دەمێ ئێك گەلەکێ عاجز بیت، یان بێ وەستیای بیت، ئێکێ دی بێژتێ، تۆژکیفە تێ ی، دێ کیفە چی؟ دێ بێژتێ، (ئەزێ دۆژەهێ تیم.....)، ئەڤ گوتنە رەسەنی و خومالیا سەرهاتیا مە پتر قایم وموکم دکەن، کو ئەڤ سەرهاتیا کوردی، ژچ مللەتا نە هاتیە وەرگرتن.

مێژ ووا ژدایك بونا ڤێ سەرهاتیێ، کا چ سال پەیدا بویەو کەنگی گوهـورین ب سەردا هاتینە، ئەم نکارین دیار بکەین، چونکی چ ئیشاتێت وەسا تێدا نینن، کو ئەم مێژوویەکێ تێدا دیار بکەین، ژبلی هندێ، کو بێژین، ئەڤ سەرهاتیە دیارە پشتی هاتنا ئیسلامێ پەیدا بویە، بەلێ چ دەمێ ئیسلامێ؟ ئەڤە یا ب زەحمەتە. ژلایێ هونەریڤە، سەرهاتیا کوردی، یا تەواوەو چ موتیف ژێ نە کەڤتینە، وەکو هەر سەرهاتیەکا دیریا کوردی دەست پێ دکەت، هەروەسا ب ئەنجامەکا دیاروروون، ب دوماهی تێت، ئانکو سەروبنێت وەریسکی دکەتە ددەستێ ڤەکولینەرێدا. زنجیرا رووی‌دانا، نە هاتیە بچراندن، چ جهێت ئالۆزو بوشایی (ڤالایی) نا کەڤنە بەر سینگێ ڤەکولینەرا، بەلکو کەمەرەکا پری زێرە، زێرێت وێ ئێك، ئێك گرتیە... ئەڤە ژی بۆمە دیار دکەت، کو هێشتا سەرهاتێت مە ب سلامەتن. دگەل هندێدا دڤێت ژ بیرنەکەین، کو سەرهاتی، وەکو هەمی نایێت دی، یێت فولکلۆری، ژدەڤ بۆدەڤ، یا هاتیە وەرگرتن، زێدەهی وکێماتی چوویە سەرو ژێڤە بویە، بەلێ یا گرنگ ئەڤە نینە، یا گرنگ ئەوە سەرهاتی ژکەڤلۆژانکێ خودەرنەکەڤیت، خوژ بیرنەکەت، کراسەکێ دی دبەرخو نەکەت، بیروهزرێت خو نە گوهوریت. (الحمدلله) ئەڤە ب سەر سەرهاتیا کوردی نە هاتیە، ژبلی چەند نیڤ موتیف چووینە سەر ـ ب دویف هزرا من ـ وەکو، (خەبەر گوتنە ژنا خو)، (بەلێ فایدە نەکر)، یێت کول دوماهیا سەرهاتیێ هاتین. هەروەسا رووباری (باسەوا)، گوهورینە، نەکو زێدەهی یە، چونکی سەرهاتیێژ خەلکێ، (باسەوا) یە، لەوما گوتی، رووبارەکێ وەکو (باسەوا). هەکە هاتو سەرهاتیێژەك دی، ئەڤ سەرهاتیە گوت، دێ ناڤێ رووبارەك دی بێژیت.....

دیسان نیڤ موتیفا، (کاروانی ما ل چ دگەریێت)، زێدەهی یە، یا پێڤە مای. ئەڤ زێدەهی یە، نابنە کیماسی بۆسەرهاتیێ، بەلکو پتر ژین و ڤەژینێ ددەت بەر گیانێ سەرهاتیێ.....

هەکە بزڤرینە سەرهاتیا کوردی، دێ بینین هونەرەك تێدایە، دسەرهاتێت دن دا نەبو، ئەوژی ئەو پرسیارو بەرسڤ بون، یێت دناڤ بەرا ژنکێ و کاروانی دا هاتینە کرن، پرسیارێت ژنکێ درێژ و ل سەرخوبون، بەرسڤێت کاروانی کورت وب لەز بون، دیارە ژ بەر هندێ بویە، چونکی ژنکێ دڤیا پتر ژ حالێ کورێ خو بزانیت، مێرکی ژی دڤیا زوویکا تشتێت خو ببەت وبچیت، بەری مێرێ

ژنكێ بێته مال.

ئەوێ ژ ی دڤێت بزانین، كوسەرهـاتیـا كوردی، ب (هەبونەبو) دەست پێ ناكـەت، بەلێ چیـرۆك و چیڤـانۆك بڤێ كلیلێ ڤەدبن. دیسـان سەرهاتیا كوردی، ب (رەحمە ل دەی بابێت گوهدارا)، یان (ئـەز هاتمـەڤـە، چ نەدا من)، ب دومـای ناهێت، بەلێ چیرۆك و چیڤانۆك، بڤان گوتنا تێنە گرتن

## ژێدەرو پەراوێز

١ - الدراسات الشعبية، بين النظرية والتطبيق، د. نبيلة ابراهيم، مصر. ،ل١٢.

٢ - ژێدەرێ بەرێ، ل٣٦.

٣ - ژێدەرێ بەرێ، ل١٨٠.

٤ - قصصنـا الشعبي من الـرومـانسيـة الى الواقعية، بيروت دار العودة، د. نبيلة ابراهيم، ل٢٥.

٥ - كۆڤارا روشـنبیری نوێ، ژمارە (١٢٠)، ١٩٨٨.

٦ - ئەڤ سـەرهاتیا كوردی، ژ زار دەڤێ (جعفر حارس مصطفى) هاتیە وەرگرتن، خەلكێ گونـدێ (خوركی - باسەوا)یە، ل ناڤ مزوریری ژێریا، گەلەك چیرۆك و سـەرهاتیا دزانیت، ژێ وی دگەهتە (٥٧) سـالا، نهۆل دهوك دژیت

٧ - الدراسات الشعبية، ژێدەرا بەرێ. . . ، ل٢٢٣.

٨ - الدراسات الشعبية، ژێدەرا بەرێ. . . ، ل٢٢٤.

٩ - الدراسات الشعبية، ژێدەرێ بەرێ. . . ، ل٢٢٨.

# حكاية كردية في ضوء

# المنهج الجغرافي التاريخي

حجي جعفر

يحـاول الكـاتب في هذا البحث، ان يحلل حكـايـة كردية في ضوء المنهـج (الجغـرافي التـاريخي) الـذي وضعته مجموعة من علماء الالحان وعلى رأسهم (أنتي أرني). وفي ضوء هذا المنهج قارن الكـاتب هذه الحكـاية الكردية مع ثلاث حكايات متشابهة، (مصرية - ولاتينية - وفنلندية) وشرحها واخرج المواضيع المتشابهة وغيـر المتشـابهـة. وبعـد ان أوضـح الكاتب اهم المواضيع وضع الحكـايـة الكـرديـة تحت المنهـج (الجغرافي التاريخي) وحللها تحليـلاً جغـرافيـاً وتاريخياً واستنتج الكاتب بان الحكاية الكردية، ليسـت مستعـارة أو مهـاجـرة الى كردسـتـان من ديار اخرى، بل هي حكـايـة اصيلة خالصـة نابعة من قلب كردستان. واستنتج الكاتب بأن الحكاية الكردية هي من صنع العصر الاسلامي.

كمـا تطـرق الكـاتب الى مايعتـري الحكاية الكردية من حذف وتحـويـر وتغيـر، ويعتقـد بان الحكـاية كانت متكاملة من الناحية الفنية ولازالت الحكاية الكردية تعيش بخير.

ولاينـسى الكـاتب فضل الدكتورة (نبيلة ابراهيم)، ويعتبر نفسـه مديناً لهـا، حيث لولا دراساتها وترجماتها لهذا المنهج وغيره، لما كان بامكان الباحث التطرق الى هذه المواضيع ودراسـة الحكايات الكردية في ضوء هذه المناهج . . . . .

# وەرزانەی رۆشنبیری

ئامادەکردنی سەرگوڵ تەیمور

دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی لە بەغدا ئەم بزوتنەوانەی پێشکەش کرد.

- بە بۆنەی رۆژی سەرکەوتنەوە (٨ ئاب) ئاهەنگێکی فراوانی گێرا تیدا جێگری بەرێوەبەری گشتی وتەیەکی خوێندەوەو باسی تێکۆشانی بێ وچانی گەلی عیراقی کرد. ئینجا ئاهەنگی گۆرانی‌و مۆسیقا دەستی پێکرد.
- لە ریکەوتی ١٩٨٩/١٢/١داو بە بۆنەی رۆژی شەهیدەوە ئاهەنگێکی گێرا، بەرێز مامۆستا مصلح جەلالی بەرێوەبەری گشتی دەزگا وتەیەکی خوێندەوە باسی پلەی شەهیدی کرد.
- بەبۆنەی رۆژی برادانەوە ١٩٨٩/١١/١٤ ئاهەنگێکی فراوان گێرا مامۆستا مصلح جەلالی وتەیەکی خوێندەوەو خەلاتی چەند موچەخۆرێکی داهێنەری کرد.

## خوێندنی بەرزو قوتابیانی کورد:

(١) کاك مەریوان وریا قانع بە پلەی ئیمتیاز باوەر نامەی ماجستیری لە هەڵسووراندنی کاروباردا وەرگرت، نامەکەشی بەناوی (کاری کەشی رێکخستن لە دەرچەکانی ریکخستن دا، لێکۆڵینەوەیەکی بەکردەوەیە لە کارگەی پیشەسازی خوری‌دا لە هەولێر) پێشکەشی زانکۆی بەغدا - کولیجی کارگێری‌و ئابووری کرد.

(٢) لەزانکۆی صلاح الدین لە کۆلێژی ئەدەبیات گفتوگۆ لەسەر نامەی قوتابی نازەنین علي محمود کرا کەدەربارەی شاعیر بلند حیدری ئامادەی کردبوو.

(٣) رۆژی پێنج شەممە ریکەوتی ١٩٨٩/١١/٢ لە کۆلێژی زانستی بەشی زەوی ناسی زانکۆی صلاح الدین گفتوگۆی بروانامەی قوتابی خوێندنی بالا (ئارام نامق توفیق) کە بەناونیشانی لێکۆڵینەوەی برگەیەکی جیولوجی - جیوفیزیاوی لە نیوان شارەکانی بەغدا - تکریت - موصل - دهوك)کرا. لیژنەکە نامەکەی پەسەندکرد بەپلەی ئیمتیاز

(٤) لە زانکۆی بەغدا لەم ماوەیەی دواییدا لە بەشی پەروەردەو دەرون زانی نامەی ماجستیری قوتابی کەریم شەریف عبدالله کۆڵرایەوە کە بەناونیشانی (کاریگەری بێ باوکی لە سەر گەشەکردنی رۆڵی سکسی کورەکانیان)

(٥) رۆژی ١٩٨٩/١١/٨ لە زانکۆی صلاح الدین - کۆلیجی ئاداب وتوویژ لەسەر نامەی ماجستیری قوتابی کورد کاك لطیف محمد حسن کراو لیژنەکە بەسەرۆکایەتی د. علي عباس علوان بوو. لە ئەنجامدا پلەی ئیمتیازی پێ دراو بریاردرا لەسەر ئەرکی زانکو چاپ بکرێت نامەکەش بەناونیشانی «الحیاة والموت في شعر ابي القاسم الشابي».

(٦) لە زانکۆی صلاح الدین بەشی زەوی زانی موناقەشەی بروانامەی ماجستێری قوتابی ئامانج ابراهیم فتاح کرا بە ناونیشانی (دراسة السحنات الدقیقة لتکوین نجمة في مناطق مختارة في شمال وشمال العراق).

(٧) لە زانکۆی صلاح الدین کۆلێجی ئاداب بەشی زمانی عەرەبی موناقەشەی بروانامەی ماجستێری قوتابی محمد صابر مصطفی کرا بە ناونیشانی (النودهي وجهوده النحویة).

(٨) لەرۆژی ١٩٨٩/١٠/١٤ قوتابی ئیبراهیم محمد شەریف سندی لە کولیجی قانون لە زانکۆی بەغدا نامەی ماجستیری بەناوی «بەرپرسیاری سووچداری (المسؤولیة) کە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری‌یە گفتوگۆی لەسەر کراو بە پلەی سەرکەوتوو پەسەندکرا.

(٩) رۆژی ١٩٨٩/٨/٢١ لە هۆڵی یەکیتی نیشتیمانی قوتابیان و لاوانی عیراق لقی کوردستان لە هەولیر نامەی ماجستیری قوتابی ئیبراهیم احمد حسین کۆڵرایەوەو لیژنەکەش بریتی بوون لە د. مارف خەزنەدا (سەروك) ئەندامیەتی د. امین موتابچی د. محمد نوری عارف سەرپەرشتکاری نامەکە. نامەکەش بە ناونیشانی (دیوانی موخلیص) بوو.

(١٠) خالد أمین باوەرنامەی ماجستیری لە زانکۆی صلاح الدین کۆلیجی بەریوەبردن و ئابووری وەرگرت، نامەکەشی دەربارەی ریۆشوینی کۆکراوەی گیروگرفتی هەڵگرتنی قوماش بوو

(١١) مصطفی زەنگنە باوەرنامەی ماجستیری لەکۆلیژی ئاداب بەشی کوردی، زانکۆی صلاح الدین وەرگرت و باسەکەشی بەناونیشانی (کارو ئەرکی لە سینتاکسیدا)و لیژنەی وتوویژ. د. پاکیزە رفیق حلمی، د. نەسرین فخري، د. فاروق عمر بوو.

## یەکیتی ئەدیبان و نووسەران:

- لە دهوك رۆژی ١٩٨٩/٧/٢٩ کۆرێك بۆ هزرڤان عبدالله لەسەر دیوانی (وەرنەئەڤینێ)
- لە دهوك رۆژی ٧/٢٠ کۆرێك بۆ دکتۆر فاضل عمر لەسەر زمانی نووسین
- لە دهوك رۆژی ١٩٨٩/٨/١٤ کۆرێك بۆ صدیق شەرۆ لە بابەتی (دارشتنا هۆزانێ ب دیتنا رەخنێ)
- رۆژی ١٩٨٩/١١/١٢ لقی یەکیتی لە هەولیر کۆرێکی چیرۆك خوێندنەوەی بۆ چیروکنووس فیصل دیهاتیو هەڵسەنگاندنی مصطفی درویش. سازکرد.
- رۆژی ١٩٨٩/١١/١٣ لقی یەکیتی ئەدیب و نووسەرانی کورد لە هەولیر ئاهەنگیکی گەورەی بە بۆنەی رۆژی بروادانەوە گیرا، مامۆستا حسن حسین، نصرالدین مجید، مغدید سۆران، فخرالدین گەرمیانی وتارو شیعریان خوێندەوە

## (شانۆ)

تیپی شانۆی (ئەڤرۆ) لە رۆژی ١٩٨٩/٩/٢٦ لە پاریزگای دهوك شانۆیی (بیرەوەرییت دینەکی) پێشکەش کرد دەرهیانی احسان عثمان

- لە ریکەوتی ١٩٨٩/١٠/٢ لەسەر شانۆی هۆڵی فارابی لە سلیمانی شانوگەری (ناڵەی حەسەن زیرەك) پێشکەش کرا، ئامادە کردن و دەرهێنانی (بەختیار کوردی)

- شانۆیی دکتور فاوست نووسینی نووسەری مەغربی عبدالکریم برشید، دەرهێنانی دلشاد أحمد، تیپی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی سلیمانی لەسەر شانۆی ئامادەیی سلێمانی کوران لە ١٩٨٩/١٠/٢٥
- لەهەفتەی دوایی تشرینی دووەم دا تیپی شانۆو هونەرە میللیەکان لەهەولیر شانۆنامەی (مۆڵەت)ی پیشان دا. نووسینی محي الدین زەنگەنەو دەرهێنانی تحسین شعبان.
- تیپی شانۆیی (شورەشڤان)ی سەر بە نقابەی هونەرمەندان لە دهوك شانۆیی (بوچی) پێشکەش کرد لە ١٩٨٩/٨/٢٥دا بۆماوەی چوار رۆژ.

## هونەر

- دەزگای هونەری تەشکیلی پێنجەم پێشانگای هونەرمەند نامق علي قادری سازکرد لەسەر هۆڵی الرواق لە بەغدا لەریکەوتی ١٩٨٩/٩/٣٠دا.
- ٩/١٤ پێشانگای دیکۆر سازیی مەریوان عبدالرحیم زەنگنە لەسلێمانی.
- ١١/١٥ پێشانگای نیگاری هێلکاریو گرافیکی فؤاد کریم لە بەغدا
- یادی سالانەی هونەرمەندی بەناوبانگ تایەر تۆفیق بە ئاهەنگێکی رازاوە لە شاری کۆیە لەلایەن تیپە هونەرییەکانی هەولیرو کۆیەوە ئەنجام درا.
- ١٩٨٩/١٠/١٩ هونەرمەندی ناسراو دلشاد محمد سعید دەربارەی ئەمرۆی مۆسیقای کوردی و تازەکردنەوەی و تاریکی پێش کەش کرد.
- ١٩٨٩/١١/٦ پێشانگای هونەری تەشکیلی سێ قۆلی وەهبی رسول، بێگەرد عثمان و مەریوان جلال لە سلێمانی کرایەوە.
- لە ١٩٨٩/١١/٢٢ دووەم پێشانگای هونەری تەشکیلی ابراهیم اسماعیل لە هەولیر کرایەوە.
- رۆژی ١٠/١٤ پێشانگای سیرامیکی سامیە احمد لە سلێمانی
- پێشانگایەکی هونەری شیوەکاری لە هەولیر کرایەوە بۆ شەهید سەردار حسن. (٣٧) تابلۆی تێدا بوو
- رۆژی ١٩٨٩/١١/٥ لە هۆڵی ئەمانەتی گشتی رۆشنبیریو لاوان لەهەولیر پێشانگای شیوەکاری هونەرمەند رۆستەم رەسوڵ کرایەوە.
- لەهەولیر رۆژی ١٩٨٩/٨/١٦ لەهۆڵی قوتابخانەی ئەیوبیەی

کچان پێشانگایەکی فراوانی وێنەی فۆتۆگرافی کرایەوە کە لەلایەن کۆمەڵەی وێنەگرانی عیراق لقی هەولێر سازکرا بوو

- لە شاری هەولێر رۆژی ٢/٩/١٩٨٩ کۆڕێکی فراوان بۆ مۆسیقا کە گەلێك پارچە مۆسیقای جوانی تیدا پێشکەش کرا هونەرمەند لقمان جوهر لەگەڵ تیپی موسیقای بەهرەوەران بەشداربیان تێداکرد.

- لە هەولێر پێشانگای هونەرمەند عبدالوهاب فوئاد لە هۆڵی رۆشنبیری گشتی لە مانگی ٩/١٩٨٩ کرایەوە.

- لە دهوك رۆژی ٢٤/١٠/١٩٨٩ پێشانگای هونەری تەشکیلی مامۆستا عزیز سلیم.

- لە چوارچێوەی سێ یەمین میهرەجانی بابل دا لەرۆژی ٢٩/٩/١٩٨٩ هونەرمەند دلشاد محمد سعید سەمفونیایەکی کوردی پێشکەش کرد کە ئەمساڵ بۆ ئەم میهرەجانە دانابوو.

## هەولێر

أ - چالاکییەکانی هەفتەی قادسیەی صدام

- رۆژی ٢/٩/١٩٨٩ لقی دەزگا لە هۆڵی (ابن المستوفي) ئێوارە کۆڕێکی بۆ مۆسیقا سازکرد

- ٢/٩/١٩٨٩ پێشانگای زانستی لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری و لاوان

- ٥/٩/١٩٨٩ کۆڕێکی فراوان دەربارەی قەڵاچۆکردنی تاوان لەلایەن یەکێتی قوتابی و لاوانەوە.

- ٦/٩/١٩٨٩ سازکردنی ئاهەنگ لەلایەن یەکێتی قوتابی لاوانەوە

- ٧/٩/١٩٨٩ ئاهەنگێکی فراوان یەکێتی کرێکاران

- چەند چالاکییەکی وەرزشی مەڵبەندی گشتی لاوان و قوتابیان.

- ١١/٩/١٩٨٩ کردنەوەی پێشانگایەکی دوورین و هونەری شێوەکاری لە هۆڵی لاوانی عەنکاوە.

- ١١/٩/١٩٨٩ کردنەوەی پێشانگای شێوەکاری لەلایەن نەقابەی هونەرمەندان

- ١٢/٩ کۆڕێکی رۆشنبیری لەلایەن لیژنەی صدیق لە صدیق

- ١٢/٩ کردنەوەی پێشانگای بەرهەمی زانستی و دابەش کردنی دیاری لە هۆڵی چاودێری زانستی.

- ١٦/٩/ کۆڕێکی رۆشنبیری لە کەورگۆسك

- ١٦/٩ کۆڕێکی رۆشنبیری لەلایەن یەکێتی قوتابیان و لاوان.

- کردنەوەی پێشانگایەکی کتێب لە لایەن دەزگای نیشتمانی بڵاوکردنەوەو دابەش کردن لە ٦/٩/١٩٨٩.

- لە ٢٠/٩ پێشانگای (فاو) لەلایەن کۆمەڵەی وێنەگرانی عیراق لقی هەولێر

- لە ٢١/٩/ سازکردنی ئاهەنگێکی گەورە لەلایەن نەقابەی هونەرمەندان

- لە ٢٣/٩/ کۆڕێکی رۆشنبیری لەلایەن یەکێتی قوتابیان ولاوانەوە

ب - دەزگای رۆشنبیری وبڵاوکردنەوەی کوردی لقی هەولێر رۆژی ٤/١١/١٩٨٩ لەهۆڵی نقابەی کرێکاران کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەی بۆ مودریك ژالی، شۆرش محمد علی، ئارام صالح، وریا جلی زادەسازکرد..

جـ - لەهەولێر ٧/١١/١٩٨٩ کۆڕێك لەسەر ئەدەبی منداڵان کە مامۆستا روستەم باجەلان و ژمارەیەك منداڵی شیعر دۆست پێشکەشیان کرد.

د - بەبۆنەی جەژنی ١٧ - ٣٠ی تەمووزی پیرۆزەوە رۆژی ٣١/٧/١٩٨٩ لە هۆڵی میدیا ئەمینداریتی رۆشنبیری و لاوان پێشانگایەکی چاپەمەنییەکانی خۆیانی رێك خست.. لەگەڵ ئاهەنگێکی گەورەی هونەرو مۆسیقادا

## سلێمانی

- بەبۆنەی جەژنە مەزنەکانی تەموزەوە لەرۆژی ١٥/٧/١٩٨٩ لقی دەزگا پێشانگایەکی کتێبی کوردی و عەرەبی خستە رووبەنرخێکی داشکاو.

- سەر لە ئێوارەی رۆژی ٣١/٧/١٩٨٩ ئێوارە کۆڕێکی تایبەت بە ئەدەبی منداڵان بۆ مامۆستا عمر عبدالرحیم و مامۆستا لطیف هەڵمەت

- رۆژی ١٢/٨/١٩٨٩ تا ١٩/٨/١٩٨٩ پێشانگایەکی کتێب لەشاری چە مچەماڵ

- رۆژی ٢٣/٩/١٩٨٩ لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی پێشانگایەکی تایبەتی بە چاپکراوەکانی دەزگاکەمان

- کۆڕی چلەی ماتەمینی شێخ محمدی خاڵ:

رۆژی ٢٤/٨/١٩٨٩ کۆڕی چلەی ماتەمینی بۆ زاناو ئەدیبی کورد شێخ محمدی خاڵ گێڕراو. ووتەی مامۆستا مصلح جەلالی خوێندرایەوەو پاشان کاك فریا جاف ووتەی یەکێتی ئەدیبان و نووسەران لقی سلێمانی خوێندەوە و ئەم بەرێزانەش هەندێکی خۆیان ووتاریان خوێندەوە و هەندێکی لەبریان خوێندرا یەوە:

مامۆستا عبدالکریم المدرس، جمال بابان، حسیب قەرەداغی،

جمیل رۆژبەیانی - د. عزالدین مصطفی، د. شکریة رسول، محمود أحمد محمد، رؤوف ئالانی، ساجد ئاوارە، محمدی مەلا کەریم قادر برسی، عبدالرحمن مفتي، پاشان بەفلیمی فدیو چاوپێکەوتنێك لەگەڵ مامۆستای خاڵدا پیشان درا.

## دهۆك

بەبۆنەی چەژنەکانی تەمووزەوە کوڕێکی شیعر خوێندنەوە لە ١٠/٧/١٩٨٩ بۆ ئەم شاعیرانە: ابراهیم علی هاجانی، غنیة بطرس، کامیران درباس، گوڤان شعبان، ناجي طه، عبدالرحمن طیب مصطفی محمد، عمر عامر

- لە ٢٢/٧/١٩٨٩دا کوڕێك بۆ کاك بابیز عمر لەسەر شانۆی کوردی سازکرا.
- لە ١٩/٧ دا کوڕێك لەسەر فۆلکلۆری کوردی بۆکاك حجي جعفر.
- لە رۆژی ٢٠/٧/١٩٨٩دا کۆڕێك بۆ دکتور فاضل عمر لەسەر زمان
- لە ١٤/٨/١٩٨٩دا کوڕێك بۆ مامۆستا معروف خەزنەدار بەناونیشانی (رۆژهەلات ناسی‌و کورد ناسی لە ئەوروپاو رۆژئاوادا)
- رۆژی ١٤/٨/١٩٨٩ کوڕێك بۆ (صدیق شەرۆ) بەونیشانی دارشتنی شیعر.
- کوڕێك لەسەر رێزمان بە ناوی (بەکارهێنانی پیتی (ی) لە ریزمانی کوردیدا بۆ مامۆستا متي فیلیب البازي

## هەواڵی رۆشنبیری بەغدا:

١ - کۆڕێکی هەلبەست خوێندنەوە لە کۆمەلەی رۆشنبیری کوردی رێك خراو ئەم شاعیرانە شیعریان خوێندەوە: صلاح شوان، عبدالله عباس، سعدالله پەرۆش، کریم دەشتی، نەوزاد رەفعت، مجیدی حەسۆ، فرید زامدار

٢ - لە ٢١/١١/١٩٨٩ کوڕێك بۆ مەریوان وریا قانع دەربارەی بنیاتگەری لە شیعری گۆران دا رێك خرا

٣ - لە ٣/١١/١٩٨٩ د. بەدرخان سندی دەربارەی (مێژووی قوتابخانەو ئەنجوومەنە کوردیەکان لە بەغداد) لەیانەی سیروان وتارێکی پێشکەش کرد.

٤ - لە ١/١١/١٩٨٩دا لە هۆڵی ئیدریسی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا قوتابیانی کورد یەکەم فیستڤاڵی پیرەمەگرونی ویژەییان ساز کردو لەلایەن مامۆستا مصلح جەلالی بەرێوەبەری گشتی دەزگا کرایەوە

٥ - رۆژی ٢٦/١١/١٩٨٩ قوتابی فتحی محمد علی کوڕێکی دەربارەی رۆژهەلاتناسی لەهەمان کۆلێژدا سازکرد.

## کتێبی تازە

١ - تیۆوەکانی مۆسیقا - صلاح رؤوف
٢ - شاری سلیمانی بەرگی دووەم - کۆکردنەوەو نووسینی اکرم محمود، صالحی رەشە
٣ - بوونەوەرە هۆشمەندەکانی بۆشایی ئاسمان - دانان و وەرگیرانی اسماعیل موسی مرادو ئازاد حمە شریف
٤ - کێشەی کورد (بەشی‌یەکەم) د. کاوس قەفتان
٥ - القنص - کۆمەڵە چیرۆکێکی بەعەرەبی کراو - حسن جاف
٦ - پەیکەرو پیاو - کۆمەڵە چیرۆك - غفور صالح عبدالله
٧ - هەڵۆ - کۆمەڵە چیرۆك - رؤوف بێگەرد
٨ - کۆردەرە - رۆمان - خوسرەوجاف
٩ - پێشەکی‌یەکی دەرمان زانی - د. ذنون پیریادی
١٠ - دیروکا چیرۆکا کوردی یاهونەری - شعبان مزیری
١١ - حەیرانۆك ژکەلەپووری کوردی - حجي جعفر
١٢ - شیعرو بەرهەڵستی‌و راچەنین لە کوردستانی ئیران - محمود زامدار
١٣ - دیلان - حسن سەربەنی
١٤ - عەشقی دلان شعر - عمر جاف
١٥ - فەرهەنگی زانیاری‌و هونەر یان (دائرة المعارف) مامۆستای ئەندازیاری ئەدیب خوسرەوجاف

## ژمارەیەکی تایبەتی رۆشنبیری نوی بۆ فولکلۆر تەرخان دەکرێت

لەسەر داخوازیی لیژنەی فولکلۆری کوردی سەر بە ئەمیندارێتی روشنبیری‌و لاوان لە هەولێر دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەمان بریاری دا ژمارەیەکی تایبەتی بۆ فولکلور تەرخان بکات جا هیواداریین باس و لیکولینەوەو دەقی نایابی فولکلوری پێش کەش بکەین. بەرهەمی هەموو نووسەرێك بەریزەوە وەردەگرین و ئەوەی شیاوی بلاوکردنەوە بوو بلاوی دەکەینەوەو لەم بارەیەوە هاوکاری لەگەڵ لیژنەکە دەکەین.



# قەڵای شێروانە

بەرگی گۆڤارەکەمان ئەم جارە بە قەڵای شێروانە رازاندەوە، بەو ناوە کە شوێنەوارێکی دێرینەی کوردە سەرۆکی فەرماندە بەرێز صدام حسین تەشریفی بۆ بردو بەهۆی تەلەفزیون و رۆژنامەکانەوە وێنەی قەڵاکەو سەردانی سەرۆکی تێکۆشەر لەقەڵاکە دەنگی دایەوەو مێژوو یەکی ناوچەکەی بیرهێنایەوە.

ئەوەبوو لە سەرەتای مانگی تشرینی یەکەمدا سەرۆکی بەرێز پێنج رۆژ گەشتی بە ناوچەکانی کوردستان دا کردولە ٢ / ١٠دا لەنزیك شاری کەلار سەری‌دا لە قەڵای شێروانـــەو فەرمـــانی‌دا ئاوەدان بکرێتەوەو شێوازی دیاری بیناسازیی‌یەکەی بەشێوازی ئیسلامی پارێزگاری لێ بکرێت. ئەم گەشتەی نوێنوخشەی فەرو خێر بووجەماوەری کوردستان بە خۆشەویستی‌و رێزگرتنەوە پێشوازی لە صدام حسین نیشانەی پایە بەرزی گەل کرد.

هەر لەو گەشتەدا بوو سەرۆکی تێکۆشەرگوتی: (کوردستان دەکەین بە بەهەشتی خوا لەسەر زەوی)ئەوەی شایانی گوتنە ئەم قەڵایە سالی ١٨٧٤ لەلایەن محمد پاشای جافەوە دروست کراوە، تەرزی بیناکەو تاق و هەیواڵ و حەوشەو نەخشەکەی، تەرزێکی نایاب و جوانە شایانی ئەوەیە لە دەستی رووخان و لەناوچوون رزگار بکرێت، بەو پێیە نیشانەیەکی شارستانەتی‌ی گەلە بایەخ دانی سەرۆکی فەرماندە بەم شوێنەوارە مێژوویی‌یە مایەی شادی‌و سەربلندی گەلی کوردە.

ROSHLNBLRY NWE
QUARTERLY MAGAZLNE
FORSTUDLES AND RESEARCHES
PUBLISHED BY: THE KURDISH
CUL TURAL AND PUBLISHING HOUE
MINISTRY OF CUL TURE AND
INFORMATION
BAGHDAD - IRAQ

روشنبيرى نوى
مجلة فصلية تعنى بالدراسات
ر عن: دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغداد



العنوان دار الثقافة والنشر الكردية
الوزيرية قرب المعهد القضائي
تلفون ٤٢٥١٨٤٦ بدالة (٤) خطوط
ص.ب. ١٤٠١٦

الثمن ٥٠٠ فلس

دار الحرية للطباعة
بغداد

بدل الاشتراك السنوي ٤ دنانير

# لەگەڵ ڕێزو سڵاوی گــــۆڤــاری ڕۆشنبیری نوێ

## ١٩٩٠ ز ■ ٢٦٩٠ کــــــوردی ١٤١٠ ■ ١٤١١ کــــــۆچــــی

(١) کانوومی دووەم/ بەفرانبار - ڕێبەندان

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ |
| سێشەممە | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | ٣٠ |
| چوارشەممە | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ | ٣١ |
| پێنج شەممە | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ | |
| هەینی | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ | |
| شەممە | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ | |
| یەک شەممە | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | |

(٢) شوبات/ ڕێبەندان - ڕەشەمێ

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ |
| سێشەممە | | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ |
| چوارشەممە | | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ |
| پێنج شەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | |
| هەینی | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | |
| شەممە | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ | |
| یەک شەممە | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ | |

(٣) ئادار/ ڕەشەمێ - نەوروز

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ |
| سێشەممە | | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ |
| چوارشەممە | | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ |
| پێنج شەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ |
| هەینی | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | ٣٠ |
| شەممە | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ | ٣١ |
| یەک شەممە | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ | |

(٤) نیسان/ نەوروز - گوڵان

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | ٣٠ |
| سێشەممە | | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ | |
| چوارشەممە | | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ | |
| پێنج شەممە | | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ | |
| هەینی | | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ | |
| شەممە | | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | |
| یەک شەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ | |

(٥) ئەیار/ گوڵان - جۆزەردان

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ |
| سێشەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ |
| چوارشەممە | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | ٣٠ |
| پێنج شەممە | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ | ٣١ |
| هەینی | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ | |
| شەممە | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ | |
| یەک شەممە | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ | |

(٦) حوزەیران/ جۆزەردان - پووش پەڕ

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ |
| سێشەممە | | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ |
| چوارشەممە | | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ |
| پێنج شەممە | | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ |
| هەینی | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ |
| شەممە | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | ٣٠ |
| یەک شەممە | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ | |

(٧) تەمووز/ پووش پەڕ - خەرمانان

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | ٣٠ |
| سێشەممە | | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ | ٣١ |
| چوارشەممە | | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ | |
| پێنج شەممە | | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ | |
| هەینی | | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ | |
| شەممە | | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | |
| یەک شەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ | |

(٨) ئاب/ خەرمانان - گەلاوێژ

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ |
| سێشەممە | | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ |
| چوارشەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ |
| پێنج شەممە | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | ٣٠ |
| هەینی | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ | ٣١ |
| شەممە | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ | |
| یەک شەممە | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ | |

(٩) ئەیلول/ گەلاوێژ - ڕەزبەر

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ |
| سێشەممە | | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ |
| چوارشەممە | | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ |
| پێنج شەممە | | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ |
| هەینی | | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ |
| شەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ |
| یەک شەممە | ٢ | ٢٣ | ١٦ | ٩ | ٣٠ |

(١٠) تشرینی یەکەم/ ڕەزبەر - گەلاڕێزان

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ |
| سێشەممە | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | ٣٠ |
| چوارشەممە | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ | ٣١ |
| پێنج شەممە | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ | |
| هەینی | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ | |
| شەممە | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ | |
| یەک شەممە | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | |

(١١) تشرینی دووەم/ گەلاڕێزان - ڕەزبەر سەرماوەز

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ |
| سێشەممە | | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ |
| چوارشەممە | | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ |
| پێنج شەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ |
| هەینی | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | ٣٠ |
| شەممە | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ | |
| یەک شەممە | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ | |

(١٢) کانوونی یەکەم/ سەرماوەز - بەفرانبار

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| دووشەممە | | ٣ | ١٠ | ١٧ | ٢٤ ٣١ |
| سێشەممە | | ٤ | ١١ | ١٨ | ٢٥ |
| چوارشەممە | | ٥ | ١٢ | ١٩ | ٢٦ |
| پێنج شەممە | | ٦ | ١٣ | ٢٠ | ٢٧ |
| هەینی | | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ |
| شەممە | ١ | ٨ | ١٥ | ٢٢ | ٢٩ |
| یەک شەممە | ٢ | ٩ | ١٦ | ٢٣ | ٣٠ |

دەرهێنانی هونەری: نەسرین خضر